## لەم ژمارەیەدا

● راپورتی جەنگ و رامیاری :



● لێکۆلینەوەی زمانەوانی :



● مێژوو :



● زانست :



● کەلەپووری نەتەوەیی :



● لێکۆلینەوەی ئەدەبی :



● بیرەوەری و یادداشت :

ڕۆشنبیری نوێ
ئاداری ساڵی ١٩٨٨
ژماره ١١٧

گۆڤارێکی وەرزانەی لێکۆڵینەوەیە
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەرەکی ئەنجومەنی
کارگێڕو سەرنوسەر
مصلح جەلالی

دەستەی نوسەران

د. أمین موتابچی
د. جمال رشید
د. محسن محمد حسین
د. کوردستانی موکریانی
فؤاد حمه خۆرشید
غفور میرزا کریم

سکرتێری نووسین:
عبدالرزاق بیمار

دەرهێنانی هونەری نەسرین خضر

ناونیشان

دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
وزیریە تەنیشت المعهد القضائی ت٤٢٥١٨٤٦



# ئالای سەرکردە صدام حسین لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی‌تر بەردەوام دەبێت

**سمیرة محمد علي**

صدام حسین پاڵەوانێکی بە جەرگ و چاونەترسە لە ژیانی گەل دا، لە شێوەی سوارچاکێکی بێ وێنەو هەڵویستەکانی بە گوێرەی جەماوەرو رۆڵەی هێزە چەکدارەکان پێك دێنێ.

نموونەیەکی وا کە لە ناخی‌دا گیانی ئازایەتی بەرەوپێشەوە چوون و قوربانی دانی تێ‌دا بخەملێ.

صدام حسین رەمزێکە هەر هاوولاتیەك و هەر جەنگاوەرێك لە هێزە چەکدارەکانمان هەستی پێ‌دەکەن شانازی بەوە دەکەن لە ژێرسێبەری‌دا بن و شانازی بەوە دەکا کە سەربازێکن لە سێبەری‌دا سەرکەوتن بە دەست دێنن..

جەنگاوەرە دلێرەکانمان بە ورەیەکی بەرزەوە دەجەنگن، چونکە ورەیان لە سەرکردەوە وەردەگرن، سەکردەی بلیمەت و لێهاتوو.

لە کاتێك دا تووشی ئەم جەنگە بووینە لەگەڵ رژێمی فارسی رەگەزپەرست وسەرکەوتنی مەزنمان وەدەست هێناوەو لە هەموو بەرەکانی جەنگ دا جەنگاوەرانمان داستانی قارەمانی‌یەتیان نواندوە.... یادێکی پیرۆز وەبیردەخەینەوە ئەویش یادی لە دایك بوونی حزبی سەرکردە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە رۆژی ٧ی نیسانی ساڵی ١٩٤٧دا، عیراقی‌یەکان بە کوردو عەرەب و هەموو کەمایەتی‌یەکانی‌تری ولاّت بە گەورەو بچووکەوە ئاهەنگ بە بۆنەی ئەم یادە پیرۆزە دەگێرن حەوتی نیسان رۆژێکی پرشنگدارە نەك لە عیراق بەڵکۆ لە مێژووی هەرێمەکانی عەرەبیش دا.

ئەم حزبە روو بەرووی هەموو کۆنەپەرستان و ئەو لایەنانەی سەر بە دەزگا ئیمپریالیست و زایۆنیەکان وەستا.

٧ی نیسان لە دایك بوونی سەرکەوتنە، جەماوەرە تێ‌کۆشەرەکەمان خۆشی‌و شادی دەردەبڕن بەو سەرکەوتنە مەزن و داستانە

قارەمانیەتی‌یانەی شۆرە سوارانی قادسیە وەدەستی‌دەهێنن، نموونەی پاڵەوانیەتی‌و بە جەرگی‌و دلێری دەنوێنن لە بەرەکانی جەنگ دا. جەنگاوەرە پاڵەوانەکانمان، کە ئەم جەنگەو ئەرکی بەرگری کردن لە خاك و ئاوی عیراقیان خستوەتە ئەستۆی خۆیانەوەو بە ئەرکێکی گەورەی دادەنێن..

هەروەها بەرگری لە بنیاتنانی شارستانیەت دەکەن بە سەرکردایەتی سوارچاکی لێهاتوو صدام حسین.. ئەوەی بە رێرەوی بەرەوپێشەوە چوون و پێشخستنی خەباتی گەورەی ئەم حزبە نەمرەدا بچێتەوە وێنەیەکی جوان و مەزنی لە پێش چاودا دروست دەبێت، ئەویش تێکچرژانێکی وشیارانە لە نێو حزب و جەماوەردا کەوا بنەڕەتەکانی لە وەفایی ئەم رێرەوە خەباتگێرە وەردەگرێت کەوا کۆڵەکەو بنچینەی لە رۆژی ٧ی نیسانی ساڵی ١٩٤٧دا دانا، بیرەوەری (٤١) ساڵەی دامەزراندنی پڕ کۆشش و خەباتەکە سەدان دەستکەوتی بۆ جەماوەر هێناوەتە کایەوە..

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست نەخشەی بۆ رێرەوی هاوچەرخی کێشاوە، وەکو جووڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی سەر بە بیری نەتەوەیی سۆشیالیستی، هەروەها لە ڕەگی مێژووی نەتەوەو نرخە بەهاکانی‌و کەلەپووری کە پڕە لە بەخشش پرشنگدارو نامەی شارستانیەتی نەمر...

عیراقی‌یەکان بە دەستە بەرەی خەباتی بەعس و ڕاستیی بیرو باوەڕەکانی دەژین کەوا گۆڕانێکی دیاری لە هەموو بوارەکانی ژیان دا بەرپاکرد، کەوا لە خۆشگوزەرانی‌و کامەرانی‌داو بە هێمنی دەژین و دەڕوانن ئاسۆکانی پاشەرۆژ.

ئەو بەخشش و قوربانی‌دانەی جەماوەر بۆ ئەم نیشتیمانەو گردبوونەوەی جەماوەر لە دەوری سەرکردایەتی شۆڕش و لە سەرووی هەموویانەوە سەرەکی بەرێز صدام حسین (خوابیپارێزێت) ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی وڵاتەکەمان تێیدا دەژیت دژی رژێمی ئێرانی نەفرەت لێکراو جەنگێکی بەرگری‌کردنە لە خاك و ئاو وشەرەفمەندی عیراقی‌یەکان، دژی پەلاماری دڕندانەی کۆنەپەرستانی قوم و تاران ئەوەی یارمەتی لەدەزگا ئیمپریالیست و زایونیزمەکانەوە وەردەگرێت.

ئەمە تاقی‌کردنەوەیەکی راستەقینەیە کەوا تاج ڕادەیەك بیروباوەڕەکانی حزبمان کاری‌گەری خۆی هەیەو رووبەروو بوونەوەی هەموو بەرهەڵستی‌یەکان بووەتەوە...

سەرکەوتنێکی پڕ شانازی‌و تاقی‌کردنەوەیەکی پڕ شانازی‌یە...

* * *

سەرکردەی دامەزرێنەر هاوڕێ میشیل عفلق ئەمینداری گشتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست.. لە وتەیەکی نەتەوەیی سەرتاپاگیر بە بۆنەی بیرەوەریی دامەزراندنی حزبن بەعسی عەرەبی سۆشیالیست فەرموویەتی: «ئەو جەنگەی عیراق ئەوا شەش ساڵە دەیکات دەربڕینێکی بەهێزو نەتەوەی عەرەبە» هەروەها فەرمووی: «حزبی ئێمە لە عیراق دا دوای شۆڕشی ١٧ی تەمووز گوێزانەوەیەکی جۆرەکی (نوعي) گوێزراوەتەوە هەر لە ساڵانی یەکەمی شۆڕشەوە ڕادەیەکی تازەی لە توانست و لێهاتوویی‌و پێگەیشتوویی دەربڕیوە، بەشێوەیەکی وەهاکەماوەبدات تاقیکردنەوەی شۆڕشی عیراق ببێ بە تاقیکردنەوەی نموونەیی بەعس، کەوا هەموو مەرج و سیفەت و بەهرەیەکی بۆ تەرخان بوو تا ئەوپەڕی مەودای تەعبیرکردن لە گیانی نەتەوەو وزەکانی گەل بدا بە حزبی بەعس و بە فیکرە نەتەوەیی‌یە تازەکەی، ئەو شتەی وای‌کردووە کە ببێ بە تاقیکردنەوەیەکی نموونەیی نەتەوایەتی.»

● حزب وگەل ●

لە دایك بوونی ئەم حزبە گۆڕانێکی گەورەی لە بنەڕەتەکانی شەخسیەت دروست کردو هەستی نەتەوەیی زیاتر چەسپاندو پێویستی بۆ یەکیەتی عەرەبی، هەروەها یەکگرتنی هەموو وزەیەك لە پێناوی بەرژەوەندی نەتەوەو ڕۆڵەکانی‌و مونتەلەقاتی بەعس هۆیەکی یەك بەلاداخەربوو لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو ئیستیرا تیجیاتەی دژی نەتەوەی عەرەبی‌یە، هەر لە سەرەتای چلەکانەوە و بە تێپەڕبوونی پەنجاکانەوە دەست پێشخەر لە ئاسۆی رامیاری ئەوە دووپات دەکاتەوە کەوا (وەرچەرخانی بیری‌و خەبات گێری کە بەعس دروستی‌کرد، ئامادەیە ئەو هەورەی ئاسمانی عەرەبی گرتبوو لابەرێت.

ئیستراجیەتێکی عەرەبی تەواو دروست بوو بە لە دایك بوونی بەعس بۆ رووبەروو بوونەوەی نەخشەکانی دوژمنان کەوا لە ڕۆژی یەکەمی‌یەوە هەوڵیان دا بەرەنگاری ئەم راپەرینە وشیارە ببنەوە، هەموو دوژمنان هەستیان کرد کەوا بەعس هێزو هەڕەتی سەرتاپاگیری ڕاپەرینی عەرەبی‌یە.

هەڵمەتی بە توانا بۆ بنیاتنانی بنەڕەتە سەرەکی‌یەکانی یەکیەتی عەرەبی‌و ڕاپەرینەکەی‌و پێشکەوتنی ڕاپەرینی عەرەبی.

حزب هەر کە لە دایك بوو لە قۆناغی دامەزراندنی‌یەوە دژی پارچەبوون و دواکەوتن و دژی پەیوەندی بەرهەم هێنانی دواکەوتوو دواکەوتنی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری، جەنگا...»

حزب هەمیشە داوای پەرەپێدانێکی سەرتاپاگیری دەکرد لە هەموو بوارەکانی ژیان دا...

حزب هەڵوێسی پتەوو چەسپاوی بووە هیچ هێزێکی دەستدرێژکەر نەیتوانی بەرامبەری بوەستێت یا لە هێزی کەم بکاتەوە، هەموو ڕێگەو شێوازێکیان بە کارهێنا بەڵام ورەو ئیرادەی بەعس، پەرژینێکی پتەوو ئەستوور بوو . . . کاروانی شەهیدانیش، ڕووناکی بوو ڕێگەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی ڕۆشن کردەوە کەوا ئاراستەکانی چاك کردەوە.

حزبی بەعس گواستنەوەیەکی گەورەی لە ڕێڕەوی خەباتی نەتەوە لەم قۆناغەدا دروست کرد. . .

حزبی سەرکردە سەدان دەستەکەوتی بۆ گەلی عیراق بە جێ‌هێنا، یەکێك لەم دەستکەوتانە ئەوەبوو لە مانگی حوزەیران ١/٦/١٩٧٢دا سەرکردایەکی سیاسی نەوتی خۆماڵی کردو ئەم سامانە گەورەی گەڕانەوە بۆ سوود قازانجی میللەت کەوا ماوەیەکی دوورو درێژ لە ژێر چنگی کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکان دا بوو. . . . خۆماڵی کردنی نەوت بە سەرکەوتنێکی گەورەو مەزنی دادەنێین، چونکە سەرکردایەتێکی لێهاتوو و دووربینیمان هەیە، جگە لەمە حزب چاککردنی کشتوکاڵ و پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی جێ‌بەجێ کردووە، هەروەها قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری . . . هتد لەو دەستکەوتانەی کە بەرژەوەندی گەلی تێدابوو جێ‌بەجێ کردنی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد، دەستکەوتێکی هەرە مەزن بوو، حزب و شۆڕشی (١٧ - ٣٠)ی تەمووزی پیرۆز هەر لە ڕۆژانی یەکەمی‌یەوە ئەرکی ئەوەی خستوتە پێش چاوی کە یەکێتی‌ی نیشتیمانی بهێنێتە دی، بێ جیاوازی لە نێو ڕەگەزو ئاین و زمان و بنەمای کۆمەڵایەتی و ئابووری، بۆ ئەوەی عیراق بتوانێ هەموو توانای خۆی بۆ ئەم کێشەیە ئامادەبکات. .

میلللەتی کورد شان بە شانی برا عەرەبەکان جەنگاوەو ئێرانی دوژمنیان لەت و پەت کردووە، هەمیشە لە پێناوی سەربەرزی عیراق دا دەجەنگن.

سەرەکی بەڕێز صدام حسین .لە وتەیەك دا دەفەرمێ (باس کردنی کوردایەتی، بێ‌هێزمان ناکات؛ مادامەکی باس لە چوارچێوەی عیراقی‌یەتمان دەکەیت. . . بەڵام ئیمپریالیزم و نۆکەرانی

هەمیشەویستویانە کوردلە عیراق جیابکەتەوە بۆ ئەوەی دەوری کورد لە پاراستنی عیراق بشارنەوەو ئەم گەلە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.).

هەروەها دەفەرمێ: (ئەوەی کە ئومێدی دەکەم، هەروەکو بە جەنگاوەرەکانیشم وتوە ئەوەیە، کە هاووڵاتیە کوردەکەمان . . . گەلەکەمان نابێ دەوریان لە دەوری عەرەب، کەمتر بێت لە مەیدانی بەرگری کردن لە عیراق دا).

کورد بەشێکن لە دانیشتووانی عیراق بەشێکی گەلی عیراقن، بە درێژایی زەمان و ڕۆژگار دەوری کورد دیارو ئاشکرایەو مێژوو شاهیدە بەڵگەش هەیە، خاکی عیراقی‌یان لە دەستدرێژی دوژمن پاراستووە بە ڕووی دوژمن وەستاون، هەروەها سەرەکی فەرماندە لە وتەیەك دا

دەفەرمێ: «ئێمە دەمانەوێ بیروڕاکانی تاقی کردنەوەکەتان لە بەڕێوەبردنی کاری ئۆتۆنۆمی‌دا تیشك بدەنەوەو وەکو نموونەیەکی زیندوو لەجیهانی سێیەم دا .پەیڕەوی بکرێن».

لە نیسانی بەخشش دا بۆنەیەکی تری پیرۆزمان هەیەو ئاهەنگی شادی‌و خۆشی بۆ دەگێڕین، ئەویش لە دایك بوونی سەرکردەی خۆشەویستمان صدام حسین لە ٢٨/٤/١٩٣٧ لە دێی العوجە شاری تکریت بە لەدایك بوونی ئەم قارەمانە مەزنە ڕووناکی بە

عیراقی بەخشی، ئەم ڕووناکی‌یە کەوا هەرگیزاو هەرگیز ناکوژێتەوە، لە ڕاپورتی ناوەندیی کۆنگرەی هەشتەینی هەرێم لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢دا ئەمە دووپات دەکاتەوە: (سەرکردایەتی هەڤاڵ صدام حسین بۆ حزب و ڕێڕەوی شۆڕش، هەر لە سەرەتاوە (ضرورە)تێکی مێژوویی

بوو کەوا هەموو تێکۆشەرێکی شەرەفمەند لەم حزبە کە بایەخی دەداتێ، وەلەگەڵ ڕۆژگادابوو پێویستی‌یەکی نیشتیمانی‌یەو هەموو عیراقی‌یەکان باوەڕیان پێ‌یە کە سەرکردەی تێ‌دا دەبینن و پێشەوایانە لە سەر ڕێگەی خێرو بەخشش)..

ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ‌وەرگرتوون لە ئامادەکردنی ئەم .وتارەدا ئەمانەن:-

١ - قاتلتم وانتصرتم وغيرتم مجرى التاريخ/ صدام حسين

٢ - ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ١١٤ - ١٩٨٧

٣ - ڕۆژنامەی الثورة ساڵی ١٩٨٦

٤ - ڕاپۆرتی ناوەندیی کۆنگرەی هەشتەمینی هەرێم حوزەیران ساڵی ١٩٨٢.

# سوف تمضي راية القائد صدام حسين خفاقة من نصر الى نصر

سميرة محمد علي

نحتفل في نيسان الخير والعطاء بمناسبتين عزيزتين وهي ميلاد الحزب القائد وميلاد الرئيس صدام حسين (حفظه الله) ففي كل عام

يستقبل العراقيون هذه الذكرىٰ العزيزة بالفخر والاعتزاز لقد تأسس الحزب القائد حزب البعث العربي الأشتراكي في ٧نيسان ١٩٤٧ -

هذه الانطلاقة الوثابة في الفكر العربي الثوري التي جسدت رؤية عميقة لافاق المستقبل، الحزب الذي عالج جميع المواقف السلبية في المجتمع وغير صورة الواقع الذي تعيشه وعزز الشعور القومي والتي تتظافر الجهود والطاقات من أجل مصلحة الأمة وابنائها، وكانت منطلقات البعث حاسمة في التصدي للاستراتيجيات المناوئة للأمة العربية منذ بداية الاربعينيات مروراً بالخمسينات، هنا نستعرض معدة البحث اهم المكتسبات التي أنجزتها قيادة الحزب والثورة لشعبنا العظيم.. ويأتي في مقدمتها تأميم النفط في ١٩٧٢/٦/١ وتطبيق الاصلاح الزراعي الجذري والنهضة الصناعية والتنمية الاجتماعية بالأضافة الىٰ المكتسبات التي حصلت عليها المرأة العراقية هذا وان القيادة السياسية كان لها الدور الريادي الكبير في اصدار قانون الحكم الذاتي للشعب الكردي في كردستان العراق في ١٩٧٠/٣/١١ والذي تم تطبيقه في ١٩٧٤/٣/١١ حيث ان المسألة الكردية كانت من اكثر المعضلات التي واجهت الحزب القائد والثورة صعوبة وتعقيداً لكثرة مارافقتها من تداخلات وتأثيرات،

فالحكم الذاتي ليس اجراءاً تشريعيا ولا عملاً دستوريا بل صيغة ديمقراطية متقدمة انبثقت من صلب الواقع ضمن اساس متين وقويم مناسب مستوعب لجوهر الوحدة الوطنية وكما قال عنها الرئيس القائد

صدام حسين (حفظهُ الله):- «اننا نريد لتجربتكم في ممارسة الحكم الذاتي ان تشع بمبادئها ويقتدي بها كنموذج حي في العالم الثالث»

وشهر نيسان يحمل بشارة اخرى حيث نحتفل فيه بمناسبة عزيزة أخرى او بيوم خالد في حياة العراق والعراقيين ونعني ميلاد الرئيس القائد صدام حسين.

وبعد ذلك تتحدث عن المعركة المقدسة التي يخوضها قطرنا المناضل ضد الهمجية والعدوان في إ يران والتي مرّ عليها اكثر من ٧ سنوات لقد قاتل العراقيون بكل اقتدار وقوة حيث كان للقائد الملهم في قدرته العالية علىٰ ادارة المعركة المقدسة من جميع جوانبها العسكرية والسياسية والاقتصادية والاعلامية وقد كان ولايزال للقائد الدور الاول والاساس في تحقيق النصر وان النصر النهائي يتحقق بأذن الله للعراق وسوف يذكرهُ التاريخ وتذكرهُ الاجيال . . .

دیـروكـا كوردێت عیراقێ ڤەدگەڕیتەڤە بۆ هزاران سالان ژشـــارستـــانیێ یاكـــو شارستـــانیـــا هەمی عیـراقیێـەو ڤەدگـــەڕیتـــەڤـــە بۆ وێ هەولـدانـا دەست نیشـان كری دائـاڤـاكرنا شارستانیا ئیسلامیو عەرەبی ، وەكو پشكەكێ ژدەورێ عیـراقێ دڤێ چەنـدێ دا ، ڤێجـا هەكە مە كورد دانانە دكوژیەكی دا دێ وان بێ بەهر كەین ژ دەورێ وانێ دیـروكی یێ مەزن ددانـانـا شارستـانیێدا ، ڤێجـا ما ئەڤە دبیـت؟ بەرسڤ : نە ، چنكـــو هنگی دێ مە بێ مروەت غەدرەییا ل ملەتێ كورد كری . .

سەرۆكێ قوماندار

صدام حسین

# بهەلكەفتنا بیرهاتنا لدایك

# بونا سەرۆكێ قوماندار صدام حسین

# بیرهاتنەكا پیرۆز

● مختار فائق ●

سەرۆكێ قومـانـدار صدام حـسین ـ خودێ بهێلیت ـ نەوەكـو هنـدە حاكمـانە ڤیاینە بێنە سـەر حوكمیو بۆدەمەكێ كورت ، بەلكو سەرۆكێ قوماندار سەرۆكەكێ بێ بەڤلەو وەكـــو وی نینن و نابن ژنـــاڤ وان قومـانـداران ئەوێت ژنـاڤ جەرگێ ملەتی پەیدا بوین . هاتنا سەرۆكێ قوماندار صدام حسین پێتڤیەكا فەر بۆدهندە بارو زروفێت مێژوویی یێت گرنگ و ناسك ددیروكا عیراقیدا . . داكو جارەكا دی عیراق دەورێ خۆیێ شارستانیو مرۆڤاینی ببینیت . .

راپورتا مەلبەندییا كۆنگرا هەرێمایەتیا نەهێ یا پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشكی بڤەكولینەكا زانستیو گەلەك هویـرو ناسك ئەوبارو زروڤێت گشتیو سیاسەتا زەحمـەت و بگـرێ یا دەست نیشـان كری یاكـو سەرۆكێ قوماندار صدام حسین تێـدا هاتی دەمێ گوتی [هـەڤال صدام حـسین نەژ وی تەرزیـیە ئەوێ بخافلەتی پەیدا دبن د ئینقلابێت عەسكەریدا ، هەروەسا نەژ وی تەرزییە ئەوێ بدەمەكێ گەلـەك درێـژ پەیدا دبن دهێنە نیـاسین بەری بێنە سەرحوكمی ، وەكو دحزبان دا ئەڤ چەنـدە چێـدبیت ئان ژی دوان بزاڤان دا بێت كو دبارو زروفێت ئاشكرا ئان نیڤ ئاشكـرادا كاردكـەن وخەبـاتێ دكـەن ، نمـوونەیەكێ بێ بەڤلەودهندە بارو زروفێت بێ بەڤل دا پەیدا بوو پێش كەفت] .

لدویف رونـاهیـا ڤێ راستیێ ، پێتڤیا مێژوویی یا قومانداریا سەرۆك صدام حسین پێ تڤیـەكـا نیشتمـانی بۆدویریەكا نەتەوەیی و مرۆڤایەتی هەبو، ژ بۆدانانا ئێكـەتیـا نیشتمـانیـا ملەتێ عیـراقی لدوی بنیاتێت نویو بڤێ چەندێ سـەرۆكی قومـانـدار معـادەلـەكا گەلەك مكوم و ناسك دانا ل هاڤلییا جەوهەری لناڤ بەرا ئێكـەتیـا ملەتێ عیـراقیو ئێكەتیا نەتەوەیی . . ژ وی بنیاتی كو ئێكەتیا نیشتمانی ئەوبنیاتێ ئێكێیە بۆمكوم كرنا ئێكەتیا كورێت ملەتێ عیراقی .

راپۆرتا سیاسی یا مەلبەندی دەورێ سەرۆكێ قوماندار صدام حسین ـ خودێ

بهێلیت ـ یێ دەست نیشـان کری د بجهـ ئینـانا وان دەست کەفتێت مەزنێت وی بدەست ئێخستین هەرچـەنـد بەرپسیارێت وی دگەلەگ بۆن و ئەرکێت وی دژوار بۆن، لێ ئەوروح و گیـانێ قومـانداریەتیا شۆرشگێری یا وی وەل وی دکر کو دڤیا خۆلبـەر وان بارێت گران بگـریت داکـو چو کۆسپ و ئەگـەرە نەکـەڤنـە درێکـا شۆرەشێ دا . .

ئەو سیفەتێت مێژویی دقوماندار یا سەرۆکێ قوماندار دا وەل وی کرن کو رێکا پالەوانەتیێ و هەلوێستێ بێ بەڤ بگریت، چنکو بێ گومان سەرۆکی باوەری هەبۆ کوملەتێ عیـراقـی دزانـی کا صدام حسێن چ زەلام باشـەکـەو ژ چ رەنگێ قوماندارێت مێژوییەو ژ چ قۆناغا پێش کەفتن و پەرەپێدانێیە . .

هەروەسـا دراپـۆرتـا سیـیـا مەلبـەنـدی یا پارتێ دەورێ گرنگێ سەرۆکێ قوماندار صدام حسین یێ دیارکری دمکوم کرنا بنکێت دیمقراتیێ دا ئەڤ چەندە ژ ی هاتـە دەست نیشـان کرن ددامـەزرانـدنـا جڤـاتا نیشتمانی و جڤاتا تەنفیزیو تەشریعی لدەڤەرا کوردستانێ . . نەخاسمە پشتی سالا ١٩٧٩ پشتی کو سەرۆك صدام حسین قوماندار یا پارت و شۆرەشێ بدەست گرتی . .

چاڤـدێـری کـرنـا سەرۆکێ قومـانـدار یا سەرانسـەر و بەردەوام بۆ کەرتێ رەوشـەنبیـری و راگەیاندنێ کارەکێ گرنگ کرە دپێش کەفتنا کاروانێ رەوشەنبیری لعیـراقێ برەنگـەکێ گشتی و رەوشـەنبیری یا کوردی برەنگەکێ تایبەتی ول هەمی دەلیڤـان داو بزاڤێت رەوشـەنیـری و ئەدەبی مشـەبۆن لدەڤەرا کوردستانێ و دام و دەزگـەهێت رەوشـەنبیـریـا کوردی هاتنـە دانـان وەکـو دەزگـەهـا رەوشـەنبیری و بەلاڤ کرنـا کوردی لوەزارەتـا رەوشـەنبیـری و راگـەیـانـدنێ و ئەمینـداریا گشتی یا رەوشـەنبیـری و لاوان و کۆرا زانیـاری یـا عیـراقی / دەستـەکـا کورد / و رێڤەبەریا گشتی یـا خانـدنا کوردی و ئێکەتیا نڤیسـەڤانێت کوردو گەلەك دام و دەزگەهێت دی یێت رەوشەنبیریا کوردی، کو هەمیا هەر ئێك ژلایێ خۆڤە دەست هاڤێتنە بزاڤ و چالاکی یێت خۆیێت رەوشـەنبیـری و هونـەری و هەمی بابـەتێت دی وکـاروانێ رۆژنـامـەگـەریـا کوردی ژ ی برێ کەفت و پێش کەفت ورۆژ نامـا هاوکاری یاکو ژسـالا ١٩٧٠ هاتیـە دامـەزرانـدن پێنگـاڤێت بەرفـرەهـ هاڤێتن درێـیـازێ رۆژنـامـەگـەریـا کوردیدا کو ئەڤـە سەرێ ١٨ سالانە ئەڤ رۆژنامە بێ راوەستان دەردکەڤیت و نەکو هەر نەراوەستایە بەلکو هەرا ب وەرار بۆو پێش کەفت و ژهەیڤا دەمێ ژسالا ١٩٨٧ پێڤە حەفتی یێ دوو جاران دەردکەڤیت و جهێ پیتە پ ێکرنا جەمـاوەرێ رەوشـەنبیـرێت کوردە . . هەروەسـا گۆڤـارا رەوشـەنبیری نوێ و گۆڤارا بەیـان و کوڤـارا رەنگین کوجهێ خۆیێ مکـوم کرین درێکـا رەوشـنبیـریا کوردیدا دگەل هەمی کۆڤارێت دی یێت کوردی .

ئەڤـەژ ی هەمـو ژ بـەر وێ پیتـەپێ کـرنـا بەردەوامە یا سەرۆکێ قوماندار صدام حسین ـ خودێ بهێلیت ـ برەوشـەنبیـریـا کوردی . ئو سـەرەدانـا بەرێز سەرۆکی بۆ دەزگەها رەوشەنبیری و بەلاڤ کرنا کوردی لـسالا ١٩٨٣ گەلەك کارەکێ گرنگ کرە سەر کاروانێ رەوشنبیـر یاکـوردی و ئەو شیـرەت و ئاگـاداری یێت وی کرین بۆ کاربـەدەستێت دەزگـەهێ وەکـو فەتەرەکاا گەشی بۆن رێك روهن کرن لپێش وان داکـو هەمی شیـرەتێت وی بجهـ بینن و ڤەگـوهێـزنـە کارەکێ رۆژانـە یێ مجد بۆ پێش خستنا کاروانێ رەوشنبیری یا کوردی .

ئو لدەلیڤێ ئافـرەتـا عیـراقی ژ ی سەرۆکێ قومـانـدار صدام حسین خودێ ـ بهێلیت ـ پیتـەیـەکێ زۆرێ دایێ نەخـاسمـە دەمێ دبێـژ یت : [لێ رێنـانـا مە بۆ ئافـرەتێ دهێتـە دەست نیشـان کرن لدوی رۆنـاهیـا بیـرو باوەرێت پارتێ یێت کو باوەریێ دئینیت بدەورێ گرنگێ مرۆڤی و گرنگی یـا داگـرتنا میللی و بکار ئێخستنا هەمی هێـز و شیـانێت کورێت مللەتی ژ بـۆ بجهـ ئینـانـا وێ گوهـۆرینا بتێکرایی دکـۆمـەلێ دا] هەروەسـا دبێـژ یت [رزگارکرنا ئافرەتێ برەنگەکێ گشتی و بنەرەتی لدوی وێ رێنـانـا ئەم باوەریێ پێ دئینین دهێتـە بجهـ ئینـان برزگـارکـرنـا هەمی کۆمەلێ ژلایێ سیاسی و ئابوری و رەوشەنبیری] .

سەرۆکێ قوماندار صدام حسین بڤێ پەیڤێ نەکو تنێ داخازا مافێت رەوایـێت ئافـرەتێ دکـەت، بەلکو نەخشەی بۆوان دادنیت دکاروانێ گشتی یێ شۆرەشێ دا یاکـو ئافـرەتێ دەورێ خۆ تێـدا دیتبـۆ برەنگەکێ درست . کو نهۆ ئافرەتا عیراقی بۆ جارا ئێکێ لدیـروکـا عیـراقێ دا گەهشتـە گەلـەك جهێت گرنـگ د دەولـەتێ داو رێکخـراوێت نیقـابی و یاسـایێ چارەسـەرکرنا کۆمەلایەتی یەکـسانی یەك پەیداکر لنـاڤ بەرا ئافـرەتێ و مێـرکی دهـەمی مافـان دا . ئەڤـەیـە لێ رێنـانا قوماندارێ و سەرۆکێ قوماندار بۆ ئافرەتا عیراقی . . یاکو بۆ چەندین سالان بۆ هەر لبن زولم و زەورداریا بیرو باوەرێت کەڤنەپەرێس مابۆ . . ئو هەکە مرۆڤ بەرێ خۆ بکەتە بیرو هزرێت سەرۆکێ قومـانـدار دێ بینیت کو بیـرو هزەکـا دویـرو تیـژا عەسکەری یا هەی و ئەڤـە ژ ی دهێتـە دەست نیشـان کرن دوان نەخشێت عەسکـەری یێت کو دادنیت چ لە مەیـدانـا شەری و سەرەدانێت وی بۆ بەرەیـا شەری، شەرێ مە یێ پیـرۆز دژ ی رژێمـا ئیـرانیـا سەهیـۆنی و . . گفت و گۆیێت وی دگـەل سەربـاز و ئەفسـەران لمـەیـدانـا شەری و ئەو نەخشێت عەسکـەری یێت وی دانـاین بۆ چارەسەرکرنا شەرێ دژمنکاریا ئیرانی دژ ی عیراقێ و ئەو نەخشە ژ ی بڤی رەنگی دهێتە دەست نیشان کرن :

١ ـ ئاگاداری و زێرەڤانی بەرانبەر وان بزاڤێت دژمنی بەری شەری .
٢ ـ ڤەگوهازتنا شەری بۆ ناڤ ئەردێ دژمنی دگەل دەسپێ کرنا شەری
٣ ـ چۆن بۆ ناڤ ئەردێت دژمنی دا .
٤ ـ ڤەمان لـسەر وان ئەردێت دژمنی بۆ پتر ژدوو سالان .
٥ ـ ڤەکێشانا رێك و پێك ژ وان ئەردێت دژمنی .
٦ ـ بەرسینگ گرتنا وێ دژمنکاریا دژمنی بۆ سەر توخیبی پشتی کو ئەم ڤەگەریاینە ڤە بۆ سەر ئوخیبێ خۆو پویچ کرنا وان هەمی هەولدانا یێت کو دژمن پێ رابۆی بۆ دەربازبونا توخیبێ مە .

براستی ڤان بیرو هزرێت بەرکەفتی یێت سەرۆکێ قوماندار صدام حسین ئەو بیرو هزرێت بەرکەفتی نە یێت کو بیرو هزرا عەسکەری یا هەڤچەرخ روهن کری و گەشێ کری کو دبنـە ئەگـەرێ وان سەرکـەفتنێت بنـاڤ و دەنـگ یێت کو هێزێت مەیێت چەکـدارێت پالـەوان بدەست ئێخستین ل هەمی بەرەیێت شەری و دڤـان هەشت سالێت شەریدا .

ژ وان سیفـەت و سەرو سیمـایێت گرنـگ للایێ سەرۆکێ قومـانـدار صدام

حسين دويربينينا وي‌وزانينا وي يا بەرفرەهـ وباوەرياوي‌يا مكوم بكەتواري (واقـع)ي‌و تێكەهشتنا وي بۆپاشە رۆژێ. . ئەڤ چەنـدە ژي تشتەكێ گەلەك پێ‌تڤي‌يە بۆ هەر پێشەوايەكي و قوماندارەكي يێت كو سەركێشيا مللەتان دكەن. .
چنكو ئەو باش دزانن كو ئەون بەرپسيارێت جيلێ ئەڤرووێ پاشە رۆژێ، وهۆسا كورێت پاشە رۆژێ دێ هەرپێش كەڤن بەرەڤ خۆشيێ وبەختەوەريێ. . ژبەر هندێ پەيڤ و گۆتنێت بەركەفتي يێت سەرۆكێ قوماندار صدام حسين يێت بوينە بنيات بۆ كارێ مە يێ رۆژانەو دەمێ دەليڤان دا. . ڤێجا ئەو پەيڤ و گۆتن يێت هاتينە دانان لپێش چاڤێ دام ودەزگەهێت دەولەتێ داكو لدوي بچيت وبخۆ بكەتە بەلگەو پەيرەو. .

براستي چو سەرۆك دەولەتي ددیروكا نوي دا پەيدا نەبوينە شارەزاي هەمي بابەتان بيت و تێگەهيت و بلەرستي وەرگريت وەكو سەرۆكێ قوماندار صدام حسين. . ڤێجا لدەليڤێ دام ودەزگەهێت دەولەتێ بيرو باوەرێت سەرۆكي تێگەهشتنا شۆرەشگێرانەكا كارو وەزيفەي يێ دەست پێشان كري‌و شياينە دەرباز بن ژهندە برياريت رێڤەبەري يێت كەڤن. داكو تێگەهشتنەكا نوي دانن بۆمرۆڤي نوي‌و تێگەهشتنا وي كو بەرژەوەنديا مرۆڤي پێشي هەر تشتەكي‌يە. .

هەروەسا ل دەليڤێ كۆمەلايەتي دا، شيرەتێت سەرۆكي رێك روهن كرن بۆ مرۆڤێ نوي‌يێ عيراقي. . ماف و ئەركێت مرۆڤي دياركرن، كو پەيڤێت سەرۆكي ژهەمي تەخێت كۆمەلێ گرتن بكرە ژ زارۆوا وگەنج ولاوان وپالەو جوتيارو قوتابيان كو رێكێ لبەر وان هەميا روهن دكەت بۆ ژيانەكا نوي.

ئوللعراقێ شەرێ مەيێ پيرۆزو هێزێت مە يێت چەكدار بيرو هزرێت سەرۆكێ هێزا و شيرەتێت وي يێت نەزمەري‌و مەيداني وەكو كليلا بۆن بۆوان سەركەفتنێت بناڤ و دەنگ يێت كو هێزێت مە يێت چەكدارێت پالەوان بدەست دئێخن لبەرەيێت شەري.

ژێدەر:

---

● راپۆرتا مەلبەنديا كونگرا نەهێ يا پارتا بەعسا عەرەبيا هەڤپشكي.
● رۆژناما (الثورة) لروژا ٥/١/١٩٨٨
● گۆتارا سەرۆكێ قوماندار صدام حسين بۆئێكەتيا گشتي‌يا ئافرەتێت عيراقێ ل ١٩٨٣/٣/٢٢
● پيگڤە ژ بۆ ئاڤاكرنا عيراقا مەزن.

# في ذكرى ميلاد السيد الرئيس القائد صدام حسين

**مختار فائق**

**لقد شخص التقرير المركزي الصادر من المؤتمر القطري التاسع لحزب البعث العربي الاشتراكي بالتحليل العلمي الدقيق أبعاد الظروف العامة والسياسية المريرة والصعبة والمعقدة التي برز فيها الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ ذلك القائد الضرورة حيث ورد فيه (إن الرفيق صدام حسين ليس من ذلك الطراز الذي يظهر فجأة كما يحدث في الانقلاب العسكري وليس أيضاً من ذلك الطراز الذي يتكون عبر فترة طويلة جداً ويعرف قبل تسلم السلطة كما يحدث في الاحزاب أو الحركات التي تعمل في ظروف علنية أو شبه علنية. انه نموذج فريد ظهر وتطور في ظروف فريدة من نوعها.).**

**في ضوء هذه الحقيقة، فأن ما يجعل الضرورة التأريخية لقيادة السيد الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ ضرورة وطنية تحمل أفقاً قومياً وإنسانياً، كونها حاجة وطنية أساسية لصياغة وبناء الوحدة الوطنية للشعب العراقي بعربه وكرده. وبذلك أوجد الرئيس القائد معادلة دقيقة من الترابط بين وحدة الشعب العراقي ووحدة الأمة. ويتطرق المقال الى دور المرأة الصحيح في المجتمع العراقي حيث بدأت تحتل المراكز القيادية في دوائر ومؤسسات الدولة وكل ذلك بفضل الدعم الامحدود من لدن السيد الرئيس القائد صدام حسين بالمرأة ومدى أهمية مشاركتها في بناء مجتمعنا الجديد المنشود. ويمضي المقال باستعراض طروحات السيد الرئيس القائد في الفكر العسكري والحرب، وأبرز دلائل العبقرية العسكرية الفذة للسيد الرئيس القائد، والخطط العسكرية التي وضعها سيادته لمعالجة الحرب العدوانية التي فرضها العدو الايراني الغاشم ضد قطرنا المناضل.**

**ويستعرض المقال آفاق الثقافة الكردية والتطور الذي حصل فيها في زمن الثورة وبفضل الدعم المتواصل للسيد الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ للحركة الكردية الثقافية وزيارته لدار الثقافة والنشر الكردية وتوجيهات سيادته التي أصبحت كمشعل منير ينير الدرب أمام المثقفين الشرفاء من أبناء شعبنا الكردي ليعبروا بكل حرية عن آرائهم وأفكارهم ويغنوا بها مسيرة الثقافة الكردية في ظل الثورة وفي ظل راية الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ.**

راپورتی جەنگە و رامیاری

# له یادی ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردی دا

حسين عبدالله

میژووی ئەم دەزگایە، میژوویەکی زێرینی لەلاپەرە گەشەکانی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا گێڕاوەو دەیگێڕێ، هەر لەڕۆژی دامەزراندنی‌یەوە تا ئەمڕۆ وبەردەوام.. هەمیشە لەئاستی ئەو مەسئولیەتە بووە، کە شۆرشی پیرۆزی ۱۷ ـ ۳۰ی تەمووز نەخشەی بۆ کێشابوو.. کەچی هەمیشەو بەردەوام ئەڵهای گۆڕانێکی بنەڕەتی دەکرد، لەبەرهەم و داهێنان و ئەرکەکان دا.. هەوڵیشی هەر بەردەوام بوو، تا خەونەکەی هاتەدی‌و لەگەڵ سەردانە پیرۆزەکەدا، ئەو واقیعە گۆڕرا بەواقیعێکی گەشترو درەوشاوەتر، ئەو واقیعەی کە هەموو کادیرو فەرمانبەرانی خەوندیدەو دڵسۆزانی دەزگاکە چاوەڕێی بوون...

ئەم بۆنە پیرۆزە کە بە ڕۆژی ڕۆشنبیریی کوردی ناودێرکرا، جەژنی ئەدەب و هونەرو میژوو و هەموو لقەکانی ڕۆشنبیریی کوردی‌یە ە.. هەر لەبەر تیشکی گرنگی ئەم ڕۆژە گەشەدا نووسەران و ڕۆشنبیران باسکی هیمەتیان لێ‌هەڵ کردو هەریەکە لەلایەکەوە کەوتە برەودان بە ڕاپەڕینی ڕۆشنبیریی کوردی، کەوتە بەرهەم دان و بەهرە نواندن و ڕەنج و تەقەلادان بۆ ئەوەی ڕانمایی‌یەکان ببن بە ڕێ‌نیشان دەر، ببن بە چراوکی کاروانی بەرەو پێشەوەمان لە عیراقێکی سەربەرزی پتەوی پێشکەوتوودا.

ئەوەبوو لە ۱۹۸۳/۳/۹دا، کاتێ کە دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، خەریکی کۆڕێکی فراوان بوو، بۆ موناقەشەکردنی کارنامەی ساڵانەی خۆی، سەرۆکی فەرماندە بەڕێز صدام حسین (خوا بیپارێزێ) سەری لەو کۆڕەداو بەوردی گوێی بۆ ڕاوسەرنج و بۆچوون و ئارەزوو داخوازی‌و ئامانجی ئەو کادیرە ڕۆشنبیرو لێهاتووانە ڕاگرت، کە لەگەڵ وەزیری ڕۆشنبیری‌و ڕاگەیاندن کاک لطیف نصیف جاسم سازاندبوویان.. دوا بەدوای ئەوان، سەرۆکی فەرماندە، سەرکەوتە سەر مینبەرو دەستی‌کرد بە ئاخافتن و بەهەڵخستنی دەیان ڕاو سەرنج و تەگبیرو نەخشەی وردوردو پەندو ئامۆژگاری قووڵەوە، چ لەپێناوی خزمەتی مرۆڤی کورد ـ بەگشتی ـ و چ لە پێناوی ڕەگداکوتانی ڕەوتی ڕۆشنبیری‌ی کوردی، بەشێوەیەکی تایبەتی..!

لەوتارە بەنرخەکەی‌دا، سەرۆکی فەرماندە وتی:

«شادمانم بەوەی لەم شوێنەدا چاوم بەدەستەیەك خێرخوازی گەلی کوردی عیراقمان بکەوێ، ئەوانەی نوێنەرایەتی ڕۆشنبیرانی کورد ئەکەن، جالە خودی خۆیان دا یان لەماوەی ئەو ئەرکانەوە، بەهەر جۆرێ لە جیاتی ئەوان بەجێ دەهێنن...»

لەئاخاوتن بەردەوام بوو وتی:

«گوێم لەلایەنێکی گفتوگۆکان بوو، هەروەك ئاسایی وایەو نامەوێ قسە لەسەر گفتوگۆکان، بەمانای تەکنیکی بکەم، بەڵکو بەمانای گشتی و سەرتاپاگیر... دەڵێم: ئێمە لەعیراق دا. کاتێ باسی کوردایەتیی خۆمان دەکەین، شتێ نیە بۆمان عەیب بێ، یان نیشتمانپەروەریەتی عیراقمان لەنگ بکات، بەڵام ئەوەی لەنگی ئەکات ئەوەیە کە باسی کوردایەتیمان بەدابڕاو لە خێوەتی گەورەی عیراقیەتمان بکەین و بەدابڕاو لەئەرکەکانمان، بەرامبەر بەتێکڕای عیراقی مەزن، چ لەچوارچێوەی بەرپرسیاریمان دا ، وەك فیکری یان لەچوارچێوەی هەڵسوکەوتی کاری

رۆژانەمان دا دەبینین. . .»

سەرۆکی فەرماندە، لەوتارەکەیدا، لەبارەی رۆشنبیریی کوردیو مەسەلەی راگەیاندنەوە، فەرمووی:

«ئەبێ ئەم حاڵەتە، وا لێبکەین باو بێت، هەتا لەراگەیاندنی ئاراستەکراو، بۆ گەلی کوردمان تێر دەبێ، باوی بکەین و وا بکەین رۆژنامەکە لەسەرەتاوە، تادوایی پڕ بێت لەباس کردن دەربارەی کوردو مێژووی کوردو ئەدەبی کوردو رۆشنبیریی کورد، هەرگیز هەرچیمان بۆ یەت بڵاوی دەکەینەوە، دوای ئەوە گەلی کوردمان تێردەبێو رۆشنبیریی کوردیو هونەری کوردی، هەمووی باسی دەکرێ، حاڵەتێکی بریقەدار نامێنێ بۆ مەبەستی بەرهەڵستکاران، بەڵکو حاڵەتەکە وای لێدێت، ئەو وەختە کوردێك لەسلێمانییەوە دێت و پێت دەڵێ (بەس) باسی ئەوەمان بۆ بکە، لەکوویا ئەدەب لەجەزایر، ئەدەب لەئەندەلووس لەقۆناغی ئەندەلوسیا. . با سەرنجی حاڵەتەکانی ژیان بدەین، بەهەموو وێنە گشتییەکانیەوە، تەنیا لەگۆشەیەك گیرمان مەکە. . بەڵام ئەگەر وامامەڵە لەگەڵ ئەدەبی کوردیو رۆشنبیریی کوردیدا بکەن، بەئەدەب و هونەرەوە، هونەر، رەسم، نەحت، مۆسیقاو گۆرانی، لەئێستەوە مامەڵەی وای لەگەڵ دا بکەن، لەچوارچێوەیەکی هاوسەنگ دا. . حاڵەتەکە هەروا ئەمێنێتەوە، وەك ئەوەی خەڵکی‌تر هەبن، باسی زۆرترینیان بوێت، چاکە، باسکردنەکە باو بکەن، گۆڤارو رۆژنامەکان زیاتر پڕ بکەنەوە بەنووسین لەسەر ئەدەبی کوردیو رۆشنبیریی کوردیو هونەرو شیعری کوردی، هەتا گەلی کوردمان تێر دەبێ. . .»لەبارەی بەشداری کردنی گەلی کوردەوەش لەبەرگری کردن لەعیراقی مەزن، سەرۆکی فەرماندە فەرمووی:

«ئەوەی کە ئومێد دەکەم و هەروەکو بەجەنگاوەرەکانم ووت: کە: هاووڵاتیە کوردەکانی گەلەکەمان، نابێ دەوریان لەدەوری عەرەبی گەلەکەمان کەمتر بێ، لەمەیدانی بەرگریکردن لەعیراق، چونکە ئەم ماوە مێژووییە لەبەرچاو دەبێو ئەنجام و کارکردن و هۆیەکانی، تاسەدان ساڵی ئایندەش دەخوێندرێ. . .» لەبارەی بیروڕای (سەربەست)و (دەربڕینی ئازاد) ەوەش سەرۆکی فەرماندە گووتی:

«باشە بۆچی دڵخۆش نەبین بەوەی، کاتێ کە دەبینین هەروومیللەتەکەمان قسە دەکا، هەریەکەو لەمەوقیعی خۆیەوە، بەپێی ئەو بەشەی پێی‌براوەو بەپێی ئارەزوو زەوق و رۆشنبیریی خۆی قسە دەکا، دەربارەی پێوەندی خۆی بەم رێرەوەو، بەو ئیعتبارەی کە بەشێکە لێی. . بۆچی رێگە لەعیراقی‌یەکان بگرین و نەهێڵین ئەوەی برِوایان پێ هەیە بیڵێن و ممارەسەی مافی خۆیان نەکەن. . .؟»

لەبارەی خۆ ئامادەکردنی دەزگاو رۆشنبیرانی کوردەوەش سەرۆکی فەرماندە وتی:

«وا تێبکۆشن و خۆتان وەك ئەوان تەماشا بکەن، کە لەبەرەی شەڕدا شەڕ دەکەن، یان دەبێ خۆتان لەبارێکی دووقاتدا دابنێن، چونکە داواکراوە لێتان. . مەبەستم: ئەوەیە هەریەکێ لەبەرەدا چەکی هەڵنەگرتبێ، لێی داوا دەکرێ، ئەگەر لەپشتەوەبێ، لەبەغدا یا لەسلێمانی بێ، یان لە کەرکوك بێ، ئەگەر دەوری ئەوەی نەهاتبێ چەك هەڵگرێ ـ بەژن وپیاوەوە ـ دەبێ وەك فەرمانبەرێکی باری ناوەخت ئیش بکاو لەهەمان کاتیش دا، وەك عیراقی‌یەکی داوالێکراو ئیش بکا، چونکە نەچووە بۆ بەرەو وەك براکانی چەکی هەڵ نەگرتووە، ئەگەر بەم گیانەوە ئیشمان کرد دەبینین ئەو توانایەی ئێستە هەمانە، لەپێویست زیاترە. . .»

* بەڵێ: بەم وتارە بەنرخەو بەو وتە بەهادارانە، ئەو کۆڕە مێژوویی‌یە رازایەوەو هەر لەو رۆژەوەش، نابەڵکو بگرە لەو ساتەوەش، باری دەروونی کادیرانی دەزگاو زۆرەها رۆشنبیری کورد گۆڕاو بەرەو پێشەوە تەکانی‌دا. . کار زۆرتر بوو، ئەرك گەورەتر، لێپرسینەوە پترو بەرهەمی جۆراوجۆر فرەترو دەسکەوتی رۆشنبیری مەزنتر. . .

* لەو ساتەوە، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، کەوتە گەڕو لەهەموو بوارێکدا خۆی نواند، چ لەئەنجامی ئەو پشتگیری‌یەی کە سەرەوکی فەرماندە بۆی رەخساند، چ لە ئەنجامی ئەو ئامۆژگاریانەی کە بوونە مەشخەڵی رێگای کارو بەرهەم، چ لێرە لە بەغدا و چ لە رووپێوی کوردستانی خۆشەویست دا. .

هەر بۆ نموونەو بەس، قەوارەی رۆژنامەی (هاوکاری) بوو بە (١٦) لاپەڕەو بە (٦) هەزار دانە، جۆری دەرهێنانی هونەریشی کەوتە بارودۆخێکی پوختترەوەو گۆشەو دەروازەکانیشی بەپێی بابەت و پسپۆری گۆڕاو هەر لاپەڕەیەك، بەپێی نەخشەیەکی وردەوە نەخشەی بۆ کێشرا. . گۆڤاری (بەیان)یش ئامانجەکانی (١٠٠٪) جێ‌بەجێ کردو بوو بەدیارترین گۆڤاری ئەدەبی لەژیانی رۆشنبیریی کوردیا. . . ئەم گۆڤارەشمان گۆڤاری (رۆشنبیریی نوێ) هەر لەو رۆژەوە کەوتە نێو حاڵەتێکی ترەوەو بوو بە تاقەگۆڤارێکی ئەکادیمی، چ لەمێژووی رۆژنامەگەری کوردیدا وچ لەسەر ئاستی هەموو عیراق داو سێ زانکۆی دیاری نێووڵات دانیان پێانا (زانکۆی صلاح الدین ـ زانکۆی بصرة ـ زانکۆی بەغدا). . . . !

هەر بۆنموونەش، لەساڵی ١٩٨٥داو بەس (٤) ژمارە بەقەوارەی (٢٨٠ ـ ٣٨٤ ـ ٣٧٦ ـ ٣٣٦) لاپەڕە دەرچوو، کە سەرجەمی ئەکا بە (١٣٧٦) لاپەڕەی هەمەرەنگ لەگشت بوارەکانی زانست و لێکۆڵینەوەی

جۆربەجۆردا...!

لەبارەی (کتێبی رۆشنبیری) یەوەش، هەر تەنیا ـ بۆنموونە ـ لەساڵێك دا ـ ١٩٨٥ ـ کارەکە بەم جۆرە کەوتەوە:

(٦)دیوانە شیعر بە (٢٦) هەزار دانە (٤) کۆمەڵە چیرۆك بە (١٧) هەزار دانە (٣) لێکۆڵینەوە بە (١٨) هەزار دانەو (٤) شانۆگەری بە (٢٨) هەزار دانە (٥) کتێبی فۆلکلۆری بە (٢٠) هەزار دانەو (٢) کتێبی هونەری بە (٨) هەزار دانەو (١) کتێبی مێژوویی بە (١٠) هەزار دانەو (٢) لێکۆڵینەوەی زمانەوانی بە (٨) هەزارو (٢) کتێبی فیکری بە (٨) هەزار و (١) کتێبی کەلەپووری ـ بەعەرەبی ـ بە (١٠) هەزارو (٢٢) نامیلکەو کتێبی سیاسی بە (٢٣١) هەزار دانە، کە سەرجەمی ئەکا بە(٣٨٤) هەزار دانە..!!

لەبارەی سازدانی ـ هەمدیس بۆ نموونە ـ کۆڕو کۆمەڵ و خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەو ئێوارە شیعرەوە، ژمارەی گەیشتە (٣٧) کۆڕی جیاجیاوە، لەپاڵ (٦) پێشانگای کتێب و (٨) پێشانگای تەشکیلی، چ لێرە لە بەغداو چ لە هەولێرو سلێمانی و دهۆك دا.

* کەچی ئەوەی جێی سەرنج و شانازییش بێت: ساڵ دوای ساڵ، کارو بەرهەم بەرەو پێشەوەتر دەرواو هەر تەنیا لە ساڵی (١٩٨٦)دا، ژمارەی چالاکی مەیدانی گەیشتە (١٢٠٪)و کتێبی رۆشنبیری و هەروا نامیلکەی سیاسیش دوو ئەوەندەی ساڵانی تر.. لەساڵی (١٩٨٧) یشدا، کارەکە بووە جێی شانازی و سەرسورمانی هەموو کادیرانی دەزگاو گشت رۆشنبیرێکی دڵسۆزی کورد ورادەی چالاکی مەیدانی بوو بە (١٤٣٪)و کتێبی رۆشنبیریش، نامیلکەش، دوو ئەوەندەو بگرە پتریش.. هەر لەو ساڵەش دا بودجەی دەزگای بەرزکرایەوەو بوو بە نزیکەی (ملیۆنە) دینارێ، بۆ راپەڕاندنی ئەرکە جۆراوجۆرەکانی خۆی.. گۆڤاری (رەنگین)ی رەنگینیش سەری هەڵداو لەمانگی تشرینی یەکەمی هەر ئەو ساڵەش، دەرچوونی رۆژنامەی (هاوکاری) بوو بە دووجار لەحەفتەیەکداو هەوڵێکی دڵسۆزانەی بێشوماریش ئەدرێ، بۆ کردنی بەرۆژنامەیەکی رۆژانە..!

* ئەم هەموو دەسکەوتەش خۆی لەخۆیدا گەورەترین شانازییەکە، چ بۆ گەلی سەرفرازی کوردو چ بۆ رۆشنبیرانی کورد.. بەڵێ: دوای ئەو سەردانە هەر بەجارێ رەوتی دەزگاکە گۆڕاو گەیشتە ئەو رادەیەی کە هەر بۆ نموونە، کە مشتێکە لەخەروارێ، بۆمان باسکردن...

دەبا هەر پیرۆز بێت، رۆژی هاتن و سەردانی سەرەکی فەرماندە صدام حسین بۆ ئەم دەزگایە.. چاوەڕێی دەسکەوتی ترین...

## بمناسبة يوم الثقافة الكردية

حسين عبدالله

شهدت الثقافة الكردية نهضة جبارة خلال عقود السنين الأخيرة توطدت اسسها بعد ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة وعلا صرحها شيئاً فشيئاً مع استمرار ثورة حزب القائد بالعطاء فكانت بذرة حية نامية لقيت الأرض الخصبة والرعاية الكريمة والمناخ الصحي في عراق حر متقدم، وكانت دار الثقافة والنشر الكردية احدى مؤسسات الثورة التي اضطلعت بمهمة تطوير الثقافة الكرية وازدهارها ولازالت تواكب مسيرة البناء والتطور للثورة المجيدة في عراقنا العزيز وتبذل قصارى جهدها في هذا السبيل.

وفي يوم ١٩٨٣/٣/٩ شرف السيد الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ إجتماعاً لدار الثقافة والنشر الكردية بالحضور وكان الاجتماع مكرساً لمناقشة الخطة السنوية للدار فكانت توجيهاته القيمة في هذه الزيارة بداية لخطوات كثيرة اخرى في خدمة ثقافة كردية شريفة تحت خيمة العراق العظيم.

قام كاتب هذا البحث بذكر أبعادها وتفاصيلها، ولاسيما ماتخص عمل الدار ونشاطاته المتزايدة، إذ ذكر بالأرقام كمية المطبوع من كتب أدبية وعلمية وفنية باللغة الكردية إضافة الى اعداد مجلة روشنبيري نوى وبەيان وجريدة هاوكاري والمجلة الجديدة (رەنگين) وذكر الندوات الثقافية والمهرجانات والمعارض الفنية والنشاطات الميدانية التي قامت بها الدار في السليمانية واربيل ودهوك وأقضيتها. واستخلص من أن الثقافة الكردية في تطور دائم تحت رعاية باني صرح العراق الجديد الرئيس القائد صدام حسين حفظه الله ورعاه، واطلق على هذه الزيارة الميمونة يوم الثقافة الكردية

# بیرەوەریا

# روژنامەگەریا

# کوردی

عبدالله ئامێدی

بەری ئەم باخڤین لسەر روژنامەگەریا کوردی پیدڤیە ئەم سەروبەری وی دەمی دیارکەین یێ روژناما کوردی لێ پەیدابوی، کا سەروبەرێ کومەلایەتی و ئابوری و سیاسی ل وێ سەردەمی چەوا بو؟ تشتەکێ دیارە کو میللەتێ کورد وەك هەمی میللەتێت دی یێت دەورو بەری ژێر دەستی خویندکارێت عوسمانیا بون، و ئەو رەش پوشیە بسەر کوردستانێ و وەلاتێ عەرەبیدا بەردای ل درێژاهیا چەرخێ هەژدێ و هەتا نیڤا دوێ ژ چەرخێ نوزدێ و هەر بزاڤەکا رزگاربونێ یان سەر هەلدانەکێ دیار ببا یان ئێکبونەك بکارەکێ درندانە تەپە سەردکر. ئێکجار دوژمنێت زانین و تێگەهشتنێ بون بەلێ ل وی دەمی شورەشا فەرەنسی پەیدا بو و هزروبیرێت پێش کەتی بەلاڤەبون ل دونیایێ و تیروژکا ئاگاهـلێبونێ روناهی دا هەمی دەڤەرێت دەولەتا عوسمانلی و دەنگێ سەربەست و داخوازێت مافێت میللەتا گەهشتنە حوکمدارێت عوسمانیاو روژنامەگەری رێگا ئێکانەبو بو دەربرینا داخوازێت میللەتاو ئامانجێت وان کە دگوهێ رێبەرێت عوسمانیادا دەنگ ڤەددا. . کە حوکمدارێت دەولەتا عوسمانی نەچار بون خو یێ ئینا دەر و روژنامە دەرێخستن و رێکا روشەمبیر وتێگەهیشتیا بیروباوەرێت خو دیارکەن. . جامیللەتێ کورد هەر وەك هەمی میللەتێت دی ژ سالا ١٥٣٥ بویێ هەتا ١٩١٧ێ ل ژێر دەستی حوکمێ عوسمانیا بو. ومیللەتێ کورد پێدڤی روژناما بون داکو هیڤی وداخوازێت خو تێدا دیارکەن. هەر چەندە دیروکا روژنامەگەریا کوردی ل دیماهیا سالێت چەرخێ نوزدێ دەست پێ کریە ئەوژیك پشتی چەندەها شورەشێت سەرنەکەتی. . بەلێ هزروبیرێت کومەلایەتی و گیانێ نەتەوایەتی شکەفت و پێش کەت ئێدی روژنامەگەریا کوردی سەر هەلدا بەلێ براستی روژنامەگەریا کوردی دەست پێ دکەتن ژ دیروکا تەپە سەریا نەتەوایەتی و هزروبیرێت دەمێ بەر سینگ گرتنا زورداریێ وکارێت نەهێلانێ ل سەر دەستێ زوردارێت وێ سەردەمی. ونمونە بو ڤێ چەندێ ئەوە کو دەرکەتنا یانکو بونا ئێکەمین روژناما کوردی ل دەرڤەی کوردستانێ بو. ئەوژی روژناما «کوردستان» ل روژا ٢٢ی نیسانا ١٨٩٨ێ دەرکەتیە ل قاهرە[(١)] ئەڤ روژنامە یا سیاسی و ئەدەبی و کومەلایەتی بو. خودانێ وێ (خـودێ ژێ رازی) (مقداد مدحت) ژ بنەمالا بناڤ ودەنگێ بەدرخانیا بو. ول ژێر ناڤێ روژنامێ هاتیە نڤیسین [ژ بو هوشیار بونا کورداو حەز لێکرنا وان یا هونەری ئەڤ روژنامە بزمانێ کوردی هەیڤ دوو جار دەردکەت] هەر جارێ سێ هزار ژمارە دەردکرن وبێ پارە بەلاڤە دکرن بەلێ ژبەر سەروبەرێ ئالوز ئاکنجی نەبو ژ قاهرە، هاتە ڤەگوهاستن بو (جنیف)ول وێرێ ژی پشتی چەند ژمارەکا جارەکا دی زڤری (قاهرە)وچەند ژمارەکێت دی قەستا لندن کر وژمارەك بتنێ ل وێ درێ دەرکەت وئێدی نەڤەحەوها قەستا (فولکستون)کر چەند ژمارەك ل وێرێ ژێك دەرکرن ول دیماهیکێ زڤریف (جنیف) هەتا ژمارا دیماهیکێ ل ١٤ی نیسانا ١٩٠٤ێ دەرکەت و ئێدی نەما. ئەڤ هندە ڤەگوهاستنە ژ بەر سەروبەرێ تەنگاڤ و بزاڤا نەهێلانا دەنگێ مروڤێ کوردبو. بەلێ دسەر هندێرا بەلاڤەکرنا بیروباوەرێت نەتەوایەتی لبەر پەرێت روژنامێ کارەکێ دژوار هەبو دهەژاندنا هزروبیرێت کوردادا ژبلی ڤەژینا کەلەپورێ کوردی کە ژمارەکا نڤیسینێت ئەدەبی وروشەمبیری هاتنە بەلاڤەکرن چونکە وەك لبەر پەرێت روژناما کوردستاندا دیارو ئاشکەرایە ئاگەهدار بو لسەر کارێت سیاسی ل دەڤەرا کوردی هەر چەندە ژێ دیر بو. وپشتی گوهرین کەتیە ددستورێ عوسمانیدا ل سالا ١٩٠٨ێ ژمارەکا گوڤارو روژنامێت کوردی دەرکەتن و هەیامەکێ کێم رێك ڤەبو لبەر سینگێ بزاڤێت نیشتمانی و کومەلایەتی ل هەمی باژێرێت مەزن وپێشکەتی. .

روژنامەگەریا کوردی لسەر دەمێ عوسمانیا یا پاشکەتی بو چونکە شولکەرێت زانا دکێم بون. . ونەخویندەواری یا بەلاڤە بو ورێکێت هاتن و چونا دئاشی بون. . چاپەمەنی نەبون. . ژبلی کو ژمارەکا کێم یا نڤیسەڤانا هەبو ئەوژیك نڤیسینێت وان بزمانێ تورکی بون. . بەلێ روناهیا روژنامەگەریا کوردی نەڤەمریا بەلکو بسپور و خەمخورێت زمانێ کوردی بزاڤ کر وخو کرە سەرکێشێت رێکا سەربەستیێ و لبەراهیا هزروبیرێت نیشتمانی وکومەلایەتی کاروانێ روژنامەگەریێ هاژوت و بەرپەرێت روژنامەو گوڤارێت کوردی خەتی کرن ژ هوزان و چیروك و لێکولینا، و سەروبەرێ ئاگەهلێبونێ داڤێت خو بەردانە ناڤ میللەتی وروژ بو روژێ روناهیا رەوشەمبیری گەش بو. وژ نالەکێ دیڤە روژنامەگەریا کوردی تێکەلاهی هەبو دگەل سەروبەرێت نەتەوا عەرەبی وهەمی لایێت ژیانێ برەنگەکێ گشتی و سەح و سیێت جیهانێ و پشکداری کریە دگەل بزاڤا عەرەبی یا مەزن (بزاڤا فەلەستینێ) و بەرەڤانی ژێ کریە دگەل روژنامەگەریا عەرەبی دژی هێزێت کەڤنە پەرێس وئیمپریالیزم. . بەلێ یا دهەمی سەردەمێت

بەریْدا روژنامەگەریا کوردی چوجارا وەلیٚ نەهاتیە کو شیابیت سەربەست بیروبـاوەریْت نەتـەوایەتی‌و هیڤی‌یْت میللەتیٚ کورد دەر ببریت هەتا شورەشا ۱٤، ۱۷ تیرمەها پیروز هاتی چونکە بەری شورەشا تیرمەهیٚ بچو رەنگیٚ‌هەمی دەستەکیْت حوکمدار نەهیْلایە روژنامەگەریا کوردی بدلیٚ خو هیڤی و ئارمانجیْت میللەتیٚ خو دیارکەتن . . وگەلەك جارا دەرگەهیٚ روژناما هاتیە گرتن ژ بەر ئالـوزیێت سیاسی ونەتەوایەتی ل کوردستانیٚ . . بەلیٚ پشتی شورەشا تیرمەها

پیروز پیٚنگاڤیْت بەرکەتی هاڤیْتینە دریکا پیٚشکەتنیٚ‌دا . . خاسمە پشتی مافیْت میللەتیٚ کوردی هاتینەدا دحوکمیٚ زاتیدا ناڤ جاڤا عیراقا بەرکەتیدا و پیٚنەڤیْت ئەم بەحسیٚ روژنامەگەریا کوردی بکەین چونکە یا دیار وبەرچاڤە کە هەر سال بصەدەها کتیٚب و گوڤار دەردکەڤن ژبلی روژناما ودەزگەهیْت چاپەمەنیٚ کە ددەمەکیٚ زیٚرین دایە بەلیٚ ئەگەر ل دیروکا روژنامەگەریا کوردی بنیٚرین ل عیراقیٚ بومە

دیاربـویە برەنگەکیٚ گشتی دەما گوڤارا (بـانگی کورد) دەرکەتی ل سالا ۱۹٦۳یٚ لسەر دەستیٚ خودیٚ ژیٚ رازی (جمال بابان)ی وبەلاڤە دبو ل هەمی دەڤەریْت کوردی کە بزمانیٚ کوردی و تورکی . هەیڤیٚ دووجارا دەردکەت ل بەغدا . . . وئەڤ گوڤارە نەما پشتی ژمارا پیٚنجیٚ ژ ئەگەرا هەودانا شەریٚ جیهانی یێ ئیکی ژمارەکا دەڤەریْت کوردستانیٚ دگەل دەڤەریْت عەرەبی ژ ئیمبراطوریەتا عوسـمانی ڤەبـون بەلیٚ کەتنـە تەڤنیٚ بیانیەکیٚ دی ئەوژیك بەریطانیا بو . . وسەروبەریٚ میللەتیٚ عیراقیٚ خراپتر لیٚ‌هات پشتی سالا ۱۹۱۷یٚ ودەستەکیْت

داگیرکـەر نەهیْلا گوتـارەك بەلاڤـة ببیت بیٚ‌یەرازیبینا ریٚڤـەبەریا گشتی‌یا پروپاگندیٚ . . وهیٚزیْت بەریطانی دەست دا بەلاڤەکرنا پەرتوکیْت روژ انە بزمانیٚ عەرەبی‌و کوردی وتـورکی چاپکـرن و بەلاڤـەکرن هەمی بەحسیٚ سەروبەریٚ شەری بو . . پاشی ئەو پەرتوك وەك روژناما لیٚ هاتن هەروەك روژناما (تیٚگەیشتنی راستی کە ل بەغدا ل سالا ۱۹۱۷یٚ دەرکەت و روژناما پیٚشکەوتن ل سلیمانیٚ‌ی ل سالا ۱۹۱۹یٚ بزمانیٚ کوردی وروژنـامـا (بانگی حەق) ل سالا ۱۹۲۳ی دەرکـەت کە ل شکـەفتەکا (جاسنە) دەڤەرا سورداش ل سلیمانیٚ‌ی دەرکەت . وحوکمداریْت ئینگلیزی هەمی ریکیْت خرابیٚ بکار، دئینان ژبو بەرگریا بزاڤا سیاسـی

وهـزروبیرا ل کوردستانیٚ . . وروژنامەگەری بکار دئینا بوٚ ئارمانجیْت خو کە روژنـامـا ژیانـەوە ل سالا ۱۹۲٤یٚ ل سلیمانیٚ‌ی دەرکر . . هەروەسا سیاسەتا ئەمریکی دەورەکیٚ مەزن بینی ل عیراقیٚ ژبوٚ پاراستنا کاریٚت خو ژ پیٚڤەگرتنیٚ ل عیراقیٚ ژبـەر ڤیٚ چەنـدیٚ ژمـارەکـا گوڤارو روژنامیْت (دعایەتیٚ) دەرکرن ل

دەڤـەریٚ وەك گوڤـارا پەیام و (ئـاگا)و (رووداوی هەفتەیی) بزمانیٚ کوردی ول سالـیْت سیهیٚ ژمـارەکـا پارت و دەستـەکیْت سیاسی دیاربـون . . ئەوان دەستەکا ژیك هندەك گوڤارو روژنامە دەرکرن ل هەڤلیٚریٚ و سلیٚمانیٚ‌ی و بەغدا

ژبوٚ بەلاڤەکرنا هزروبیریْت نەتەوایەتی . . ودڤیٚ قوناغیدا گوهرینەکا مەزن کەتە روژنامەگەریا کوردیدا ژ ناڤەروك و رەنگ و دیمەنیٚ کاریٚ روژناما‌دا . . . چونکە ژمارەکا گوڤار وروژنامیْت کوردی دەرکەتن بکارەکیٚ نوی ودیمەنەکیٚ قەشەنگ و جوان . .

ول سالیْت جلیٚ‌دا بزاڤیْت سیاسی و نەتـەوایەتی زیٚدەتـر بزاڤ کر بەلیٚ دەستەکیْت دوژمنکار پتر کەرب وکینیْت خو دارێتنە سەر روژنامەگەریا کوردی . . وچو روژنامەو گوڤار نەهاتنە بەلاڤەکرن بتنیٚ گوڤارەك نەبیت ئەوژیك نزار ئەوا خودیٚ ژیٚ رازی (علاءالدین سجادی) دەرکری ل سالا ۱۹٤۸یٚ کە ژمارەکا نیشتیمان پەروەریْت کوردو عەرەب پشکداری تیٚدا کربو . . . بەلیٚ پشتی شورەشا ۱٤ی تیرمەها ۱۹۵۸یٚ ژمارەکا دی‌یا گوڤار و روژنامیْت کوردی دەرکەت دمەیدانا روژنامەگەریێ‌دا وباهرا پتر ئالیٚ ئەدەبی‌و رەوشەنبیری وەرگرتبوو . . ول ڤیٚ دیڤ چون و لیٚکولینیٚ بوٚمەدیاردبیت کو سەروبەریٚ روژنامەگەریا کوردی ل عیراقیٚ گریٚدایە دگەل بزاڤا نەتەوایەتی یاکوردی ژبەر ڤیٚ چەندیٚ هەر زورداریەك ل نەتـەوێ کوردی هاتبیتـەکـرن ددیٚژاهی‌یا دیروکیٚدا ئەو زورداری یا ژ روژنـامـەگـەریا کوردی گرتی ژبـەر هندیٚ دیٚ بینی دهندەك سەردەمادا روژنامەگەریا کوردی یا پیٚش کەتی و نوی ژەن بوی و ل هندەك سەردەما یا کزولاواز بوی . . هەتا پشتی شورەشا تیرمەها پیروز روژنامە گەریاکوردی نەدشیا بدروستاهی بکاریٚ خوێ پیروز رابیت بەلیٚ پشتی هنگی روژنامەگەریا کوردی سال بوٚ سالیٚ جهیٚ‌خـو ڤەوژارت و دەهمانیْت خو داقوتان ژ توز وگەردا کەڤن وکارەکیٚ نوی‌کر داکو بگەهیتە ریٚزا مافیْت میلل و خزمەتا پەیڤا کوردی بکەت . .

روژنـامـەگـەریا کوردی ل عیراقیٚ دقـونـاغـا خویا ئاسیٚ ویا دویر گەلـەك دەستـەکیْت نڤیسـەڤـان و روژنامەگەریْت کورد دیارکرن و بسپوریْت زانا پەیدا بوینە، ژیانا گەنجاتیا خو هەمی بوراندیە بکاریٚ لیٚ گەرهان ودیڤ چونا ئەدەب و زمـانیٚ کوردی و بزاڤ کریە ژبـوٚ پەیڤـا کوردی یاپیروز ژبلی کو ژیانا وان یا هەژاریێ‌و دەست کورتیێ ودەربـەدەریێ وگـەلـەك نەخوشی دیتی‌یە و هندەکا خوینـاخـو کریە قوربـانی ریکـا روژنـامـەگەریێ داکو ئەو روژنامەگەری ببیتە چەکەکیٚ دژوار دخەباتا وەلاتیدا دژی دوژمنا .

ژیدەر

---


۱ ـ گوڤارا رەوشەنبیریا نوی ژمارە ۲ / ۱۹٦۹ بەغدا بەرپەر ۹۲
د. معروف خزندار
۲ ـ حول الصحافة الكردية/بغداد ۱۹۷۳ د. عزالدين مصطفى
ص ۱۲۸
۳ ـ رابەری روژنامە گەری‌ی کوردی/جمال خزندار ۱۹۷۳
٤ ـ روژی کورد/جمال خزندار/۱۹۸۱
۵ ـ (کوردستان) یەکەمین روژنامەی کوردی د. کمال فؤاد ۱۹۷۲

# في ذكرى الصحافة الكردية

عبدالله آمدي

قبل الحديث عن الصحافة الكردية وكيفية ظهورها يجب التطرق الى الاوضاع الشاذة التي مرت بها المنطقة الكردية والعربية أبان الحكم العثماني والظلام المطبق الذي لف كوردستان والوطن العربي بصورة عامة في القرن الثامن عشر حيث كان السلاطين العثمانيون وولاتهم يحكمون المنطقة حكما مطلقا ويقمعون كل حركة تحررية أو اصلاحية بالحديد والنار وكانوا ألد أعداء العلم والمعرفة وكل حركة تقدمية سياسية كانت أو أجتماعية او فكرية وجاءت الثورة الفرنسية والافكار والحركات التقدمية لتنشر في العالم مشاعل النور حيث وصلت هذه الافكار الى بقاع الامبراطورية العثمانية وكانت الصحافة هي اللسان الثوري الذي ينطق بأسم الشعب، وشعبنا الكردي كسائر الشعوب التي رزحت تحت نير الحكم العثماني من سنة ١٥٣٥ الى ١٩١٧ كان يشعر بحاجته الى صحف لتعبر عن امانيه. وان الاحداث التأريخية تؤكد بان تأريخ الصحافة الكردية هو تأريخ الاضطهاد القومي والفكري للشعب الكردي وان أول صحيفة كردية هي (كردستان) التي صدرت في القاهرة بتأريخ (٢٢) نيسان ١٨٩٨ الميلادي ثم انتقلت الى اوروبا تهربا من الاضطهاد القومي ولم تستقر في مكان معين ولم تتمتع بحرية التعبير وابداء الرأي الآ بعد ثورة ١٧ تموز التقدمية ولاحاجة الآن بالقول عن نشاط الصحافة الكردية ودورها بعد أن قامت المؤسسات الدستورية في منطقة الحكم الذاتي.

# دەوڵەت

## «بەشی یەکەم»

# دەوڵەت لە ڕوانگەی مێژوو و فەلسەفەدا

[redacted]

### پێشەکی

-:

ڕامیاری وەك زانستێك لەم سەدەیەدا پێش ڕەوی زانستەکانی گرتووەو زیاتر لە هەمووان لێی دەکۆڵرێتەوە ـ تاماوەیێکی زوو ڕامیاری وەك زانستێکی سەربەخۆ نەدەخوێندرا بەڵکو لەگەڵ فەلسەفەو ئابووری‌و کۆمەڵناسی‌دا دەخوێندرا، بەڵام ئێستای سەدەی گۆڕانکاری‌و تەکنەلۆژی‌و ڕامیاری، لە هەموو زانکۆکان بایەخێکی زۆری پێ دەدرێ‌و بەچەندان نامەی پلەداری زانستی لێ‌دەهێننەوە، ئەمەیش بە هۆی تێکەڵدایی‌و گەشەسەندنی بوارەکانی زانستی، سەرەڕای ئەمەش جەنگ و پێکادان هەر لە کڵپەدایەو. سەرهەڵدانی چەندان بیروباوەڕی نوێ‌و شۆڕش کردن لە پێناوی‌دا بۆ گۆڕانی واقیعی ستەم و بێ‌داد، هەروا ڕاپەڕینی گەلانی ئازادیخوازی جیهانی سێ‌هەم و ڕزگاربوونی هێندێکیان لە چنگی ئیستعمارو داگیرکەردا، لەسەروی هەمووانیشەوە هەڵگیرسانی هەردوو شەڕە زلە کاولکارەکەی جیهان کە بە ملیۆنان ئادەمیزادی کردە خۆراکی ئاگری خۆی.

بۆیە کتێبخانەی هەر زمانێك دەبینین پڕە لە دانراوی ڕامیاری، کە لە کون و کەلەبەرەکانی بەتێرو تەسەلی دەکۆڵێتەوە. بەڵام کە دێتە سەر کتێبخانەی کوردی ئەوا نەك هەر بە هەژاری دەبینیت بەڵکو نابووتیشە. ئاوا کتێبخانەکەمان چاوەڕوانی قەڵەمی بەتوانا دەکات لەم بوارەو لە گشت بوارە زانستی‌یەکانی دی‌دا.

نووسین لەم جۆرە بابەتەدا کارێکی ئاسان و بێ‌ماندووبون نی‌یە، بەتایبەتی کە سەرچاوەکانی بێگانەبن و تەنانەت کە فەرهەنگێکیشت لەبەردەست دا نەبێت بۆ زاراوەو دەستەواژە لەبارەکان. بێ‌گومانم کە ئەم چەند دێرانە بێ‌کەم و کورتی نین وەلێ وەك دەروازەیێك پێش کەشی خوێنەرانی بەرێزی دەکەم، هیوادارم شایانی خوێندنەوەو سەرنج گرتنی بێت.

دەوڵـەت باسێکی دوورو درێـژە. . بۆیـە ناتـوانین بە چەنـد رووپەرێك یەکالای بکەینەوە. بەڵام وەك دەروازەیێك و مەبدەئە گشتی یەکان ئەم بابەتەمان دابەش دەکەینە سەر دوو لقی سەرەکی:

یەکەمیان:ـ سەرهەڵدانی دەوڵەت و رێرەوی مێژووی. .

دووهەمیان:ـ دەوڵەت لە روانگەی فەیلەسوفەکان دا.

**پێناسەی دەوڵەت:**

-:___

دەوڵەت وشەیەکە بۆ وشەی لاتینی ـ (status) دەگەرێتەوە، کە واتـای بارێکی جێگیـر دەدات (الحالـة المستقـرة). بەڵام لە بوتەی رامیاریدا خۆیگرتەوە کاتێ رۆمانەکان لە چاخەکانیان دا کۆماریان ناسی.

کەچی بەکـارهێنـانی واژەی دەوڵـەت بەو پێیـەی دەزگایێکی رامیـاری هەرەبـەرزە لە زووەوە پێ ناس نەکـراوە تا «مـاکیاڤللی» گوتی «هەر دەستەیێك کە دەسەڵاتی لەسەر گەلان دا هەبێت پێی دەگـوترێت دەوڵـەت، کە کۆمـارین یاخـود میـرنشینین. زمـانـە ئەوروپی یە زیندووەکانیش پەیڤەکەیان وەرگرت، ئەڵمان staat و ئینگلیزیش state و فەرەنگییش Etat بەکار دەهێنن. [١]

دەوڵەت لە زمانەوانیدا بە سێ واتا دێت:ـ

١) دەوڵـەت بریتی یـە لە کۆمـەڵێکی رێکخراو کە نەتەوە (الامة) بنەما کۆمەڵایەتی یەکەیانە. بەو پێیە دەگوترێت ئیتالیاو ئیسپانیاو یابان دەوڵەتن.

٢) دەوڵـەت لە کۆمـەڵگـای رامیـاریدا دەسـەڵاتی گشتیو دەسەڵاتداران دەگەیەنێت لەبەرچاو دەسبەسەرەکان دا.

٣) واتـەی دەوڵـەت لەنێـو دەسـەڵاتـە گشتی یـەکان دا ناوەندێتی (مـەرکـەزیـەت) دەگـرێتـەوە. . چەشنی کۆمـەڵـە گشتی یـە هەرێمی یـەکـان: پارێـزگـەو شارەوانیو دامـەزراوە گشتی یـەکان بەرامبـەر بە پایـەتـەخت. بۆ نمـوونـە پارێـزگار کاتێك دەتوانێت پەیمانێك مۆربکات کە پایتەخت رەزامەند بێت. [٢]

وشـەی دەوڵـەت لێـرەدا واتـای تۆپکـەی دەزگا رامیاریەکان دەگەیەنێت، جا چ سەربەرزێتی کۆمەڵی رێکخراو بنوێنێت، یان دەسـەڵاتی گشتی یاخـود ناوەنـدێتی. . کە هەمـووی هەر لە دەوری دەسەڵات و مافی فەرمان دەرکردن و یاسا دانان خول دەخوات.

بە پێی کۆمـەڵنـاسیش دەوڵـەت کۆمـەڵـە خەڵکێکـە لەسـەر زەوی یێکی دیارکراو جێگیرن و رژێمێکی کۆمەڵایەتیو رامیاریو یاسـایی یـان لەنێـوانـدایـە، بە ئامـانجی بەرژەوەنـدی گشتی کە دەسەڵات پشتگیریەکەیەتی، دەسەڵاتیش بۆی هەیە زۆری بەکاربهێنێت. [٣] کەواتە کۆمەڵی دانیشتوان و زەوییو دەسەڵات و رژێم و دان پێدانانی نێو دەوڵەتی بنەمای سەرەکی دەوڵەتن (کە لە بەشی دووهەم دا بەدرێژی باسیان دەکەین).

بێجگـە لەم ناسینـانـەی سەروو پێـویستیمـان بە هێنـانـەوەی هەندێ پێناسەیدی هەیە بۆ یەکالاکردنەوەی کاکڵێ باسەکەو بە ئەنجام گەیاندنی باش.

بەکـورتی دەوڵـەت بریتی یـە لە یەکـەیـەکی رامیـاری خاوەن دەسـەڵات و پایـە، مەرجـە سەرەکی یـەکـانیشی گەل و هەرێم و میـریو ددان پێـدانـانـە. [٤] مامۆستا (هۆریۆ) وا دەوڵەت دەناسێنێ کە

کۆمە ڵگـایێکی رێکخـراوە بەندبووی زەمینێکی دیارکراو و توانای یاسا دەرکردن و سزادانی لە رێ لادەرەکانی هەیە.

دکتـۆر (اسمـاعیـل الغـزال)یش دەڵێت **«بەرای ئێمە دەوڵەت کۆمەڵە کەسانێکی رێکخراون لە ناوەندێکی (وسط) کۆمەڵایەتی ژێـر دەسـەڵاتێکی رامیـاری کە هەڵ قولاوی کۆمـەڵـەکەیە، ئەم دەسـەڵاتـە رامیـاریـیـەش بەتـوانای یاسا دەرکردن و دەرچواندنی پەیرەو جێبەجێ کردنی جیادەکرێتەوە.** [٥]

دکتـۆر (منـذر الشـاوی)ش بە جۆرێکی تـر پێناسەی دەوڵەت دەکات، کە بەندە لەسەر جیاکردنەوەی دەسەڵاتدارو دەس بەسەر ـ (الحاکم والمحکوم). ئەو دەڵێت لە هەر کۆمەڵگایێك جیاوازی نێوان دەسەڵات دارو دەس بەسەردا هەبوو ئەو لەویدا دەوڵەت هەیە.

دکتـۆر شاوی لەسـەری دەرواو دەڵێت ئەو کەسـانـەی کە پایـەیێکی بەرزیـان هەیـەو یاسـا دەردەکـەن و فەرمان بە خەڵکی رادەگـەیـەنن و توانـای سزادانیـان هەیـە ئەوان حوکم گێـرن (حاکمن)، ئەو کەسانەش کە گوێرایەڵن حوکم بەسەردا کراون (مەحکومن). . . کەواتە لێرەدا دەوڵەت هەیە.

بەڵام سیفەتی ئەم جیاوازییەی نێوان حاکم و مەحکوم زۆر تێکەڵاو و ئالۆزو هێزدارە، کە لە پلەدا زۆر بەرزترە لە جیاوازی نێـوان حاکم و مەحکـومی پارت و جڤـات (نقـابـة)و سەرەك

خێڵ.[٦]

بە شیتەڵ کردن و لێکدانەوەی ئەم پێناسانە دەتوانین بڵێین: دەوڵەت کۆمەڵە کەسانێکن یەکدیگرییێکی بەرژەوەندییان لە نێوان دایەو لەسەر زەمینێکی دیارکراو و رژێم و رێکخستنێکی تایبەتیان هەیەو ددان پێدانراون و جیاکردنەوەی حاکم و مەحکومیش بە ئاسانی تێیان دا بەدی دەکرێت.

**سەرهەڵدانی دەوڵەت:**

بۆ زانینی سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەت و پەیدابوونی، زۆر رای لەیەك جیاواز هەیە، هەر یەکێك لەم رایانە سەر بە فەلسەفەیێکی دیارکراوەو لە روانگە خۆیەوە بۆی دەچێت. باوەرگەی فەلسەفیش بە پێی روانینی فەیلەسوفەکان بۆ جەوهەرییەتی شتەکان لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆرێت. یەکێکیان بایەخ دەداتە سۆنگەیێك زیاتر لە سۆنگەکانی دی، وەك ئایین.. ئابووری.. دەروونی.. تاد، هەر بۆیەش زۆر بیروڕا هەن دەربارەی دەوڵەت.

هەندێك لە زانایان دەبێژن لەو کاتەوە دەوڵەت هاتۆتەکایەوە کە کۆمەڵ بەسەرخۆیدا دابەش بۆتە سەر دوو چین.. دوولا.. یەکیان ئەویدی حوکم دەکات.. واتە جیاوازی لەنێوان دەسەڵاتدارو دەس بەسەردا.. لە یەکەمیان فەرماندان و یاسا دەرکردن و لە دوو هەمیشیان مل کەچیو گوێڕایەڵی، بێ‌گومان ئەمەش هەر لەو کاتەوە سەری هەڵ داوە کە بە حوکمی خاوەنداریتی، یان ترس و هێز، یان نیشان و شەوکەت، یان پایەی بنەماڵەیی یاخود بیروباوەری ئایینی توانیوانە دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن و ترۆپکی رەمەکی کۆمەڵ داگیربکەن.[٧]

ئەم بیرورایەی پێشوو بە دڵی هەندێ لە زانایان نەبوو، بەڵکو نووکی رەخنەشیان ئاراستەکردو دەوڵەتیان بە دەزگاییکی نوێ لە قەڵەم دا.

ئەوان دەوڵەت لەو کاتەوە دەناسن کۆمەڵی رامیاری بگەنە پلەیێکی وا لە رێك خستن دا بوونی سەربەخۆیی بسەلمێنێ بێ لەو کەسانەی کەتیایدا حوکم دەکەن... واتە [کەسێکی واتایی دروست بکەن] ئەمەش رووندادت مەگەر کۆمەڵ بگاتە پایەیێکی پێش کەوتوو لە ژیاریدا (شارستانێتیدا)... بەو پێیە دیارکردنی مێژوو بۆ دەوڵەت کارێکی ستەمە، چونکە مێژوو پلەدارییە نەوەك دەرخستنێکی یەکجاریو کتوپری.[٨]

کەواتە دەوڵەت تەنیا بە رژێم نەبێت نایەتەکایەوە کە دەوری هەموو چالاکیەکانی تاك بدات، لەپێناو گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش، کە مرۆڤایەتی بۆی تێدەکۆشێ. ئەم جۆرە رژێمە بەرزترین جۆری کۆمەڵ دەنوێنێت، کە کۆمەڵی رامیارییە. خەڵکی دەبێت لە دەوری ئامانجێکی هاوبەشی سووددار دا کۆببنەوەو دەسەڵاتێك چاودێرییان بکات و پارێزگارییان بخاتە ئەستۆی خۆی... لێرەدا دەسەڵات و رژێم هیچ لەسەربەستی کەم ناکەنەوە بە مەرجێك دەسەڵات و رژێمەکە ئامانجیان سەربەستی خەڵکی بێت، بەم جۆرە بەرەو پێشی دەبەن و رێکی دەخەن.[٩]

هەندێکیش دەوڵەت بە خێزانێکی گەورەکراو دەزانن.. سەرەتا خێزان، ئەوجا بنەماڵە لەپاشا تیرە، ئیدی تیرە لەگەڵ تیرە دەوڵەتیان پێك هێناوە. شەرعیەتی دەسەڵاتی سەرەك و حاکمیش لە سەرداریتی باوك و باپیرەوە وەرگیراوە.

کەچی خاوەنەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی پەیمانێك دەکەنە بنچینەی دەوڵەت کە لەنێوان گەل و تاقمێك لەگەل دەبەسترێت، بە مەرجێك گەل بۆ سوودی خۆیو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە مەترسی خۆخۆریو لەناوچوون، لە بەشێك لە سەربەستییەکەیان واز دێنن و شەرعیەتی دەسەڵاتەکە دەدەنە دەزگاییکی نوێ کە دەوڵەتە. لە لاپەرەکانی دوایی زیاتر لەم باسە دەوێین.

مارکسییەکانیش روانینێکی جیایان دەربارەی دروست بوونی دەوڵەت هەیە. کە دەوڵەت رژێمێکی رامیارییە بە دەست چینی دەوڵەمەندەوەیەو ئامانجەکەشی پاراستنی رژێم و بەرپەرچ دانەوەی چینەکانی دییە.

دەوڵەت لەو کاتەدا پەیدابووە کە کۆمەڵ بەسەر دوو چینی جیاوازدا بەش بووە، هەژارو دەوڵەمەند، چەوساوەو چەوسێنەر.. ئاوها دەوڵەت دەزگاییکی رامیاری سەربازییە بە دەست چەوسێنەرانەوە بۆ سەرکوت کردنەوەی چەوساوەکان. بێ‌گومان لەم بارەش دا یاسا داردەستی چینی دەسەڵاتدارەو دەربەستی ستەم و زۆرەکییەتی. بەم پێیە دەوڵەت ئاگری زۆرانبازی چینەکان خۆشتر دەکات... تا چینە هەژارەکە خۆی دەگرێتەوەو بەرەبەرە بە هۆی شۆرش کردن دەسەڵات دەگرێتە دەست و ئیدی

دەوڵەت دەبێتە دکتاتۆریەت و کوتکی سەری سەرمایەداران جۆرێکی دی زەبرو زەنگ دووپات دەکاتەوە، تا دەگاتە قۆناغی کۆمۆنیستی بێ‌چینایەتی‌و دەوڵەت و یاسا!!. (١١)

**دەوڵەت لای یۆنانیەکان.**

**أ :-**

یۆنان بەو شوێنە ستراتیژیەی کە هەیەتی ڕۆڵێکی مەزنی بووە لە مێژ وودا. لە خۆرهەڵاتی‌یەوە ئاسیاو باشووریشی ئافریقا، خۆیشی دەروازەیە بۆ ئاوروپاو هەڵ کەوتنی لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست زیاتری بایەخدار کردووە لە بارەی بازرگانی‌و سەربازی یەوە.

ئەگەر لە ئاسیا دەسەڵات بە ناوی خواوە هەڵ سوڕێنرابێ ئەوا یۆنانیەکان یەکەمین کەس بوونْ کۆمەڵگەیێکی ڕامیاریان ناسی. واتە دەسەڵات و حوکم لە قاوغی بەخودابوون و سایەکەی دەرچوون و کەوتنە دەستی گەل (لە دیموکراتیەت)و پاشاو خونکار لە (دیکتاتۆریەت)و چەند کەسانێك لە (ئەرستۆکراتیەت).

بەڵام ئەم کۆمەڵگە ڕامیاریە شێوەیێکی جیاوازی بەخۆیەوە بینی لەچاو کۆمەڵگە هاوچەرخەکانی. . خاسیەتی تایبەتی دەوڵەت لەو کۆمەڵگەیەدا دەوڵەتی شاربوو (دولة المدينة city state) واتە شارێك خۆی دەوڵەتێك بووە، کە مافی شارستانیەت و کەسی تێدا دەپارێزراو جۆرە ڕژێمێکی تایبەتمەندی بووە. کەچی ئەو یاسایە کە لە نێوشاردا پەیرەو دەکرا بەپێچەوانەشەوە دەرەوەی شار مەیدانی ڕووتاندنەوەو کوشتن و برینی بێ لێ‌پرسینەوە بووە، واتە هەر کەسێك لە شار دەرچووبا توشی تالان و ڕووت کردنەوە دەهات بێ‌ئەوەی هیچ پیرۆێك (ڕژێمێك) پارێزگاری بکات. . بەو شێوەیە دەوڵەتەکانی شار داخراو بوون. (١٢)

سەرهەڵدانی دەوڵەتی شاریش دەگەڕێتەوە سەر چەند هۆیێك، لەوانە هێندێکیان ئابوورین، چونکە گیروگرفتی زۆربوونی دانیشتوان و کەمی خۆراك و زۆرانباری لەپێناوی گەیشتن بە دەسەڵات وای لێ‌کردووە کەسانێکی زۆر زێدەکەیان جێ‌بهێڵن و لە شوێنێکی دیکەدا بگوزەرێنن. هەندێکیان هۆی جوگرافین. . کە سروشتی یۆنانی بە کەژ و کیۆو دەریا زۆری بۆتە هۆی لێك ترازانی وڵات و گرانی هات وچۆی ئەو کات لەنێوانیان دا ومانەوەی لاپەرگەیی یارمەتی دروستی‌بوونی شاری لەیەك جیاو دەوڵەتی سەربەخۆی داوە. هەروەها مێژ ووش کاری کردۆتە سەر ئەم لاپەرگەیی‌یە چونکە ئەغریقیەکان پۆل پۆل بە شێوەی هۆزو تیرە کە هەر یەکێکیان زمان و داب و نەریتێکی لەیەك جیای هەبووەو بۆ ئەو شوێنەیان هاتوونە. . ئەمانە گشتیان بوونەتە هۆی پێك هێنانی دەوڵەتی شار، کە مەرجەکانی ڕووبەرێکی دیارکراوو سەربەخۆیی ئابووری ـ ڕامیاری‌یە. گەورەترین شارەکانی یونانیش ئەسیناو ئەسپارتە بووە. (١٣)

ئەسینا بە ڕووبەری ١٠٦٠ میلی چوارگۆشە گەورەترین شاری یۆنان پێك دەهێنێ کە هەر لەوێ‌دا ژیانی فەلسەفی‌و ڕامیاری خۆی گەیاندە ترۆپکە. . ئەسینا یەکەمین دەوڵەت بووە لە مێژ وودا کە دیموکراتیەتی ڕاستەوخۆی ناسیوە بە دەزگە ڕامیاری‌یەکانی [کۆمەڵە، ئەنجومەنی پێنج سەد کەسی‌و دادگا] (١٤)

(ئەسپرتە)ش دووەمین شاری یۆنانی‌یەکانە کە دەوڵەتی تێدا دامەزرابوو. کۆمەڵگەی (ئەسپرتە)ش وەك ئەسینا دابەش ببووە سەر سێ چینی سەرەکی:- چینی کۆیلەکان HELOTS بنکەی بینای کۆمەڵایەتی‌یان پێك دەهێنا، لەبەر شوێنی ئەو کەسانەی لەو چینەدا کە باری گرانایی کاروپیشەی دەستی تەواوی شاریان لەسەر بوو بێ‌ئەوەی بەشداری کەمترین ژیانی ڕامیاری ببن. چینی بازرگانی ناوەڕاست ئەمانەش مافی شاری‌یان هەبوو بێ لە خۆتێ هەڵ قورتانی ڕامیاری. ئەوسا چینی هاو وڵاتیە (ئەسپرتە)ی‌یەکان کە لە نەژادی جەنگاوەرە هێرش بەرەکان بوون، تەواوی ژیانی ڕامیاری‌و هەڵسوڕا ندنی چالاکی سەربازی‌و دەسەڵات و حوکم کردنی گەل بەدەست ئەوانەوە بوو. (١٥)

**ب ـ دەوڵەت لای ڕۆمانی‌یەکان:**

ئەوەی ڕۆمان (وەك دەوڵەتێك) لە ئەثیناو ئەسپرتە جیادەکاتەوە هێزداری‌و بە بەرەوبوونی خاکە، بە شێوەیێك ڕۆما بوو بە پایەتەخت و ناوچەکانی دەوروو بەریشی خستە ژێر دەسەڵاتی، واتە شار دەوڵەتێکی داخراو نەبوو وەك شارەکانی یۆنان.

مێژ ووی ڕامیاری ڕۆما بەسەر سێ قۆناغ دا تێپەڕیوە، هەر قۆناغێکیش خاسیەتی جیاوازی خۆی هەبووە. ئەم سێ قۆناغەش چاخی پاشایەتی‌و کۆماری‌و ئیمپراتۆری بوون.

چاخی پاشایەتی زیاتر لە سەد ساڵی گرتەخۆ (٦١٦ - ٥٠٩ پ.ز) کە توخمی ئەتروسکی دەسەڵاتی گرتبوە دەست و ڕۆماش ببووە شاری سەرەکی. لەسەر دەستی پاشایەکان ڕۆما لە دەوڵەتێکی بچووکەوە بەرەو دەوڵەتێکی بە هێز تەکانی دا. کۆمەڵگەش هەروەك تەواوی کۆمەڵگەکان دابەش ببووە سەر چینی کۆیلەکانی بناغەی ڕەمەکی کۆمەڵایەتیو چینی سەربەست. ئازادەکانیش بەپێی بنەماڵەو دارایی توێژ یی جیاجیان پێك دەهێنا. دەزگا ڕامیاریەکانیش بریتی بوون لە پاشا کە لەلایەن پاشای پێشوو دادەنرا، دەسەڵاتەکەشی لە بارەی ئایینیو سەربازیەوە ڕەهابوو.

دووەم دەزگاش ئەنجوومەنی پیران لە سەرەك خێڵەکان پێك دەهات. دەسەڵاتەکەشی هەڵبژاردنی پاشا کاتێ کە پاشای پێشوو دەمرد بۆ ئەوەی کەسێك دەست نیشان بکات بۆ جێگرتنەوەی هەروەها ئامۆژگاریکردنی پاشاش لەلایەن پیرانەوە دەکرا. ئەوسا ئەنجومەنی گەل کە لە تەواوی ئەو سەربەستانەی توانای چەك هەڵ گرتنیان هەبوو پێك دەهات. فەرمانیشیان لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی دی دەگۆڕا، بەڵام هێڵی سەرەکی بریتی بوو پێشنیازکردن و یاسادانان و بڕیاری دانی کاروباری ئاشتیو ڕاگەیاندنی باری جەنگ و دەنگ دان و پەیمان بەستن.

چاخی کۆماری لەلابردنی دوا پاشای ئەتروسکی دەست پێدەکات تا ڕاگەیاندنی ڕژێمی ئیمپراتۆری لە سەدەی یەکەمی زایین. سەرهەڵدانی حوکمی کۆماری دەگەڕێتەوە سەر دوو هۆی گرنگ: یەکەمیان خۆخەریك کردنی بە جەنگ و پێکادانی گەورە کە توانای بەڕێوەبردنی لەسەر شانی ئەرستوکراتیەکان گران کردو باری خەڵکی ڕەش و ڕووتیش زۆرکرد. ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیەوە خول خواردنی فەرمانە گشتیەکان و ئەندامێتی ئەنجومەنی پیران و کۆمەڵە ئایینیەکان بە دەوری ئەرستوکراتیەکان، ئەمە وایکرد جەماوەری گەل دوور بکەوێتەوە لە کاروباری ڕامیاریو گشتی، ئەمە بووە هۆی زۆرانبازی نێوان جەماوەرو ئەرستۆکراتیەکان، لە ئەنجام دا بە بڕیاردانی یەکسانی مافە ڕامیاریەکان و شاریەکان و (الحقوت المدینة) ئاینیەکان کۆتای هات. ئەوسا سەر لەنوێ زەوی دەوڵەت دابەش کرایە سەر هاوولاتیە ئازادەکان بێ ڕوانینە توێژەکانیان.

لەدوای ئەوەی بارودۆخی ناوەوەی ڕۆما بەرەو جێگیریو هێمنی ڕۆیی، دەسەڵاتی شار زیادیکردو چەند شارێکی ئیتالیاشی خستە ژێر ڕکێفی خۆی. لێرەدا حوکمی ڕۆما تایبەتمەندێتی بەخۆوە بینی کە ناوەندێتی (مەر کەزیەت)بوو. لەسەر شارەکانی دەوروپشتیشی) فەرمانڕەوایێکی ڕۆما دادەنرا بۆ کارگێران و پەیڕەوکردنی یاساکانی پایەتەخت.

ڕۆمانیەکان هەر لەم چاخەدا ڕژێمیکی تریان داهێنا، ئەویش گواستنەوەی دەسەڵاتی پاشا بۆ دەستەیێك لە شابەندەر (قنصل). بەم پێیە ئەنجومەنی گەل ساڵێ دوو شابەندەری هەڵ دەبژاردو دەسەڵاتی پاشایان پێ دەسپێردرا، ئەگەرچی تەواوی دەسەڵاتی پاشا پێشوویان پێنەدەدا. چونکە دەسەڵاتی ئایینی درایە دەست پیاوە ئایینیەکان (الکهنوت). ئیدی بازنەی فەرمانەکانیان ئەمانەی خوارەوەی دەگرتەوە، سەرکردایەتی کردنی سوپاو سزادانی سەربازە لادەرەکان تارادەی لە سێدارەدان، هەروەها مافی داواکردنی ئەنجومەنی پیران بۆ کۆبوونەوەو سەرۆکایەتی کردنی، بێجگە لەمەش دەسەڵاتی چاودێریکردنی بێگانەکان و دامرکاندنەوەی یاخیبوون و گێروکێشەی ناوەوە. پێبەپێی دەستەی شابەندەری ئەنجومەنی پیران و گەل ڕۆڵی خۆیان دەگێڕا.

ئۆگستس ی ئیمبراتۆر توانی شەڕە ناوخۆییەکان کۆتایی پێبهێنێت و لە ساڵی (٢٧)ی پێش زایین ڕژێمی ئیمپراتۆریی ڕاگەیاند. هەرچەندە لە سەرەتادا بنەمای ڕژێمەکە لەسەر دەزگە ڕامیاریەکانی چاخی کۆماری مایەوە.. وەك بوونی ئەنجوومەنی پیران و گەل و سەرکردە هەڵبژێراوەکان، کەچی زۆری نەخایاند بەرەو ڕژێمی پاشایی ڕەها هەنگاوی نا، ئەمە پاش ئەوەی لەلایەن جەماوەرەوە باوەڕێکی زۆری پێدەکراو بە سەرکردەیێکی لێوەشاوەیان دادەنا.

لە سەرەتاوە بەو چاخەیان دەگوت ڕژێمی دوو لایەنی لەبەر ئەو دەسەڵاتە زۆرەی ئەنجومەنی پیران هەیبوو پێبەپێی ئیمبراتۆر لەسەر حیسابی سەرکردە شابەندەریەکان و ئەنجومەنە میللیە کۆنەکان.

لەگەڵ پەرەسەندنی ئەم ڕژێمە لەدوا کاتی حوکمی ئۆگستس دا دەسەڵاتی ئیمپراتۆر زیاتر پەرەی سەند، ئەنجومەنی پیرانیش دەسەڵاتی ڕامیاری دەرەکی (هەندەرانی) لێ دەستێنرایەوە... بەرەبەرە ئیمپراتۆر هەموو کاروبارێکی وڵاتی

گرتەرەست و بوو بە حوکمی تاکرەوی.

ئەم قۆناغەی بە ناوی چەرخی ئیمپراتۆریەتی گەورە ناودەبرا تاوەکو ساڵی ٢٨٤ زاینی مایەوە، ئەنجا لە سەردەمی ئیمپراتۆر (دیــوقلتیــان) بوو بە ئیمپــراتــۆریــەتی بچـووك کە تا سەردەمی (جـوستنیـان)ی ئیمپـراتـۆر درێـژەی کێشـا، لەو کاتەدا شێوازی پاشـایـەتی رەهـا چەسپیبـوو، بەڵام لەگـەڵ (جـوستنیان) بەرگی پاشایەتی دەستوریشی پۆشی.

ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یەکێتی نیوەخۆی تا ساڵی ٣٩٥ زاینی پاراست، کە لەو ساڵەدا دابەش بووە سەر دوو ئیمپراتۆریەت، خۆرئاوایی کە ڕۆما پایەتەختی بوو، خۆر هەڵاتی (قوستەنێنە)ی پایەتەخت بوو..

ئەوەبــوو لە ساڵی ٤٧٦ زاینی ڕۆمـا لەســەر دەستی توخمــە جەرمـەنیـەکـان ڕووخـا، بەڵام (قـوستـەنتینـە) درێـژەی کێشـا ئەگەرچی زۆر شارو هەرێمی لێبوونەوە بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئیســلام، تا ساڵی ١٤٥٣ کە تورکـەکـان سەرکـەوتن و لە جێی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ئیمپراتۆیەتی عوسمانی ئیسلامیان دامەزراند.[١٦]

**دەوڵەت لای ئیسلامەکان**

---

هەموو ئاینە ئاسمانیو زەمینییەکان[١٧] بایەخیان داوەتە سەر پەیــوەنــدی مرۆڤ لەگــەڵ خوداو لەگــەڵ خودی خۆیدا.

مەبـدەئـەکـانی خێرو ئەخلاقیان چەسپاندووە، بە شێوەیێك دوور بوە لە ڕامیاری، بۆ نموونە مەسیح فەرموویەتی (ئەوەی بۆ خودا بۆ خوداو ئەوەی بۆ قەیسەریش بۆ قەیسەر). بەڵام دەبینیت ئاینی ئیســلام ئەو قاوغــە پەیــوەستیـەی بڕیو بەرگێکی فراوانتـری لەبـەرکـردو گشت گریو هەمـەلایـەنی جیهـانێتی بەخۆوە بینی. ئیـدی بێجگـە لە پەیـوەنـدی مرۆڤ لەگەڵ خوداو لەگەڵ خۆی، پەیـوەنـدی مرۆڤ لەگـەڵ مرۆڤیشی گرتـەوە، کە ئەمـەیـان لایـە ڕامیاریو کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. بەمە ئاینی ئیسلام هەم دینەو هەم دەوڵەتیشە.

کاتێ پێغـەمبــەری مەزن لەبـەر تەنگـەتـاوکـردن و ئازاردانی لایــەنگــرە هەژارەکـانی شاری ـ مەککــەی ـ جێ هێشت، لە (مەدینە) یەکەم دەوڵەتی نوێی ئیسلامی دامەزراند، کە دری بە شەوەزەنگی ئەو کات دا. پێغەمبەر خۆی سەرکردەو بەڕێوەبەرو پەیامبەرو یاسادانەر بوو. شەرعیەتی حوکمی لە خواوە بوو چونکە خودای گەورە لە ئایـەتێـك دا دەفـەرمـووی (اطیعوا الله واطیعوا الرسول ولاتبطلوا اعمالکم ـ سورة محمد ـ آیة ٣٨). هەروەها بە هۆی ئەوەی پێغەمبەر لە هەموو کردەوەو رەفتارێك دا پاك بوو، فەرمــایشت و بڕیــار ـ دراوەکـانی دەبـووە ڕێبـەرو پێشـەنگ بۆ ئیسلامەکان، ئەمەشیان هەر خودا شەرعیەتەکەی پێداوە (چونکە هەر قســەو کردەیـەکی سروشێـك بوو بۆ خۆی، (وما ینطق عن الهوی، ان هو الا وحیٌ یوحی سورة النجم ـ آیة ٣ ـ ٤)

سەرەڕای ئەم شەرعیـەتـەش ڕادەربـڕین لەلایەن ئیسلامەکان مەبدەئێکی باوەڕپێکراو بوو، بەڵکو لە زۆر شوێن دا پێغەمبەرمان لەسەری ڕۆیشتووە، بەتایبەتی لە بارەی جەنگ و نەخشەکەی. ئەم پرس پێکردن و ڕادەربڕینەش شورای پێدەگوترێت ـ خودای مەزن لە دوو ئایـەت دا جەختی دەکـاتـەسەرو وەسفی بڕواداران دەکـات کاتێ دەفــەرمـوێت (وامـرهم شوری بینهم... سورة الشوری آیة ٣٨)

دوای کۆچ کردنـی پێـغــەمبــەر، وت و وێــژێکی زۆر لای ئیسلامەکان پەیدابوو لەسەر پایەی سەرەکایەتیکردن، تا کارەکە بە جێنشینی کۆتایی هات ـ الخلافة ـ. ئەبووبەکری سەدیق بەپێی بەیعــەت بوو بە یەکــەم خەلیفـەی ئیســلام. بەیعـەتیش بەڵێنێکە لەسەر گوێڕایەڵی کەسان بۆ سەرۆکەکەیان، کە دەست لەنێــو دەست دەنێت و فەرمـانـڕەوایی خۆیـانی دەدەنـە دەستی، هەروەك لە کڕین و فرۆشتنتن دا دەکرێت، بۆیە وشەکەش هەر لە ـ بیع ـ ەوە هاتووە.[١٨]

گوتمـان پایـەی جێنیشینی بە بەیعـەت بوو کە شێـوەیەکە لە شێــوەکــانـی هەڵ بژاردن، ئەمــەش بێگــومــان ڕژێـمـێکی دیموکراتییە. ئەم فەرمانڕەواییەی خەلیفە تا کارەساتی ـ صفین ـ درێـژەی کێشـا، ئەوسا، دەوڵـەتی ئەمـەوی هات کە لەســەر ڕەگــەزپــەرستیو داراییو پاشمــاوەی (لـە باوك بۆ کوڕ)و لادان لەسەر پەیڕەوەکانی ئیسلام دروست بوو.

**دەوڵەت لە ڕوانگەی فەیلەسوفان دا**

---

پاش ئەوەی دەوڵـەتمـان پێنـاسـە کردو سەرهەڵدانیمان ڕوون کردەوەو ڕژێمی حوکمیشمان لای یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان و ئیســلام دا باس کرد. وا بە بەبــاش دەزانین ڕوانین و ڕاکــانی

فەیلەسـوفـەکـانیش شی بکـەینـەوە، بە تایبـەتی کە گشت پێناسەیەکی دەوڵەتی وەك گوتمان لە باوەرگەیێکی فەلسەفی‌یەوە هەڵ دەقوڵێ، جا ئەگەر سەرچاوە فەلسەفی‌یەکانیشمان لارۆون بێتەوە.. ئەوا دەیان جار باشتر...

هەڵبـژاردنی فەیلەسـوفـەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیێك، لەوانـە دامـەزرانـدنی باوەرگـە خۆی، کە ئەفـلاتـون و ئەرستـۆو ئین خەلدون و مارکس دامەزرێنەرن هەروەها زۆر لەسەر دوان و تەرخـان کردنـی کتـێب لەو بارەو گرنگی پێـدانی. بێجگـە لە سەیرکردنی شوێنی لەدایك بوونیان و پێ‌گەیشتنیان و سەردەمی ژیانیان..

بێ‌گومان بۆ یەك لەدوای یەکیش پشتمان بە مێژوو بەستووە...

**ئەفلاتون (٤٢٧ ـ ٣٤٨ پ.ز)**

ئەفـلاتـونی خاوەن بەهـرەو بلیمـەت لەنێـو خێـزانێکی ئوروستـوکـراتی لە شاری ئەسینـای فەلسـەفـەو تێ‌ڕوانین و دیموکراتیەت لەدایك بووە. سەرەتای ژیانی بە خۆشی‌و دارایی‌و سەربازێتی بەسەربردووە، بەڵام دەست پێ‌کردنی خوێندنی لەبەر دەسـت سوکـراتـی فەیلەسـوف دا بووە خاڵی بازدان و گۆڕانی ئەفـلاتـونی دەوڵـەمـەنـدو پایـەدار لە سوپادا بۆ شاگـردێکی گوێ‌ڕایـەڵ و بیـرکـەرەوە لەدەوروبـەرو خێـرو عەدالەت ئامانجی تاك و دەوڵـەت لە ژیـان دا.. ئەو پرسیـارە تیـژو بەکـارانەی کە ئاراستـەی سوفستـایی‌یـەکـانی دەکردن گەلێ لە نووکی خەنجەر تێژترو لە زۆرانبازی توندتر بوون.

لە تەمەنی ٢٨ ساڵی‌دا مامۆستای هەرەبەرزیان لە پێش چاودا بە دەرمـانـخـواردن برد.. چارەنـووسی مامـۆستـاکـەی کە دیموکـراتی‌یـە سوفستـایی‌یـەکـان بە گەوجیـەتی خۆیـان بۆیـان کێشـا.. هەول دان و پووچـەڵ بوونـەوەی هەوڵـەکـانـی بۆ ڕزگارکردنی.. ئەمە هەمووی وای لەو شاگردە بیرتیژەکرد ڕق و کینە بەرامبەر بەو ڕژێمە نەزانە پەیدا بکات و بیر ـ لە چارەکردن بکاتەوە بۆ دەوڵەت و ڕاژەکردنی خەڵك. لە ساڵی ٤٩٩ پ.ز لە ترسی گرتن ئەسینای بەجێ‌هێشت، هەرچەندە ڕوون نی‌یە ئاخۆ ڕووی لە کوێ کردووە، میسر یاخود سەقلیە یا ئیتالیا. دوانزە ساڵی ڕەبـەق بە هاتـوچـۆکـردن دوور لە زێدەکەی بەسەربرد. لە (٣٨٧ پ.ز) لە تەمـەنی چل ساڵ پێ‌گـەیشتن و کامڵی‌یـەوە سەرلـەنـوێ گەڕایـەوە ئەسینا[١٩]... دوای ئەوەی ببـوە ئەو ئەفلاتـونـەی داهێنەرو فەیلەسوف و بلیمەت و مامۆستا.. ئەوسا دەستی کرد بە دەرس دانەوە لە فێرگە بیرکردی‌یەکەی (ئەکادیمیا Academy لە باخی ئەکادیموس نزیك ئەسینا.. ئەو فێرگەیە بە بنـاغـەی گشـت زانسـتگـەکـان دادەنـرێت کە لەو سەردەم پەیدابوون، لەوێ‌دا دەستی‌کرد بە دەرس دانەوەی فەلسەفە (بە فراوانێتی واتـای).. ئەو ئەکـادێمیـایـە بۆ ماوەی دە سەدە هەر بەردەوام بوو کە توانی ڕۆشنبیری‌و زانیاری (المعرفة) لە باکوری دەریای سپی ناوەڕاست بڵاو بکاتەوە.

ئەفلاتونی بلیمەت سێ دانراوی هەرە بە نرخی لەدوای خۆی بە مرۆڤـایـەتی بەخشی، کە هەر یەکـەیـان بەرهـەمی قۆناغێکی ژیـانـی‌یـەتـی... کۆمـار (RePubLic) لەسـەردەمی لاوێتی‌و بیـرکـردنـەوەی‌داو ڕامیـاری‌زان یان پیـاوی دەوڵـەت States man لەدوای کۆمـارو یاسـاکـانی Laws لە سەردەمی پیـرێتی‌و دوا کاتی ژیانی نووسیوێتی.[٢٠]

لێرەدا ئێمە زیاتر بایەخ دەدەینە کتێبی کۆمار، بەڵکو دەی‌کەینە چەقی باسـەکـەمـان چونکـە کۆمـار کاکڵی بابـەتـەکـەمـانـەو لە حەقیقـەتی کۆمـەڵایـەتی مرۆڤ لە دەوڵـەت دا دەدوێ‌و حوکم و حوکمـداری شی‌دەکـاتـەوە، دەوڵەتێکی بێ‌هاوتا لە دانراوەکەی‌دا دروس دەکات.

سەرهەڵدانی ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی‌و دەوڵەت دەگەڕێتەوە بۆ کۆمـەڵ بوونی کەسـان، بۆ ئەوەی شارێکمـان (دەوڵـەتێکمـان) دەست بکـەوێت پێـویستـە چوار پێـنج کەسـانێـك هەبن و بنـە بنـەڕەتی دابـەش بوونی کار لەنێـو شاردا. لەگەڵ گەورە بوون و گەشـەسـەنـدنی ئەو کۆمـەڵـە بچـوکـە پێـویستی زیاد دەکات و گۆڕانی چەنـدایـەتی‌و چۆنـایـەتی پەیـدا دەبێت. لەسـەرەتـاوە کشـتـیـارەکـان و وەسـتـاکـان و بەرگە دروەکـان و پێـڵاو دروست کارەکـان.. پاشـان ژمـارەیـان زیـاددەکات، دارتاش و ئاسنگـەرو شوانیش دێنـەکـایـەوە، بە تێپەڕبوونی کات و سەردەم ئاڵوگۆڕیەکی دەرەکی سەرهەڵ دەدات و کە کەل وپەلی زیاد لە دانیشتوانی شار ڕەوانەی دەرەوە بکرێت و شت ومەکی پێویست بە هاوشـاریـای‌یـەکـان بهێنـرێت، بۆ ئەو کارەش دەستـەیێك لە فرۆشیارو خاوەن کوگە دروست دەبن.. بەو شێوەیە شار پێویستی

بە بازرگـان و دەریـاوان و کرێکـارو راژەکـارەکان دەبێت. . سەر هەڵـدانی دەوڵـەت لەسـەر ئەو رێبـازە پێـداویستی یـەکانی خۆی جێ بـەجێ دەکـات بێ ئـەوەی ژمـارەی دانیشتـوانی شار لە سامـانـەکـەی بەرێـژەییکی بەرچـاو زۆرتربێت. ئیدی کاروباری شارستـانی دێتـەئـارا وەك هونـەرمـەنـدو سەمـاکـارو شاعیـرو پزیشکـەکـان، ئەمـەش بەرفـراوانی شاری دەوێت کەوا دەکـات بکـەوێتـە باری جەنـگ و پێکـادان لەگـەڵ دراوسێ کانی دا. بەم بۆیە دەوڵەت پێویستی بە سوپاو لەشکرێکی هەمیشەیی هەیەو دەستەیەکیش لە فەرمانرەوایان.(٢١)

ئا بەم رەنگە ئەفلاتونی بلیمەت دروست بوونی دەوڵەتمان بۆ دەگـەرێنێتـەوە سەر کۆمـەك کردنی کەسان لە پێناوی بەدیهێنانی پێـویستی یـەکـانی ژیـان و ئاسودەیی و خێرو خۆشی و عەدالەت. وەك لە شوێنێکی دی کۆمـاردا دەفـەرمـوێت «هـەمـوو مرۆڤێـك پێـویستی بە یارمـەتی ئەوی دی هەیـە بۆ تێـرکردنی پێویستیەکانی خۆی. . چونکە هەر یەکێك لە ئێمە پێداویستی زۆری هەیە. . پێکهاتنی دەوڵەتیش لەبەر رێك نەبوونی تاکە بە تەنیایی لەگەڵ دەوروبـەری دا، ئەمـە وا دەکات یەکگرتنێك پێك بهێنن دەوڵەت یان شار دروست بکەن».(٢٢)

ئەفلاتون دوای ئەوەی مەبدەئی دابەش بوونی کار لەنێو شارە نموونەیی یەکەی دا دەچەسپێنێ، کۆمەڵ دابەش دەکاتە سەر سێ چین، هەر چینێکیش لەمـانـە کاروبـارێـك و بەرپـرسیـارێکی جیـاوازی هەیـە لەوی دی. رێگـای جیـاکـردنـەوەی ئەو سێ چینـانـەش سایکـۆلـۆژیـانـە بۆی دەچێت، کاتی رێـرەوشتی

(سلوك) مـرۆڤ لە سێ سەرچـاوەوە هەڵ دەقوڵێنێ. . ویستن و سۆزو زانیاری (الرغبة والعاطفة والمعرفة). ئەم سێ سەرچاوانە پێش وەخت رێـرەوشتی مرۆڤ و جێگیـریـەتی چینـایـەتیشی پێوە دەنـوسێنێ. ویستن و ئارەزو و هان دان یەکن و جێگـاکـەشیـان رەشـە، کە کۆگـایێکی بەهێـزە بۆ لایـەنی ئارەزووە جنسیـەکان. ئەگەرچی ئەم (سیفەتانە) لە تەواوی ئادەمیزاددا هەن. بەڵام هی هێنـدێکیـان لە هێنـدێکی دی زۆرترو بەهێزترە. . ئەمە وا دەکات مرۆڤـی رەوشـت ویـسـتـن و ئارەزوو حەز لە پارەو دارایـی و خۆش گوزەرانی بکات، کە چینی بەرهەم هێنان پێك دەهێنن و ئەرکیـان کشتیـاری و پیشـەسـازی و بازرگـانێتی یـە. سۆزو گیان و ئامانج و ئازایش لە قاڵبێك دا یەك دەدرێن و خاوەنەکەی حەز بە ئازایێتی و شـەڕوشـۆڕو زۆرانبـازی دەکـات، شانـازی یـان بە سەرکـەوتنی سەربـازی پتـرە لە دەست کەوتنی پارەوپـوول. . ئەمـانـەش سوپـا پێـك دەهێنن و فەرمـانیـان پاراستنی شارە لە دەس درێژی دوژمن و هێرش بردنە سەر شوێنی دی یە.

زانیاری (المعرفة) و بیرو هۆش و زیرەکی و ژیری خاوەنەکەی بەرەو بیرکردنەوەو تێ روانین و هێمنی و هزر تیژی دەبەن. ئەمەش وا دەکـات ببنـە حوکمـران و سەرەکی وڵات و شار، بەم شێـوەیە پاشـایـەتـان خاوەن هۆش و زانیاری و بیرن. . . بە واتا یەکی دی دەبێت پاشاکان هەر یەکێکیان فەیلەسوفێك بێت بۆ خۆی ئەوسا خێرو عەدالەت و خۆشی بەرپا دەبێت.(٢٣)

بۆ بنیات نانی شارێکی بێ هاوتای وەك (کۆمار) پێویستیمان بە خوێندنێکی توندو بەند هەیە.

بۆ ئەوەی لە منداڵان پیاوی پاشەڕۆژ و ئایندە دروست بکەین و رێـرەوشت ئارەزوو سۆزو زانیـاری لە کەسـان دا دەربکەوێت. . رژێمی پەروەردەکردنی ئەو شارە بەفێرکردنی منداڵان دەست پێ دەکـەین. لە سەرەتـای دە ساڵی منـداڵی دا پێـویستـە جۆرە خوێنـدن و پەروەردەیێکی وەهـا بهێنـرێتـە کایـەوە لەگـەڵ جەستـەیـان دا بگـونجێت، خوێنـدنەکەش هەموو منداڵانی شار بگرێتەوە بێ جیاکردنەوەی گەدایێ لە پاشایێ. . سەرەتا لە هەر فێرگەیێك گۆرەپانێکی وازی دروست دەکرێت و وانەی وەرزش و جمبازو مۆسیقایان پێ دەگوترێت. ئەم جۆرە فێرکردنە ماوەی دە ساڵی رەبەق دەخایەنێ ئەوسا بەرەو رووی تاقی کردنەوە دەبن، ئەو کەسـانـەی لە تاقی کـردنـەوەکـەدا دەکـەون و دەرنـاچن روو بەرووی ژیـان دەبنـەوەو کارو باری ئابووری یان دەکەوێتە ئەستو وەك پیاوی کارو پیشەزو کشتیار، بەو واتایە دەبنە چینی بەرهەم هێن چونکە رێرەوشتیان ویستن و ئارەزورە.(٢٤)

بەم پێیـە رژێمی شار ئەرستـوکـراتی دەبێت، بەڵام وەك ـ ول دیـورانت ـ خاوەنی کتێبی (قصة الفلسفة) دەبێـژێت: ئەم رژێمـە وەك ئەرستـوکـراتیەکانی دی نی یە، چونکە ئەوان تەختی فەرمانرەوایی بە پاشماوە (الوراثة) بۆ دەمێنێتەوە، واتە لە باوك بۆ کوڕ کەچی لە هی ئەفـلاتـون دا توانستی کەس و ژیـری یـەکەی دابینی تەختە. بۆیە ناوی لێ دەنێت ئەرستوکراتی دیموکراتی. .

چونکـه کاتێ کوڕی حوکمـڕان لە تاقی کردنـەوەکـان دەرناچێت بەڵکـو کوڕی جوتیـارێـك دەردەچێ، ئەوا کوڕی جوتیـار دەبێتـە پاشاو کوڕی پاشاش دەبێتە جوتیار.

ئا بەم شێـوەیـە یەکسـانـیو سەربـەستی لەپێش هەمـوو هاوشـاریـیەکـان دایـە بۆ خوێنـدن و تاقیکردنەوەدان و دەرفەتی چوونە سەر تەخت بە پێچەوانەی ئەرستۆکراتیەتی واقیعی.

ئەرستۆ (٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ.ز)

ـــــــ ـ مامۆستای یەکەم ـ

لە ستاجیرای (stagira) سەر بە، وڵاتی مەکدۆنیا ساڵی ٣٨٤ پ.ز مامـۆستـای یەکەمی مرۆڤایەتی ئەرستۆتالیسی فەیلەسوف و زاناو حەکیم لەدایك بوو. باوکی پزیشك و ئاشنای مینتاس پاشاو فلیپ پاشای باوك و بەپیرنی ئەسکەندەری گەورە بوو. سەرەتای خوێنـدنی لە ژێـردەستی باوکیدا لە بواری پزیشکیدا دەستی پێکـرد. لە تەمـەنی ١٧ ـ ١٨ ساڵیدا لە نێـو ئەکـادیمیـای ئەفـلاتـون خۆی گرتـەوە. نزیکـەی بیست ساڵ لە بەردەستی مامۆستای بەهرەمەندی مێشکی بە فەلسەفەو تێڕوانینەکەی زاخاو دەدا.

پاشان ئەسینای بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە ئەسکەندەری مێـرد منـداڵ بۆ فێـرکـردن و پەروەردەکـردنی، بەمـە گەورەتـرین فەیلەسـوف کە دنیـای بە فەلسـەفـەکـەی ڕۆشن کردەوە، بوو بە مامۆستـای گەورەتـرین سەرکـردەی سوپـا کە جیهانی خستەژێر ڕکێفی خۆیەوە.

لە ساڵـی ٣٣٤ پ.ز دیـسـان ئەسینـا گەڕانـەوەیێکی دی ئەرستـۆی بەخـۆوە بینـی، ئەوسـا لە تەمـەنی ٥٣ ساڵیدا خوێنـدنگـەی (لقیـون) Lyceun ی پێـك هێنـا. وە نەبێت خوێندنگەکەی وێنەیێك بێت لە ئەکادێمیای ئەفلاتون.. چونکە لەو کاتـەی ئەفـلاتـون لەسەروی هەموو شتێکەوە بایەخی دەدایە بیرکاریو فەلسەفەی ڕامیاریو تێڕوانین.. تا ئەو ڕادەی لەسەر ئەکـادێمیـاکـەی نوسیبـوو (ڕێگـای بیرکاری نەزانێك نەدەی بێتە ئێـرە)... بەڵام خوێنـدنگەی ئەرستۆ زیاتر بەرەو زیندەوەرزانیو زانسـتە سروشتییـەکان دەچوو. تا دەڵێن ئەسکەندەری گەورە فەرمـانی بە ڕاوکـەران دەدا هەرچی پێـویستی ئەرستـۆ هەیـە بۆیجێبەجێ بکەن لە هێنانی هەموو جۆرە گیاندارێك.

لە ساڵی ٣٤٤ پ.ز یەکێك لە شاگردەکانی بە ناوی ـ الدسر هیرمیاس) فەرمانڕەوای شاری ـ ئەتارنیس ـ پاداشی مامۆستاکەی دەداتـەوە بەوەی کچی خوشـکی خۆی دەداتێ. ئەرستـۆ لەم ژن هێنانەیدا زۆر سەرکەوتوو شاد دەبێ، سەرەرای ئەمەش ئەم ژن هێنـان و سەرکـەوتنی گۆڕانێکی گەورەی بەسـەردا دێنێت لە بارەی فەلـسـەفـەکەیەوە، ئەمە وای لێدەکات خێزان بە بنەمای کۆمەڵ و دەوڵەت بزانێت.[٢٥]

ژمارەی دانراوەکانی ئەرستۆ خۆی زیاتر لە سەدان دەدات.. هەنـدێـك لە مێـژوونـووسـان بە چوار سەد کتێبی دادەنێ، هەنـدێـکیشیـان بە هەزار.. کەچی ئەوەی ماوە بەشێکی زۆر کەمە.. لەگەڵ ئەوەش دا کتێبخانەیەکە بۆخۆی.

(ڕامیاری)و (دەستورەکان) بە گرنگترین کتێبی ڕامیاری دەژمێردرێن.

ئەرستۆی باوکی ڕامیاری لە شیکردنەوەو راڤەکردنی دەوڵەت گەلێ جیـاوازی لەگـەڵ مامـۆستـاکەیدا هەیە، بەڵکو لە هەندێ شوێنی دژیشی دەوەستێت. لەو کاتـەی ئەفـلاتـون سەرەتـایی دەوڵەت دەگەڕێنێتەوە بۆ پێویستی، کە تاکە کەسێك ناتوانێت بە تەنیـا پێـداویستـیـەکـانی خۆی دەستـەبـەر بکـات، بەم پێیـە کۆبوونەوەی کۆمەڵە کەسانێك بەو مەبەستە دەوڵەت پێك دێنن کە تاکـەکـەس بارێکی سەربـەخـۆیی تێـدا نییـە. بەڵام ئەرستـۆ دەوڵەت بە بەرزترین جۆری کۆمەڵ بوون دادەنێت بۆ جوانترین ئامـانـج.. خێـزانیش لەپێش دەوڵـەتەوەیە. کۆمەڵ بوونی چەند خێزانێك گوندێك پێك دێن لە چەند گوندیش دەوڵەت پێك دێنن بەو مەرجەی گردبوونەوەیان بەو فراوانییەوە بێت کە دەربەستی تێرکردنی خۆیان بن. ئەگەر دەوڵەت بەپێی پلەی کات لەدوای خێزانەوە بێت ئەو لە هزردا لەپێشیەوەیەتی بەڵکو لەپێش بوونی تاکە کەسیشە بە حوکمی سروشتی کاروبار.

چونکـە لە هزردا گشت (هـەمـوو) پێش بەش دەکـەوێت، بنـەمـای ئەم بیـرەش یەکێتی ئەنـدامێتییـە (الوحدة العضوية). دەستی مرۆڤ بە دەست دانانرێت گەر جە تە توانای نەما، واتە دەست بە ئامـانجـەکـەیـەوە دەناسرێ کە گرتنە.. ئەویش بەبێ تەواوی ئەنـدامـەکـانیدی ناتـوانێت ئەم ئەنجـامە بەدیبهێنێت. هەروەها تاکە کەسیش ناتوانێت ئامانجی بوونی خۆی بە ئاکام بگەیەنێ بێئەندامێتی لە دەوڵەت دا.

لای ئەو ئەوانەی بەشداری بناغەی دەوڵەتن خێرومەندەکانن نە خەڵکی. . مرۆڤیش بێ یاسا درەندەترین جۆری گیاندارە. . بوونی یاساش بە دەوڵەت بەندە کە ئامانجی دابین کردنی ژیانێکی خۆشە لە کۆمەڵ بوونی چەندان خێزان و دێ بۆ گەیشتن بە ژیانێکی بەختیارو سەربەخۆ.

لە بارەی خێزان و منداڵ و ژن هێنانیش دا دیسان جیاوازیێکی گەورە دەکەوێتە نێو شاگردو ماموستاکەی.

بەو شێوەیە فەیلەسوفەکەمان دەوڵەت شی‌دەکاتەوە. سەبارەت بە سەرداریتی یاساو عەدالەت و فێرکردنیش چەند راییکی جیاوازی هەیە.

دەسەڵات لای ئەفلاتون رەهایە بە دەست فەیلەسوفی فەرمانرەوا چونکە بە هەموو کون و کەلەبەرێکی شارەکەی دەزانێت بە هۆی ئەو مێشکە فەلسەفی‌یەی کە هەیەتی بێ ئەوەی حوکمەکە بە دەستورو یاسا بەندبکرێت. . بە پێچەوانەو لای ئەرستۆ کە دەسەڵات لە کۆمەڵێکەوە هەڵ دەقوڵێ و دەبێت یاسا دەسەڵاتداربێت نەوەك پاشا، هەرچەندیش فەرمانرەواکە هۆش و تێ‌گەیشتنی و لێ‌هاتوویێکی بێ‌ئەندازەی هەبێت هەر ناتوانێت واز نە یاسا بهێنێت، چونکە چەندان رێسای بابەتیانەی تێدایە. هەروەها یاسا ژیری‌یێکی دوور لە ئارەزووە.

فێرکردن لای ئەرستۆ رۆڵێکی تایبەتی بە خۆ دەبینێت ئەویش خەڵك کردنە بە هاووڵاتی چاك و خاوەن رەوشت، ئەم فێرکردنەیش دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت.

پێرەوی پەروەردەکردنیش تا رادەیێك لە هی ئەفلاتون دەچێت. . لە حەوت ساڵی یەکەم دا بایەخ دەدرێتە سەر جەستەی منداڵ لە بارەی تەندروستی‌و وەرزش دا. . لە ساڵی حەوتەم تا تەمەنی خوێناسین فێرکردن و مەشق کردن لەسەر کارکردن. . لەدوا قۆناغیش دا کە تا ساڵی ٢١ دەخایەنێ. . ئامانجی فێرکردن رازەی کۆمەڵ و گۆرانی هاووڵاتی‌یەکان بۆ کەسایك توانای فەرمانرەوایی‌یان هەبێت. . بە هۆی فێربوونی فەلسەفەو مەشق کردن لەسەر بەکارهێنانی توانستی عەقڵ و فەلسەفەی تێروانین.

ئەرستۆ یەکەم فەیلەسوف بووە کە دەسەڵاتی دەوڵەتی دابەش کردۆتە سەر سێ جۆر، وەك دەسەڵاتی یاسادانان ـ التشريعي ـ و راپەراندن ـ التنفيذي ـ و دادگایی القضائي . . لە هەر دەوڵەتێك شێوەکەی هەرچۆنێك بێت سێ فەرمانی سەرەکی هەیە: یەکەمیان پێرەو رێسادانان بۆ خەڵکی لەسەر رۆیشتن واتە یاسا دانان، دووهەمیان توانای راپەراندنی کارو جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو یاسایانەو سێ‌هەمیان دادپرسین و سزادانان. ئەم مەبدەئەی ئەرستۆ چەسپاندی پێی دەگوترێت ـ مەبدە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ـ (مبدأ الفصل بين السلطان) کە مۆنتسکیۆ لە سەدەی هەژدەهەم وەری‌گرت و گشت گری پێ‌کرد.

ئەرستۆ لە هەوڵێکی‌دی‌دا کە بەشێکی زۆری لە دانراوی (رامیاری) بۆ تەرخان کردووە، هەڵ دەستێ بە دروست کردنی کۆمارێك لە شێوەی کۆماری ئەفلاتون، بەڵام ئەوەی هی ئەرستۆ لە هی دووەم جیادەکاتەوە واقیعەتە. . ئەرستۆ زیاتر پێ‌لەسەر زەمینی واقیعەت دادەنێ کەچی ئەفلاتون جڵەو بۆ خەیاڵە بیرکردی‌یە فەلسەفی‌یەکەی بەردەدات.

ئەو دەوڵەتەی ئەرستۆ بینای دەکات پێك هاتوویێکی لێك دراوە لە دوو جۆرە رژێم، واتە ناوەندێکە لەنێوان رژێمی دیموکراتی‌و ئۆلیگارشی لەپێناوی بەدەست هێنانی جۆرە رژێمێکی سەرکەوتوانەو بێ وێنە، ئەم جۆرە رژێمەشی بە دەستوری جاروباریش بە کۆماری ناو دەبات.

بۆ ئەنجام دانی ئەو رژێمە دەستوری‌یە هەڵ دەستێ بە تەتەڵەکردنی خاسیەت و توخمە دژیەکەکانی هەردوو جۆرو دۆزینەوەی ناوەندێکی لەبار بۆ دەوڵەتێکی نموونەیی. . ئەرستۆ لەم دەوڵەتە نموونەیی‌دا پشت بە چینی ناوەراست دەبەستێت و دەی‌کاتە بنەمای رژێمەکەی.(٢٦)

## فارابی (٨٧٠ ـ ٩٥٠ز)

### ماموستای دووهەم

پێش ئەوەی لەدیسانەی (بیردۆزە) دەوڵەت لای فارابی بکۆڵینەوە، بە باشی دەزانین سەرنجێکی ورد دەربارەی رۆشنبیرانی بەرەی نوێ لە بارەی فەلسەفەی خۆرهەڵاتی بدەین، هەر رۆشنبیرێکی گەنجی ئێستا بگری ئەوا دەیان ناوی وەك کانت و دیکارت و هیگل و مارکس و داروین و فرۆیدت بۆ هەڵ دەرێژێ‌و چەندان قسەیشی‌و وەك توتی بۆ دووبارە دەکاتەوە هەوڵی رەخنەگرتنی بارودۆخی خویشی لەبەر رۆشنایی ئەوان

دەدات. کەچی کاتێ پرسیاری بلیمەت و فەیلەسوفانی خۆرهەڵاتی لێ‌دەکەیت یاخود فەیلەسوفەکانی ئیسلام وەك فارابی‌و ئیبن خەلدون و ئیبن سیناو ئیبن روشدو رازی ـ دەبینیت پەکیان دەکەوێت لە وەڵام دانەوەو قسەلەسەرکردن. ئەوسا بۆ راکردن لەم پرسیارە رەنگبێ چەند تان و تون لەو بلیمەتانە بدەن و بە بیرتیژیان لە قەڵەم نەدەن هەر لەبەر ئەوەی لە خاکی خۆرهەڵاتەوە هاتونەتە جیهان.

ئەبونەسر محمد فارابی لە گوندی (سیج) سەر بە هەرێمی تورکستان لەدایك بووە. لە بەغدادو حەران و حەڵەب خوێندوێتی‌و لە (دیمەشق)یش کۆچی دوایی کردوە. ئەوەی جێی‌داخە زۆر لە بارەی ژیانی‌یەوە نەزانراوە. لەبەر بلیمەتی‌و لێ‌هاتوویی نازناوی مامۆستای دوهەمیان پێ‌بەخشیوە. ئەرستۆ مامۆستای یەکەم بووەو ئەویش دووەمە لەبەر فراوانی بیرتیژی‌و تێ‌گەیشتن و زانست و زۆری دانراوەکانی.

بە دەیان کتێبی هەمە جۆری هەیە لە بواری ژیربێژی‌و فەلسەفەو مۆسیقاو ئیلاهیاتەوە. گرنگرینی دانراوەکانی رامیاری (آراء اهل المدینة الفاضلة)و (السیاسة المدنیة)و (تحصیل السعادة)ن.[٢٧]

سەرەتا دەبێ ئەوە نیشان بدەین کە فارابی ـ مامۆستای دووهەم ـ بە فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆوە کارانگاز بووە. بۆیە زۆر بۆچوونی لە هی ئەوان دەچێت ئەگەرچی لەهەندێ شوێنیشدا لەگەڵیان رێك نەکەوێت. وەك دکتۆر (حسن صعب) دەڵێت: فارابی رۆڵەی دوو کلتوری ئیسلام و مەسیحی‌یە هەروا کوری فەلسەفەی یونانی‌و هیلینی‌یە بۆیە روانینەکانی ئایینی‌و رامیارین.[٢٨]

لەپێشەوە باسمان کرد کە ئەرستۆ کۆمەڵ بوونی خەڵکی بە پێویست دەزانێت بۆیە گوتویەتی مرۆڤ هەر بە خورسك شاری‌یە. فارابیش هەر بەم شێوەیە دەروانێ، بەڵام لە راڤەکردنی ئەو پێویستێتی‌یە رای تایبەتی خۆی هەیە لە مامۆستاکەی جیابکاتەوە.

ئەو وا دەروانێت (شار) بۆ مرۆڤ لە خۆرسکەوە نی‌یە بەڵکو لە ئەنجامی پێداویستی‌یە مادیەکانێتی. پێویستی‌یە زۆرەکانی مرۆڤ وای‌لێ‌دەکەن بەرەو کۆمەڵ پچێت و بی‌کاتە ناوەندێکی لەبار بۆی. بۆ سەلماندنی ئەمەش هەر پشت بە خودی کۆمەڵ کردن و هاوکاری کەسانەوە دەبەستێت، هەریەکێك لە ئێمە ئەوە خۆرسکێتی بگاتە رادەی کەماڵی لە بارەی تێرکردنی مادی‌دا. بۆ ئەم تێرکردنەش هەوڵی تاکرەوی هیچ ئەنجامێکی باش بە دەستەوە نادات بۆیە ناچاریی بەرەو یارمەتی‌دان لەگەڵ کەسانی دەوروبەری‌دا دەبات و کۆمەڵ بوونێك دروست دەکەن و نشینگەیان دیاردەکەوێت کە بنەمای کۆمەڵ و دەوڵەتە.[٢٩]

لێرەدا کە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵی شی کردەو سەر یەك گرتنی ئەندامەکانی، هەر بەم شێوەش شارو دەوڵەت دروست دەکەن بە هەندێ زیادکردنی فەرمان و رووبەری شارو ئامانجی‌گشتی. ئەوسا سێ پلەی یەك بەدوای‌یەکی هەرەمی دادەنێت بۆ کەماڵی‌و بەختیاری دەوڵەت، بە پێی بەدی‌هێنانی ئامانجی کۆمەڵ بوونی ئادەمیزاد لە بەختیاری‌و سەرفرازی‌دا. بەم رەنگە مرۆڤایەتی دابەش دەکاتە سەر سێ شار. سێ دەوڵەت، سێ کۆمەڵ. یەکەمیان شاری هەرەتەواو (المدینة الاکمل)ی گشت گر بە مەرجێ تەواوی مرۆڤایەتی بگرێتەخۆ بێ رەچاوکردنی سنووری نیشتمان و زمان و نەتەوە کە بەرەو تەسك و تروسکی ژیان و پێکدادانمان دەبات. فارابی بەم روانینە گشت گری‌یە هەمەلایی‌یە لە مامۆستاکانی دوور دەکەوێتەوە چونکە شاری بێ‌هاوتای ئەفلاتون لە خاکی یونان تێ‌پەری نەدەکردو ئەرستۆش روانینی شاگردەکەی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) رەچاو نەدەکرد کە دەوڵەتێکی وا گەورەو فراوان لە دەرەوەی خاکی یونان دروست بکات. ئەم رایەی فارابی کارتێ‌کردنی فەلسەفەی رەواقی پێوەیە.

دووهەمیان شاری ناوەندی (شاری تەواو) ـ مدینة الکمال کە هەموو نەتەوە دەگرێتەخۆی ـ [بێ‌گومان مەبەستی فارابی لە وشەی ـ نەتەوە ـ الامة ـ ئەو واتایە ناگەیەنێت کە هاوچەرخانە تێی دەگەین بەڵکو واتای قورئانی دەگەیەنێت کە بریتی‌یە لە نەتەوەی ئیسلام ـ چونکە ئیسلام نەتەوە (امة) بە دینەکەی دەناسێنێ نەوەك بە زمان و نیشتمان، هەرواش مەبەستی فارابی نەتەوەی ئیسلامە یاخود نەتەوەی مەسیحی ـ ش]. سێ‌هەمیان شاری ناتەواو [المدینة الناقصة] ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکێکی کەم بگرێتەخۆ وەك هەرێمێك، یان میرنیشی‌نیەك. بێ‌گومان فارابی لە شارە هەرە تەواوەکەو ناوەندی‌یەکەی‌دا جیاوازی خەڵکی پیشت گوێ نەخستوە، بەڵام ئەوە هەیە هەرچەندە

خەلّکیش لە ڕۆشنبیریی و زمان و بەرژەوەندی جیاواز بن ئەوا وەك خۆی دەلّێت «یەك سروشتی مرۆڤایەتی یان هەیە». [٣٠]

فەیلەسوفەکەمان شارە بەختیارەکەی ـ المدينة الفاضلة ـ بە جەستە شێواندووە ـ کە هەموو ئەندامەکانی کۆمەکی یەکدی ئەکەن و یارمەتی یەك دەدەن بۆ درێژەپێدانی ژیانی گیانلەبەر. . بە هۆی ئەوەی ئەندامەکانی جەستە هەموویان وەك ء یەك نین، ەڵکو لە شێوەو فەرمان دا لێك جیاوازن، (دڵ)یش لە نێوانیان دا سەرۆکە. . ئەندامەکانیش بە پێی هەڵ کەوتنی و فەرمانیان دوورو ـریـك دەبنەوە لە سەرەکیان کە دڵە. . هەر بەم جۆرەش شار ئەبێت ئەندامەکانی تەبا بن و سەرۆکێکیان هەبێت. [٣١]

سەبارەت بەوەی کێ سەرەکایەتی شاربکات و یاساکانی دبرێژێت و بریارو فەرمانی شەرعی خۆی بەرەو ڕووی خەڵك ىکاتەوە، ئەوا مامۆستای دووهەم ئەو پایەبەرزی یە تەنیا لە ێغەمبەر ـ النبي ـ دەوەشێنێتەوە لە کاتێك دا مامۆستاکانی ئەو ـ میێ ئەفلاتون ئەو پایە دەداتە دەست فەیلەسوف. ئەمە ئەوە ـگەیەنێت کە فارابی نکولی لە فەلسەفە دەکات، بەلّام ئەوەندە هەیە پێغەمبەر [بە چەمکی فارابی] بە باشتر دەزانێ لە ەیەسوف، ئەوەی ئاشکراشە پێغە‌بەری فارابی لە فەیلەسوفی گمێ ژیرترو تێگەیشتووترە هەروەها کردەیی یشە واتە وقیعی ترە. دەنا مامۆستای دووهەم لە زۆر شوێن دا جەخت دەکاتە سەر ئەوە کە فەلسەفەو لقەکانی مایەی بەختیاری هەو شاری یەکانە. چونکە بەختیاری ڕاددەی بە حەقیقەت گەیشتنە، فەلسەفەش حەقیقەت دەناسێنێ، جا کەوا بێ ەلسەفە هۆیێکی گەیشتنە بە حەقیقەتی ئەو بەختیاریی یە کە ەرابی لە شارە بێ هاوتاکەی دا کردوویەتی یە ئاوات. سەرەڕای ئەمەش ئەو بە حەقیقەت گەیشتنەی شار لەسەر ڕوی زەوی بە ئەوپەڕی ئامانج نازانێت. . بەلّکو ئەوەی هەیە ڕێگایەکە بۆ ەمەری لە ژیانەکەی دی دا. . یاخود هۆیەکە بۆ گەیشتن بە ەەشتی بەرین کە خوای پەروەدیگار مژدەی داوتە بڕواداران و چاکەخوازان. [٣٢]

دیسانەوە بێینەوە سەر پێغەمبەری سەرۆك، پێغەمبەر لای ەرابی تەنیا هێمایێك و وشەیێکی ڕووت نی یە، بەلّکو مرۆڤێکە گەیشتبێتە ئەو پەڕی عەقڵ و زانست و فەلسەفەو کەماڵ، بەوە لە ەیلەسوف جیادە. دەکرێتەوە کە پێغەمبەر خاوەن پەیامێکە. . پەیامەکەشی لە کۆمەڵەوە هەڵ دەقوڵێ. بەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەرایەتی لای فارابی بۆ سەرەکایەتی کردنی شارەکەی کارێکی سروشت شکێن نی یە، هەروەها دۆخێکی ڕاکێشانی سۆفیگەریی نی یە لەگەڵ هێزە نادیارەکان، بەلّکو مرۆڤێکی ئاسایی یە بەلّام چەندان سیفەتی تێدا گرد بوونەتەوە لە دادوەری و زانست و حیکمەت و نەفس بەرزی و ورەبەرزی و یاسادانەری و توانستی لەسەر دەرهێنانی حوکمی یاسایی و فتوادان و پاکی و لەش ساغی و ڕەوشت بەرزی. . . هتد، کە ئەمە هەمووی وای لێ دەکات بە زمانی پێغەمبەرایەتی نەك فەلسەفی خەلّکی بدوێنێ و یاساو دەستوریان بۆ دابرێژێت بۆ گەیشتنی شار بە پلەی کەماڵ و بەختیاری. [٣٣]

گەر بە وردی بەراوردێك بکەین لەنێوان دیمانەی (بیردۆزەی) فارابی و دیمانەی فەیلەسوفەکانی پەیمانی کۆمەلّایەتی کە بە حەوت سەدە لەدوای ئەوەوە هاتون ئەوا یەکدیگری یێك ڕەچاوەکەین، یا دەتوانین بلّێین چاوگی ئەو پەیمانە کۆمەلّایەتی یە بۆ فارابی و لەپێشتری دەگەڕێتەوە لەگەڵ هەندێ جیاوازی لە درێژە پێدان دا.

لەلای ئەوان و فارابیش پێویستی و و ناچاریی خەلّکی خڕدەکاتەوە هەر ئەم پیویستی یەش شاریان پێ دروست دەکات. بەلّام ئەوەندە هەیە لە هی فەیلەسوفە دوایی یەکان بە ئاشکراو ڕاستەوخۆ پەیمانێك لە نیۆ خویان دا دەبەستن و لە بەشێك لە سەربەستیان بۆ دەستەیێکی نوێ دەبێتە فەرمانڕەوایان واز لێ دێنن. هەروەها جیاوازی یێکی دی لە نێوانیان دا ئەوەیە کە ئەو سیفەتانەی فارابی بۆ سەرەکی دادەنێت جیاوازی یێکی بنەڕەتی هەیە لەگەڵ سیفەتە دارایی و هێزی یەکانی پاشاو فەرمانڕەواکانی پەیمانی کۆمەلّایەتی.

لەدوایی دا دەلّێین ئەو لەیەك چوانەی نێوان ئەو فەیلەسوفـ و باوەڕگەیانە ئەگەر شتێك بگەیەنێت ئەو بیرتیژی و زیرەکی و هزرفراوانی فەیلەسوفەکەمان دەگەیەنێت. [٣٤]

## ئیبن خەلدون

## (١٣٣٢ - ١٤٠٦ ز)

ولي الدين عبدالرحمن بن خلدون لە تونس لە سالّی ١٣٣٢ز لەدایك بووەو هەر لەوێ خوێندوویەتی تا تەواوی

زانستەکانی سەردەمی خۆی فێربووە لە ژیربێژیو فەلسەفەو یاسا (فقه)و مێژوو. . .

ژیانی خۆی بە خوێندن و بە راژەکردنی دەوڵەت (سەردەمێك وەزیری نووسین ئەنجا باڵوێز)و گەران بە شارو میرنشینەکان دا ئیبن خەلدون مێژوونووس و فەیلەسوف و زاناو فەرمانبەرو رامیاریزان بوو لە ماوەی ژیانیدا. بە دانەری فەلسەفەی مێژوو یا، فەلسەفەی کۆمەڵ دەناسیٚ. .

لە گرنگترین کتێبەکانی پێشەکییەکەیەتی (المقدمة) کە بۆ کتێبی مێژووی بەناوی ـ کتاب العبر ـ نووسراوە.[٣٥]

دەوڵەت لای ئیبن خەلدون مەدایێکی جیاواز وەردەگرێت وەك لەچاو فەیلەسوفەکانیدی. ئەو نەهاتووە جیهانێکی خەیاڵاوی بۆ خۆی دروست بکات وەك ئەفلاتون و ئەرستوو فارابی کردوویانە. . بەڵکو هاتووە دیرۆکی (مێژووی) کردۆتە مەحەك و لەبەر رۆشنایییەوە کەوتۆتە شیتەڵ کردنی هۆکارەکانی کۆمەلایەتیو شوێنەواریو ئابووری. . بۆیە پێی دەگوترێت خاوەنی فەلسەفەی دیرۆك.

ئیبن خەلدون دەڵێت: پێویستە خەڵکی کۆببنەوەو تەبابن ئەم کۆمەڵ بوونەش زانایان بە شارستانێتی ئادەمیزادیان لە قەڵەم داوە، واتە مرۆڤ بە خۆرسك حەز لە نیشتەنی کۆمەڵیو شار دەکات، ئەم گردبوونەوەی شاریش ئاوەدانی (العمران) دەگەیەنێت. چونکە خودای گەورە مرۆڤی لە شێوەیێك ئافەریدەکردووە (دروست کردووە) پێویستی بە خواردن و خواردنەوە هەبێت ـ تواناشی داوەتیٚ بۆ پەیداکردنی توێشوی خۆی. بەڵام توانای تاکەکەسێك پەك کەوتەیە بۆ پەیداکردنی نان و پێخۆر، چونکە توێشووی ژەمێکی گەنم پێویستی بە چاندن و دروونەوەو لەئاش کردن و بەنان کردنە، ئەوسا ئاگرو ئامرازیٚ پێخواردنی لەقاپ و کەوچك و شتیدی گەرەکە، ئەمانەش پێویستیان بە کشتیارو ئاشەوان و ئاسنگەرو بەدەیان جۆرە پیشەیدی هەیە، کە لە توانای تاکەکەسێك دا نییە بۆ دەبێت بەشداریو کۆمەکی یەکدیبکەن. ئەمە لە بارەی خواردن و خۆژیاندن. هەرواش لە بارەی بەرگریکردن لە خۆوە. چونکە لە مرۆڤ دا ئەندامێکی دەربەستی خۆپاراستنی نییە وەك لە گیاندارانیدیدا هەیە، بۆ نموونە قۆچ و قەپ و چرنووك و لووشك و دەندووك کە ئەمانە هەموویان لە کاتی پێکدادان دا کاری تایبەتی بەرگریان هەیەو لە مرۆڤ دا بەدیناکرێت: بۆیە بەناچاری دەبێت پەنا بەرنە بەریەك و مێشکیان بخەنەکار بۆ دۆزینەوەی چارەیێك. خوداش فەرمانی ئاوەدان کردنەوەی زەویو جێنشینی خۆی پێسپاردوون، ئەمەشیان بەبێ هاریکاری ناکرێت. . . کاتیٚ ئەم کۆمەڵ بوونەش هاتەدی پێویستیمان بە پەند ـ دادەرێك (الوازع) هەیە بۆ ئەوەی لە خراپەو گومرایو لادان هۆشیارمان بکاتەوەو رێگای چاکەو هاوژیانیو ئاوەدانیمان بۆ بکێشێت. چونکە دەروونی هەر یەکێك لە ئێمە غەریزەی خێرو شەری تێداهەیە، غەریزەی ئاژەڵیش گەر سەرکوت نەکریٚ دەتەقێتەوەو ژیانی پێکەوە ژیانی ئادەمیزاد بەرەو یاسای جەنگەڵ دەبات. ئەم پەنددادەرەش دەبێت هێزدارو دەسەڵاتداربێت بۆ بە ئاکام گەیاندنی فەرمانەکەی، کە پاش ئەم پایەیە وەردەگرێت. وەك پاشا لە ژیانی مرۆڤ دا هەیە، لە هەندیٚ زیندەوەری دیشدا هەیە شایانی دەرس لیٚوەرگرتنە وەك شارە مێرووڵەو شانەی هەنگ. . کە تەواوی ئەندامەکانیدی گوێڕایەڵی پاشاکەیان دەکەن و فەرمان بەجیٚ دەگەیەنن. ئەم پاشاو سەرکردە لەنێو خەڵکی خاوەن کتێب لەلایەن خواوە پەیامی بۆ دێت و دەبێتە یاسا، خەڵکیدیش پاشاکانیان پشت بەهێزو جەزرەبە دەبەستن.[٣٦]

ئیبن خەلدون زیاد لە جارێك و دوو باسی سەرەکایەتی دەوڵەت دەکات و سیفەتی توندوتیژیو مەردایەتیو جەربەزەییو دەمارگیری دەداتە پاڵ، تا وایلیٚدەکات ئەم سیفەتانە ببنە مەرجی سەرەکی سەرۆك. ئەم بە هێزیو توندی نواندنە لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوەیە، بەڵام کاتیٚ بەرەو جێگیری رۆیشت ئەوا ئەو سیفەتانە هێمنتر دەبنەوەو رەنگیٚ وازیشی لیٚبهێندریٚ ـ چونکە ترسی لەناوچوونی لیٚناکرێت.[٣٧]

بەلای ئەوەوە باشترین رێکخەری خەڵك و هێنانە جۆشیان و یەك گرتنیان و زیادکردنی هێزو دەسەڵاتیان ئاینە. ئاین وایان لیٚدەکات واز لە دەمارگیریی سەرەتاییو خێڵەکی بهێنن و بەرەو دەمارگیریی ئاینی برۆن و تەنیا بیروبروا ئامانجیان بێت و لە پێناویدا قوربانی بدەن و دەوڵەت دابمەزرێنن. نموونەشی بۆ ئەوە ئاینی ئیسلامەو هێنانەوە سەر رێی راستی رەوەندو نەزان و مرۆڤە سەرەتاییو خۆخۆرەکانی سەرەتای ئیسلامە.[٣٨]

ئەم سێ قۆناغەی دەوڵەتی پێدا دەڕوا لەلای[39] - مالك بن نبي - چاکەخوازدا دەبنە قۆناغی پێداتێپەڕبوونی شارستانیەت. لای - مالك بن نبي - شارستانێتی بە سەر سێ قۆناغ دابەش دەکات وەك لەلای ابن خلدون. بەڵام ئەگەر گۆڕینی دەوڵەت و شارستانی لەبری دانان.. قۆناغەکانیش ڕاپەڕین و توێکەو ئاوابوون و لەناوچوونە. بۆ سەلماندنی ڕایەکەشی پەنا دەباتە بەر مێژوو، لەو ڕوانگەیەشەوە ئەم دیمانە - یەی لەسەر شارستانێتی ئیسلامی پەیڕەو دەکات. کاتێ کە دابەشی دەکاتە سەر سێ قۆناغ - هەر قۆناغێك کات و ڕووداوی دیارکراوی خۆی هەیە. ئەم نەخشەیەش دەکێشێ بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی بیروڕاکانی:

**«پێوەری قیەمە دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان نیشاندەری بارو دۆخی پێشکەوتن»**




**قۆناغی یەکەم کە بە پاڵنەری گیانەوە دەستی پێ کرد، لە سەرەتای ئیسلامەوە تا کارەساتی - سەفین - صفین - قۆناغی دووەم بە پاڵنەری ژیر تا سەردەمی ئیبن خەلدون ئەوسا قۆناغی سێهەم بەرەو لێژی دەڕوات کە تا ئێستاش ڕاست نەبۆتەوە، گەر ڕاستیش بووبێتەوە لە ئاستی پێویست نی‌یە.**[40]

ئیبن خەلدون زیاتر باسی قۆناغی سێهەمی دەوڵەت دەکات کاتێ پیردەبێت و پەکی دەکەوێت، ئەم پیربوونەش بەشتێکی سروشتی دەزانێ‌و ڕاست بوونەوەی بۆ نی‌یە، واتە ڕمانی حەتمی‌یە، لەو کاتەش دا دەڕمێ کە خونکاران (السلاطنة) زیاتر بەرژەوەندی خۆیان و خێزانیان بگرنە بەرچاو، بێ گوێ‌دانە داواکاری‌یەکانی گەل، هەروا نەمانی جەربەزەیی‌و دەمارگیریی لەنێو خەڵك و کزبوونی باری‌دارایی‌و ستەم و زۆری خونکاران لەگەڵ ئەنجامەکە دەبێتە هۆی دابەش بوونی دەوڵەتەکە بە چەند لایێك، یان هێرش هێنانە سەری‌و ڕووخاندنی.[41]

سەبارەت بە نوێ‌بوونەوەی دەوڵەتەکە دوای پیربوون، ڕمانی ئەوا دوو شێواز هەیە: یەکەمیان لە کاتی زوڵم و زۆری خونکارو بارگران کردنی میرەکان (سەرکردەی ناوچەکان و لەشکرەکان) ئەوان دەست دەکەن بە هەڵگەڕانەوەو دوورکەوتنەوە لە دەوڵەتەسەرەکی‌یەکەیان و دەوڵەتێکی نوێ بە زەبری هێزو دەسەڵاتداری پێك دێنن، نموونەش بۆ ئەمە لاوازبوونی دەوڵەتی عەباسی‌و دابەش بوونی بەسەر چەند میرنشینێك دا.

دووهەمیان: بە هەڵگەڕانەوەی کەسێك (سەرکردەیێك) بە پشتگیری لەلایەن هێزێکەوە، یاخود بە پشتگیری جەربەزەیی خۆی‌و جەماوەرەوە، ئەم هەڵگەڕانەوەیە (شۆرشە) بە پشتیوانی هاوولاتیانەوە دەوڵەتی کۆن دەڕوخێنن و سکەی نوێ لێ‌دەدەن و سەرلەنوێ قۆناغەکان دەست پێ‌دەکەنەوە.[42]

## «ژان ژاك ڕۆسۆ»
## هۆبز - لۆك - ڕۆسۆ

سەرچاوەی پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ سەردەمێکی زوو دەگەڕێتەوە.. بۆ ئەفلاتون و ئەرستۆو.سوفستا ئی‌و فارابی‌و سپینۆزا دەگەڕێتەوە، بەڵام هۆبزو لۆك و ڕۆسۆ ڕاستەوخۆ بیردۆزەکەیان شی‌کردەوەو بەسەردەمی خۆیان ناساند، حوکمی پاشایەتی ڕەهاو دەستوری‌و دیموکراتیەتیان لەسەر دا چەسپاند.

تۆماس هۆبز (١٥٨٨ - ١٦٧٩ز) لە دانراوە بە ناوبانگەکەی (لیفیاتان - التنین) ڕایە ڕامیاری‌یەکانی خۆی لە بارەی سەرەتای ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ[illegible]ت کردنی دەوڵەت دەردەبڕێ. ئەو دەڵێت مرۆڤ لە بارە سروشتی‌یەکەی‌دا لەگەڵ هەموو ئەندامانی‌دی یەکسانە. هەر یەکێك دەیەوێت خۆی بپارێزێت لەسەر حیسابی کەسانی‌دی، بەو ڕەنگە باری شەڕ هەڵدەگیرسێت شەڕی هەموو دژ بە هەموو، واتە غەریزەی شەڕ بە جۆشترە لە هی خێر. بۆ ئەوەش خەڵکی لەم بارە پڕترس و بیمەڕزگاربین، کۆدەبنەوەو توانستی‌ی خۆیان بە دەسەڵاتێکی ناوەندی - مرکزي - دەبەخشن - بە هۆی ئەوەی مرۆڤ هۆشی هەیە، ئەوا ژیری‌یەکەی وای لێ‌دەکات لەنێو خۆیان دا پەیمانێك

ببەستن و لەسەر ئەوە ڕێك بکەون واز لە بەشێکی دەسەلات و مافەکانیان بهێنن بۆ دەستەیێك کە خۆیان دایان دەنێن. هەر کاتێکیش ئەو دەستەیان دانا مافی یاخی‌بوونەوەیان نی‌یە، چونکە ڕێکەوتنیان مۆر کردووەو دەشبێ بی‌گەیەنە سەرو لێی لانەدەن و هەڵی نەوەشێنن، تەنیا لە دۆخێك دا نەبێت گەر فەرمانڕەواکە نەتوانێت هێمنی و ئاسایشیان بۆ دابین بکات ر توانای پاراستنیانی نەمێنێ. ئەم جۆرە دەوڵەتەش پێ دەگوترێت دەوڵەتی لەسەر بەرژەوەندی هاوبەش دروست بوو CommonweaLth کە لەوە دەچێت پیاوە ئاسایی‌یەکان زەلامێکی زەبەلاح پێك بهێنن واتە ( ین). ئەم دەوڵەتە تواناداترو بەهێزترە لە مرۆڤ و لەخودا دە نیت دەسەلاتەکەشی بێ‌سنوورە (ڕەهایە)، ئەو سـ ـداریتی‌یەشی دەکەوێتە دەست پاشایە ڕەهاکان. بەم جۆرە ه بز ئەو دیمانەیەی بۆ ئەوە گوتوە تا شەرعیەت بە دەسەلاتی پاشا ر ماکان بدات.(٤٣)

جۆن لۆك (١٦٣٢ ـ ١٧٠٤ز)یش لە دانراوی لە نامەی ووەم لە حوکمی شاردا (من الرسالة الثانية في الحكم المدني) ەمان دیمانەی سەرەوە دەردەبڕێ لەگەڵ هەندێ جیاوازی. لەو تەی خودا مرۆڤی ئافەریدەکرد لە بارودۆخێکی وای پێویستی و ەڵك وەرگرتن لە پێکەوە ژیانی چونکە بە لاپەرگەیی ناژیت. ۆمەڵی سەرەتا لەسەر ژن ومێرد بەندبوو کاتێ کە خێزان ڵك هات ئەنجا منداڵ و پاشان کۆیلەو خاوەنەکانی. هەر لەگەڵ ۆڤەوە مافی پاراستنی خاوەنداریتی خۆی لە ژیان و ەربەستی و زەوی هەیە. بۆ ئەوەش تاوانکار بەسزای ڕەوای ۆی بگات پێویستی بە دەسەلاتێکی بە هێز هەیە کە دەوڵەتە. ژ دەوڵەت دروست بوونیش دەبێت هەر ئەندامێك لە کۆمەڵ واز . بەشێکی سەرداریتی و مافی خۆی بهێنێت بۆ دەسەلاتی تازە. ەم پێیە یاسایێك دادەنرێت بە هۆ... دەستەی ڕێ تاوانکارو لەڕێلادەران سزادەدات و خەڵکی لە هەموو رس و دوژمنکاریکی لابەلا دەپارێزێت. گەر هەر گلەیی و گازاندەو داواکاریشیان لەسەر یەکدی هەبێت ئەوا لەبەردەم یاسایێکی جێگرو دادوەری ڕادەوستن بۆ وەرگرتنەوەی مافیان. بەم ەنگە دەسەلاتێکی بەند لەسەر یاسامان بۆ دەردەچێت. لۆك ێرش دەباتەسەر ـ پاشایەتی ڕەهاو دەڵێت ئەم جۆرە پاشایەتی‌یە ـگەڵ سروشتی کۆمەڵی شاری ناگونجێت، چونکە زۆر کاری ناپەسەندی لێ‌دەوەشێتەوەو کۆمەڵی لێ‌یەوە دوورە. ئاوەها یاسا بە باشترین هۆ دادەنێت بۆ ئاسایش بلاوکردنەوەو سنووردانان بۆ خراپە بەکارهێنانی هێز. لەبریتی حوکمی پاشایەتی ڕەها حوکمی پاشایەتی بە یاساوە بەندبوو بە باش دەزانێ و بڕیاری لەسەردەا(٤٤)

ژان ژاك ڕۆسۆ (١٧١٢ ـ ١٧٧٨ز) خاوەنی کتێبی پەیمانی کۆمەلایەتی ڕوویێکی یەکجار گەشی بە دیمانەکەداو بناغە دیموکراتیەتی لیبرالی چەسپاند. ئەوەی شایانی باسە بیروڕاکانی ڕۆسۆ هاوکارە لەگەڵ بیروڕاکانی ڤۆلتێر (١٦٩٤ ـ ١٧٧٨ز)و مۆنتسکیۆ (١٦٨٩ ـ ١٧٥٥ز) هانەی گەنجەکان و چینی ناوەڕاستیان دەدا بۆ بەگژداچوو نەوەی دەسەلاتی دەرەبەگی و کەنیسسە، تا کار گەیشتە تەقینەوەو شۆرشی گەورەی فەرەنسای بەرپاکرد، کە فەرەنسای دەرەبەگایەتی سەرنخوون کردو کاریشی کردە سەر ئەوروپاو جیهان.

ژان ژاك ڕۆسۆ بناغەی کۆمەڵ بۆ خێزان دەگەڕێنێتەوە، بەڵکو زیاتریش دەروات و دەوڵەت بە خێزانێکی گەورە دەشوبهێنێ کە دەسەلاتی سەرەك دەوڵەت لەجێی سەرداریتی باوکەوەیە، تەواوی خێزانەکە هاریکاری یەکدی‌دەکەن و مل کەچی باوکن بۆ ڕێ نیشاندان و پاراستنیان، لە دەوڵەتیش ئاوا دەبێت ئەندامەکانیان ڕێك بکەون و دەسەلاتێکی لە خۆیان گەورەتر دابمەرزێنت. بە پێچەوانەی (هۆبز) یشەوە مرۆڤ بە خێرۆمەند دەدانێت و بۆ سوودو کەڵکی یەکدی پەیمان دەبەستن.(٤٥)

ڕۆسۆ دەڵێت، ئادەمیزاد لە سەرتای پەیدابوونیەوە تەنیا هێزی ڕووتی خۆی هەبووە بۆ پارێزگاری لەخۆکردن. نەشیان دەتوانی هێزێکی تواناداری نوێ دروست بکەن بێ یەکدیگرتن و تەبابوون. بۆیە هەریەکێك لە مافەکانی خۆی خۆش دەبوو بۆ کۆمەڵ (نەوەك بۆ یەکێکی‌دی) ئەوسا لەنێو خۆیان دا دەستەیەکیان هەڵ دەبژارد لە شێوەی ڕێکخراوەو دەنگی خۆیان دەدایە. . بەمە مەسەلەی دیموکراتیەت هاتەئارا. بە پوختی هەر یەکێك لە ئێمە هێزو توانای خۆی دەداتەدەست بەڕێوبەرایەتی ئیرادەی گشتی گەورەو دەستەیێك پێك دەهێنیت، کە هەر ئەندامێك بەشێکەو جیانابێتەوە لە گشت. بۆ سەرگرتنی پەیمانەکەش دەبێت مل کەچی بۆ بکرێت و بڕیارەکانی پەیرەو بکرێت، هێزو جەزرەبەش بەکاربهێنرێت بۆ ڕاپەڕاندنی یاساکانی ئەوەی مرۆڤ

...یمانەدا لە دەستی دەچێ سەربەستی سروشتیو مافە ...لای یەکانە، لە بریتی سەربەستی شاری مافی خاوەندارێتی ...تی لەبەر دەست دایە وەردەگرێت.[٤٦]

...دەستە نوێیەی پێك هات میری دەگەیەنێت، کە ...یە لە ئیرادەی گشتی، ئەم ئیرادەیەش دابەش ناکرێت ...کە لە خەڵکییەوە هاتووە. یاساش بە باشترین رێگا ...یت بۆ دیاریکردنی ماف و ئیمتیاز. یاسا سنوورێك بۆ ...ڵاتین دەکێشێت و مافی شکاندنیان نییە، ئەگینا تووشی ... . یاسا عەدالەت بەجێدێنێو باشترین دابینکارە بۆ ...کردنی هێمنیو ئاسایش.[٤٧]

...سۆ وەك مۆنتسکیۆ دان بەدابەش کردنی دەسەڵاتەکان دا ...یت. دوو دەسەڵاتی گەورە لە یەك جیادەکاتەوە، یەکەمیان ...تی گشتییە واتە دەسەڵاتی یاسادانان کە لە گەلەوە بۆ گەلە ... دووەمیان دەسەڵاتی جێبەجێکردن، کە ئەو یاساو بڕیارانەی ...ڵاتی یەکەم پەیڕەو دەکات.[٤٨]

گۆنمان ژان ژاك ڕۆسۆ سەرداریتی (السيادة) بۆ تەواوی ...ی کۆمەڵ دەگەڕێنێتەوە، هەریەکێك خاوەنی بەشێکی ئەم ...ڵاتەیە کە یەکسانە لەگەڵ یەکدی. لە کاتی میری ...یش دا هەڵ بژاردن بە باشترین ڕێگا دەزانێت، هەروەك ... خەڵکی یەکسانن لە ماف دا ئاواش دەبێت یەکسان بن لە ...یەتی هەڵبژاردن دا. کە بە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتی ...کرێت و مافێکی کۆمەڵایەتییە بەبێ دانانی هیچ کۆت و ...ندو تەگەرەیێك بۆ جیاکردنەوەی چینێك یا توێژێك لە ...دی. بەڵام دەسەڵاتی بۆرژوازی دوای شۆڕشی فەرەنسا ...چەمکەی گۆڕیو کەوتە دانانی چەندان کۆسپیو تەگەرە ...ەردەم چینەکان بو لەپێناوی بەرژەوەندییەکان خۆی.[٤٩]

## مارکس
## (١٨١٨ - ١٨٨٣ز)

سەدەی نۆزدەهەم تەقینەوەیێکی فەلسەفیو ئایدۆلۆژی تیژ ی ...ویەوە بینی، لەناو ئەو هورووژمانەش دا مارکسیزم بە گوڕ ...ری هەڵ داو جیهانی ئایدۆلۆژی دابەش کردە سەر دوو ...ەرگەی فەلسەفی گەورە ئایدیالیزم و ماتریالیزم. .

کارل مارکس لە ناوچەی (تریيف)ی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨١٨ز لەدایك بوو، دوا هەوارگەشی لەندەن بوو کە لە ساڵی ١٨٨٣دا کۆچی کرد. سەرەتای خوێندنی شاگردێکی چەپڕەوانەی هیگل بوو، پاشان لێی هەڵ گەڕایەوە بەتایبەتی لەو بیروباوەڕانەی کە لەگەڵ ماتریالیزم دا نەدەگونجا. وەك ئەو گوتەنی «هیگل لەسەر سەرەوە وەستابوو من ڕاستم کردەوە سەر قاچەکانی».

لەگەڵ فریدرك ئەنگلزی دەوڵەمەندی هاوبیری بوو بە هاوڕێو کەوتنە سەر دانانی ئایدۆلیژێکی جیاواز، ئەوەبوو مانفێستی حیزبی شیوعیان بڵاوکردەوە. کە تیایدا هێڵە پان و بەرینەکانی ماتریالیزمی دیالکتیکیان ڕوون کردەوە.[٥٠]

کارل مارکس بە لێکدانی فەلسەفەی ئەڵمانی (بەتایبەتی دیالیکتیکی هیگل و ماتریالیزمی فیرباخ)و ئابووری ڕامیاری ئینگیلز (ئادەم سمیث و دایڤید ڕیکاردۆ)و سۆشیالیزمی فەرەنسی (سان سیمون) فەلسەفەی مارکسیزمی لێ پێك هێنا.

مارکس بۆ ئەوە فەلسەفەکەی دانا تا جیهان بگۆڕێت و زەبرو زەنگ کەم بکاتەوەو چەوسانەوە نەمێنێت و خێروخۆشیو یەکسانی پەرش ببێتەوە. لە گوتەیێکیدا دەڵێت «فەیلەسوفەکان تا ئێستا هیچیان نەکردوە لە ڕاڤەکردنی دنیاوە زیاتر، کەچی گرنگ گۆڕانێتی» بەڵام هەروەك مامۆستا (میرزا محمد حسین) دەڵێت بەشی ئەویش لە ئەوانی دی زیاتر نەبوو، نەگۆڕان و نەهیچ، ئەوەی ئەو فەلسەفە کردی دۆزینەوەی یاسای حەتمیەتی سروشت بوو نەوەك گۆڕان.[٥١]

ئەمە لەلایەك لەلایەکیدیشەوە مارکس هەندێ لەپێش بینییەکانی وەك ئەو ڕەچاویدەکرد دەرنەچوون. سەرەڕای ئەمەش ئەو دەوڵەت و یاساو توندو تیژی بە خراپەو شەڕدەزانی گوایە دەیەوێت نەیان هێڵێت، کەچی لە سایەی ئەوەوە هێندەی دی زیادیکردو دروشمی چەکوش و دکتاتۆریەت زیاتر پەرەی سەندو تیرۆرستی باشتر گردا.[٥٢]

لێرەدا کە بیروڕای مارکس دەربارەی دەوڵەت دەردەبرین مەرج نییە لە دانراوی ئەوەوە وەرمان گرتبێ، بەڵکو لە کتێبی شاگردەکانی ئەو، یاخود بڵێین لە پەیڕەو پڕۆگرامی بیرو باوەڕەکەیەوە دەرمان هێناوە.

کارل مارکس دەبێژێت، هۆشی مرۆڤ قەوارەکەی دیارناکات بەڵکو بەپێچەوانەوە بوونی مرۆڤ هۆشی مرۆڤ دەکێشێ. بەم پێیە ئەخلاق و رامیاریو ماف ناسین و ئایین و فەلسەفە هەموویان هۆشن و بەسەرخان دادەنرێن، سەرهەڵدانیان بەندە لەسەر بوون و قەوارە (وجود)ی مرۆڤ وەك ماددەو سەرمایە، یا باشتر بڵێین رەنگ دانەوەی باری ئابووریی، بێگومان ئابووریش بناغەو ژێرخانی کۆمەڵە.[٥٣]

لای ئەو دەوڵەت هێزێکی دەرەکی نی‌یە خۆی بسەپێنێتە سەر کۆمەڵ، بەڵکو بەرهەمی گەشەسەندنی ناوەوەی کۆمەڵە، کە لە ئەنجامی گۆران لە بەرهەمی مادەی‌یەوە پەیدابووە. لاچوونی شێوازێکی بەرهەم هێنان بە شێوازێکی‌دی بینای دەوڵەتیشی لە گەڵ دا دەگۆرێت. هەرا لە کۆمەڵی سەرەتایی دەوڵەت نەبووە، چونکە نە خاوەنداریتی تاکرەوی‌و نەچینەکان لە ئارادا نەبوون. هەموو شتێك لە کۆمەڵ دا هاوبەش بووە، پاشان بە هۆی گۆران و گەشەسەندنی یەك لەدوای یەکی هێزەکانی بەرهەم هێنان کۆمەڵی سەرەتایی هەڵ وەشایەوە، خاوەنداریتی تاکرەوی بەدەرکەوت و لەگەڵی‌دا چینی کویلەو خاوەن کۆیلەش پەیدابوو.

پێویستی پاراستنی ئەو خاوەنداریتی‌یەش هاتەمەیدان، ئا بۆ ئەو مەبەستە دەوڵەت سەری هەڵ دا. کەواتە سەرهەڵدانی دەوڵەت و پەرەسەندنی هاوکار بووە لەگەڵ زۆرانبازی تیژچینایەتی.

بەم رەنگە جەوهەری دەوڵەت لە کۆمەڵی چینایەتی‌دا ئامرازێکی رامیاری‌یە، ئامێرێکە ئامانجی مانەوەی دەسەلاتداریی چینێکە بەسەر چینێکی‌دی‌دا.[٥٤]

مارکسیزم ژیانی کۆمەڵ دابەش دەکاتە سەر پێنج قۆناغ، یەکەمیان قۆناغی هاوبەشی‌یەو بەرەلایی‌یە کە خاوەنداریتی تەواوی هۆیە بەرهەم هێنە سەرەتایی‌یەکان هاوبەشەو خەڵکیش یەکسانن، گەداو پاشای تێدا نی‌یە. دووهەمیان کۆیلایەتی‌یە کۆیلەکان هێزی بەرهەم هێنانن، خاوەنەکانیان لەسەر هێزی بازوویان دەژین و وەك ئاژەڵ سەیریان دەکەن. سێ‌هەمیان دەربەگایەتی‌یە جوتێرو سەپان هێزی بەرهەم هێنانن کە بە خاکەوە دەبەسترێنەوەو ئاغاکانیش خاوەنیانن. چوارەمیان سەرمایەداری‌یە، کریکار هێزی بەرهەم هێنانە ئەوسا قۆناغی سۆشیالیستی‌یە کە چینی کرێکار (پرۆلیتاریا) دەسەلات دەگرێتە دەست و چۆك بە سەرمایەداری دادەداو رێگا خۆش دەکات بۆ دوا هەنگاو کە ـ کۆمۆنیزم ـ ی بێ‌چین و توێژە، ئیدی لێرەدا رەوەرەوەی گۆران و پێش کەوتنی رادەوەستێت و لە شوێنی خۆی‌دا دەمەێنێت!!!

دەوڵەتی هەر سێ قۆناغی کۆیلایەتی‌و دەرەبەگایەتی‌و سەرمایەداری زەبرێکە بەدەست چینی زۆردارو چەوسێنەرانەوەو بەرژەوەندی چینێکی زۆرکەم لەبەر چاو دەگرێ.. بە پێچەوانەشەوە دەوڵەتی سۆشیالیستی چەوسانەوە لادەبات و میللیەتێکی راستەقینە دەردەبرێت.[٥٥]

مارکسیزم لە هەموو قۆناغەکانی کۆمەڵ دا دۆخی ئابووری بە تاکە هۆی جەوهەری‌و بنەرەت دەزانێت بۆ هەر گۆران و گەشە سەندنێك. بە شێوەیێك دەی‌کاتە مەحەکی گشتی‌و شۆرش و جولانەوەو جەنگ و پێکدادانێکی مێژوویی، کە ئەمەش بە ماتریالیزمی مێژوویی لە قەڵەم دەدەن. بێ ئەوەی هیچ ئیعتبارێکی بایەخدارو لەبەرچاو بۆ هۆش دابنێن وەك پاڵدەرو هۆیێکی گرنگی گۆرانی مێژوویی. هەروەك چۆن هۆشی ئایینی ئەو سێ ئایینەی بەرزەی بلاوکردۆتەوە، یاخود هۆشی نەتەوەیی کە ئەو شۆرشە رزگار یخوازانەی جیهانی سێ‌هەمی دژ بە ئیستعمارو داگیرکەر بزوکردەوە. لە کاتێك دا هەندێ لە دەستە مارکسی‌یەکان خەباتی نەتەوایەتی پێش خەباتی چینایەتی‌دا دەخەن.

بە رای مارکسیەت دا هەرچەندە قۆناغێك بە قۆناغێکی پێشکەوتووتر حەتمی‌یەو هەر دەبێ ببێ، لەگەڵ ئەوەش دا لە خوت و خۆرایی روونادا بەڵکو بە هۆی خەبات و راپەرین و هەڵگەرانەوە روودەدات. بۆیە دەبێ لە قۆناغی سەرمایەداری‌یەوە بۆ سۆشیالیستی کرێکارە رەنجدەرە چەوساوەکان تێ‌بکۆشن و خەبات بکەن، بکەونە جەنگێکی بێ‌ئامان لەگەڵ سەر مایەداران دا، کە سەریش کەوتن ئەوا دەوڵەتێك پێك دێنن و ـ دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ـ شەرعیەت دەدات بۆ سەرداپلۆچاندن و لەناوبردنی هەموو ئەو چین و توێژانەی کە بە موڵکدارو سەرمایەدریان لە قەڵەم دەدەن.

دکتاتۆریەت کە خۆی لە خۆی‌دا مانای دەسەلاتی تاك و زەبروزەنگ دەگەیەنێت لای ئەوان دێموکراتیەتێکی شێوە

ـەرزە،[٥٦] هەرچەندە لە هەمان کاتیش دا تەواوی ئەندامانی ئەمەن ناگرێتەوە!!

**«سەرچاوەکان»**

- د. اسماعيل الغزال. القانون الدستوري والنظم السياسية.
مؤسسة الجامعية للدراسات والنشر - بيروت لبنان ١٩٨٢ الطبعة الاولى ل ٦٩.

٢ - د. محمد فايز عبد اسعيد - قضايا علم السياسة العام - دار الطليعة - بيروت ١٩٨٦ الطبعة الثانية. ل ٥٢ - ٥٣.

٣ - د. محمد فايز عبد اسعيد.... ل ٥٣.

٤ - د. عبد المجيد عباس - القانون الدولي العام - مطبعة النجاح - بغداد ١٩٤٧ - ل ٩٤ - ٩٥.

٥ - د. اسماعيل الغزال... ل ٧١.

٦ - د. منذر الشاوي - القانون الدستوري (نظر الدولة). منشورات مركز البحوث القانونية - بغداد ١٩٨١ ل ٥ - ٨٤.

٧ - د. منذر الشاوي... ل ٥٣ - ٦٢.

٨ - د. محمد فايز عبد اسعيد... ل ٥٢.

٩ - د. اسماعيل الغزال... ل ٧٠.

١٠ - د. محمد فايز اسعيد.... ل ٥٢.

١١ - الموسوعة الفلسفية، لجنة من العلماء الاكاديميين السوفياتيين، باشراف م - روزنتال، ب - يورين، ترجمة: سمير كرم - دار الطليعة بيروت - ١٩٨٥ - الطبعة الخامسة ل ٢٠٢.

١٢ - د. اسماعيل الغزال... ل ٧١ - ٧٢.

١٣ - د. غانم محمد صالح - الفكر السياسي القديم، جامعة بغداد كلية القانون والسياسة ١٩٨٠ ل ٢٢.

١٤ - بروانە دەزگا رامیاریو دێموکراتیەکان لە ئەسینا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە - ١١٠ - بابەتی دێموکراتیە .

١٥ - د. غانم محمد صالح... ل ٢٤ - ٣٥.

١٦ - تەواوی ئەم برگـەیـە (دەوڵەت لای رۆمانیەکان) لە دانراوی د. غانم محمد صالح... ل ١٤٧ - ١٥٨ وەرگیراوە.

١٧ - د. محمد عبد الله دراز، الدين [بحوث ممهدة لدراسة تاريخ الاديان] دار القلم - كويت ١٩٧٠، الطبعة الثانية ل ٢ - ٤٤.

١٨ - ابن خلدون، المقدمة، دار الفكر بيروت ١٩٧٨، الطبعة الاولى. ل ٢٩.

١٩ - ول. ديورانت، قصة الفلسفة، ترجمة الدكتور فتح الله محمد المشعشع، مكتبة المعارف، بيروت ١٩٧٩ - الطبعة الرابعة ل ١٩ - ٢٠.

٢٠ - د. غانم محمد صالح... ل ٥٩ - ٦٠.

٢١ - جمهورية افلاطون، ترجمة حنا خباز، دار القلم - بيروت ١٩٨٠ الطبعة الثانية ل ٤٣ - ٤٤.

٢٢ - جمهورية افلاطون... ل ٥٦.

٢٣ - ول - ديورانت... ل ٣١ - ٣٢.

٢٤ - ول - ديورانت... ل ٣٤ - ٤٣.

٢٥ - ول - ديورانت... ٦٧ -٧٧.

٢٦ - د. غانم محمد صالح... ل ٠٣ - ١٢٩.

٢٧ ـ الموسوعة الفلسفية المختصرة، نقلها عن الانكليزية فؤاد كامل، جلال العشري، عبد الرشيد صادق والدكتور زكي نجيب محمود، مكتبة الانجلو المصرية ١٩٦٣ ل ٢٠٧ ـ ٢٠٩.

٢٨ ـ د. حسن صعب، الاسلام وتحديات العصر، دار العلم للملايين ـ بيروت ـ ١٩٧٩ الطبعة الرابعة ل ٥٩.

٢٩ ـ محمد مبارك، بعض اشكاليات الفكر والمجتمع عند الفارابي ـ مجلة آفاق عربية، السنة الحادية عشرة ـ العدد الثامن آب ١٩٨٦ ل ٨٠.

٣٠ ـ د. حسن صعب... ل ٥٩ ـ ٦٠.

٣١ ـ عبد السلام بنعبد العالي ـ الفلسفة السياسية عند الفارابي ، دار الطليعة بيروت ١٩٨١ الطبعة الثانية ل ٨٥ ـ ٨٧.

٣٢ ـ عبد السلام بنعبد العالي... ل ١٠٣ ـ ١٠٧.

٣٣ ـ عبد السلام بنعبد العالي... ل ١١١ ـ ١١٣.

٣٤ ـ محمد مبارك، آفاق عربية... ل ٨١ ـ ٨٣.

٣٥ ـ الموسوعة الفلسفية المختصرة... ل ١٠.

٣٦ ـ ابن خلدون. المقدمة... ل ٤١ ـ ٤٤.

٣٧ ـ ابن خلدون... ل ١٥٤ ـ ١٥٧.

٣٨ ـ ابن خلدون...١٥٧ ـ ١٦١.

٣٩ ـ ابن خلدون... ل ١٧٠ ـ ١٧٢.

٤٠ ـ مالك بن نبي.. شروط النهضة.. ترجمة عبد الصبور شاهين و عمر كامل مسقاوي، قاهرة مطبعة المدني ١٩٦١، الطبعة الثانية ل ٨٣ ـ ١٠٠.

٤١ ـ ابن خلدون... ل ٢٩٨.

٤٢ ـ ابن خلدون... ل ٣٠٢.

٤٣ ـ برتراند رسل، حكمة الغرب، الجزء الثاني، ترجمة د. فؤاد زكريا (سلسلة عالم المعرفة) كويت ١٩٨٣ ل ٦٢ ـ ٧.

٤٤ ـ د. ملحم قربان ـ قضايا الفكر السياسي (الحقوق الطبيعية) المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر. بيروت ١٩٨٣ الطبعة الاولىٰ ل ١١٨ ـ ١٣٠.

٤٥ ـ جان. جاك. روسو ـ العقد الاجتماعي. ترجمة ذوقان قرقوط، مكتبة النهضة ـ بغداد ـ ١٩٨٣ الطبعة الاولىٰ ل ٣٦.

٤٦ ـ جان. جاك. روسو... ل٤٨ ـ ٥٥.

٤٧ ـ جان. جاك. روسو... ل ٦٥ ـ ٨٢.

٤٨ ـ جان. جاك. روسو... ل ١٠٥ ـ ١١٠.

٤٩ ـ بروانه، رۆشنبيرى نوێ، ژماره ١١٠، بابەتی دیموكراتیەت.

٥٠ ـ م ـ روزنتال، ب ـ يودين. الموسوعة الفلسفية... ل ٤٣٨.

٥١ ـ ميرزا محمد حسين، الاسلام والاشتراكية، ترجمة الدكتور عبد الرحمنٰ ايوب، المؤسسةالمصرية العامة للتأليف والترجمة والنشر ١٩٦٥ ل ١٢ ـ ١٣.

٥٢ ـ دينيس لويد ـ فكرة القانون ـ ترجمة سليم الصويص (سلسلة علم المعرفة) كويت ١٩٨١ ل ٢٦ ـ ٢٧.

٥٣ ـ بروانه أ ـ ك ـ أوليدوف ـ الوعي الاجتماعي، ترجمة ميشيل كيلو ـ دار ابن خلدون بيروت ـ ١٩٨٢. الطبعة الثانية.

٥٤ ـ ق ـ آفاناسيف ـ اسس الفلسفة الماركسية، ترجمة عبد الرزاق الصافي، منشورات الطريق الجديد ـ دار الرواد للطباعة ـ بغداد ـ ١٩٧٨ الطبعة الرابعة ل ٢٥٦ ـ ٢٥٧.

٥٥ ـ ق ـ آفاناسيف... ل ٢٥٧ ـ ٢٦٤.

٥٦ ـ ق ـ آفاناسيف... ل ٢٦٤.

# الدولـــة

شفيق حاجي خضر

لقسم الاول

:-

الدولة باعتبارها ارقى مجتمع سياسي وصل اليه الانسان لها تعاريف عديدة ومتباينة طبقاً لاصول الفلسفات والآراء، ولكن بتحليل هذه التعاريف ان نقول بان الدولة عبارة عن مجموعة من الناس لهم مصالح مشتركة ويحكمهم تنظيم معين معترف بها دولياً ويمكن بسهولة تميز الحاكم عن المحكوم.

عندما كان حكم الدولة عند الشرقيين من سلطات الالهه منها ان تعين الحكام ويصبحون ظلها، ولكن في بلاد اليونان القديمة عرف تنظيم سياسي بكل معنى الكلمة، حيث كانت كل مدينة كبيرة دولة بذاتها والتي سميت هذه الانظمة بدولة المدينة. فكانت اثينا واسبرطة دولتين مستقلتين يحكمهما حكام وهيئات منتخبين من الشعب.

للفلاسفة أراء متباينة حاولوا من خلال ذلك ان يرسموا لنا حياة الانسان الاولى وكيفية ظهور المجتمع والدولة فعند الفيلسوف العبقري افلاطون يرجع اساس اجتماع الانسان الى الضرورة، حيث هو وحده وبقدراته المحدودة عاجز عن اشباع نفسه وتحقيق السعادة لهذا لابد من الاجتماع وبناء مدينة (دولة) تحكمها ملوك فلاسفة، وعند ارسطو المعلم الاول كذلك ترجع اصول المتجع الى التعاون والتآلف بغية تحقيق حتياجاتهم. ولكنه لايتخيل مدينة مثالية مثل استاذه وانه هو اكثر واقعية، ويعرفنا النظام الدستوري او الجمهوري الذي هو وسيط بين النظامين الديمقراطي والاوليگارشي. من حيث المبدأ هذا الاتجاه نفسه يظهر عند الفارابي المعلم الثاني.

حيث عنده المدينة (الدولة) اما فاضلة اوفاسقة وجاهلة ومن حيث الكمال عنده مدينة الاكمل التي تشمل الانسانية جمعاء والمدينة الكاملة والتي تشمل امة من الامم اما المدينة الناقصة وهي ادنى درجة من رفيقاتها والتي تضم جماعات واهل بلد معين اقل عدداً بكثير الدولة الكاملة.

اما ابن خلدون فهو لايتخيل اي مدينة مثالية، بل انه يفسر ويحلل الدولة بالنظر الى التأريخ. وعنده ترجع الدولة وامر رئاستها الى العصبية الملك. وعمر الدولة عنده اجيال ثلاثة وكل جيل يحدد له اربعون عاماً، حيث الجيل الاول الذي هو على حياة البداوة يبني ويغزو ويفتح البلدان والجيل الثاني وهو الوسط والافضل باعتباره حامل الصفات المخضرمة من البداوة والحضارة، وفي الجيل الاخير تهرم الدولة ثم تنهار على ايدي امرائها او تغزى من قبل قوة اجنبية.

روسو الفيلسوف وتوماس هوبس وجون لوك تجمعهم نظرية العقد الاجتماعي ، ومحتواها ان المواطنين يعقدون عقداً على امر الادارة والرئاسة لحمايتهم الى هيئة جديدة تسمى بالحكومة، والحكومة اما ان تكون ملكية مطلقة عند هوبز اوملكية دستورية عند لوك او ديمقراطية عامة عند روسو.

اما عند كارل ماركس الفيلسوف المادي وداعية الشيوعية تختلف الامور بكاملها، وله وجهة نظر مختلفة، حيث يقول بان الدولة وليدة صراع طبقي حاد، وظهرت عندما تفكك المجتمع المشاعي الاول وبرزت الملكية الخاصة، لهذا حاول المالكون ان يحافظوا على املاكهم ونظروا الى الدولة حيث كونها قد حققت لهم احلامهم من خلال عنفها وسلطتها.

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی شەش کار لە لێکۆڵینەوەی "ئاوەڵناو"دا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف
بەشی کوردی ـ کۆلێجی پەروەدە
زانکۆی بەغدا

لە نێو زمانەوانانی کورددا بەر لە هەر کەس مامۆستا سەعید صدقی کابان لە کتێبی «مختصر صرف ونحوی کوردی»دا بەناوی «صفت»ەوە لەو کێشەیە دواوە . . . [1] لەم نووسراوەدا باسی ئاوەڵناو بە پێناسەیێك دەست پێ کراوە، کە دەڵێ: «صفت ـ اسمیکە حال و شان اسمەکەی پێش خوی بیان دەکا بەو اسمە دەلین موصوف، بە هردوکیان دەلین ترکیب توصیفی» (ل ٢٥). ئەگەرچی ئەم پێناسە هەندێ ناتەواوی تێدایە و زۆر تەواو نی یە، بەڵام لە گەلێك لەو پێناسانەی لەم ساڵانەی دواییدا بۆ ئاوەڵناو دانراون ڕاستترو لەبارترو گونجاوترە.

بەدوا ئەو پێناسەیەدا کەمێك لە دیارخراو (کە ئەو «موصوف»ی پێ وتووە) دواوە (ل ٢٥) و ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، کە چۆن بەیاریدەی نیشانەی (ی) بە دیارخراوەوە دەبەسترێتەوەو سێ حاڵەتی دیاری کردووە:

١ ـ «موصوف دائما ژێردار نەبی بشرطی اخر حروفەکەی لە حرفان املا نەبی. وکو (قلم درێژ، کاغذ سپی، منداڵ زیرك، او سارد» (ل ٢٥).

واتە ـ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە هەر دەنگێکی نەبزوێن بێ، ئەوە کورتە بزوێنی (ی)ی دەچێتە سەر، وەك: (قەڵەمی درێژ، کاغەزی سپی، منداڵی زیرەك، ئاوی سارد).

٢ ـ «واگر اخر حرف موصوف لە حرفان املا بو لە باتی ژێر (ی) دادەنری. بەو (ی)یە دەلین (ی)ی وصفی وکو بە ژێرەکە دەلین ژێر وصفی. وکو (بالای بەرز، بەروی شیرین، تریی سپی، تختەی رش» (ل ٢٥).

واتە ـ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێنی (ا، وو، ێ، ی) بێت، ئەوە بزوێنی (ی) دادەنرێ.

٣ ـ «لکن اگر اخر حرف موصوف (ی)ی ڕاست بووەکو (شوتی، تروزی) بو خاتری سوکی (ی)ی وصفی پیوە نانوسینری. وەکو (شوتی سور، تروزی ناسك» (ل ٢٥ ـ ٢٦).

واتە ـ ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێنی (ی) بێت، ئەو کاتە نیشانەی ئیزافەی (ی) لە تەلەفوزدا دەرناکەوێ.

ئەگەرچی مامۆستا سەعید صدقی کابان تەنیا باسی نیشانەی (ی)ی کردووەو بە لای ئەو نیشانانەی تردا نەچووە کە دیارخەرو دیارخراو بەیەکەوە دەبەستن، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستی یە لەیاد نەکەین باش بۆ مەسەلەکە چووەو بۆچوونەکەی لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ . . . ئەوەی لێرەدا جێگەی ڕەخنەبێ، تەنیا دوو سەرنجە کە لە بەشی دووەمی ئەم باسەی پەیدا دەبێ:

١ ـ نووسەر وای داناوە، ئەگەر دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێن بێت، بزوێنی (ی) وەردەگرێ. بەڵام لە ڕاستیدا وا نی یەو نیشانەکە دەبێتە (ی ـ ٧)، نەك (ی ـ أ).

٢ ـ نموونە بۆ دیارخراوی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ۆ) نەهێنراوەتەوە.

مامۆستا سەعید کابان بەدوا ئەمەدا، ئەوە ڕادەگەیەنێ، کە «موصوف چە مفرد، چە جمع بی صفت هر مفرد دەبی. وکو (منداڵ زیرەك، منداڵان زیرەك)و نابێژ ری (منداڵان زیرەکان)» (ل ٢٦) . . . ئەگەرچی ئەمە وایە، بەڵام نووسەر دەبوو پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشێ، کاتێ دیارخراو بە یاریدەی (ە) بە دیارخەرەوە دەبەسترێت، دیارخەرەکە ـ واتە ئاوەڵناوەکە دەبێتە کۆ [2] وەك.

هەڵووژە کاڵەکان لە دارەکە کەوتنە خوارەوە.

لەبارەی جۆرەکانی ئاوەڵناویشەوە نووسیویە: «صفت ـ دو قسمە (١) سماعی. (٢) قیاسی»و ئنجا بەجیا باسی هەریەکێکیانی کردووە و لە پەیدابوونیان دواوەو پێناسەی بۆ داناون . . . (ل ٢٦). ڕەنگە ناونانی جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی زاراوەوە پڕ بە پڕی خۆی نەبێ، بەڵام لە دابەش کردن و ڕوونان و

ـــــه بۆ دانانیانـدا بە گشتی سەرکـەوتـووە و بەپێی هەڵکەوتی زمانی کوردی ـەکەی دارشتووە.

ـە کۆتاییشدا بە کورتی لە پلەی بەراوردو پلەی باڵا دواوەو بۆ پلەی بەراورد، کە ـ (صفت تفضیلی)ی ناوناوە (تر)ی دیاریکردووە. بۆ پلەی باڵاش، کە ئەو بە ـفت عالی)ی ناوبردووە (ترین)ی دەست نیشان کردووە.

ـگشتی ئەو چەنـد لاپـەڕەیـەی خاوەنی کتێبی «مختصر صرف و نحوی ـوردی» لەبـارەی ئاوەڵنـاوەوە نووسیـویەتی، لەگەڵ کەمی و باس نەکردنی هەندێ ـەی گرنگ و بوونی چەند ناتەواویشدا نرخ و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

ـی گەورەو مەزنی کورد ـ مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی «دەستووری زمانی ـوردی»دا لەژێـر سەرنـاوی «سفـەت»دا کۆڵیـوەتـەوە[3] ولە سەرەتادا پێنج جۆر ـێفەی دیاریکردووە: «١ ـ سفەتی چۆنی، ٢ ـ سفەتی نیشانی، ٣ ـ سفەتی ـەرەمی، ٤ ـ سفـەتی موبهـەم، ٥ ـ سفەتی پرسی»و دوایی لە هەر یەکێکیان بە ـوورو درێژ ی دواوە.

ـوسـەر باسی جۆری یەکـەمی ئاوەڵنـاوی بە سەرباسی «وەزیفەکانی سفەتی ـۆنی» دەست پێ کردووە (ل ٦٢)و دوو ئەرکی: «١ ـ ئەبێتە تەواوکەری ناو. . . ٢ ـ ئەبێتە تەواوکەری باسی ناتەواو» بۆ دەست نیشان کردووە. . .»[4] بەدوا ئەمەدا ـە چەند دێڕێك دەربارەی هاتنی ئاوەڵناوی چۆنێتی بەدوا ناودا دواوەو ئەوەی وتووە ـە ناوەکـە (ی)ی ئیـزافـە وەردەگـرێ (ل ٦٢ ـ ٦٣). لەژێر سەرباسی «ئەداتی ـەعـریف لەگـەڵ ناوی بە سفـەت تەواوکـراوا» (ل ٦٣)دا لە دوو حاڵـەت دواوە: حاڵەتی یەکەم، کە دەڵێ: «ئەداتی تەعریفی موبهەمی (ێك) ڕاستەوخۆ ئەخرێتە ـوی ناوەکـەو، وەکـو: منالێکی زیرەك. . .» لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوە. بەڵام حاڵـەتی دووەم، کە نووسیـویەتی: «بۆ ئەوە کە ناوێکی بە سفـەت تەواوکـراو بە ـەداتی تەعـریفی مەعیـەن تەعـریف بکـرێ ئەبێ لە پێشـا بخـرێتە شکڵی ناوی ـێکـدراوەوە، ئەمجـا ئەداتـەکـەی تەعـریفیـان لەسـەر دابنـرێ، وەکـو: منـاڵـە ـیـرەکـەکـە. .» ئەگەرچی ڕاستە نموونەی وەك «مناڵە زیرەکەکە. . .» لە شێوەی ـێکهـاتنی ناوی لێکـدراوی، وەك «گـوڵەباخ. . .» دەچێ، بەڵام نابێ ئەوە لەبیر ـکـەین کە (ە)ی نێـوان «گـوڵ» و «باخ» ناوبەندەو هەرچی (ە)ی دوای «منداڵە» ـشـانـەی ئیـزافـەیـە. جا ڕاستـر وابـوو مامۆستا وەهبی چۆنێتی هاتنی نیشانەی ـاسیـاوی و نەنـاسیـاوی لەگـەڵ ناوی بە ئاوەڵنـاو تەواوکـراودا ببـەستایە بە جۆری بەکارهێنانی نیشانەکانی ئیزافەوە.

نووسەر لەباسی «گەل کردنەوەی ناوی بە سفەت تەواوکراو» (ل ٦٤)یشدا وای داناوە، کە «مناڵە زیرەکەکان. . .» شێوەی ناوی لێکدراوە.

لەژێـر سەرباسی «دروست کردنی سفەتی چۆنی»دا لە ڕۆنانی ئاوەڵناو دواوەو شایانی باسە، کە سێ جۆر (سادە، داڕێژ راو، لێکدراو)ی دیاریکردووە (ل ٦٤ ـ ٧٠).

لە بەشی ئاوەڵنـاوی داڕێـژ راودا، کە ئەو «سفـەتی دروست کراو»ی پێ وتـووە وای باس کردووە کە «ئـەتـوانرێ لە ناوو فیعل هەندێ سیفەتی چۆنی پەیا بکرێ» (ل ٦٤)و دواتریش هەندێ لەو پاشگرانەی دەست نیشان کردووە، کە دەچنە سەر ناو یان کرداری سادەو دەیـانکـەنـە ناوو ئاوەڵنـاوی داڕێژ راو. . . لەم باسـەدا سێ ناتەواوی بەرچاو دەکەوێ:

١ ـ نووسەر وای یادداشت کردووە، کە تەنیا لە ناوو کردار دەتوانرێ ئاوەڵناوی داڕێژ راو ڕۆبنرێ، بەڵام وەك ئاشکرایە، لە ئاوەڵناوو ئاوەڵکرداریش سازدەکرێن.

٢ ـ ئەگـەرچی باسی بەشێکی زۆر لەو پاشگـرانـە کراوە، کە یاریدەی ڕۆنانی ئاوەڵناوی داڕێژ راو دەدەن، بەڵام چەند پاشگرێکی زۆر چالاك هەن ناویان نەبراوە.

٣ ـ ڕاستـە لە ڕۆنـانی ئاوەڵنـاوی داڕێژ راودا پاشگر دەوری سەرەکی دەبینێ، بەڵام پێشگریش (ئەگەرچی کەمتر) دەورێکی دیار دەبینێ وکەچی مامۆستا وەهبی ئەوەی یادداشت نەکردووە.

نووســـەر دوا بە دوای باسی ئاوەڵنـاوی داڕێـژ راو لە «دروست بوونی سفـەتی چۆنی لێکـدراو» (ل ٦٨ ـ ٧٠) دواوەو زوربـەی شێـوە پێکهاتـە جۆربەجۆرەکانی ئاوەڵنـاوی لێکـدراوی دەست نیشـان کردووە. ئەگەرچی ئەم باسە لەسەر بناغەی کەرەستـەیێکی تێـرو بەرفـراوانی زمـانی کوردی بنیات نراوەو سەرکەوتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوو تێبینی هەیە، کە ناکرێ نەخرێنەبەر چاو:

١ ـ نووسەر وشەکانی «نارێك، ناپاك» «بەدەس» «بێ کەس» «هاودەنگ» یشی بە ئاوەڵنـاوی لێکـدراو دانـاوە، بەڵام دەبینین، ئەو وشـانە لە پێشگرێك و وشەیێکی واتادار پێکهاتوون، جا کەواتە ئاوەڵناوی داڕێژ راون. هەرچی ئاوەڵناوی لێکدراوە وەك مامـۆستـا وەهبی خۆیشی لە پێنـاسەکەیدا وتوویە: «ئەو سفەتانەن کە لە دوو یان لە دوو پتر کەلیمە دروست بوون» (ل ٦٧).

٢ ـ چەند شێوە پێکهاتنێکی دیارو ئاشکرای ئاوەڵناوی لێکدراو باس نەکراوە.

لە لاپـەڕە (٧٠ ـ ٧١)دا لەژێـر سەربـاسی «سفـەتی چۆنیی بچـووك کراو»دا باسی هەنـدێ لەو پاشگـرانـە کراوە کە بۆ بچـووك کردنـەوە یان گەیـاندنی واتای نازداری بەکـاردەهێنـرێن. . . ئـەم باسـە دەبـوو بخـرێتـە نێـو باسی ئاوەڵنـاوی داڕێـژ راوەوە، چونکـە تێکـڕای ئەو نمـوونـانـەی نووسـەر هێنـاوینـەتەوە بوونەتە ئاوەڵنـــاوی داڕێـــژ راو. . . دواتـر کێشـەی «سفـەتی چۆنیی وەکـو ناو بە کەڵـك ئەهێنرێ» (ل ٧١) بە چەند دێڕێك باس کراوەو ئەمجا بەناوی «پایەکانی سفەتی چۆنی» (ل ٧١ ـ٧٢)وە لەسـەر پلەکـانی ئاوەڵنـاوەوە کۆڵراوەتەوە. ناتەواوی هەرە دیـاری ئەم باسـە لەوەدایـە، کە ناوی نیشانەی (تر + ین)ی ئاشکراو دیاری پلەی باڵا نەهێنراوە. . .

مامـۆستـا تۆفیق وەهبی لە لاپەڕە (٧٢)دا لە باسی ئاوەڵناوی چۆنێتی بووەتەوەو لە لاپەڕە (٧٣)وە کەوتۆتە لێدوان لەو چوار جۆرەی تری ئاوەڵناو، کە لە سەرەتادا ناومـان بردن. . . لێـرەدا نامـەوێ لەو باسـانـە بدوێم، چونکـە زۆربـەی زۆری نمـوونـەکـانی ئەو چوار جۆرەی دی، کە نووســەر بە ئاوەڵنـاوی دانـاون، ڕوون و

ئاشکرا دیارن، کە بەشە ئاخاوتنی جێناو یان ژمارەن. جا لەم شوێنەدا مەودای ئەوە نی‌یە چەندین لاپەرە بە ڕەت کردنەوەی ئەو بۆچوونانەوە ڕەش بکەمەوە.

ئەگەرچی ئەو جۆرە ناتەواوی‌یانەو هەندێکی تر لە نووسراوی ناوبراودا بەدی دەکرێن، بەڵام ئەمانە بایەخی ئەو کارە دیرینە کەم ناکەنەوەو وێرای ئەوەش ڕووە باشەکەی هەموو کەم و کورتی‌یەکانی شاردۆنەوە.

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لەو کتێبەیدا کە بە ناوی «ڕێزمانی کوردی»ی[5] لەژێر سەرباسی (ئاوەڵناو)دا لەو کێشەیە دواوە ئەمیش وەك مامۆستا تۆفیق وەهبی بەسەر پێنج جۆردا دابەشی کردووە:

«١ - ئاوەڵناوی خەبەری؛ ٢ - ئاوەڵناوی ئیشاری؛
٣ - ئاوەڵناوی فرمانی؛ ٤ - ئاوەڵناوی چەندی؛
٥ - ئاوەڵناوی پرسیاری».

نووسەر لە سەرەتادا لە ئاوەڵناوی چۆنێتی (کە ئەو - ئاوەڵناوی خەبەری - پی‌وتووە) دواوە. پاش پێناسەکردنی بەسەر سادەو لێکدراودا دابەشی کردووە... وا چەند کەم و کورتی‌یێکی ئەم بەشە دەخەینە ڕوو:

خاوەنی ئەم بەرهەمە ئاوەڵناوی دارێژ راوو لێکدراوی وەك یەك تەماشاکردووەو لە یەکتری جیانەکردوونەتەوە. بەوێنەهەندێ ئاوەڵناوی دارێژ راوی بە لێکدراو داناوە، وەك: «بەهێز، بەجەرگ، بەگور... نەمر، نەبەز، نەخۆر... نارەسەن، نارێك... بێ‌هێز... بەختیار... تەقلەباز... نوێژکەر... (بڕوانە ل ١١٢ - ١١٣).

هەرچەندە نووسەر زوربەی زۆری ئەو حاڵەتانەی ئاوەڵناوی ناسادەیان لێ پەیدادەبێ یادداشت کردووە، بەڵام هەندێ حاڵەتی ئاشکراو گرنگ هەیە تۆماری نەکردووە... وێرای ئەوە لەدیاری کردنی بەشە پێکهینەکانی هەندێ وشەی ناسادەدا هەڵە دەبینرێ. بەوێنە وای داناوە، گوایا وشەکانی «دوودڵ... چوارچاو» لە (ئاوەڵناو + ناو) پێکهاتوون (ل ١١٢). ئاشکرایە (دوو... چوار) بەر لە هەموو شتێك ژمارەن. دەربارەی وشەی «بێ‌هێز» وای ڕاگەیاندووە، کە لە (ئاوەڵکردار + ئاوەڵناو) ڕۆنراوە (ل ١١٣). (بێ) بە ڕەسەن پێشبەندەو لێرەدا بووە بە پێشگرو هەرگیز نە دەبێتە ئاوەڵکردارو نە دەوری ئاوەڵکردارو دەبینێ. هەرچی وشەی «هێز»یشە ناوە، نەك ئاوەڵناو. کەواتە وشەی «بێ‌هێز» لە (پێشگر + ناو) پێکهاتووە، نەك لە (ئاوەڵکردار + ئاوەڵناو)... هتد.

بەدوا ئەو باسەدا ئنجا لەبارەی «پلەکانی ئاوەڵناوی خەبەری»یەوە دواوەو بەسەر سێ پلەی (چەسپیو، بەراورد، باڵا)دا دابەشی کردوون و پێناسەی بۆداناون وشەرحی کردوون و نموونەی بۆ هێناوتەوە (بڕوانە: ل١١٤ - ١١٥). ئەم بەشە تێکرا زانستی‌یانەو سەرکەوتووەو تەنیا کەمێ ناتەواوی لە هەندێ پێناسەو نموونەدا بەرچاودەکەون.

کاتێ نووسەر هاتۆتە سەر باسی ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی چۆنێتی، دەبینین (٢٣) پاشگری دیاریکردووە (ل ١١٦ - ١٢٠)... ناتەواوی ئەم بەشە بریتی‌یە لە:

١ - ناونەبردنی هەندێ پاشگر، وەك (ەمەنی - ساردەمەنی...)؛ (اك - ڕووناك...)... هتد.

٢ - هەڵەکردن لە دیاریکردنی شێوەی هەندێ پاشگردا بەنموونە نووسەر (ی)و (یی) بە دوو پاشگر داناوەو وشەی «هەژاری»و «ئازایی» بە نموونە بۆ هێناوەتەوە. بەڵام وەك ئاشکرایە، ئەمانە یەك پاشگرن، کە ئەویش (ی)یە. حاڵەتی دووەمیان ئەوەیە کە بەپێی دەستووری فۆنەتیکی کوردی نیمچەبزوێنێك لە نێوان دوو بزوێندا پەیدابووە...

٣ - دانانی وشەکانی «چلك، شەرم» بە ئاوەڵناو... هیچ گومان لەوەدا نی‌یە، کە ئەو وشانە ناون.

٤ - لە زمانی کوردیدا جگە لە پاشگر چەند پێشگرێکیش هەن دەچنە سەر ئاوەڵناو و نووسەر بە هیچ چەشنێك ناوی نەبردوون.

... و هەندێکی تر.

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە لاپەرە (١٢١)دا بەناوی «ئەرکی ئاوەڵناوی خەبەری چی‌یە لە ڕستەدا؟» دواوەو لە لاپەرە (١١٢)ەوە هاتۆتە سەر باسی ئەو چوار جۆرەی تری ئاوەڵناو، کە لە سەرەتادا ناومان بردن.. لەبەر ئەوەی لێدوان لە «ئەرکی ئاوەڵناو لە ڕستەدا» دەچێتە بەشی ڕستەسازی‌یەوەو زوربەی هەرەزۆری باسی ئەو چوار جۆرەی تری ئاوەڵناویش، کە نووسەر کردوویەتی، پێوەندی بە ئاوەڵناوەوە نی‌یە، بۆیە هەڵیان دەگرین بۆ شوێنی پێویستی خۆی...

لەگەڵ نیشاندانی ئەو ناتەواوی‌یانەشدا، ڕاست وایە، ئەوە لە یاد نەکەین، کە بەرهەمەکانی مامۆستا نووری عەلی ئەمین تاکو ئەمرۆ نرخ و بایەخیان بەردەوامەو هێشتا هەر لە ڕیزی پێشەوەن.

نووسەری کتێبی «آوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی»[6] لە لاپەرە (٢٩ - ٣٠)دا بەناوی «پەسن»ەوە بە چەند دێڕێك لە ئاوەڵناو داواوە. لە سەرەتادا بە پێناسەیێك دەستی پێ‌کردووە، کە دەڵێ: «پەسن: ئەوە کۆبۆی پەسنێ (کەس) یان (تەبا) یان (تشتکی تێ‌کردن، وەك: بارامێ (سۆر)، گای (ڕەش)...». بەدوا ئەمەدا «پەسن» دەکا بە دوو بەشەوە: «١ - پەسنێ ڕاستی؛ ٢ - پەسنێ چێکروخی». بۆ «پەسنێ ڕاستی» چوار جۆری دیاریکردووە: «١ - تام: شۆر، شیرین...؛ ٢ - ڕەنگ: سۆر، سپی...؛ ٣ - کیمیاسی: کن، کورت...؛ ٤ - زێدای: درێژ، ستور...» هەرچی بۆ «پەسنێ چێکروخی» یشە ئەم نموونانەی: «گەڕناسی، سواری، جوانی» هێناوەتەوە ئەمە سەرپاکی ئەو باسەیە، کە مامۆستا جگەرخوێن لە بەشی ئاوەڵناودا لێی دواوە... وێرای ئەو پێناسە ناتەواوەو ئەو دابەش کردنە نامەنتیقی‌یەو ئەو هەموو هەڵە زۆرە، هەڵەیێکی یەکجار گەورە لەوەدا دەبینرێ، کە سێ وشەی «گەڕناسی، سواری، جوانی» بە ئاوەڵناو داناوە. ئەو وشانە، کە ئەسڵەکەیان «گەڕناس، سوار، جوان»ە پاشگری (ی)ی ناوی مەعنایان چووەتە سەر. ئەم پاشگرە لەگەڵ پاشگری (ی)ی سیفەی نیسبی جوداوازن - واتە دوو پاشگری سەربەخۆن و هەر یەکەیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتووەو ئەرك و دەوری جوداواز دەبینن. وێچوونی شێوەیان بووەتە هۆی ئەوەی

معیت جگەر خوێن بە یەك پاشگریان تێ بگا[7] .

سەرنج ڕاكێش ئەوەیە، پاش (٣٥) لاپەڕەیێك و دوای چەندین باسی حو.ـە جۆر ئنجا نووسەر لە لاپەڕە (٦٥ ـ ٦٦)دا لە پلەی بەراورد دواوەو ئەم ـەمنی چ لە ڕووی ناوەرۆك و چ لە ڕووی زاراوەوە پڕ هەڵەو كەم و كورتی یە . . ـە ڕووی ناوەرۆكەوە، ئەوەیە كە بە شێوەیێكی شێواندراو باسی نیشانەی (تر)ی ـرنووە هیچ حاڵەتێكی دی ناو نەبردووە . ئەوەی پێوەندیشی بە زاراوەكانی ئەم ـەیە هەیە نادروستە . بەوێنە بە پلەی بەراوردی وتووە «بیتر ناڤ» . بەم پێ یە ئەو ...ییە ناتوانێ وشەكانی «كەمتر، نزمتر، خراپتر . . .» بگرێتە خۆ . . . سەرەڕای هەموو ئەوەش نووسەر بە هیچ چەشنێك ناوی پلەی باڵای نەهێناوە . ئەمەو جـسی باسی دی، كە پێوەندییان بە ئاوەڵناوەوە هەیە لە كتێبی ناوبراودا بەرچاو ـكەوێ .

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لەو كتێبەیدا كە بەناوی «سەرەتایێك لە فیسۆ ـی زمانی كوردی»یەوە بڵاوی كردووەتەوە لە هەندێ كێشەی ئاوەڵناو ـدوە . ئەمیش وەك نووسەرانی دیكە باسەكەی بە پێناسەی ئاوەڵناو ـەر سەووەو دەڵێ: «ئاوەڵناو شتێكە، كە تاریفی ناو یا ڕاناو دەكات، وە بۆی هەیە كە: ١ ـ یەك وشە بێت، وەك: نەرمین زیرەكە . . . ٢ ـ كە بتر بێ لە یەـمێت، ئەو كچە، قژ زەردە جوانە، دۆستمە . . ٣ ـ كە ڕستەیێك بێ، وەك: ئەو كچە و دوێنێ هات بۆ لای مامی، قوتابی یە» (ل ١٦٣ ـ ١٦٤) . بە ڕای من ئەم پێناسەیە، نەك هەر زۆر نادروستە، بەڵكو ناڕێك و لەنگیشە . بەر لە هەر شت ـست نی یە بووترێ ئاوەڵناو «شتێكە»، بەڵكو ڕاستتر وایە بووترێ «ووشەیەكە» . . . ئنجا ئاوەڵناو نەك ئەركی تەنیا تاریفی ناویان ڕاناونی یە، بەڵكو ـەـە تەخلوتێكە واتای چۆنێتی و خاسیەت و دەلالەتیش ڕادەگەیەنێ . . . جۆرە ـمەرییكی وەهاش، كە گوایا ئاوەڵناو بۆی هەیە «بتر بێت لە وشەیێك» یان «ڕستەیێك بێ» زۆر نابەجێ یە، چونكە وشەكانی «زەرد» و «قژ زەرد» و «جوان» تاكە ـكە ئاوەڵناون و كاتێ پێكەوە دێن، ئەویش بە یاریدەی جێناوی (ە)ی كەسی سێیەم، دەبنە دەستەواژەیێك كە واتای وەسفی تێدابێ . . . خۆ هەرچی ڕستەی «دوێنێ هات بۆ لای مامی»یشە ڕاستە بەپێی ڕێزمانی ئینگلیزی دەوری ئاوەڵناو دەبینێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە نموونانە لە دەوری ڕستەسازی‌دان، نەك لە مەودای ڕۆنانی ئاوەڵناودا، كە سەر بە باسی وشەسازی یە . . . لێرەدا هەرچی وشەی «قوتابی»یە كە لە دوای ئەو ڕستەیەوە هاتووە و كە بە ڕەسەن ناوە، دەوری ئاوەڵناو دەبینێ .

هەرچی پەراوێزی (١٢٤)یشە، كە لەسەر پێناسەی ئاوەڵناو دایناوە تێیدا دەڵێ: «ئاوەڵناو، ئەگەر لە پاش ناوەوە یا ڕاناوەوە هات ئەو كاتە بێ زیادو كەم لە ژمارەدا لەگەڵیاندایە (تاك یا كۆ)، واتا ئەگەر (ناوەكە) یا (ڕاناوەكە) تاك بێ، ئەوا ئاوەڵناوەكەش تاكە، ئەگەر كۆ بێ، ئەمیش كۆیە، وەك:

ئەو ئازایە (تاك) . ئەوان ئازان (كۆ) . وەختی واش هەیە كە (ئاوەڵناو) لەپێش (ناوەوە) یا (ڕاناوەوە) دێت، وەك:

١ ـ ژمارەی پێش ناو: شەش تەن گەچم كڕی .

٢ ـ ئاوەڵناوی پێش ڕاناو: ئەوپۆلیسە پیس نەفەرە» (ل ١٦٣) . پڕ هەڵەو ناتەواوای‌یەو سەرنج بۆ بەشێكیان ڕادەكێشین :

١ ـ ڕاست نی یە بوترێ، ئەگەر ناویان جێناو تاك بێ، ئەوە دەبێ ئاوەڵناوەكەش تاك بێ؛ یاخود ئەگەر كۆ بن، دەبێ ئەمیش كۆ بێ . . . وەك ئاشكرایە، لە زمانی كوردیدا گەلێ حاڵەتی ئەوتۆ هەیە كە ئەم بۆچوونەی مامۆستا هەورمانی ڕەت بكەنەوە . بەر هەر شت پەنجە بۆ ئەوە ڕادەكێشم كە مامۆستا سەعید صدقی كابان لە لاپەڕە (٢٦)ی كتێبی «مختصر صرف و نحوی كوردی»دا نموونەی «مندالآنی زیرەك»ی هێناوەتەوەو دەڵێ: «نابێژ ڕێ (منداڵانی زیرەكان)»[9] . . . ئەوەتە وشەی «منداڵان» ناوو كۆیە، بەڵام «زیرەك»، كە ئاوەڵناوە تاكە . . . جا نەك هەر دەشێ ناو كۆ بێ و ئاوەڵناوەكەش تاك، بەڵكو لە كوردیدا پێچەوانەی ئەمەش هەیە، واتە وا ڕێ دەكەوێ ناوەكە تاكە ئاوەڵناوەكە كۆ . ئەوەتە پیرەمێرد دەڵێ:

ئەستێرە بەرزەكان ئەدرەوشێنەوە بە شەو
وەك من بە داخەوەن، نەسرەوتیان هەیەو نە خەو

(پیرەمێرد، ل ١٠٦)

هەروەها گۆرانیش وتوویە:

ئەی چاوا! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەرێ پەرت،
كوا باڵە تیژەكانی نیگای حوسنی دلبەرت؟

(گۆران، ب. ل ٢١)

٢ ـ لە ڕستەی «شەش تەن گەچم كڕی»دا وشەی «شەش» ژمارەیە، نەك ئاوەڵناو. جا لێرەدا ژمارە پێش ناو كەوتووە، نەك ئاوەڵناو پێش ناو كەوتبێ .

٣ ـ ڕستەی «ئەو پۆلیسە پیس نەفەرە»، كە كردوویەتی‌یە نموونەی هاتنی ئاوەڵناو لە پێش جێناوەوە، دروست نی یە . وەك ئاشكرایەووەك نووسەر خۆی دیاری‌كردووە لەو ڕستەیەدا ئاوەڵناوەكە وشەی «پیس»ە، كە لە پێش وشەی «نەفەر»ەوە هاتووە، بەڵام بە هیچ لێكدانەوەیێك وشەی «نەفەر» نابێتە جێناو. سەرباری هەموو ئەوەش لە ڕستەی ناوبراودا «پیس» و «نەفەر» دوو وشەی سەربەخۆ و جیا. نین، بەڵكو بە هەردووكیان وشەی لێكدراوی «پیس نەفەر» یان پێكهێناوە .

. . . هتد .

نووسەر پاشان دێتە سەر جۆرەكانی ئاوەڵناو لە ڕووی ڕۆنانەوەو دەڵێ: «لە ڕووی قەوارەوە، ئاوەڵناو دەكرێ بە دوو جۆرەوە:

١ ـ ئاوەڵناوی ساكار:

ئاوەڵناوی ساكار بریتی‌یە لە یەك وشە، وەك: ئازا، سوور، زیرەك، دوو هەندێ .

ئازاد ئازایە .

دوو گوڵم لێ كردەوە .

هەندێ دەفتەرم كڕی . . . هەندێ شتم كڕی .

٢ ـ ئاوەڵناوی لێکدراو:

ئەم جۆرە پێك هاتووە لە بتر لە وشەیێك، وەك:

ڕێك و پێك. دەستکرد، بیست ویەك. . .

ئازاد ڕێك و پیکە

ئەم کورسی یە دەستکردە

بیست ویەك صندوق گوێزم کڕی

ئەوە زۆر نەرم وشلە (ل ١٦٤ ـ ١٦٥).

**بەداخەوە ئەم بەشەش هەڵەو ناتەواوی هێندە زۆر تێدایە، کە لە توانستدا نی یە هەمووی بلوێین، بۆیە تەنیا بەشیکی کەمیان دەخەینە پێش چاو:**

**١ ـ لە باسی ئاوەڵناوی ساکاردا:**

**أ ـ لە پێناسەکەدا دەبوو بوترێ «برتی یە لە یەك مۆرفیم»، نەك مامۆستا هەورامانی واتانەنی «بریتی یە لە یەك وشە»، چونکە وەك ئاشکرایە، مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانەو هەرچی وشەشە دەشێ پێکهاتبعی لە چەند مۆرفیمێك.**

ب ـ وشەی «دوو»، کە نووسەر بە ئاوەڵناوی داناوە، ئاوەڵناو نی یەو ژمارەیە.

ج ـ وشەی «هەندێ»، ئەگەرچی دەنوانێ وەك ئاوەڵناویش خۆی بنۆێنێ، بەڵام لە ڕەسەندا جێناوەو مامۆستا نەدەبوو بە ئاوەڵناوی دابنێ:

**د ـ گەلی ئاوەڵناوی سادەی چالاك لە زمانی کوردیدا هەن و نووسەر ناوی نەبردوون.**

٢ ـ لە باسی ئاوەڵناوی لێکدراودا:

نووسەر لێرەدا نەك هەر باسی ئەو هەموو حاڵەتە زۆرو هەمەچەشنانەی نەکردووە، کە لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوی لێکدراویان لێ پەیدا دەبێ [١٠]، بەڵکو بە سێ نموونە، کە یەکێکیان ژمارەیە ئەو باسە گرنگەی پێ تەواوکردووە.

سەرنج ڕاکێشتر ئەوەشە کە نووسەر بە هیچ چەشنێك نە ناوی ئاوەڵناوی داڕێژ راوی هێناوەو نە باسی کردووە. وەك ئاشکرایە لە زمانی کوردیدا ژمارەیێکی زۆر پشگرو پاشگر هەن، کە دەچنە سەر ناوی سادەو ئاوەڵناوی سادەو ڕەگی کردار یان ناوی چاوگ و ئاوەڵکرداری سادەو دەیانکەنە ئاوەڵناوی داڕێژ راو [١١]. جا دەبوو ئەم کێشە پێویستە باس بکرێ. . . وێڕای ئەوە، لە باسی ئاوەڵناوی کتێبی «سەرەتایێك لە فیلۆلۆژ یی زمانی کوردی»دا گەلێ کێشەی دی گرنگ وپێویستی سەر بەو باسە هەیە، کە نووسەرەکەی هەر ناویشی نەبردووە.

لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە لاپەڕە (٧٥ ـ ٩١)ی کتێبی «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی»دا لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوی کۆڵیوەتەوە [١٢].

بۆ لێکدانەوەی زاراوەی ئاوەڵناوو پێناسەی ئاوەڵناو، باسی ئاوەڵناو بە گەشتێك بە هەندێ لەو نووسینانەدا دەست پێ کراوە، کە لەبارەی ئاوەڵناوەوە نووسراون. . . ئەوەی لێرەدا جێی سەرنج بێ، ئەوەیە کە لیژنەی ناوبراو لە سەرەتادا بۆ پێناسەی ئاوەڵناو ڕایێکی یەکگرتوو لە نێوان ئەندامەکانیدا نەبووەو بۆیە هەر یەکە بەپێی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی پێناسەیێکی تایبەتی خۆی پێشنیار کردووە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**١ ـ مامۆستا صادق بەهائەدین دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیێکە وەصفی مەوصوفەکەی خۆی دەکات و مەوصوفەکەی ناو بێت یا ڕاناو یا هەر شتێکی تر بێت.**

**٢ ـ د. نەسرین فەخری دەڵێت: ئاوەڵناو ئەو وشەیەیە کە لە خۆیدا (وصفیە) هەیە بۆیە جۆر و چۆنیەتی (موصوف) دیاردەخات لە ڕستەداو بەمەدا لە ناو جودا دەکرێتەوە، هەروەها توانای ئەوەی هەیە جێگای ناو بگرێتەوە ئەگەر هاتو بوو بە صفەتێکی دیار یان هەمیشەیی لە مەوصوفدا، یان وەك ناو بەکار دێت بەمە هێزی وەصفیەتەکە دەردەکەوێت و بەمانەش لە ناو جودا دەکرێتەوە.**

**٣ ـ مامۆستا هەژار دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیێکە لە خۆیدا مانای (وصفیة) هەیە لە ڕستەدا چۆنیەتی موصوف دەردەخات.**

**٤ ـ مامۆستا نووری عەلی ئەمین دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیێکە گوزارەی (وصفیە)ی تێدایەو بۆ تەواوکردنی واتایی ناو یا ڕاناو یا ئاوەڵناوێکی تر بەکار دەهێنرێت، هەندێ جاریش لە سنووری خۆی تێ دەپەڕێت و لە ڕستەدا وەك ناو یا ئاوەڵکار یا تەواوکەری فیعلی مساعد بەکاردەهێنرێت، وەك:**

**نازدار هات (نازدار بووە بە ناو)**

**بارام باش دەڕوات (باش بووە بە ئاوەڵکار بۆ وشەی دەڕوات)**

**پەروین جوانە**

**٥ ـ بیروڕای مەسعود محەمەد: وا دیارە هەموو ئەندامان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئاوەڵناو وشەیێکە (وصفیة)ی تێدایە. من ئەوەش دەخەمە سەر (وصفیة)و دەڵێم وشەکە دەبێ بە کاتیشەوە نەبەسترابێتەوە. بەمەدا دەتوانین بڵێین (ئاوەڵناو ناوێکە وەصفی تێدا بێ) چونکە ناو بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە. ئەم تەعریفە بەشی (ناو) ناگرێتەوە، چونکە واتای (وصفیة) لە ناودا نی یە، بەو پێ یە تەعریفەکە بۆ تەنها بەشی (ئاوەڵناو) دەمێنێتەوە کە ئەمەش مەبەستێکی بنجیبە لە دانانی تەعریفەکە (ل ٧٧ ـ ٧٨).**

دوای دەربڕینی ڕای جودا جودای ئەندامانی لیژنە، لەسەر بناغەی ئەو بیروڕایەی مامۆستا مەسعود محەمەد هەندێ ڕوونکردنەوەی دی بڕیاردرا ئەم پێناسەیەی خوارەوە بۆ ئاوەڵناو پەسەند بکرێت:

«ئاوەڵناو وشەیێکە (وصفیة)ی تێدایەو بەکاتەوە نەبەستراوەتەوە» (ل ٨١).

بە پێویستی نازانم لەو بیروڕا جوداوازانە بدوێم، کە لە سەرەتادا ئەندامانی لیژنە بۆ پێناسەی ئاوەڵناو دەریان بڕیوە، بەڵکو باشتر وایە ڕا یەکگرتووە پەسەندکراوەکەو هەندێ لێکدانەوەی دەمڕاستی لیژنە بخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە:

ئەگەرچی ڕاستە کە ئاوەڵناو (وصفیة)ی تێدایە، بەڵام ئەمە باش ئەوە ڕوون ناکاتەوە خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاری دەکا یان لەسەر بناغەی واتای لێکسیکی (سوور، لاواز، چاپووك. . .) یان لە ڕێگای پێوەندیی شت بە شتی ترەوە (کێوی بەفرین، زمانی کوردی. . .) ڕادەگەیەنرێ. . . یاخود دەبوو پەنجە بۆ ئەوە درێژ بکرێ، کە ئاوەڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك واتای چۆنیەتی و خاسیەت و

دەلالەت نیشان دەدات. ئەم نیشاندانەش چ لە بەکارهێنانی ڕستەسازیداو چ لە تایبەتێتی وشەسازیدا ڕوون و ئاشکرا بەدیاردەکەوێ.

ئەگەر لە لاپەڕە (٨١)ی ئەو کتێبەوە، کە پێناسەی «ئاوەڵناو»ی تێداکراوە، بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕە (١٠)، کە پێناسەی «ناو»ی تێدایە، ئەوە دێتە پێش چاومان، کە ئەو بەشە ئاخاوتنەش دیسان چەمکی بەکاتەوە نەبەسترانەوە ڕەچاو کراوەو نووسیوە: «ناو ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایێك دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوە...» (ل ١٠). لێرەدا بە پێویستی نازانم لە نادروستی گرتنی لایەنی بەکاتەوە نەبەسترانەوە بۆ ئاوەڵناو بدوێم، چونکە کاتی خۆی لە پێناسەی (ناو)دا بە دوورو درێژی لێی کۆڵیومەتەوە[١٣]. لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم، ئەگەر لەو بگەڕێینەوە بۆ پێناسەی (ئاوەڵناو) بچین، ئەوە دەبێ بۆ (جێناو)و (ژمارە)و (چاوگ)و پێشبەند)و (ئامرازی پێوەندی)و... هتدیش، هەمان مەسەلەی نەبەسترانەوە بەکاتەوە لە نەزەربگرین، چونکە ئەو بەشە ئاخاوتنانەش کە ناومان بردن، هەر یەك بە کاتەوە نەبەستراونەتەوە.

هەروەستی لیژنە لەو لێدوانەیدا کە دەڵێ: «لێرەدا دەمەتەقە هەڵدەستێ لەسەر ئەمە تیا کە وشەیەکی ئاوەڵناوی بێ گومان وەك (جوان، تێر، ئازا...) لە هەمەنگدا ئیشارەی بۆ کرا کە (ئاوەڵناو)ە، کەچی لە ڕستەدا جێگەی جەوهەرکردنی کار (فعل)ی گرتەوە وەك کە بگوترێ (تێرم خوارد...) (ل ٦٠)... «لەبارەی بەکارهێنانی وشەی ئاوەڵناوی بێ گومانی وەك (جوان) بۆ جەوهەری کار (فعل) دەتوانین بڵێین لەو تەرزە جێگەیەدا (موصوف)ێکی قرتاو هەیە، کە وەصفەکە دەلالەتی لێ دەکا. بە نموونە کە گوتمان (زۆرم خوارد) لێرەدا بە ئەصڵ (خواردنێکی زۆرم خوارد) بووەو وشەی (خواردن) قرتاوە کە (زۆر) دەلالەتی لێ دەکاو فیعلی (خوارد)یش ئیشارەی بۆ دەکا...» (ل ٧٩)... «لە کوردیشدا وشەیەکی (ئاوەڵکار) کە لە مادەی وشەیەکی (ئاوەڵناو)ەوە وەرگیرێت بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ بەکاردێت. بە نموونە لە وشەی (جوان) کە ئاوەڵناوە (بەجوانی) دەگوترێ بۆ ئاوەڵکار، هەروەها (ئازایانە، مەردانە) ئاوەڵەکان لە (ئازا، مەرد) وەرگیراون...» (ل ٧٩)... «بە نیسبەت ئەوەوە کە بگوترێ ئاوەڵناو لەوانەیە ببێتە ناو وەك (زانا هات)، لێرەدا هیچ سروشت و تایبەتیێکی ئاوەڵناو دەخلێ بەسەر ڕستەکەوە نییە چونکە (زانا) بۆتە (ناوی تایبەتی - اسم علم)...» (ل ٨٠)... هەندێ شتی تێکەڵ بەیەك کردووە...

لە ئەنجامی پێشکەوتن و گەشەکردنی زماندا، وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ بەشێکی دی ئاخاوتن. لە ئەنجامی ئەو ڕاگوێزانەشدا، وشە خاسیەتی پێشووی نامێنێ و شێوەی نوێ وەردەگرێ و لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی ڕستەسازی دەگۆڕێت. بەوێنە وشەی «جوان» لە ڕستەی «کچی جوان زۆرە»؛ «جوان کچێکی باشە»دا دوو بەشی جیاوازی ئاخاوتن و دوو ئەندامی جیاوازی ڕستەن. لەڕستەی یەکەمدا «جوان» ئاوەڵناوەو دیارخەرە. بەڵام هەر ئەو وشەیە لە ڕستەی دووەمدا واتایێکی تری وەرگرتووەو مەبەستێکی دی داوە - واتە بووە بە ناوو ئەرکی دیارخراو بەجێ دێنێ. وشەی «جوان» لە سەرەتادا هەر ئاوەڵناو بووە، بەڵام دواتر - واتە لە ئەنجامی گەشەکردن و پێشکەوتنی زماندا - وەك ناوی تایبەتی کەوتۆتە کار. وشەی «پیاوانە» لە ڕستەی «مام بارام جلی پیاوانە دەفرۆشێ»دا ئاوەڵناوە، چونکە وەسفی ناو دەکا. بەڵام ئەگەر بوترێ «ئازاد پیاوانە دانیشتووە»، ئەوە وشەی «پیاوانە» دەبێتە ئاوەڵکردار، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا - واتە چۆنیەتی دانیشتن نیشان دەدات. هەروەها لە ڕووی ڕستەسازییەوە ئەرکی جیاواز دەبینن. وشەی «هێمن» لە ڕستەی «ئازاد کوڕێکی هێمنە»دا ئاوەڵناوە؛ لە ڕستەی «هێمن کوڕێکی زیرەکە»دا ناوە؛ لە ڕستەی «دارا هێمن دەڕوێشت»دا ئاوەڵکردارە. بەم جۆرە دەبینین کە وشەی «هێمن» وەك ئاوەڵناوو ناوو ئاوەڵکردار خۆی دەنوێنێ - واتە وەك سێ بەشی ئاخاوتن بەکاردەهێنرێ... هەندێ وشە هەن، وەك (دەر، بەر، سەر، لا، پێش، پاش، دوا، ژێر، بن...) کە ناوو ئاوەڵکردارن - واتە وشەی واتادارن، بەڵام دەتوانن وەك پێشگریش خۆیان بنوێنن. بەوێنە (بەر) لە وشەی لێکدراوی «بەرماڵ»دا یاخود لە ڕستەی «نەسرین چووە بەر هەتاوەکە»دا وشەیە، بەڵام لە وشەی «بەربوون»و «بەردان»...دا پێشگرە. هەروەها ژمارەیێك پێشبەند، بەوێنە (پێ، تێ، لێ...)، وەك پێشگریش خۆیان دەنوێنن، بە نموونە «پێکەنین، پێگەیشتن...»، «تێکردن، تێگرتن...»؛ «لێدان، لێنان...»... هتد.

ڕاستە ئەگەر وشەیێك لە بنەڕەتدا ناو بێ ناڵوێ لە هەمان کاتدا لە ڕیزی ئاوەڵناو یان ژمارەدا دابنرێ... بێ گومان لێرەدا مەبەست گوێزانەوەی وشە نییە لە بەشێکی ئاخاوتنەو بۆ بەشێکی دی. بەڵێ ناو دەشێ وەك ئاوەڵناو بەکاربهێنرێ، بەڵام ئەو وشەیە ناشێ لەیەك کاتدا ناویش و ئاوەڵناویش بێ.

گوێزانەوەو گۆڕانی وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێکی دیکەی ئاخاوتن، دیاردەیێکی هەمیشەیی یە لە زماندا، لەبەر ئەوە دابەش کردنی وشە بەسەر بەشەکانی ئاخاوتندا کارێکی گرانە.. بێ گومان هەر زمانێکیش لە گواستنەوەو گۆڕانی وشەکانیدا، خاوەنی توانست و تایبەتێتی خۆیەتی. لە زمانی کوردیدا، وەنەبێ هەموو بەشەکانی ئاخاوتن وەك یەك بە ئاسانی بگۆڕێن. بەوێنە ئاوەڵناو زوو دەبێتە ناوو ئاوەڵکردار، پێشبەندو ئاوەڵکردار چالاکتر لە بەشەکانی تری ئاخاوتن دەبنە پێشگر، بەڵام جێناو لەو ڕووەوە کەم توانستە[١٤].

مامۆستا مەسعوود لەوەدا ڕاستە، کە دەڵێ: «بە نموونە کە گوتمان (زۆرم خوارد) لێرەدا بە ئەصڵ (خواردنێکی زۆرم خوارد) بووەو وشەی (خواردن) قرتاوە کە (زۆر) دەلالەتی لێ دەکا...» (ل ٧٩)، بەڵام کاتێ دەوترێ «خواردنی خۆشم زۆر خوارد» خۆ ئەوە هیچ وشەیێك نەقرتاوەو (زۆر)یش ڕوون و ئاشکرا وەسفی کردارەکە دەکاو گومان لە ئاوەڵکرداری ناکرێت...

لیژنە دوای ئەو لێدوان و پێناسەیە لە ڕووی پێکهاتنەوە لە ئاوەڵناو دواوە. ئەگەرچی لەم بارەیەوە هەندێ جیاوازیی بیروباوەڕ لە نێوان ئەندامانی لیژنەدا هەیە، بەڵام لە ئەنجامدا لە ڕووی پێکهاتنەوە هەروەك ناو، ئاوەڵناویشی بەسەر سادەو ناسادەدا دابەش کردووە. هەرچی ناسادەشە داڕێژراوو لێکدراوی لێ جیاکردوتەوە.

بەداخەوە، ئەم باسە شتی لاوەکی زۆرتێ ئاخنراوە، کەچی هەندێ شتی سەرەکی و پێویست باس نەکراوە. بەوێنە ئەم باسە چوار لاپەڕە دەبێت و ماکەکەی لە دوو دێر تێ ناپەڕێ. . . کەم و کورتی و ناتەواوی هەرە بەرچاوی ئەم باسەش لەوەدایە کە لیژنە لە چۆنیەتی و جۆری ڕۆنانی ئاوەڵناوی ناسادە نەدواوە ـ واتە باسی ئەو پێشگر و پاشگرانەی نەکردووە کە یاریدەی دروست کردنی ئاوەڵناو دەدەن؛ یاخود باسی شێوازی پێکهاتن و جۆرەکانی ئاوەڵناوی لێکدراوی نەکردووە. . . بە نموونە لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر پاشگر و چەند پێشگرێك هەن، دەچنە سەر (ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار)ی سادەو دەیانکەنە ناوی دارێژ راو. . . لیژنە نەك هەر باسی ئەو پاشگر و پێشگرانەی نەکردووەو دەربارەی ئاوەڵناوی دارێژ راو هیچ شتێکی نەوتووە، بەڵکو سەبارەت بە ئاوەڵناوی لێکدراویش هیچی نەنووسیوە.

پاش ئەوەی لیژنە بەو ناتەواوی و کەم و کورتی یە لە ئاوەڵناوی سادەو ناسادە دواوە، ئنجا هاتۆتە سەر باسی «ئاوەڵناو لە ڕووی گوزارەوە» (ل ٨٥ ـ ٩١). لە سەرەتادا ئەوەی مامۆستایان: سەعید صدقی کابان و تۆفیق وەهبی لەو بارەیەوە وتوویانەو ئەوەی لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکاندا نووسراوە خستوویانەتە بەرچاو و ئنجا ئەندامانی لیژنە یەکە یەکە ڕای خۆی لەبارەی «جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە» دەربڕیوە. . . بەداخەوە، ئەم باسەش کەم و کورتی و هەڵەی زۆرە:

بەر لە هەرشت، لیژنە دەبوو وێرای ئەو سێ سەرچاوەیە،[15] ئەو سەرچاوانەی تریش، کە باسی ئاوەڵناویان کردووە بخاتە پێش چاو، چونکە وەك ئاشکرایە پێش ئەو لێدوانەی لیژنە گەلێ باس و نووسینی‌تر دەربارەی ئاوەڵناو بلاکراوەتەوە.[16]

ڕەنگە زێدە ڕۆیی نەبێ، ئەگەر بڵێم هەموو ئەندامانی لیژنە (جگە لە مامۆستا مەسعوود محەمەد) لە دابەش کردنی ئاوەڵناوا لە ڕووی واتاوە، تووشی هەڵەی گەورە گەورە بوون. بەوێنە:

١ ـ چ مامۆستا صادق بەهائەدین و چ د. نەسرین فەخری و چ مامۆستا نووری عەلی ئەمین پلەکانی ئاوەڵناویان بە جۆرێك لە جۆرەکانی ئاوەڵناو داناوە لە ڕووی واتاوە. . . وەك ئاشکرایە، پلەکانی ئاوەڵناو فۆرمی جیاوازی یەك وشە نیشان دەدەن و حاڵەتی ڕێزمانین. لەبەر ئەوە هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشان دەدەن، بۆیە ڕاست نی یە وەك وشەی جیاجیا تەماشابکرێن، واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن، بەڵکو فۆرمی جۆر بەجۆری یەك وشە دەردەبڕن. کەواتە مەسەلەکە وشەگۆڕی یە، نەك وشەڕۆنان. جا بۆیە ناکرێ ئەم کێشەیە بخرێتە باسی جۆرەکانی ئاوەڵناوەوە لە ڕووی واتاوە.

٢ ـ مامۆستا نووری عەلی ئەمین هەشت جۆر ئاوەڵناوی دیاری کردووە، کە زوربەیان نەك هەر بە ئەسڵ ئاوەڵناو نین، بەڵکو لەو نموونانەشدا کە بۆیانی هێناوەتەوە نە بوون بە ئاوەڵناو و نە دەوری ئاوەڵناو دەبینن. لێرەدا بە پێویستی نازانم لەو بۆچوونانە بدوێم، چونکە مامۆستا مەسعوود محەمەد لە لاپەڕە (٨٩ ـ ٩١)دا بە شێوەیێکی زانستی ڕەتی کردوونەتەوە. . .

تێکڕای باسی ئاوەڵناو لە کتێبی «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکان»دا یەکجار سادەو پڕ ناتەواوی و هەڵەیە. . . .

**ئەنجام:**

بەم جۆرە ـ واتە دوای کورتە گەشتێك بەو شەش کارەدا کە دەربارەی ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا نووسراون ـ ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە زوربەیان سادەو ساکارن و ناتەواوی و هەڵەی زۆریان تێدایەو بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون و تیشکی ڕووناکی یان ئاراستەی گەلێك ڕووی نەکردووەو ئەنجامێکی سەرکەوتوویان وەدەست نەهێناوە. . .

ئەو نووسەرانەی پێناسەی ئاوەڵناویان کردووە، ئەگەرچی زوربەیان مەسەلەی وەسفیەتیان لە نەزەر گرتووە، بەڵام هیچ کامێکیان ئەوەیان ڕوون نەکردووەتەوە خاسیەتی شت کە ئاوەڵناو دیاری دەکا لەسەر بناغەی واتای لێکسیکی یان لە ڕێگای پێوەندیی شت بە شتی ترەوە ڕادەگەیەنرێ. . . یاخود پەنجەیان بۆ ئەوە درێژ نەکردووە، کە ئاوەڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك واتای چۆنێتی و خاسیەت و دەلالەت نیشان دەدا.

بەشێك لە نووسەران لە جۆرەکانی ئاوەڵناو نەدواون، ئەوانەش کە باسیان کردووە، وشەو حاڵاتی ڕێزمانی و بەشە ئاخاوتنی هەمەجۆریان لەژێر سەرباسی جۆرەکانی ئاوەڵناودا باس کردووە.

لە باسی ئاوەڵناو لە ڕووی ڕۆنانەوە چەند کێشەیێك دەبینرێ:

١ ـ هەندێ لە نووسەران نە باسیان کردووەو نە بەلایدا چوون.

٢ ـ تێکڕای ئەو نووسەرانەی باسی ئەو پێشگر و پاشگرانەیان کردووە، کە یاریدەی سازکردنی ئاوەڵناوی دارێژ راو دەدەن، ئەگەرچی لە بەشێکی زۆریان دواون، بەڵام چەند پاشگر و پێشگرێکی چالاك هەن، ناویان نەبردووە.

٣ ـ تەنانەت ئەوانەش کە بەباشی و دوورو درێژ ی لە جۆرەکانی ئاوەڵناوی لێکدراو دواون، گەلێ شێوە پێکهاتنی دیارو ئاشکراو گرنگیان یادداشت نەکردووە.

٤ ـ گەلێ جار ئەوە بەرچاو دەکەوێ، کە ئاوەڵناوی دارێژ راو بە لێکدراو دانراوەو بە پێچەوانەشەوە لێکدراو بە دارێژ راو ناوبراوە.

مەسەلەی باسی پلەکانی ئاوەڵناو دوو تێبینی بنەڕەتی لێ پەیدادەبێ:

١ ـ لە هەندێ کاردا کێشەی «پلەکانی ئاوەڵناو» لە بەشی «وشەڕۆنان» دا باس کراوەو لە چەند بەرهەمێکیشدا لە باسی «جۆرەکانی ئاوەڵناو»دا لێی کۆڵراوەتەوە. . . وەك ئاشکرایە، لە هەرسێ پلەکانی ئاوەڵناودا مەبەست هەر یەك دەلالەتە، بەڵام جیاوازیی پلەی بەراوردو پلەی باڵا لەگەڵ پلەی چەسپیودا، ئەوەیە ئەوان خاسیەتی نیسبی یان تێدایە. پلەی بەراوردو پلەی باڵا شتێك بەجیا نیشان نادەن، بەڵکو نیشانی بەراوردیان دەدەن لەگەڵ شتی تردا. لەبەر ئەوەی هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشان دەدەن، بۆیە ڕاست نی یە وەك وشەی جیاجیا تەماشابکرێن ـ واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن، بەڵکو فۆرمی جۆر بە جۆری

...ت وشه دەردەبڕن. کەوابوو مەسەلەکە وشەگۆڕی‌یە، نەك وشەڕۆنان.

... ئەگەرچی باسی پلەکانی ئاوەڵناو لە زوربەی ئەو کارانەدا بەدی دەکرێ، ...ڵام حگــە لە هەڵــەی زۆر، ئەو ناتەواوی‌یەش دەبینرێ، کە گەلێ ڕێگەی ... ووی ئەو پلانە ناونەبراون.

...ەکان:

سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٨، ل ٢٥ - ...

... ئەگەر دیارخراو بە یاریدەی (ە)ەوە بە دیارخەرەوە ببەسترێ، ئەو دەمە نەك هەر ...ەی کۆ، بەڵکو هەموو نیشانەکانی تریش هەر بە دیارخەرەوە دەنووسێن و ...ر و هەرگیز وەریان ناگری. وەك:

- ...ەی (ەکە). بەوێنە:

...چە جوانەکە؛ کورە ئازاکە..

- ...نەی (ێك). بەوێنە:

...چیە عەیارێك...

- ...ەی (ەکە + ان). بەوێنە:

...ە بەرزەکان؛ بەرخە بچکۆلەکان...

هتد.

...ڵام ...و دیارخراو بە یاریدەی (ی)یەوە بە دیارخەرەوە ببەسترێ، ئەوە تەنیا لە ...ێکدا نیشانەکان دەچنە سەر دیارخەر (ئاوەڵناوەکە)، کە دەوری (مضاف ...). وەك:

کوڕی ئازاکە

کوڕی ئازایێك

کوڕی ئازایان

کوڕی ئازاکان

...مدا کە ئاوەڵناوی (ئازاکە، ئازایێك، ئازایان، ئازاکان) بەدوا وشەی ...وڕی)دا هاتووە دەوری (مضاف الیه)ی بینیوە، هۆی ئەوەیە کە بە مەبەست ...ێك)ە (ئازایە)یەو ئەو ناوەی بەردەمی کە وەسفی دەکا لابراوە.

...) تەوفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩، ل٦١ - ٨١.

...) ئەگەرچی ئەرکەکانی ئاوەڵناو لەوە زیاترە، کە مامۆستا تۆفیق وەهبی لێی ...وە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە لە ڕووی وشەسازی‌یەوە دەڕوانێتە ...و، بۆیە لەو بارەیەوە هیچ تێبینیمان دەرنەبڕیوە.

...) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ١١١ - ...

...) جگەر خوین، آوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١.

...) بۆ زانیاری پتر لەبارەی (ی)ی ناوی مەعناو (ی)ی سیفەی نیسبی‌یەوە، بڕوانە:

أ - مەسعوود محەمەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، ب١، ژ١، بەغدا، ١٩٧٣، ل٢٩ - ١٠٢.

ب - فارووق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، ب٣، ژ٢، بەغدا، ١٩٧٥، ل٤١٧ - ٥٢٣.

ح - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٢، ٥٩، ٦٦ - ٦٧.

ء - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٩، ل١١٢ - ١١٥، ١٢٦.

(٨) محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣، ل ١٦٣ - ١٦٥.

(٩) سەرچاوەی ناوبراو، سەعید صدقی کابان، ل٢٦.

(١٠) بۆ وەرگرتنی زانیاری لەبارەی ئاوەڵناوی لێکدراوەوە، بڕوانە لاپەڕە (٨٧ - ٨٩)ی کتێبی «وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا»، بەغدا، ١٩٧٧.

(١١) بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو باسە، بڕوانە لاپەڕە (٦٥ - ٧٢)ی هەمان سەرچاوە.

(١٢) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦، ل٧٥ - ٩١.

(١٣) بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٩، ل٤٢ - ٤٣.

(١٤) بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە، بڕوانە:

أ) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٩، ل ١٣ - ١٥.

ب) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٨٧، ل٣.

(١٥) سەیرو سەمەرە ئەوەشە، بەشێکی زۆری زانیاریی نێو ئەو سەرچاوانەیان بە هەڵە بۆ کارەکەی خۆیان گوێزاووەتەوە. بە نموونە، دەڵێن: «لە ڕێزمانی قوتابخانەکاندا، ئاوەڵناو کراوە بەم بەشانەی خوارەوە:

١ - ئاوەڵناوی فرمانی: ئەمیش دەکرێ بە سێ بەشەوە:

١ - بکەر، وەك: نووسەر، بکوژ.

٢ - کراو، وەك: نووسراو، هەڵ کەندراو.

٣ - ناوی فرمان، وەك: گریە، پرسە، ترس.

٢ - ئاوەڵناوی ئیشاری:

أ - ئیشاریی دیار، وەك:

ئەم - ئەو

ئەمە - ئەمانە

ئەوە - ئەوانە

ب - ئیشاریی نادیار، وەك:

گەلێك، هیچ، فلان، هین.

٣ ـ ئاوەڵناوی چەندی، ئەمیش دەکرێ بە دوو جۆرەوە:

١ ـ ئاوەڵناوی چەندیی دیار، وەك:

دە، بیست، هەشت

٢ ـ ئاوەڵناوی چەندیی نادیار

(هیچ میسالی بۆ نەهێناوەتەوە)

٤ ـ پلەکانی ئاوەڵناو: دەیکات بەسێ بەشەوە:

١ ـ پلەی چەسپیو: گەورە، رووت.

٢ ـ پلەی بەراووردی: گەورەتر، رووتتر.

٣ ـ پلەی باڵا: جوانترین، گەورەترین» (ل ٨٦)

بەڵام ئەمەی لە کتێبی ڕێـزمـانی قوتـابخـانـەکـانـدا سەبـارەت بەو کێشـەیـە نووسراوە، بەم جۆرەیە:

● لە کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا:

١ ـ ئاوەڵناوی چۆنی (ل ٦٦ ـ ٦٧)

٢ ـ پلەکانی ئاوەڵناوی چۆنی (ل ٦٨ ـ ٧١)

● لە کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا:

٣ ـ ئاوەڵناوی نیشان (ل ٨٥ ـ ٨٦)

● لە کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەییدا:

٤ ـ ئاوەڵناوی ژمارەیی

أ ـ ئاوەڵناوی ژمارەیی بنجی (ل ١٩ ـ ٢٢)

ب ـ ئاوەڵناوی ژمارەیی تەرتیبی (ل ٢٣ ـ ٢٦)

حـ ـ ئاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی (ل ٢٧ ـ ٣١)

د ـ ئاوەڵناوی نادیار (ل ٣٢ ـ ٣٣)

● لە کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەییدا:

٦ ـ ئاوەڵناوی بکەر (ل ٢٧ ـ ٣٤)

٧ ـ ئاوەڵناوی کراو (ل ٣٥ ـ ٤٢)

(١٦) بە نموونە:

أ ـ نووری عەلی ئەمین، ریزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١١١ ـ ١٤١.

ب ـ جگە خوین، آوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١، ل٢٩ ـ ٣٠، ٦٥ ـ ٦٦.

حـ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣، ل١٦٣ ـ ١٦٥.

ء ـ د. قـەنـاتێ کوردۆ، زمـانێ کوردی، چاپی چوارەم، یەریڤـان، ١٩٧٠، ل٥٠ ـ ٥٤، ٨٩.

هـ ـ د. قەناتی کوردۆ، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٥٧، ل

و ـ D.N. Mackenzie, kurdish Dialect Studies, London, 1961, pp

... و گەلێکی تر.

---

## ملخص البحث:

# تقييم موجز لستة كتب بحثت عن الصفة

د. عبدالرحمن الحاج معروف
قسم اللغة الكردية بكلية التربية في جامعة بغداد

لغرض بيـان تعـريف الصفـة والاشـارة الى أنواعها ودرجاتها وعرض بعض مسائلها اختار الباحث ستة كتب بحثت عن الموضوع باللغة الكردية وهي:

١ ـ سعيد صدقي، مختصر صرف ونحو كوردي، بغداد، ١٩٢٨،

٢ ـ توفيق وهبي، دەستووری زمانی کوردی، جـ ١، بغداد، ١٩٢٩،

٣ ـ نوري علي أمين، ريزماني كوردي، السليمانية، ١٩٦٠،

٤ ـ جگرخوين، آوائو دەستوورا زمانی کوردی، بغداد، ١٩٦١،

٥ ـ محمد امين هوراماني، سەرەتاییك لە فیلولۆژی زمانی كوردی، بغداد، ١٩٧٣.
٦ ـ ریـزمـانی ئاخـاوتنی كوردی بەپێی لێكۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەكانی ـ الهيئة لكردية، بغداد ١٩٧٦) وفي سبيل استخلاص نتائج من هذه البحوث المهمة وضع بعض الحقائق الآتية أمام الأنظار:

١ ـ مع اعتبار الباحثين للمسألة الوصفية عند تصديّهم لتعريف الصفة الاّ ان أحداً منهم لم يبين من انّ خاصية الشيء التي توضّحها الصفة تبلّغ على اساس معناها اللكسيكولوجي او عن طريق ترابط الاشياء فيما بينها، أو لم يشيروا الى انّ الصفة ـ باعتبارها جزءاً من الكلام ـ توضح المعنى الواقعي والخواص والدلالة.

٢ ـ لم يذكر قسم من الباحثين أنواع الصفة من حيث المعنى، اما الذين ذكروها فقد حشروا الكلمة والحالات القواعدية والاجزاء المتنوعة من الكلام تحت عنوان «انواع الصفة»

٣ ـ ثمة مشاكل يجابهها المرء في موضوع تكوين الصفة وهي:
أ ـ لم يتطرق اليها بعض الباحثين مطلقاً.
ب ـ والباحثون الذين تحدثوا عن السابقات واللاحقات اللواتي يساعدن على تكوين الصفة المشتقة فاتهم ذكر سابقات ولاحقات اخرى نشيطة.
جـ ـ وحتى الذين تطرقوا الى انواع الصفات المركبة بتفصيل وجدية لم يذكروا عدة صيغ تكوينية شائعة ومهمة.
هـ ـ كثيراً مايشاهد المرء وضعهم الصفة المشتقة محل الصفة المركبة والعكس بالعكس.

٤ ـ وهناك ملاحظتان رئيستان حول موضوع «درجات الصفة»:

أ ـ ذكر في بعض هذه الكتب مسألة درجات الصفة تحت باب بناء الكلمة بينما بحث عنها في البعض الآخر في باب «انواع الصفة» علماً بان القصد في الدرجات الثلاث للصفة هو لدلالة واحدة، لكن اختلاف درجة المقارنة والدرجة العظمى كلتاهما مع الدرجة المستقرة هو انهما تحتويان على خواص نسبيّة، حيث لا توضح درجة المقارنة والدرجة العظمى شيئاً مستقلاً لكنها تعرضان المقارنة مع أشياء اخرى. ولأن درجات الصفة جميعها توضّح شيئاً واحداً لذا فليس من الصحيح أن ينظر اليها باعتبارها كلمات متفرقة ويعني هذا انها لاتكوّن كلمات جديدة بل تعبّر عن أشكال متعددة اي ان المسألة هي مسألة تصريف الكلمة وليس بناؤها.
ب ـ ومع تطرق معظم هذه الكتب الى درجات الصفة فبلاضافة الى وجود اخطاء كثيرة يلاحظ وجود نقص كبير هو عدم الاشارة الى عدة طرق لتكوين هذه الدرجات.

# چەند بابەتی وشەسازی لە زاری کەڵهوڕی دا

عبدالمحسن بني ويس

لەم تۆژینەوەدا باسی چۆنێتی پێك هێنانی وشەی داڕێژراوو لێکدراو)ی کوردی لە زاری کەڵهوڕی‌دا دەکەم، هەرچەندە پسپۆرەکانی زمانی کوردی بایەخێکی زۆریان بەم لایەنە داوەو تەقەلایێکی چاکیان کردووە، بەڵام کارەکانیان تەنها لە چوارچێوەی چەند زارێك، بە تایبەتی زاری کرمانجی خوارو و زاری کرمانجی ژوورو نەچووەتەدەر. بۆیە لەم تۆژینەوەدا بە پێی توانای خۆم ئەم بابەتە لەم زارەدا، زاری کەڵهوڕی، روون دەکەمەوە بەڵکو کارەکەم هەر هیچ نەبێ خزمەتێك بە ڕێزمانی کوردی بگەیەنێت.

ئەم باسە ئەم بابەتانەی خوارەوە روون دەکاتەوە:-

**گیرەك:-**

گیرەك (Affixes) وەکو ئاشکرایە بە تەنیا خۆی لە زمان دا بایەخی نی‌یە بەڵام کە دەچێتە سەر وشەیێك، وشەیێکی نوێ بە واتایێکی جیاواز دادەڕێژێ. گیرەك سێ جۆری هەیە:-

**أ - ناوگر (Infix)**

تا ئێستا کەس لەم بابەتەدا کارێکی ئەوتۆی نەکردووە کە ببێ بە مایەی دەوڵەمەندکردنی ئەم باسە بەڵام دەبێ پەنجە بۆ کارە بە نرخەکەی مامۆستا مسعود محمد ڕابکێشین لە (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ص ١٧ - ٨٢)، کە چەند وشەیێکی هێناوەو بەراوردی لەگەڵ چەند وشەیێکی‌دی کردووەو ئەوەی بۆ سەلماندووین کە ناوگر لە زمانی کوردی‌دا هەیە.

**ب - پێشگر (prefix):**

پێشگر لەم زارەدا ئەمانەن:

**١ - پێشگری (ب):**

أ - ئەم پێشگرە لەگەڵ ڕەگی کاردا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك:

بمر، بکوش، بسین، بفروش

- زامەگەی بمر نی‌یە.

ب - لەگەڵ ڕەگی فرمان دا ناوی کارا پێك دەهێنێ وەك:

بخوەر، بزەن، بوەر، بکوش، بوور، بنویس.

- بکوش و بوور هەر خوەیە. (پەندی پێشینان)

**٢ - پێشگری (مە):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ فرمان دا ئاوەڵناو دروست دەکات وەك:

مەخوەر، مەکەر، مەگوو، مەمر، مەوەر

- جوان نی‌یە، دزمەوەرە.

**٣ - پێشگری (نە):**

أ - ئەم پێشگرە لەگەڵ ڕەگی فرمان ئاوەڵناو دروست دەکات وەك: نەمر، نەزووك، نەزان

تف لە شەرتەگەی نیمە تەماود

خوەم ناشی نەزان کەفتم لە دامد

(فۆلکلۆر)

ب - لەگەڵ ناودا ناوێکی کە دروست دەکات وەك:

نەخوەنەواری، نەمردەنی، نەدارایی

- نەدارایی سەر ئایەم کێگەماڵ دژمنەوە. - پەند -

**٤ - پێشگری (بێ):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو دروست دەکات وەك:

بێ‌دەرەتان، بێ‌فەر، بێ‌شوو، بێ‌مروەت

**٥ - پێشگری (نا):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو دروست دەکات وەك:

نارەوا، ناپیاو، ناکەس، ناجوور، ناهەموار

- نەگیری ئەرا مردگ، نەرەنج ئەرا ناکەس. - پەند -

**٦ - پێشگری (با):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو دروست دەکات وەك:

بادین، بائیمان، بارەوشت، باخودا

**٧ - پێشگری (نەو):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ ئاوەڵناودا ناو پێك دەهێنێ وەك:

نەوجوان، نەونەمام، نەوبەر

- ئاخری خێر بوو، نەو بەرەی نێربوو. - پەند -

**٨ - پێشگری (وە):**

ئەم پێشگرە لەگەڵ ناودا هەم ئاوەڵناو و هەمیش ئاوەڵکار پێك دەهێنێ. وەك:

وەکر، وەناز، وەتاو، وەشیر، وەگور

- خەسرەو وەقوەتە. (لێرەدا ئاوەڵناوە)

- خەسرەو وەقوەت دا لێی. (لێرەدا ئاوەڵکارە)

٩ - پێشگری (ئەڵ):

ئەم پێشگرە هەر (هەڵ)ی سۆرانییە. د. ئەورەحمانی حەجی مارف دەڵێ «ئەم پێشگرە بە زۆری بۆ بزووتنەوەی بەرەو ژوور بەکاردێت بەڵام هەندێ جار مەبەستی تریش دەگەیێنێ»[1]

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەڵێ «دەچێتەسەر هێندی وتە جوولانەوەیێکی سەر بەرەوژوور دەگەیێنێ»[2] ئەم پێشگرە دەچێتە سەر چاوگ، دەیکات بە چاوگێکی کە وەك:

ئەڵ چەرخانن، ئەڵ گرتن، ئەڵ ماڵین، ئەڵ پەڕین.

- وراز مل ئەڵ چەرخنێ ملی شکێگ. - پەند -

١٠ - پێشگری (هاو):

ئەم پێشگرە لەگەڵ ناودا وێکی هاوکاری، یان یەکسانی دەگەیێنێ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەڵێ: «وتەیەکە بۆ هاودەمی و هاوکاری دووگیاند بەکار دێنرێ»[1] وەك:

هاوولات، هاوماڵ، هاوعەشرەت، هاوسەر، هاوسا

- تالان بێ هاوماڵ کریا. - پەند -

١١ - پێشگری (دا):

ئەم پێشگرە جوولانەوەیێکی بەرەو خوار نیشان دەدات. وەك:

داوەزین، داگرتن، داماڵین، داملکان، دارزیان، داجریان

- ئاسارەی لە ئاسمانەوە داجریاگە. ( د)

١٢ - پێشگری (وەر):

ئەم پێشگرە دەچێتە سەر چاوگ دەیکاتە چاوگێکی کە وەك:

وەرنان، وەرگرتن، وەرچەرخانن

جـ - پاشگر (sufix):

پاشگر لەم زارەدا ئەمانەن:

١ - پاشگری (ا):

ئەم پاشگرە لەگەڵ ڕەگی فرمان دا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك:

پرسا، زانا، خورا، دانا

- دانا بوو یا پرسا بوو، (پەندی پێشینان)

٢ - پاشگری (ار):

ئەم پاشگرە لەگەڵ کاری ڕابردوودا ناو پێك دەهێنێ. وەك:

کردار، ڕەفتار، کوشتار، دیدار، گرفتار

٣ - پاشگری (ارە):

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی کە دروست دەکات وەك:

شەوارە، توخمارە

٤ - پاشگری (اك):

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ڕەگی کاردا ناو دروست دەکات وەك:

خوراك، ترسناك

خەم خورد، خەم خوراك، خەم مەردەنمی
خەم تەوق زنهار لە گەردەنمی

- شیعری فۆلکلۆری -

ب - لەگەڵ ناویش دا وەك: خەمناك، خەفەتناك

٥ - پاشگری (اڵ):

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی کە پێك دەهێنێ. وەك:

ئەڤداڵ، نختاڵ، گەناڵ، گوتاڵ

- ئێمروو یەك ئەڤداڵ پووس وە کووڵی دیم
وە زەروور هەواڵ لەیلی پرسی لیم

- شیعری فولکلۆری -

٦ - پاشگری (انە):

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك:

پیاوانە، کورانە، ژنانە، شێرانە، ئازایانە

- ژنێ توام ژنانە پوسە بکێگ وە هەوانە. - پەندی پێشینان -

ب - لەگەڵ ناویش دا ناوێکی کە، یان ئاوەڵکار دروست دەکات وەك:

ساڵانە، مانگانە، ڕووژانە، هەفتانە.

٧ - پاشگری (ان):

هەرچەندە لەم زارەدا ئامرازی کۆکردن (ەیل = کورەیل)ە، بەڵام پاشگری (ان)یش بە شێوەیێکی فراوان، نەك لە دەقەفۆلکلۆرییەکان بەڵکو لە قسەی ڕۆژانەیش بۆ کۆکردن بەکاردەهێنرێ، وەك:

پیاوان، ژنان، کوران ماڵان، باوان، چاوان

- هەزار بمرێ لە باوان، سوبەرمگ نیەورێگ لە چاوان - پەندی پێشینان -

ب - لەگەڵ ڕەگی فرمان دا ناو دروست دەکات وەك: ۆاران،

**٨ ـ پاشگری (ەڵ):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك: گردەڵ، خرتەڵ، ریقەڵ، زەردەڵ، رویتەڵ، گیزەڵ

ـ نە لە مایەرم و نە لەپێەرم گیزەڵ گونی بویە برادەرم. (پەندی پێشینان)

**٩ ـ پاشگری (وەر):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ، وەك:

دەمەوەر، جەماوەر، جانەوەر

جەم بەس جەماوەر جەمرانی تەمام
زولێخا صیفەت شیرین ئەل ئامان
(شیعری فۆلكلۆری)

**١٠ ـ پاشگری (ەمەنی):**

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر رابردووی سادە ناو پێك دەهێنێ وەك:

خواردەمەنی، سووزمەنی

**١١ ـ پاشگری (ە):**

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر رابردووی سادە ناو پێك دەهێنێ وەك:

گووشە، سەرچاوە، پەنجە، هەفتە

**١٢ ـ پاشگری (ە، ەگە، ەگان).**

ئەم پاشگرانە نیشانەی ناسیاون:

أ ـ پاشگری (ە) دەچێتەسەر ناو بۆ ناسیاو وەك:

كورە، دویەتە، ژنە

ـ كورە ها لە ماڵ؟

ـ نیەزانم ژنە زای تا نە؟

ب ـ پاشگری (ەگە) لەگەڵ ناودا بۆ ناسیاوی تاك بەكاردەهێنرێ وەك:

سوارەگە، پاڵەوانەگە، شارەگە، دارەگە، كارەكە

حـ ـ پاشگری (ەگان) لەگەڵ ناودا بۆ ناسیاوی كۆ بەكار دەهێنرێ وەك:

رینەگان، بزنەگان، باخەگان

ـ باخەگانی خوار ئاوایی هاتنە بەر.

**١٣ ـ پاشگری (ی):**

ئەم پاشگرە ناو دەكاتە ئاوەڵناو، وەك:

بەهەشتی، دووزەقی، پیری، شیرینی، سەوزی، گورگی

ـ پیری هات وە پیریمەوە كەس نیەتێگ وەتەنگ دڵگیریمەوە

ـ شیعری فۆلكلۆری ـ

**١٤ ـ پاشگری (ێ، ێگ):**

أ ـ بۆ تاك بەكاردەهێنرێ وەك:

دڵێگ، دڵێ. مانگێ، مانگێك، شارێ، شارێگ. گەزێ، گەزێگ

ـ دڵێگ وەتەنگ تا شارێ وەتەنگ (پەندی پێشینان)

ب ـ بۆ نەناسیاو بەكاردەهێنرێ وەك:

سەراوێ، سەراوێگ. شاخێ، شاخێگ، كەژێ، كەژێگ

ـ میرزام سەراوێ، میرزام سەراوێ
یەك روو راگەم كەفتەسەر سەراوێ
(شیعری فۆلكلۆری)

**١٥ ـ پاشگری (ن):**

ئەم پاشگرە ناو دەكات بە ئاوەڵناو وەك:

زگن، خرپن، چڵمن، رشكن، قرتن، شەرمن

**١٦ ـ پاشگری (ەوە):**

أ ـ ئەم پاشگرە چاوگ دەكاتە چاوگێكی كە (لە واتاییكی جیاواز)

هاتنەوە، چگنەوە، كردنەوە، سەنینەوە.

ب ـ چاوگ دەكاتە چاوگێكی كە واتای دووبارە كردنەوە دەگەینێ وەك: نویسانەوە، سرینەوە، پركردنەوە

**١٧ ـ پاشگری (ین):**

ئەم پاشگرە ناو دەكات بە ئاوەڵناو وەك:

شەكەرین، درگین، خەرگین، وەفرین

ـ گاجار مەنایمن سەر ئەو یەك سەرین
گاجار گووش دامە رازی شەكەرین
(فولكلور)

**١٨ ـ پاشگری (ەیل):**

ئەم پاشگرە لە بنەرەتا (گەل)ە بووە بە (ەیل). بۆ نیشانەی كۆكردن بەكار دەهێنرێ، وەك:

ماڵەیل، جوانەیل، ناشیەیل، شوانەیل.

ـ كەڵێگەن لە كەڵ رەم تەمەنای دویركەر

ناشیەل چاشن و صەیادەیل پیرکەر

(فولکلور)

**١٩ - پاشگری (گ):**

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ڕەگی فرمان دا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك:

مردگ، زینگ، گردگ

- مردگی باواند چوارو پێنج و شەش

ئەو خەسویران بچوو لەش لەبان لەش

(فۆلکلۆر)

ب - لەگەڵ ناودا ناوێکی کە دروست دەکات وەك:

ڕووژگ، پویشگ، ڕیشگ، چمگ، دەسگ

- ڕەنگ ئەو ڕیشگ، خێار ئەو بنە تویەم (پەندی پێشینان)

حـ - لەگەڵ (فرمانی نادیارو فعلی مطاوعە)دا کارای کارا نادیار دروست دەکات وەك:

خوریاگ، شووریاگ، گەنیاگ، ڕشیاگ

**٢٠ - پاشگری (ڵە):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا بەکار دەهێنرێت بۆ نیشانەی گەورە کردنەوەیە (تعظیم) وەك:

دویتڵە، براڵە

- دویتڵە لە باوان، گلگە لە داوان (پەندی پێشینان)

**٢١ - پاشگری (نەر):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناوی کارا پێك دەهێنێ، وەك:

قویلەونەر، ئاژاوەنەر

**٢٢ - پاشگری (ێر):**

أ - ناو دەکات بە ناوێکی کە، وەك: وەرزێر

ب - ناو دەکات بە ئاوەڵناو، وەك: خاوێر

**٢٣ - پاشگری (ەوا):**

أ - لەگەڵ ناودا ناوی کارا پێك دەهێنێ، وەك:

نانەوا، پێشەوا

ب - لەگەڵ ناودا ناوێکی ئاسایی پێك دەهێنێ، وەك:

ماشەوا. ماسەوا. ئاردەوا

**٢٤ - پاشگری (گەر):**

أ - لەگەڵ ناودا کارا پێك دەهێنێ، وەك:

مسنگەر، ئاسنگەر. زەڕەنگەر

ب - پاشگری (گەری) ناوی پیشە (اسم الحرفة) پێك دەهێنێ. وەك:

مسنگەری، ئاسنگەری، زەڕەنگەری

**٢٥ - پاشگری (ندە):**

ئەم پاشگرە کار دەکات بە ئاوەڵناو، وەك:

کوشندە، بڕندە، دارندە

هەفتەی بکەیم ڕاو وەو قەتارەوە

وەو جای کوشندەی میرشکارەوە

(شیعری فۆلکلۆری)

**٢٦ - پاشگری (کی):**

ئەم پاشگرە ناو دەکات بە ناوێکی کە (بە واتایێکی جیاواز) وەك:

شەوەکی، تویلەکی، دەیشتەکی. دەرەکی، بنەکی

- دەرکیی هات بنەکیی دەرکرد. (پەندی پێشینان)

**٢٧ - پاشگری (ە):**

ئەم پاشگرە ڕەگی فرمان دەکات بە ناو وەك:

کیشە، بەستە، خورە، لەرە، دیدە، لەرزە

**٢٨ - پاشگری (ەون):**

أ - ئەم پاشگرە ناو دەکات بە ناوی کارا وەك:

ناڵوەن، قووڵوەن، چەرمەوەن، هەمەوەن، تویلەوەن، کووڵوەن، گوڵوەن

- لە چەقەی چەوماخ کەڵەیلەو ڕەمین

تویلەوەن لەژێر ماردەم چەمین

(شیعری فۆلکلوری)

ب - پاشگری (وەنی) ناو دەکات بە ناوی پیشە (اسم الحرفة) وەك:

ناڵوەنی، هەمەوەنی، چەرمەوەنی

حـ - پاشگری (بەن) ناو دەکات بە ناوی ئامێر وەك:

میەخەك بەن، سینەبەن

ء - پاشگری (بەن) ئاوەڵناو دروست دەکات وەك: خاڵبەن، گەچبەن

**٢٩ - پاشگری (ەنی):**

ئەم پاشگرە ڕەگی فرمان دەکات بە کارا، وەك:

ڕەوەنی، کردەنی، بردەنی

- کردەنی کیو بردەنی کی! (پەندی پێشینان)

**٣٠ - پاشگری (چە):**

ئەم پاشگرە نیشانەی بچوك کردنەوەیە (تصغیر) لەگەڵ ناودا بەکاردەهێنرێ وەك:

قالیچە، ماڵەچە، خوانچە، باخچە

- برێ ژنە، برێژانە، برێ زواڵ خوانچەو نانە (پەندی پێشینان)

**٣١ - پاشگری (ێل):**

ئەم پاشگرە ئاوەڵناو دروست دەکات، وەك:

چەپێل، راسێل، چەفت وچێل، کەمێڵ

**٣٢ - پاشگری (یەتی):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی پیشە دروست دەکات وەك:

کوردیەتی، برایەتی، پیاوەتی.

**٣٣ - پاشگری (ووڵ):**

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا بۆ نیشانەی بچوك کردنەوە (تصغیر) بەکار دەهێنرێ وەك:

زەنگووڵ، پرزووڵ

ب - لەگەڵ رەگی فرمان ناوی بچووك کراو (مصغر) پێك دەهێنێ وەك

گەردووڵ، گەشتووڵ

- گەردوولە یا زووڵ تیەرێگ یا دوینێ زەمانە (پەندی پێشینان)

**٣٤ - پاشگری (وان):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناوی کارا دروست دەکات، وەك:-

باخەوان، گاوان، پاسەوان، کاروان

**٣٥ - پاشگری (لەدان):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا کارا پێك دەهێنێ وەك:

وەرەلەوان، گامشەلەوان، وشترەلەوان

**٣٦ - پاشگری (مەن):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا کارا دروست دەکات، وەك:

دەوڵەمەن، خێرمەن، ئارەزوومەن، هونەرمەن، کارمەن

**٣٧ - پاشگری (کین):**

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو پێك دەهێنێ وەك:

ئاوەکین، راوەکین، شلەکین

ب - هەروەها بۆ پچوك کردنەوەیش (تصغیر) بەکاردەهێنرێ وەك:

ماڵەکین.

**٣٨ - پاشگری (وانگ):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی ئامێر پێك دەهێنێ، وەك:

لویتوانگ. چەچوانگ. ملوانگ. دەسوانگ

**٣٩ - پاشگری (ویلگ):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا بۆ بچوك کردنەوە (تصغیر) بەکاردەهێنرێ، وەك:

جامویلك. جقویلك. داسویلك. جاشویلك

**٤٠ - پاشگری (لەمە):**

ئەم پاشگرە ناو دەکاتە ئاوەڵناو، وەك:

ئاوەلەمە. شەکەرلەمە. ئەکلەمە. دشلەمە

بە رای مامۆستا مەلا شکور مستەفا ئەم پاشگرە تورکیە

**٤١ - پاشگری (گا):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی دیکە، بە واتاییکی جیاواز، پێك دینێ، وەك: شەوگار، رووزگار.

- شەوگار شویم لە ئیوارە دیارە (پەندی پێشینان)

**٤٢ - پاشگری (چی):**

أ - ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی کە پێك دەهێنێ، وەك:

راوچی. حومامچی، خانچی. خزمەتچی.

- راهی بوی لە را خرامانی مەست

خوری لە حومامچی قوڵف قاپی بەست

(شیعری فۆلکلۆری)

ب - پاشگری (چیەتی) ناویپیشە (اسم المهنة) پێك دەهێنێ وەك:

حومامچیەتی. چاچیەتی. خزمەتچیەتی.

**٤٣ - پاشگری (وك):**

ئەم پاشگرە بۆ ناوی (تشبیه) بەکاردەهێنرێ، وەك:

هەپلوك. کیروك. ترسنوك

**٤٤ - پاشگری (لان):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا بەکاردەهێنرێ بۆ دەست نیشان کردنی شوێنی ئەو ناوە وەك:

موریژەلان. قامشەلان. میشلان. مەشکەلان

٤٥ ـ **پاشگری (وار):**

ـ ئەم پاشگـــرە لەگـــەڵ رەگی فرمـان دا ناوی کارا دروست دەکات وەك:

حوەنەوار، ئومیدەوار

ب ـ لەگەڵ ناویش دا بەکار دەهێنرێت وەك:

ریوار. شونەوار

ـ ریوارێگ هاتگە لە شاری زەمزەم

ئەتر هەر مەنا دەرد ئەو بانی خەم

(فۆلکلۆری)

٤٦ ـ **پاشگری (یشت):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ رەگی فرمان بۆ دروست کردنی ناو بەکار دەهێنرێت وەك:

خوەریشت. فەرمایشت. بریشت. هریشت.

ـ ئاسنێ خوەی بریشت نەدایشت سەد ئاسنگەر چاری نیەکێگ (پەند)

٤٧ ـ **پاشگری (سار):**

ئەم پاشگـــرە لەگـــەڵ ناودا دەست نیشـــانی شوێنی ئەو ناوە دەکات، وەك:

سەگـــار، روخسار، نسار

ـ سووسەن گوڵ چری ئەو وەرنسار

هەی وە من مزگانی هاتەوەیار (شاکەوخان مەنسوور)

٤٨ ـ **پاشگری (ەر):**

أ ـ لەگەڵ ناودا ناوی کارا دروست دەکات، وەك:

کووچەر. گوجەر

ب ـ لەگەڵ ناودا ناوێکی کە دروست دەکات وەك:

سەنگەر، بەنەر، جەنگەر

٤٩ ـ **پاشگری (چگ):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا بۆ بچوك کردنەوە بەکاردەهێنرێ، وەك:

**مەلیچگ، بنچگ، کوچگ، سەرچگ**

**ـ مەلیچگ پەلامار بنچگ** (پەندی پێشینان)

٥٠ ـ **پاشگری (زار):**

**ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی کە پێك دەهێنێ، وەك:**

**شەرمەزار، دڵزار، گوڵزار**

٥١ ـ **پاشگری (دار):**

أ ـ ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی کە دادەرێژێ وەك:

گیاندار، پویل دار، ماڵدار، دوکاندار

هێندێ جار دەنگی (د) بەر (Assimilation) دەکەوێو دەبێ بە (ی)

واتا (دار) دەبێ بە (یار) وەك:

ئاویار. جفتیار. گەلیار. پایار

ب ـ لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو دروست دەکات، وەك:

گوڵدار. رەنگدار. دەرەدار. زامدار

ـ زامداری من بوو، تەبیب داری توو

هەیهووی توانێگ دەردم دوای بوو

(شیعری فۆلکلۆری)

٥٢ ـ **پاشگری (گا):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا شوێنی ئەو ناوە دەگەیێنێ، وەك:

رەوادگا. دەسگا. ئارامگا. لەوەرگا.

ـ دەس چووگ، دەسگا مینێگ (پەندی پێشنان)

٥٣ ـ **پاشگری (سان):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی شوێنی ئەو ناوە دەگەیێنێ، وەك:

کوردسان. دارسان. جەنگڵسان. کویەسان

ـ لەشێوەد نی‌یە لەی کوردسانە

مەر دانەی فرەنگ لەو سەردکانە

(شیعری فۆلکلۆری)

٥٤ ـ **پاشگری (کەر):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوێکی دیکە (ناوی کارا) دادەرێژێ وەك:

کارکەر. نانکەر. گیاکەر. پەتگەوکەر. ناوجی‌کەر

ـ ئەگەر جەنگ کەر وە قەدر ناجی‌کەر بزانێ باوگ خوەی کێگە قوربانی (پەند)

٥٥ ـ **پاشگری (دان):**

ئەم پاشگـــرە لەگـــەڵ ناودا شوێن و جیگـــای ئەو ناوە نیشـــان دەدا، وەك:

ئاگردان. گوڵدان. نمەکدان

هێندێ جار دەنگی (د) بەر (Assimilation) دەکەوێو دەگورێ بە (ێ) واتە (دان) دەبێتە (یان) وەك:

کەیان. خوایان. مەیان

**٥٦ ـ پاشگری (بەر):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی کارا دروست دەکات، وەك:

ڕەنجبەر، دڵبەر، باربەر، هووشبەر

ـ خەر چش بوو باربەر، ژن نێك بوو کارکەر (پەندی پێشینان)

**٥٧ ـ پاشگری (تر، ترین):**

ئەم دوو پاشگرە نیشانەی (التفضیل والمقارنة Comparative Superlative. ن وەك:

گەوراتر، گەورەترین. خاستر، خاسترین. ڕەینتر، ڕەینترین

ـ گوڵەم تا قویل بووگە مەلەی خوەشترە (پەندی پێشینان)

**٥٨ ـ پاشگری (گر):**

ئەم پاشگرە ناو دەکاتەکارا، وەك:

ڕووژگە گر. فاڵگر. نوورەگر

ـ ئەوەگە لە دز بمینێگەو فاڵگر بەیگەی (پەندی پێشینان)

**٥٩ ـ پاشگری (کار):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا کارا دروست دەکات، وەك:

بەدکار. گوناهکار. شەوکار

**٦٠ ـ پاشگری (باز):**

أ ـ ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی کارا دروست دەکات، وەك:

قومارباز. قوشباز. سەرباز

ب ـ پاشگری (بازی) ناوی پیشە (اسم الحرفة) پێك دەهێنێ، وەك:

فیڵبازی. سەربازی. قوشبازی. نەردبازی

ـ گەردن جوور بلوور میناسازی هەی
سینەصاف تەخت جای نەردبازی هەی

(شیعری فۆلکلۆری)

حـ ـ پاشگری باز ئاوەڵناویش دروست دەکات وەك: فێڵباز. حقەباز

**٦١ ـ پاشگری (ئاسا):**

ئەم پاشگرە لەگەڵ ناودا ناوی (تشبیه) پێك دەهێنێ، وەك:

خوەم ئاسا. خوەدئاسا. خوەیئاسا

**٦٢ ـ پاشگری (وو):**

ئەم پاشگرە ناو دەکات بە ئاوڵناو وەك:

ڕیشوو. تروو

## ـ وشەی لێکدراو ـ

**أ ـ ناوی لێکدراو:**

---

ناوی لێکدراو لە زاری کەڵهوریدا بەم شێوانە پێك دێت:

١ ـ لە دوو ناوی سادە واتا (ناو + ناو = ناو) وەك:

دەرکەل. خاکاو. شامورواق. ساڵنامە. چرکاو. باوەژن. سەراو

٢ ـ لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (ە) واتا (ناو + ە + ناو = ناو) وەك:

مانگەشەو، زیەڵەتەرەك، خوڵەمژ، کوردە ماڵان

ـ هەی تەن سەروین زمروت نیشان هەی
هەی نازکیشی نازی کوردەماڵان هەی

(شیعری فۆلکلۆری)

٣ ـ لە دوو ناوی سادە بە یاریدەی دەنگی (و) واتا (ناو + و + ناو = ناو) وەك:

تەوولەرز. مەل ومورر. دەم ودوو. شاخ وداخ. داروەدوەن. زاوزێ. سەروشخڵ

٤ ـ لە ناوێکی سادە لەگەڵ ئاوەڵناوێك واتا (ناو + ئاوەڵناو = ناو) وەك:

زگە تێر. دەم چەفت. سەرخوەش. سەرشوور. سەرانسیە

٥ ـ لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (وە) واتا (ناو + وە + ناو = ناو) وەك:

سەر وەسەر. ژن وەژن.

٦ ـ لە ئاوەڵناوێك و ناوێکی سادە بە یاریدەی دەنگی (ە) واتا (ئاوەڵناو + ە + ناو = ناو) وەك:

تەرەپیاز. زەردەسیری. زەردەژووە. تەرەماش

٧ ـ لە ئاوەڵناوێك لەگەڵ ناوێکی سادە بە یاریدەی دەنگی (وە) واتا:

(ئاوەڵناو + وە + ناو = ناو). وەك:

زیندە وەچاڵ

٨ ـ لە ناوێکی سادەو لەگەڵ ڕەگی فرمان، واتا (ناو + ڕەگی فرمان = ناو) وەك:

لاف دوور. گلاش چن. ئاژاوەنەر. قەن شکن. چەنەدەر.

بارکیش

- بویە وە خەری باکێش. (پەندی پێشینان)

- خێرئویشێگ لە خێردەرێگ خاسترە (پەندی پێشینان)

٩ - لە ناوێکی سادە لەگەڵ ڕەگی فرمان بە یاریدەی دەنگی (و) واتا:

(ناو + و + ڕەگی فرمان = ناو) وەك:

دەس و برد. مشت ومر

١٠ - لە دوو فرمان بەیاریدەی دەنگی (و) واتا:

فرمان + و + فرمان = ناو

هاتٙ وچوو. گفت وگوو. بارو بووەر

١١ - لە دوو فرمان واتا (فرمان + فرمان = ناو) وەك:

بگربگر. بدرمەکیش. بشووربپووش

١٢ - لە ئاوەڵکارێك و ناوێکی سادە واتا (ئاوەڵکار + ناو = ناو) وەك:

ژێرپیاڵە. ژێرشەوی. بن هەنگڵ. بن بەخەڵ. بان زەمین. ومردالان.

١٣ - لە دوو ئاوەڵکار واتا (ئاوەڵکار + ئاوەڵکار = ناو) وەك:

دموروبەر. دەوروپشت.

١٤ - بە دووبارەکردنی هەمان وشە بە یاریدەی دەنگی (ە) وەك

خوتەخوت. بووقەبووق. ڕنگەڕنگ. زرەزر

١٥ - لە ژمارەو ناو، ناوێکی سادە واتا (ژمارە + ناو = ناو) وەك:

سێ‌سویکە. چوارپا. دوولق. سێ‌پایە. هەزارپێشە

١٦ - لە ئاوەڵکارێك و ڕەگی فرمان واتا (ئاوەڵکار + ڕەگی‌فرمان = ناو) وەك:

نواکیش. دویادەس

ب - ئاوەڵناوی لێکدراو:

ئاوەڵناوی لێکدراو لە زاری کەڵهوریدا بەم شێوانە پێك دێت:

١ - لە دوو ناو، واتا: (ناو + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

کەڵ مل، تەنیاباڵ، دەم هار، خەم بار، شەکەربا

- قوربانی لێوی شەکەر بارتم

دایەم خزمەتکار کەس و کارتم

(شیعری فۆلکلۆری)

٢ - لە ناوێکی سادەو ئاوەڵناوێك واتا: (ناو + ئاوەڵناو = ئاوەڵناو) وەك:

چەوپیس، زوان دریژ، سەرگەرم. ڕویترش، ڕیش چەرمگ، دەم تەڕ. سەرخوەش

- سەرخوەش دەسە لێ مەدە خوەی کەفێگ. (پەندی پێشینان)

٣ - لە ناوێکی سادەو ناوی بەرکار واتا (ناو + بەرکار = ئاوەڵناو) وەك:

زك دریاگ. دەس شکیاگ، کووس کەفتگ. بەش خورياگ. نان بریاگ

٤ - لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (وە) واتا: (ناو + وە + ناو = ئاوەڵناو)، وەك:

خەرگ وەسەر، لیوەبار، شاروەدەر.

٥ - لە ئاوەڵناوێك و ناوێك واتا (ئاوەڵناو + ناو = ئاوەڵناو) وەك

خوەش فرمان، سیەدەس، خوەش باوەڕ، فرەورا. سەڕاس

٦ - لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (و) واتا (ناو + و + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

دەس وپاچە. دەس ودەم

٧ - لە ئاوەڵناوێك و ناوێك بە یاریدەی دەنگی (و) واتا (ئاوەڵناو + و + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

چەفت وچل، هاروهەرەش،

٨ - لە ئاوەڵناوێکو ناوێك بە یاریدەی دەنگی (ە) واتا: (ئاوەڵناو + ە + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

کورتەبالا. تیەریکەشەو. پیرەمەرد

- ئەگەر دزیت تیەریکە شەو فرەس. ( پەندی پێشینان)

٩ - لە ناوێك و ڕەگی فرمان واتا: (ناو + ڕەگی‌فرمان = ئاوەڵناو) وەك:

مچ بر، هەوانەدر، نان خوەر، وێنەگر، ساماندار، فاڵ خەر، ڕێ‌گر.

- ئەوەگ لە دز بکەفێگەو هەوانەدرە (پەندی پێشینان)

١٠ - لە ئاوەڵناوێك و ڕەگی فرمان واتا: (ئاوەڵناو + ڕەگی‌فرمان = ئاوەڵناو) وەك: سیەپووش، ڕاسگوو.

١١ - لە ناوێك و ئاوەڵکارێك بە یاریدەی دەنگی (ە) واتا (ناو +

ه + ئاوەڵکار = ئاوەڵناو) وەك:

دەمەوەر، لوتیەلا.

١٢ ـ لە دوو ئاوەڵناو بە یاریدەی دەنگی (و) واتا: (ئاوەڵناو + و + ئاوەڵناو = ئاوەڵناو) وەك:

تیق وجفت، رەش و رویت، چەپ وراس

١٣ ـ لە ناوێك و رەگی فرمان بە یاریدەی دەنگی (ە) واتا (ناو + ە + رەگی‌فرمان = ئاوەڵناو) وەك:

سەرەخوەر

١٤ ـ لە ژمارەو ناوێك واتا: (ژمارە + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

دوودڵ، دووروی، دووزوان، دووپەر، شەش پەر

١٥ ـ لە ئاوەڵکارێك و ناوێکی سادە واتا (ئاوەڵکار + ناو = ئاوەڵناو) وەك: ژێردەس، بالآدەس

١٦ ـ لە ئاوەڵکارێك و رەگی فرمان، واتا: (ئاوەڵکار + رەگی‌فرمان = ئاوەڵناو) وەك: دایەم خوەر، ئەوەڵ بەردە

ـ کەم خوەر بە دایەم خوەر بە (پەندی پێشینان)

١٧ ـ لە ئاوەڵکارێك و ناوێك بە یاریدەی دەنگی (ە)، واتا (ئاوەڵکار + ە + ناو = ئاوەڵناو) وەك:

بنەماڵ، بنەتویەم

**جـ ئاوەڵکاری لێکدراو:**

لێرەدا باسی ئەو وشە لێکدراوانە ناکەین کە لە هێندێ رستەدا دەبنە ئاوەڵکارو لە هێندێکی کە ئاوەڵکار نین. تەنها باسی ئەو ئاوەڵکارانە دەکەین لە قامووس دا ئاوەڵکارن:

ئاوەڵکاری لێکدراو لە زاری کەڵهوری‌دا بەم شێوانە پێك دێن:

١ ـ لە دوو ناو، واتا (ناو + ناو = ئاوەڵکار) وەك: دویەشەو

٢ ـ لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (مو) واتا (ناو + مو + ناو = ئاوەڵکار) وەك: / دەمەو عەسر /.

٣ ـ لە دوو ناو بە یاریدەی دەنگی (ەڵ) واتا (ناو + ەڵ + ناو = ئاوەڵکار) وەك: / پەیەڵ پەی /

٤ ـ لە دوو ناو و ئاوەڵکاریك واتا (ناو + ناو + ئاوەڵکارێك = ئاوەڵکار) وەك:

/ نیمەرووەو دویا /

٥ ـ لە ژمارەیێك و دوو ناو، وەك:

/ دووکوت شەوار /

٦ ـ لە ژمارەیێك و ناوێك وەك:

/ دووسوو /

٧ ـ لە ئاوەڵکارێك و ناوێك وەك:

دویاشام، پەس پێرار، پەس پێرەکە، پێرەشەو، باناشەو

٨ ـ لە دوو ئاوەڵکارو بە یاریدەی دەنگی (ان) وەك:

/ وەرانوەر /

٩ ـ لە دوو ئاوەڵکار بە یاریدەی دەنگی (وە) وەك:

/ زوی‌زی /. واتا (زوی وە زوی)

١٠ ـ لە ناوێك و دوو ئاوەڵکار. وەك:

/ خوەربان سویەر /

**فرمانی لێکدراو:**

---

فرمانی لێکدراو لە زاری کەڵهوری‌دا بەم شێوەیە، پێك دێت:

أ ـ بە یاریدەی ناو: سێ شێوەی هەیە

١ ـ بە یاریدەی ناوێکی سادە، وەك:

نان خواردن، کارکردن، سەرگرتن

٢ ـ بە یاریدەی ناوێکی دارژاو، وەك:

دەسگاگرتن، دڵزاربوین، ئاویاری‌کردن، پایاربوین

٣ ـ بە یاریدەی ناوێکی لێکدراو وەك:

دەرکەل گرتن، چرکاوخواردن، دویادەساو خواردن، پاڵ دوتەکانن

ب ـ بە یاریدەی ئاوەڵناو: دوو شێوەی هەیە:

١ ـ بە یاریدەی ئاوەڵناوێکی سادە وەك:

گەرم بوین، سویەرکردن، سیەوەبوین، بالآکردن

٢ ـ بە یاریدەی ئاوەڵناوێکی لێکدراو، وەك:

رووی‌سیەکردن. سەرخوەش بوین. دەس پاچەکەفتن. دەس دەم کردن.

چەند فرمانێك هەنە وەك (کردن. گرتن. بوین. دان) بە شێوەیێکی فراوان بەکاردەهێنرین و دەورێکی بالآیان لە دروست کردنی فرمانی لێکدراودا هەیە:

١ ـ باس کردن. جفت کردن. راوکردن. هوولەکردن. جولیەکردن. کیشەکردن

٢ ـ رووژگ گرتن. خانگ کرتن. نواگرتن. وەرگرتن. دویاگرتن

٣ ـ گەواربوین. سیەوەبوین. خاسەوبوین. نەخوەش بوین

٤ ـ نان دان. سەردان. خێردان. ئاودان. بانگ دان. باڵ دان

**فەرهەنگۆکی وشەگرانەکان**

ئوێر : ئاودێری

ڕوبووەر : بێنە وبەردە

ڕمەکێش : جۆرە قوماشێکە

ێ شوو : بێ سنوور

ەتوێەم : بنەتۆو

ێر : پایەدار

تموونەرز : لەرزوتا

تێق وجفت : ڕاست بەڕاست

حقوینك : پاتیلە

جرکاو : چڵکاو

جمچوانك : دەسەوانە

خەرگێ وەسەر : قوربەسەر

خەرگین : قوراوی

دزمەوەر : بێ کەڵکە

دویەتە : کچە

دووزەقی : دۆزەخی

دەس وپاچە : بێ دەسەلاتی

کوولوەن : تەیمان

گوجەر : بتەبالا

گەلیار : گەلەداری

گیای‌کەر : سواڵکەر

گوتاڵ : بێ قیمەت

مشت ومڕ : چەندوچۆنێکی توند

مەل ومورور : مێروو

دەس ودەم : چالاکی

دەمەوەر : جنێوفرۆش

دەم ودوو : سپیایی

ڕاوەکین : (سائل) شلەمەنی

ڕینەگان : ڕانەکان

زوان : زمان

ژێرشەوی : ژێرکراس

سیەدەس : دەس ڕەش

سووزەمەنی : سووتەمەنی

سیەقوتە : کۆکەرەشە

سەروشخل : خشڵ

سەرانسیە : سەراسێ، سەرئێشە

شواڵ : دەرپێ

شەش پەڕ : جۆ

فرەئویش : زۆر وێژ

فرە وڕا : لە ڕوی سووکیەوە بە چەنەباز

قوولوەن : قوڵبەن

قرتن : پیسکە

قویلەونەر : ئاژاوەگێر، بشێون

قوشباز : کۆترباز

ناوچی‌کەر : ناوبژی‌کەر

نختال : تۆسقاڵ

ناجوور : نافەساڵ، ناشیرین

نەخوەنەواری : نەخوێندەواری

وەرە لەوان : بەرخەوان

هرێشت : هێرش

سەرچاوە

---


١ ـ فەرهەنگی ئەستێرەگەشە: فاضل نظام الدين بەغدا، ١٩٧٢

٢ ـ فەرهەنگی طلائي: محمد آلتونچي

٣ ـ فەرهەنگی خاڵ: شيخ محمدی خاڵ چاپخانەی کامەرانی ـ سلێمانی/ ١٩٧٤

٤ ـ گەوهەری گەرمەسێر: (دەس نووس) نعمت علي (قامووس)

٥ ـ وشەڕۆنان لە زمانی کوردی: د. ئەورەحمانی حاجی مارف

٦ ـ فیلۆلۆژیی زمانی کوردی محمد أمين هەورەمانی

٧ ـ گەوهەری پاپیران: (کۆمەڵی پەندی پێشینانە) ـ دەست نووسە ـ

# بناء الكلمة الكردية في لهجة الكلهور

عبد المحسن بني ويس

يقتصر موضوع هذا البحث على دور اللواحق في تكوين الأسماء والصفات الظروف وكذلك دراسة (الأسماء، الصفات، الظروف) المركبة من كلمتين. أن الدافع الذي حفزني على هذا البحث هو تركيز الدراسات اللغوية الكردية على لهجات معينة دون التطرق الى اللهجات الاخرى كاللهجة الكلهورية التي بدور محور بحثي ضمنها، وقد أردت من خلالها أغناء هذا الموضوع بهذا الجهد والذي كما أتصور لم يتطرف اليه أحد قبلي، أقصد التطرق الى هذا الموضوع في اللهجه التي أشرت اليها.

يشتمل القسم الاول من البحث على دور اللواحق والسوابق واللواحق الوسطية في تكوين الأسماء والصفات والظروف. فلو ألقينا نظره على هذه اللواحق لوجدناها تنقسم الى نوعين (١) اللواحق التي تعطي معنى معجمي كما في هذه اللواحق (ستان = منطقة، دار= ذو، كار= عمل... الخ) أما النوع الثاني فلا يتعدى كونه صوتاً أو صوتين أو مقطعاً لا معنى له كما يبدو ذلك واضحا في اللواحق الأتيه: (ه، أر، أن، أين، ال، يه تي... الخ) هذه اللواحق بنوعيها تدخل على بعض الكلمات فتحيلها الى أسماء أو صفات أو ظروف تختلف في معانيها عن معاني الكلمات الأصلية، فمثلاً تدخل اللاحقة (ه) على كلمة (كووش= الأذن) فتصبح (كووشه) لتعني (الراوية) كما اللاحقة (ين) تدخل على الأسم (زه ر=ذهب) لتصبح صفة (زه رين= ذهبي).

أما الكلمات المركزية فهي في اكثر الأحيان متكونه من كلمتين أو من كلمتين وبمساعدة أداة نحوية، فمثلاً كلمة (سه راو= الينبوع) اسم مركب متكون من الأسمين (سه ر= الرأس) و (ئاو= الماء). أما كلمة (راسگوو= الصادق) صفه متكونة من الصفة(راس= أستقامة) وجذر الفعل (گو= قول) والكلمة المركبه (سه رانسه ر= الكل، الجميع) ظرف متكون من تكرار الأسم (سه ر= الرأس) بمساعدة اللاحق (ان).

أما القسم الاخير من البحث فقد خصص لموضوع الافعال المركبة في اللغة الكردية. فهناك كثير من الأفعال المركبة في اللغة الكردية تتكون من (أسم + جذر الفعل) لتكون فعلاً جديداً، كما في (مه له كردن= أن يسبح) و (سه ر برين= أن يذبح)و (به رزبوين= أن يعلو)

# کورد لە ماوەی بووژاندنەوەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لە تورکیاو ئێران دا/ ١٩٠٨ - ١٩١١

فەسڵی پێنجەمی کتێبی م. س. لازاریف: کوردستان و مەسەلەی کورد: موسکو ١٩٦٤

د. کاوس قەفتان
لە ڕووسی یەوە کردوویە بە کوردی

## بەشی دووەم

تورکەکان پاش شۆڕشەکەی تورکیای لاو جۆری پەلاماردانی کوردستانی ئێرانیان گۆڕی. ئەم جارە هێزی بناخەیی و کۆڵەکەی دەست درێـژی کردنـە سەر ئێـران، کوردەکـانی ئێـران بوون. تورکـیـا لە جیـاتـی ئەوەی بە ئاشکـرا پەلامـاری دراوسێ ڕۆژهەلاتی یەکەی بدات، کەوتە ئەوەی لە ژێرەوە لە ناوەوە لەناو ئێران خۆیـەوە پەلامـاری بدات. مەبەستی کاربەدەستانی تورك لەمـەدا ئەوە بوو گونـاهـ و تاوانـی دەست ـ درێـژی کردنیکی ئاشکـرا بۆ سەر ئێران لەسـەر خۆیـان لابـەرن ئەمەش دۆخێکی ئاڵۆزبووی گەورەی لەگەڵ خۆیدا بۆ سیاسەتی دەرەوە دەهێنا. هەروەهـا نیـاز لەو سیاسـەتە ئەوەش بوو هەموو خێڵەکانی ئێران بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و هەمـوو کوردسـتـان لەژێـر سایـەو دەسـەلاتی خۆیدا یەك بخـات. ئەم نیـازەی دوایی یـان (واتـە یەك خستنی کوردستـان لەژێـر سایـەی خۆیـان دا ـ وەرگێـر)، ئەرکێکی گرنـگ و پڕ لە مەتـرسی بوو. چونکـە لە ئەنجـامی تاقی کردنەوەدا دەرکەوت کە دەست درێژی کردنی هێزی سوپایی تورکیاو کوردەکان بۆ سەر ئێران و دەست خستنەناو کاروباری یەوە لەجیاتی ئەوەی پلەی شەعبیەتی تورکیا لە کوردستانی ئێران دا بەرزبکاتەوە، بەپێچەوانەوە دەرکەوت وا نی یە. ئەوە بوو گەلێك لە کوردەکـانی سەر سنـوور بە ئاشکـرا نارەزایی خۆیـان بەرامبەر پەلاماردان و دەست ـ درێژی کردنەکەی تورکیا دەربڕی. لەوە دەترسان دەستی ڕەق و پڕ لە زەبرو زۆرداری تورکیان بێتەسەر. نەك یەك جار بگرە جارەهای جار ڕووی دابوو کوردەکانی ئەو ناوچـانـە پەنـایـان دەبـردە بەر کۆنسـوڵەکانی ڕووسیا بۆ ئەوەی لە زۆرداری تورك بیـان پارێـزن. هەر بۆ نمـوونـە لە کۆتـایی ئابیساڵی ١٩٠٨دا، خان و بەگە کوردەکانی برادۆست و تەرگەوەڕو دەشتی مەرگـەوەڕو ئۆشنـۆ کە سێ هەزار ماڵێـك دەبـوون لەوانـە (سمایل ئاغای شکاك، سلێمان خانی ماناشلی، کوردە بەگ و چەند ئاغاو بەگێکی تری کورد) پەنایان بردە بەر کۆنسۆلخانەکەی ڕووسیا لە ورمێ و داوایان کرد ڕووسیا پارێزگاری و پەنابەری یان بکـات. میللەری یاریـدەدەری کۆنسـۆل ڕازی نەبـوو داڵدەیـان بدات. بۆی ڕوون کردنـەوە کە ئەوان ڕەعیـەتی ئێـرانن و ئەو زەوی وزارەی تورکەکانی تیادان ناوچەو خاکی ئێرانن.(٩٧)

ئەو هەوڵ و کۆششەی کوردەکان کردیان بۆ خۆ نزیك کردنەوەو پەیـوەنـدی پەیـداکـردن لەگـەڵ کۆنسـۆلخـانەکەی ڕووسیا هەروا بێ ئـەنجـام نەبـوو واتـە ئەو ئینتیباعەی دا کە: «ئێمە دان بەوەدا دەنێین ئەو ناوچانەی داگیر کراون هی تورکن»، پاکانەشی بۆ ئەم هەڵوێستە پڕ لە ئاگاداریی یەی بەوە دەکرد کە دەبێ هیچ جۆرە بیانوویێك بەدەستەوە نەدرێت ببێتە هۆی تێك چوون و تیژ بوونی

پەیوەندی لەگەڵ تورك، دا. میللەر لەم ڕووەوە دەنووسێت: «دۆخی کۆنسوڵخانە لەگەڵ کوردەکانی سەر سنووردا زۆر ناسکەو من کە باش ئاگاداریی کارەکەم داوا دەکەم بە ئەوپەڕی ئاگاداریەوە ـ موراقەبە بکرێن». [٩٨] ئەوی ڕاستی بێت کاربەدەستانی ئێران نەك هەر هەوڵیان نەدا سوود لە هەڵوێستی دوژمنانەی چەند خێڵێکی کورد وەك (بەگزادەکان) ببینن و خۆشەویستیو دەروون پاکیی ئێرانیان بۆ بخەنەروو، بەڵکو لەجیانی ئەوە هاتن لەتەك کۆنسوڵەکانی رووسیادا داوایان لێ‌دەکردن بێ‌دەنگ بن و شتێکی وەهایان لێوە ڕوونەدات ببێتە هۆی ناخۆشیو دووبەرەکی لەگەڵ تورکیادا». [٩٩]

بەپێچەوانەشەوە تورکەکان هیچ هەلێکیان لەدەست نەدەداو بێ وچان لەناو کوردەکانی سەر سنووردا پروپا ـ گاندەی تیژ یان دژی ئێران دەکرد. سەربازو ئەفسەرە تورکەکان جل و بەرگی خۆیان دەگۆڕیو بە هەموو ئەو ناوچانەدا دەگەڕان و دەسوورانەوەو گفتوگۆیان لەگەڵ نیشتەنی‌یەکان دا دەکردوو داوایان لێ‌دەکردن دان تەنیا بە دەسەڵاتی تورکیادا بنێن و باج و سەرانە هەر بەو بدەن. سیخورە تورکەکان کوردەکانیان لە حکوومەتی ئێران هان دەداو لەتەك ئەوەش دا دژی دانیشتووە گاورەکان پریان دەکردن بەو نیازەی زۆریان لێ‌بکەن ببنە ڕەعیەتی تورکیا. بە واتەی ئەلفێرنیێف: «کاربەدەستانی تورك نیازێکی تەواویان هەبوو هێزێکی وەها لە کوردەکان دروست بکەن چاکەو سوودی تورکیای پێ بهێننەدی، نەك هەر بەوەی جێ‌پێی خۆیانی لە ئاسیای بچووك دا پێ قایم بکەن، بەڵکو بەو نیازەش ڕێگایان بۆ پاك بێتەوە هەتا لە دوا ڕۆژدا خۆیان لە ئازربا یجانیش دا قایم بکەن». [١٠٠] زۆری نەبرد ئەنجامی چالاکیو شەڕنانەوەی سیخورە کانی تورکیا لەناو کوردەکانی ئێران دا دەرکەوت. بەکارهێنانی کوردەکان وەك هێزێکی جەنگاوەری بەکار لەلایەن تورکەوە بووە هۆی ئەوەی بزوتنەوەی داگیرکەرانەی تورك لە ناوچەو هەرێمی‌تردا پەرەبسێنێ. [١٠١]

ورمێ لە هەموو شوێنێکی‌تر کەوتە دۆخێکی ئاڵۆزاو و مەترسی‌یەوە. سیخورەکانی تورك لە ورمێ زۆر گورج و گۆڵانە لەناو کوردە سونی مەزهەبەکان دا دەجووڵانەوەو وەك کۆنسوڵی رووسیا لە ورمێ دەڵێ «هەوڵیان دەدا هێزێکی» گەورەو بەتوانا لە دانیشتوانی کوردستان پێك بهێنن.». [١٠٢] دوا بەدوای ئەم کردەوەو چالاکی نواندنە چەتەیەتیو تاڵانی‌کردن دەستی پێ‌کرد. هێزی تورکیا بە ناوی «چەسپاندنی ئاسایش» لە ناوچەی ورمێ هاتە گەڕو کشا هەتا گەیشتە گۆماوی ورمێ. بە واتەی ئەوانەی لەوێ بوون و ڕووداوەکانیان دیوە، ئەوە دووپات دەکەنەوە کە تورکەکان نیازیان وابوو هەموو هەرێمی ورمێ داگیر بکەن. [١٠٣]

لە کۆتایی ساڵی ١٩٠٩دا، تورکەکان پەلاماری ساوجبلاقیان دا، هێزەکە بریتی‌بوو لە دوو هەزار کوردی ئێران و لە خێڵی مامەش و مەنگور بە سەرۆکایەتی هەمزاغاو سلەیمان و بایز ئاغا پێك هاتبوو. کوردەکان هەتا تۆپیشیان پێ‌بوو. هەموو ناوچەکانی ساوجبلاق و میاندواو و مەراغە کەوتنە بەر مەترسیو هەرەشەوە. بەوەی باش بوو موتەسەریفی مەراغە زوو کەوتەخۆی (ناوی شەجاع ئەل دەولە بوو بەلایەنگیرێکی تەواوی رووسیا ناسراوبوو). کوردەکان ناچار بوون لە میاندواوو ساوجبلاق بکشێنە دواوە. [١٠٤] تورکەکان لەم پەلاماردان و داگیرکردنەی ناوچەکانی سەر سنووری کوردستانی ئێران پشتیان بە چەند دەرەبەگێکی گەورەی کورد بەستبوو. یەکێك لەمانە کەریم خان بوو کە لە هەموو سەرۆکەکانی خێڵی هەرکی بە دەسەڵات و دەوڵەمەندتر بوو تورکەکان کردبوویانە سەرداری مەرگەوەڕو بەراندوزو ئەشتابیل. هێزەکانی کەریم خان زۆریان لە دانیشتووەکان دەکردو ناچاریان دەکردن دان بە دەسەڵاتی تورکیادا بنێن و خۆیان بە تەبەعەی ئەو دابنێن. [١٠٥]

ئەوەی بە زۆری خزمەتی تورکی کرد، شێخ عەبدول قادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵلای شەمدینان بوو، ئەوەی ئەندامی ئەنجومەنی مەبعوسان بوو لە تورکیا.

ماوەیێکی کورت پێش ئەم ڕووداوانە لە ئەستەمبوڵەوە چوو بۆ کوردستان بەو نیازەی کوردەکانی تورکیا ڕازی بکات هەڵ بێن و بگوێزنەوە بۆ ئێران.

کابرایێکی دووروو بوو، لەسەر دووپەت یاری دەکردو هەمیشە ئامادە بوو لا بداتە لای ئەوەی بەهێزترە. پاش شۆرشەکەی تورکیای لاو پشتی بە رووسیا قایم بوو، سەرۆکایەتی ئەو سەرکردانەی کوردی دەکرد کە دژی میری بوون. زۆری نەبرد لەگەڵ ئیتیحادی‌یەکان ئاشت بۆوە. پاش

حکومەتی ڕووسیا ڕازی نەبوو یارمەتی سەرۆکە کوردەکان بدات، بۆیە یەکێك لە هاندەرە گەورەکانی بڵاوکردنەوەی بزوتنەوەی تورك بوو لە ناو کوردەکانی ئێران دا. جا لەبەر ئەوەی ناوبانگ و ناوێکی شۆرەتی هەبوو توانی ژمارەیێکی زۆر لە خێڵەکانی سەرسنوور لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو بۆ خزمەت کردن و هێنانەدی بەرژەوەندی تورکەکان ساز بکات. عەبدول قادر لە سەرەتادا، واتە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٩دا، لەگەڵ هێزی حەمیدی لە ناوچەکانی کوردستانی ئێران دا لە (دەشتێ) سەری دەرهێنا. دانیشتووەکانی سەر سنووری ناچار کرد تەبەعیەتی تورك وەربگرن. ئەگەر لە ڕوویدا ڕاوەستانایەو ڕازی نەبوونایە فەرمانی دەدا بە سەرۆکە کوردەکان تالانیان بکەن و گوندەکانیان بسووتێنن. لەناو کوردەکانی ناوچەی ورمێدا گورج و ئەمیرێکی تەواوی پیشان ـ دا ئامادەیی خۆی دژی حکومەتی دژی موتەسەریفی ورمێ دەرخست. لەگەڵ ئەوەش دا موتەسەریفی ورمێ لەو ڕایەی ئەودا نەبوو، بەڵام عەبدول قادر توانی وا لە زوربەی کوردەکانی ورمێ بکات دژی حکومەتی ئێران بوەستن.[106] لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩١١دا، دەستگای (ك.ف.ئو) ڕای گەیاند کە: «هاتنی شێخ عەبدول قادر بۆ ورمێ سوودێکی زۆری بە تورکەکان گەیاند، چونکە توانی کاربکاتە سەر کوردەکان و وایان لێ بکات بڕوا بکەن حکومەتی یارمەتی لە ڕووسەوە وەرناگرن. لە ئەنجامی ئەمە بەگە کوردەکان کە جاران بەلای کەمەوە هەموو هەفتەیێك نامەیان بۆ کونسوڵەکان دەنارد، وازیان لەو نامە ناردنە هێنا».[107]

عەبدولقادر توانی پەرە بە دەسەڵاتی خۆی بدات و وا بکات بەلای کەمەوە هەموو بەگزادەکان و بگرە بەشێك لە شکاکەکانیش بەلای تورکیادا ڕابکێشێ، ئەو شکاکانەی جاران بە ئاشکرا دژی تورکیا بوون.[108] بە هەوڵ و تەقەللای شێخ عەبدول قادر چەند سەرۆکێکی تری کوردی ناوچەکانی کوردستانی ئێران لە سەر سنوور هاتنە تەك تورکیا. میرمامەندو تەیموور ئاغاو کوردەبەگ کە لەو ڕۆژانەدا پەنایان بردبووە بەر تورکیا دەورێکی گەورەیان لە هێنانەدی سیاسەتی داگیرکردن و دەست درێژی کردنی تورکیا بۆ ئێران هەبوو. بە واتەی پری ئەبریژینسکی یاریدەدەری کونسوڵی ڕووسیا لە ورمێ، تەیموور ئاغای لایەنگیری ئاشکرای تورکیا (لە ناوچەکانی ساماسك و ڕێگاو بانەکانی سەلماس دا بووە قامچیو کوتەك بە دەست تورکەکانەوە).[109] بۆ نموونە لە سەرەتای تەموزی ساڵی ١٩١٠دا تەیمور ئاغاو کوردەبەگ گوندی سەنگەریان بەتەواوەتی وێران کرد چونکە ڕازی نەبوون ببنە تەبەعەی تورکیا. پێش پەلامارادانی ئەم گوندە لەگەڵ کونسوڵی تورکیادا کۆبوونەوەو بەپێی فەرمان و ڕێپیشان دانی ئەو جووڵانەوە.[110] «پاش کوردەکان ـ کونسوڵی گشتی لە تەوریز دەنووسێت ـ هێزی تورك بە دوایان دا هات و بە ناوی ڕزگارکردنی گوندەکە لە کوردەکان تالانیان کردو وێرانیان کرد».[111] تورکیا لەو سیاسەتی داگیرکردن و دەست درێژی کردنەی بۆ سەر ناوچەکانی سەر سنووری کوردستانی ئێران، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەی چەند کاربەدەست و بەڕیوەبەرێکی ئێرانیشی بەکار دەهێنا. موحتەشەم ئەل سەڵتەنەی موتەسەریفی ورمێ یارمەتییێکی تەواوی تورکیای دەداو نەیدەویست لە ڕووی ئاغاو بەگە کوردەکان دا بوەستێ ئەوانەی بە ئارەزووی خۆیان چییان بویستایە دەیان کرد. موحتەشەم ئەل سەڵتەنە پاراستنی ناوچە کانی ورمێی خستبووە ئەستۆی سەرۆکە کوردەکان و ئەو مافەشیان پێ درابوو لە پاداشی ئەو پاراستنە هەموو جۆرە باجێك لە دانیشتووەکان بسێنن. بێگومان ناوچەکانی ورمێ لە ئەنجامی ئەمەوە تووشی پاشاگەردانییێکی تەواو بوون.[112] موحتەشەم ئەل سەڵتەنە چاوی لەو دۆخە شڵەقاوەی ورمێو چۆبیو سەلماس پۆشیبوو، نیازیشی لەمە ئەوە بوو دانیشتوانی ئەم ناوچانە بە ناچاری پەنا بەرنە بەر سێبەری تورکیا. ئەمەش دەبووە بیانوویێك بە دەست تورکیاوە بۆ ئەوەی هێزی سوپایی خۆی لەو ناوچانە قایم تر بکات کە دووبەرەکییان لەسەر بوو. یاریدەدەری کونسوڵ لە ورمێ لەم ڕووەوە دەنووسێت: «ئەم کردەوەیەی موتەسەریفی ورمێ وا دەکات دانیشتووەکان تاقەتیان بچێت و تووشی بێزاری ببن و بێنە سەر ئەو ڕایەی لە هیچ لایەکەوە یارمەتی نادرێن. جا زوو بێ، یان درەنگ ناچار دەبن پەنا بەرنە بەر تورك و بە تەمای ئەوەی بن لەژێر سێبەری ئەودا بحەوێنەوە، ئەو تورکیایەی لە ڕاستیدا بووەتە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو ناوچانە.»[113]

کردەوەکانی موحتەشەم ئەل سەڵتەنە شارەزایی و زۆرزانی‌یان تێدابوو، ئەمەش نەك هەر لەوەدا دەرکەوت چۆن رژێمی بەڕیوەبردنی قڵپ کردەوەو تێك وپێکی دا، بەڵکو لەوەش دا خۆی نواند چۆن بە ئاشکرا حکومەتەکەی خۆی گۆڕی‌یەوە. هەر بۆ نموونە ئێواران دانیشتووەکانی ئەو ناوچانەی رازی دەکرد بچنە ژێر سایەی جەنگیی کاربەدەستانی تورکیاوە، جاری‌تریش کوردەکانی ئەو ناوچانەی هان دەدا گاورەکان تالاّن بکەن.[114]

لە ئەیلوولی ساڵی ۱۹۱۰دا موحتەشەم ئەل سەڵتەنە لابرا. بۆ ماوەیێك ئاسایش و بێ‌دەنگی ناوچەکەی گرتەوە. جەلال ئەل مولکی موتەسەریفی نوێ چالاکانە هاتە مەیانەوەو کەوتەکار. بە واتەی یاریدەدەری کۆنسوڵی رووسیا لە (وان) سیاسەتی ئەم موتەسەریفە نوێیە: «دوو رێبازی هەبوو، یەکەمیان دەست بەسەراگرتن و بێ‌دەنگ کردنی کوردەکان و دووەمیان شوێن کەوتن و سزادانی ئەوانەی پەنایان بردۆتە بەر تورکیا». بەلاّم چەند مانگێك بە سەردا تێ نەپەڕی هەموو شت گەڕایەوە دۆخی جارانی. دەستگای ئێرانی بێ‌بایەخ و لاوازی دارزاو نەی‌دەتوانی خۆی بەرامبەر دەسیسەو پیلانی تورکیا ڕابگرێت. وەك گالۆوبینۆڤ دەنووسێت، جەلال ئەل مولك بانگی‌دا: «ئەو پێشنیازە دەخاتە بەردەم رووسیا بڕیار لەسەر دوارۆژی ورمێ بدات».[115] جڵەوی مورتەزا قولی‌خان ئیقبال ئەل سەڵتەنەی سەرداری (ماکین)یش بەدەست تورکە داگیرکەرەکانەوە بوو. میرنشینی ماکۆی بچووك کە کەوتبووە شوێنێکی هەرە دووری باکووری ڕۆژ ـ ئاوای ئێرانەوەو شوێنێکی گرنگ و ستراتیجی لەسەر سنووری رووسیاو تورکیاو ئێران دا هەبوو، هەر بە ناو و بە سەرزاری سەر بە ئێران بوو. خانی ماکین سەرداریکی کۆنەپەرست و دڵ ڕەق بوو، پشتی بە خانە کوردەکان قایم بوو، بە یارمەتی و پشتگیری ئەوان دانیشتووە ئازەری‌یەکانی خستبووە ژێر چنگی خۆیەوەو دەی‌چەوساندنەوە. تورکەکان زۆر حەزیان لەوە دەکرد سەرداری ماکین بەلای خۆیان دا ڕابکێشن، ئەمیش هەوڵی دەدا پشتگیری تورکیا دەست بخات بەو نیازەی بەرهەڵستی بزوتنەوەی شورشگێری پێ‌گەیشتو لە میرنشینەکەی خۆی و ناوچەکانی دەوروپشتی بکات. لەگەڵ سەرەك کوردەکانی تورکیادا کۆ دەبوّوەو بانگی دەکردن بۆ ماکین بەو نیازەی وەك یاریدەدەری کۆنسوڵ لە تەورێز لە شوباتی ساڵی ۱۹۱۱دا نووسیویتی: «خۆی لە هێرشی هێزی شورشگێری ئێران بپارێزێ و لە کاتی پێویستیش دا حکومەتی ئازربایجان بترسێنێ». تورکەکان بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا ئەم کردەوانەی سەردار تەشەنە بکەن و بلاّوببنەوە.[116] لە هەمان کاتیش دا ئەو دۆخە ئاڵۆزبووەی سەر سنووری تورکیاو ئێران لەم ساڵانەدا وای کرد سەردار بکەوێتە موناوەرە کردن (هەندێ جاریش لەو موناوەرە کردنانەی‌دا سەر نەدەکەوت) لەنێوان تورکیاو ئێران و رووسیادا، لەمەش دا هێندێ جار پشتی بە کوردەکانی ئێران و جاری‌تریش بە کوردەکانی تورکیا دەبەست. لە ئەنجام دا میرنشینی ماکین بووە مەیانی دووبەرەکی نێوان ئێران و تورکیاو رووسیاو تورکیا. هەرچی مەسەلەکەی (ماکین)شە، ئەوە لە سەرەتای شەڕی گێتی یەکەم دا تەواو بەرەو ئاڵۆز بوون و تیژ بوون ڕۆیشت. کۆنسوڵەکانی تورکیا لە ورمێ و خوی و سەلماس و چەند ناوچەیێکی گەورەو بچووك تر مایەی تێك چوونی دۆخی ناوچەکانی سەر سنووری کوردستانی ئێران بوون، واتە ئەو ناوچانەی شەڕو دووبەرەکی‌یان لەسەز بوو. تورکەکان لە ورمێ دەورێکی گەورەیان هەبوو. لەوێ بووبوونە سەرچاوەو ناوەرگەی جوولاّنەوەو جموجۆڵی تورکەکان لەناو کوردەکانی ئێران دا. یاریدەدەری کۆنسوڵی رووسیا لە ورمێ لەم رووەوە دەنووسێت: «گومان لەوەدا نی‌یە تورکەکان دەستیان خستۆتە هەموو کاروبارێکی کوردەکانەوە، وا دیارە لەم مەیانەدا رێ‌وشوێنی تایبەتی‌یان هەیە لەسەری دەڕۆن».[117] پیتەر ئیلۆی سیخوڕی کۆنسوڵی تورکیا لە ورمێ، لەناو هەموو سیخوڕەکانی تری تورك دا ناوبانگی زیاتر دەرکردبوو، [بە پەترۆس ئاغا ناسراوبوو]. ئەم پیاوە لە کەنەدەوە هاتبوو، خزمەتی تورکەکانی دەکرد، لە ولاّتی خۆی چەند مأسەرەییکی لێ رووداببوو. ئەم سەرکێشە (کەڵەك بازە) بە یەکێك لە سیخوڕە هەرە چالاکەکانی ناو کوردەکانی ئێران دادەنرا. خزمەتێکی بێ ڕادەی تورکە داگیرکەرەکانی کرد. جا بەخۆڕایی نەبوو ئیزفۆڵسکی پەیتا پەیتا داوای دەکرد وا لە حکوومەتی بەریتانیا بکرێت زۆر لە ئەستەمبوڵ بکات ئەم پیاوە دووربخاتەوە.[118] تاکتیك و ستراتیجی‌یەتی سیاسەتی داگیرکردن و دەست درێژی کردنی

ـیی لاو له ڕۆژئاوای ئێران دا ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا بوو، ـ ـی و دەست نیشان کردنی خۆ هیلاك کردنی گەرەك نەبوو. حەمـ ـ (یودینج)ی سەرکردەی بارەگای جەنگیی لە قەفقاس، ـ ـی ساڵی ١٩١٠دا نووسیی: «پلانی تورکەکان بریتی‌یە ـی «کوردەکان هان دەدەن ئەو گوندانە تاڵان بکەن کە ڕازی ـ ـە ژێـر سایـەی تورکیـاوە، ئەمـەش بەو نیـازە دەکـەن ـ ـن بگەنە دوا پلەی بێزاری‌و کە دەبینن لە رووسەوە هیچ ـ ـرمەتی ـ یەکیان بۆ نایەت ناچار ڕوودەکەنە تورکیاو داوای ـرمەتی ئەو دەکەن. تورکیاش کە ئەمەی بۆ هاتەدی ئەوسا پڕ بە ـ ـو دەکـات کە ئەمـان ناوچـەی ورمێـان داگیر نەکردووە ـکو دانیشتوەکان خۆیان داوای یارمەتی‌و پاراستنیان لە تورکیا ـ ـەوە. ئەم پیـلانـە بە ئیسـرارەوە دەهێنـرێتـەدی. وا دیـارە ـ ـەکـان ئەم پیـلانـەیـان داناوەو موتەسەریفی ورمێش بەجێی ـ ـی. کوردەکان پەلاماری ئەو گوندانە نادەن کە ڕازی دەبن ـجـە ژێـر سایـەی تورکیاوە.» [119] (ئەلفیرێف)ی یاریدەدەری ـ ـۆلی رووسیـا لە وان، ئەوەی ئاگـای لە ڕووداوەکـان بووە ـ ـتی دەکـاتـەوە کە کێشـەکـەی کورد دەورێکی سەرەکی لە ـ ـر دان و دەسـت درێـژی کردنـەکـەی تورکـیـا ـ ئەودیو سنووری ئێران هەبوو. لەم ڕووەوە دەنووسێت: «جگە ـ هەمـوو داڵغـەو خەیـاڵـەی تورکـەکـان دەربارەی سەرکەوتن و ـ ـگیـرکـردنی ئێـران و قەفقـاس هەیانە، ـرکیای لاو لەم کاتـ و ـ ـەدا هیوایێکی زۆر گەورەی بەوە هەیە ئەگەر هاتوو هێزەکانی ـ ـوچەی وان قایم بوو، ئەوە کوردەکانی ئێران لە خۆیانەوە دێن و ـ ـ بە تەبەعیەتی خۆیان بۆ تورکیا دەنێن و یارمەتی تورکیا دەدەن ـ ـەست بەسـەر هەمـوو کوردستـانی ئێـران دا بگرێت. پەیوەندی ـ ـن تورکیاو کوردەکان تەواو هاتۆتە باری خۆی. تورکەکان چاو ـ هەمـوو تاڵانی کردنـەکـانیـان دەپۆشـن و هەستی خۆشەویستی خۆیان بەرامبەریان دەردەبڕن و پارەو پوول و چەکیشیان دەدەنێ، بەتـایبـەتی بە کوردەکـانی ئێـران. پێویستە تەواو ئاگاداریی ئەمە بکـرێت و پشت گوێ نەخـرێت بەتـایبـەتی ئەو دەنگ و باسـەم بیسـتـووە کە بەم زوانــە تورکــەکـان پەلامــاری کوردستــانی داگیــرکـراوی ئێـران دەدەن.» [120] تیـرلینسکی کە لە نیـوەی دووەمـی ساڵـی ١٩١٠و سەرەتـای ساڵـی ١٩١١ بە هەمـوو

کوردستـان و ناوچـەکـانی سەر سنووری تورکیاو ئێران دا گەڕابوو دیسانەوە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە دەسەڵاتی تورکیا بەسەر خێڵە کوردەکانی ئێران دا قایم بووە، بە واتەی ئەم لە ئەنجامی ئەوەی تورکیـا ناوچـەکـانی سەر سنـووری داگیرکرد سەرۆکە کوردەکان کەوتنـە ئەوەی بە چاوێکی سووکـەوە سەیـری حکـوومەتی ئێران بکەن و زۆر جار نازناوەکانی خۆیان لە (خانەوە) دەکرد بە ئاغاو بەگی تورکی. «کوردەکان ـ تیرلینسکی دەنووسێت ـ هەرچەندە زۆر حەزیان لە سەربەستی‌یە بەڵام زۆر باش مانای دەسەڵات دەزانن و بەتـەواوەتی ڕێـزی لێ‌دەگـرن. کەوتـوونـەتـە نێوان دوو حکـوومـەتـەوە کە لەسـەر خاکی نیشتمـانـەکـەیان بە گژ یەك دا دەچن. لەم نێوانەدا توانیویانە سەربەخۆییەکەی خۆیان بپارێزن، یان هیـچ نەبێ دەست خستنـە ناو کاروبـاریـانـەوە لە خۆ دوور بخـەنـەوە. بەڵام ئەمـڕۆ یەکێـك لەو حکوومەتانە بەرەو دارزاندن دەچێت (نیـازی لە ئێـرانــە ـ وەرگێـر ـ) ئەوی‌تـریشیـان بەرەو بووژانـدنـەوەو پتـەوبـوون و بەهێـزبـوون دەچێ، لەم حاڵـەتەدا کوردەکـان هەر ئەوەیـان بۆ دەمێنێتـەوە ئەو ڕۆژانـە لەبیـر خۆیـان بەرنەوە کە لەم لا بۆ ئەو لا دەچوون و ساتێك لایان دەدایە لای تورك و ساتێکی‌تر بۆ لای ئێران، ڕۆژێك ژێردەستەی ئەمیان و ڕۆژێکی‌تـر ژێـردەستــەی ئەوی‌تـریـان بن، دەبێ ئەم جارە بەتـەواوەتی‌و بۆ دوا جار بچنـە ژێـردەستی تورکیـاوە. کوردەکـان لەمە گەیشتبوون، یارمەتی‌و پشتگیریشیان لە هیچ لایەکەوە بەدی نەدەکـرد، )هیـوایێکی زۆریـان بە رووسیا هەبـوو)، ئێستـەش بەنـاچـاریی خۆیـان خستـە ژێر سایەی تورکەوە، زمانی تورکی دەخوێنن و بە پەلە هەوڵ دەدەن شارستا ـ نێتی عوسمانی دەست بخەن.» [121]

وەك لە دوایی‌دا دەردەکـەوێت تیـرلیـنسکی بێ ئەوەی بە لێکـەیێکی ئەوتــۆی بە دەستـەوە بێت بایـەخێکی زۆری داوە بە بووژانــەوەو پتــەوبــوونی حکــوومــەتی تورکیــاو سەرکـەوتنی سیـاسـەتـەکـەی لەنـاو کوردەکـان دا. لە ناوچە دەست بەسەرا ـ گیـراوەکـانی کوردستـانی ئێـران دا، کاربەدەستانی تورك کەوتنە دامـەزرانـدنی دەستگـای بەڕیـوەبەرایەتی. کەوتنە سەر ژماردنی دانیشتوان و دۆخی ئابووری‌و سەپاندنی باج و سەرانەی تورك بەسـەریـان دا[122] جاران ئەم ناوچانە ناویان (نەواحی جەدیدە)

بوو، بەڵام ئەو ناوە لابـراو بوو بە (نـەواحـی ڕۆژهـەڵات).
کاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی تورکیا لە مەیانی پەیوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی یەوە ئامانجێکی دەست نیشان کراویان هەبوو، کە بریتی بوو لەوەی ئەو دەرەبەگە کوردانەی یارمەتی یان دان بکەنە بناغەو کۆڵەکەیێك دوارۆژی خۆیانیان لەسەر دامەزرێنن، لەتەك ئەوەش دا دەسەڵات و نفوزی سیاسی و ئابووری ئەوانە لەناو بەرن کە سەر بە حکوومەتی ئێران بوون. لەبەر ئەمە تورکەکان لە ناوچە داگیرکراوەکانی سەر سنووری ئێران دا چینێکی خاوەن زەوی وزاری کوردیان دروست کرد. بە هەر حاڵێك بێت ئەم کارەیان بۆ دەچووەسەر. جاری وەها هەبوو کاربەدەستانی جەنگی و مەدەنی تورکیا ڕێگایان بە بەگ و شێخە کوردەکان دەدا کرێی گوندەکانیان نەك هەر لە ناوچە داگیرکراوەکان دا بەڵکو لە ناوچە دراوسێ یەکانیش دا زیاد بکەن. جارەهای جار ڕووی دەدا تورکەکان موڵك و زەوی وزاریان لەم و لەو خاوەن موڵك زەوت دەکردوو دەیان بەخشین بەو کوردانەی خۆشیان دەویستن، بەتایبەتی گەلێك لە گوندەکانی برادۆست و تەرگەوەڕو ناوچەکانی نزیکیان بەر ئەو تەوژمە کەوتن و کوردە سەر بە تورکەکان زەوتیان دەکردن، پاکانەشیان بەوە دەکرد گوایە هەر لە کۆنەوە، پێش هاتنی عوبەیدوڵلا ئەو گوندانە موڵکی خۆیان بووە. نەك هەر لەم ڕێیەوە بەڵکو بە جۆری تریش زەوی و زاریان زەوت دەکردو بە زۆری زۆردارەکی خەڵکی یان بەلای خۆیان دا ڕادەکێشا. بۆ نموونە کاتێك ئەفسەرو سەربازەکانیان بەسەر گوندەکانی کورددا دەسووڕانەوە زۆریان لێ دەکردن مەزبەتە بنووسن و دڵ خۆشی خۆیان بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی تورکیای تێدا دەربڕن و ئەوەی تێدا بنووسن کە زەوی و زارەکانیان هی تورك بوون و موڵکی ئەو بوون. ئەمەش وای لە تورکیا دەکرد گەزاف لێ بدات کە دانیشتوانی وڵاتەکە داگیر کردن و دەست بە سەراگرتنی وڵاتەکەیان بەلاوە کارێکی باش بووە.[١٢٣]

لە ئەنجامی ئەو هەموو کردەو کۆششەی داگیرکەرە تورکەکان کردیان، تەنیا دەرەبەگە کوردە گەورەکان سوودیان دەست کەوت ئەوانەی لە ئەسڵا لە کوردەکانی تورکیا بوون وەك عەبدول قادر کە ماوەیێك لەوەوپێش دەست درێژی کردە سەر خاکی ئێران.

بەڵام لە هەمان کاتیش دا خاوەن موڵکە ئێرانی یەکان و ئاغا کوردە بچووکەکان، کە تورکیا بەش و مافیانی خواردبوو دەست درێژی دەکردە سەریان، ئەوانە بە ئاشکرا نارەزایی خۆیان دەربارەی ڕژێمە نوێیەکە دەربری. (واتە دژی تورکیا ـ وەرگێر). مینۆرسکی کە لە ساڵی ١٩١١دا بە ناوچەکانی سەر سنووردا گەرابوو، لەم ڕووەوە دەنووسێت: «سەرچاوەی کێشەو سەرئێشەی تورکەکان لێرەو بە تایبەتی لێرەدا دەتەقێتەوە».[١٢٤]

تورکەکان بۆ ئەوەی بارو ئەرکی قورس و ناخۆشی سیاسەتی داگیرکەرانەی تورك سووك بکەن و بۆ ئەوەش پشتگیری دانیشتووەکانی ئەو ناوچانە دەست بخەن خۆیان وا هێنایە بەرچاو کە نیازیان وەهایە باری سەر شانی جووتیارەکان سووك بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش بەڵێنیان دا باج نەسێنن.[١٢٥] ئەمە چەند کەسانێکی هەڵ خەڵەتاندو وای لێ کردن باوەڕبکەن تورکەکان بەرژەوەندی جوتیارەکانیان گەرەکەو بە تەمان سیاسەتی یەکسانی لە کشتوکاڵ دا بەکار بهێنن و لەسەری برۆن.[١٢٦] هەتا مینۆرسکی شارەزاو پسپۆری هەرەگەورە ئەم گەمەیەی بەسەردا تێپەری، هەر لەبەر ئەمە لە ڕاپۆرتەکەی دا کە دەربارەی «سنووری تورکیاو ئێرانە» دەنووسێت: «لە ئەنجامی ئەو وردبوونەوەیەو موراقەبە کردنەکەی ساڵی (١٩١١)م، لەو کاتەی تورکیا پەلاماری کوردستانی ئێرانی دا، تورکەکان بە تەواوەتی حیسابیان بۆ خان و بەگە کوردەکان و مسکێنەکانیان کردووە، بە ئاشکرا پشتی مسکێنەکان دەگرن. بێ گومان لەم ڕێگەیەوە دەتوانن کۆسپ بخەنە ڕێی گەشەکردن و پێشکەوتنی بزووتنەوەی کورد.».[١٢٧] ئەوەی ڕاستی بێت ستەم و زۆرداریی ئەم خاوەن موڵکە نوێیانە لە هی دەرەبەگە کۆنەکانی ئێران کەمتر نەبوون.

ئامانجە دیماگۆگی یەکانی تورکیاو پروپاگاندەکانیان دەربارەی چاك کردنی دۆخی وڵات و ژیانی خەڵکی لەسەر کاغەز مانەوە. ڕەنجبەرو زەحمەت کێشانی ناوچە داگیرکراوەکان لە ڕووی باج زۆریی و زەوت کردنی بەرهەم و بێ ئاسایشی بارێکی گرانیان کەوتبووە سەرشان. لە ئەنجامی ئەم هۆیانەی باس کران زۆربەی زۆری دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکان، هەر دەستەو تاقمێك بە هۆی بەرژەوەندی خۆیەوە دژی تورکە داگیرکەرەکان بوو. شایەتی مینۆرسکی و شیپلی نوێنەری بەریتانیا ئەم ڕایە

[illegible]نی. لەو ڕاپۆرتەدا کە نووسیویانە دەڵێن: «بڕوامان هێنا [illegible] بردنی تورکەکان لەو ناوچانەدا ناچێ بە دڵی [illegible]وەکان دا، بە ئاشکرا دیارە کە دەرەبەگ و لایەنگیرەکانیان [illegible] بردنەی تورکیان بە دڵ نییە. بوونی سوپای تورک [illegible]یکی گەورەی خستۆتە سەر شانی میللەت بە تایبەتی [illegible]ی جووتیارەکان، ئەمەش بووەتە هۆی مایەی داخ و [illegible]»[128].

هەرچەند جێ‌پێی تورکیا لە ناوچە داگیرکراوەکانی کوردستانی [illegible] نەچەسپاو قایم تر دەبوو ئەوەندەش هەستی ناڕەزایی و [illegible]ی دانیشتوان دژی دەستەو دایەرەی نوێ پەرەی دەسەند. [illegible] مایەی ناڕەزایی تورك بوو ئەوە بوو نەك هەر [illegible]ی کوردو خانەگچکەو مام ناوەندییەکان دژی تورك [illegible] بەڵکو چەند دەرەبەگێکی گەورەش هاتبوونە ریزی [illegible] کە لە هەر دوو دیوی سنووردا نفوزو دەسەڵاتێکی [illegible] هەبوو. ئەمانە دەیان ویست دەرامەت و ساڵانەی ئەو [illegible]نە کۆ بکەنەوە کە تورکەکان دەستیان بەسەریان دا [illegible]. لەسەر ئەمەش گەلێك بەیەکاچوون و ڕووداو [illegible]بوو.[129] ئەم داگیر ـ کردنەی ناوچەکانی کوردستان [illegible] تورکیاوە دووبەرەکی و شەڕو هەرای ناوخۆیی خێڵەکانی [illegible] بەدوادا هات، کە هەتا دەهات تیژتر دەبوو. ئەمەش [illegible] ئەوەی لە کوردستانی تورکیاوە دەچوونە ئەو دیو و سوودیان [illegible] پشتگیری و یارمەتی‌دانی ئاشکرای کاربەدەستانی تورك دەدی.

[illegible]درخانی سەرۆکی بەگزادەکان و پیرۆبەگ لە خێڵی هەرکی لە هەمووان زیاتر بەرهەڵستیی تورکیان لە ناوچەکانی سەر سنوور [illegible]کرد. لەگەڵ ئەوەش دا عەبدول قادر هەوڵێکی زۆری لەگەڵیان [illegible] و چاوی لێ سوورکردنەوە بەڵام بە گوێیان نەکردوو هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩١٠وە بە ئاشکرا دژی ئەوە وەستان تورکیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستانی ئێران دا بسەپێنێ و پاڵیان دایە [illegible] حکوومەتی ئێران. هەر لەو ساشەوە کەوتنە پەیوەندی پەیداکردن لەگەڵ یاریدەدەری کۆنسوڵی ڕووسیا لە ورمێ و داوایان کرد ڕووسیا چاوی لێیان بێت[130].

بەدرخان بۆ پری ئەبریژێنسکی یاریدەدەری کۆنسوڵی نووسی: «لەناو بەگزادەدا پڕوپاگاندە دەکەن و قاوێکی وایان خستۆتەوە کە باشترین ڕێگا بۆ کورد ئەوەیە لەژێر سێبەرو سایەی ڕووسیادا بژی.». سەرۆکەکانی مەرگەوەڕ، **عەبدوڵڵا بەگ و** عەبدول خان و قەرە پەپاخ لە سوڵدزەوە **سەریان دا لە** کۆنسوڵخانەی ڕووسیا، بەو نیازەی داخ و ئاخی **خۆیان لە دەست** تورك دەربڕن و داوای ئەوە بکەن ڕووسیا **پارێزگاریان** بکات[131]. یاردەدەری کۆنسوڵ لەم ڕووەوە **دەنووسێت:** **«ئەوەی** ڕاستی بێت لە ورمێ هەستی ڕزگاربوون **لەژێر دەستەیی** ئێران و هاتنەژێر سایەی ڕووسیاوە تەشەنەی کردووە. **بێگومان** بێ سێودوو دەتوانم بڵێم کە بەلای کەمەوە هەموو ورمێ ـ **دەستەو** دایەرەو پیاوەکانی موحتەشەم ئەل سەڵتەنەی لێ‌دەرچێت ـ بازرگان و خاوەن موڵکەکان، گشت گاورەکان، ئەمانە **تاقە ڕێگا** بۆ ڕزگاربوونی بەکجارییان لە کارەسات و ماڵ وێرانی لەوەدا بەدی دەکەن بنەژێر دەستەی ڕووسیا. جا کە دەزانن ئەم داخوازییەیان نایەتەدی، لەتاوا هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە هەوڵ بدەن حکوومەتەکەمان پارێزگاریان بکات[132].

ئەم هەوڵ و تەقەللایەی دانیشتوانی ناوچەکانی سەر سنووری ئێران ـ لە وانیش کوردەکان ـ بە ئامانجی دەست خستنی یارمەتی و پاراستنی ڕووسیا، لەلایەن موراقیبەکانەوە زۆر دادپەروەرانە سەیر دەکراو شی‌دەکرایەوە. هەموویان لەسەر ئەو ڕایەبوون کە ئەو دۆخە لە ئەنجامی لاوازیی و بێ دەسەڵاتیی کاربەدەستانی ئێرانەوە دروست بووبوو، ئەو کاربەدەستانەی بەتەواوەتی لەبەر چاوی دانیشتوانی وڵاتەکە کەوتبوو هەیبەتی نەمابوو ئەوەی لە بارادا نەبوو ئەو دەست درێژی کردنە ئاشکرایەی تورکیا بەربەست بکات و بتوانێ ئاسایش لە وڵاتەکەدا بچەسپێنێ و میللەتیش بپارێزێ. پری ئەبریژێنسکی لەم ڕووەوە لە (ورمێ)وە دەنووسێ: «هەر هێزێکی‌تر لە جیاتی تورکەکان بێتە مەیانەوەو لەوان ئازاتر بێت و ـ لە هەموو گرنگ تر ـ دادپەروەرترو چالاك تر بێت ئەوە کوردەکان وازیان لێ دەهێنن و لێیان دوور دەکەونەوە[133]. (واتە لە تورکەکان ـ وەرگێڕ ـ). کوردەکان دەورێکی گورج و گۆڵانەیان دژی سیاسەتی داگیرکەرانەی تورکەکان نەبوو، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە هەست و خواستی چوونە ژێر سایەی ڕووسیاوە لە پەرسەندن دا بوو، هەر لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩١٠وە هەستی ناڕەزایی لە ناویان دا دژی ڕژێمەکەی تورك سەری دەرهێنا، لە کۆتایی

حوزەیرانی ساڵی ١٩١٠وە ڕاپەڕینێکی چەکداری کوردەکان بە سەرۆکایەتی میر جەنگەدژ ی تورك بەرپا بوو. ئەلفیریێڤ لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١١دا نووسی: «کوردەکان زۆر توورەو بەداخن لە تورکەکان و خۆشەویستییان بەلای ئێمەدا دادەشکێت»[١٣٤]. ئەوەی هێندەیتر ئاگرەکەی خۆش کرد ئەو شەڕو شۆڕەی ناوخۆ بوو کە لە سەرەتای ساڵی ١٩١١وە لە نێوان عەبدول قادرو شێخ تاهای شەمدینانی خزمیدا داگیرسا. بەگزادەکان و شکاکەکان و چەند خێڵێکیتر بەشداریی ئەم شەڕو هەرایەیان کرد و هەر ڕۆژە لەسەر پەتێك یارییان دەکردو ئەمرۆ لەتەك عەبدول قادرو سبەی لە تەك شێخ تاهادا بوون. زووربەی شکاکەکان پشتی عەبدول قادریان گرت. سەرۆکەکانیان بە ئاشکرا ئەو هەستەیان دەردەبری کە دەسەلات و سوڵتە لە ئێران دا بۆ تورکەکانە[١٣٥]. تورکەکان کە هەمیشە چاویان لە سوودو چاکەی خۆیانەوە بوو دەستیان خستە ناو ئەم شەڕو شۆڕە ناوخۆییەوە. لە سەرەتادا یارمەتی عەبدول قادریان داو پشتیان گرت، بەڵام دوایی لەوە ترسان دەسەلات و نفوزی لەناو کوردەکانی ئێران دا پەرەبسێنێ، لەبەر ئەوە لایان دایە لای شێخ تاهاو کەوتنە یارمەتی دانی، ئەوەی نفوزی لە عەبدول قادر کەمتر بوو، بەڵام لەو دەوڵەمەندتر بوو[١٣٦]. لە ئەنجامی ئەمە دەسەلات و شەوکەتی تورك لەناو خێڵە کوردەکانی سەر سنووردا تەواو کزبوو. خەڵکەکە بۆیان دەردەکەوت کە سیاسەتێکی دووڕووە، سیاسەتێکی خۆپەرست و خۆویستەو وازیان لەوە هێنا بڕوای پێبکەن. هەتا نزیك ترین لایەنە گیرەکانیان وایان لێهێنان و لێیان دوورکەوتنەوە. سمایل ئاغای کاتوور(سمکۆ)، دوژمنی هەرەگەورەی و بە هێزی تورك بوو. بەلای کاربەدەستانی تورکەوە میرنشینی کاتوور تیشکی هەمیشە گزنگ بوو. چونکە شوێنێکی ستراتیجی گەورەو ناسکی لە ناوچەکانی سەر سنوورەکانی تورکیاو ئێران و رووسیادا هەبوو کە مەیدانی شەڕو هەرا بوون. لەگەڵ ئەوەش دا پەیمانەکەی سان ئیستیفانو کە لە شوباتی ساڵی ١٨٧٨دا بەسترا، هەروەها پەیمانەکانی نێوان رووسیاو بەریتانیا کە لە ١٨ - ٣٠ی مایسی ساڵی ١٨٧٨ لە لەندەن مۆرکرا، هەروەها بەندی (٦٠)مینی پەیمانەکەی بەرلین، بە شکراو بێپێچ و پەنا دانیان بەوەدا نابوو کە میرنشینی کاتور بەشێکە لە ئێران[١٣٧] کەچی تورکیا چاوی لەوەوە بوو داگیری بکات. بۆ ئەم مەبەستەش پێویست بوو سمکۆی سەرداری شکاکی خاوەن دەسەلات و نفوز لە میرنشینی کاتووردا بەلای خۆیان دا رابکێشن. تورکەکان لە پایزی ساڵی ١٩١٠دا توانیان بەشێکی کاتور داگیر بکەن. داوایان لە سمکۆ کرد لا بداتە لایان و ببێتە تەبەعەی تورکیا، بەرامبەر ئەوەش سەرداریتی کاتوروچاخریك و سومای بەدرێژایی ژیانی پێ ببەخشن. سمکۆ کە بەئاسانی نیازی ناپاکی تورکەکانی دەزانی بێ سێودوو رازیی نەبوو، هەر ئەو ساتەش لە ڕێی ئیجلال ئەل مولکەوە پەنای بردە بەر کاربەدەستانی ئێران و داوای لێ کردن گورج بێن بە دەنگییەوەو بە پارەو بە چەك یارمەتی بدەن هەتا بتوانێ ڕوو بە ڕووی دەست درێژی کردنەکەی تورکیا بۆ سەر ئێران بوەستێ[١٣٨]. سمکۆ هیچ وەلامێکی لە کاربەدەستانی ئێرانەوە وەرنەگرت، کە ئەوەیان لەبارەدا نەبوو بەرەنگاربوونێکی ڕاستەقینە بەرامبەر تورکەکان ڕێك بخەن. ئەوسا سمکۆ ناچار بوو لە ڕێی شەڕی پارتیزانییەوە بەرەنگاری تورکەکان بکات[١٣٩]. سکمۆ کە دی بە تاقی تەنیاو بە هێزی تایبەتی خۆیەوە دەرەقەت نایە پەنای بردە بەر رووسیا هەتا پشتگیری بکات و یارمەتی بدات. لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١١دا، سمکۆ نامەیێکی بۆ یاریدەدەری کونسوڵی رووسیا لە ورمێ ناردووتیدا هاتبوو: «تورکیا هەلی لە دۆخی دارزاوی ناوەوەی ئێران بینیو بە ئاشکرا شەڕم لەگەڵ دا دەکات. ئیستەش ئێران لەژێر سێبەری پاراستنی رووسیادایە، لەبەر ئەمە ئەگەر دەوڵەتێکیتر بیەوێ ناوچەکانی ئێران داگیر بکات دەبێ رووسیا ڕێگا نەدات. تکا دەکەم نیازی ناپاکی تورك بە حکومەتەکەتان بگەیەنن.»[١٤٠]. بەم جۆرە بەشێکی زۆری کوردەکانی سەر سنوور، هەتا ئەوانەش کە لە سەرەتاوە یارمەتی تورکیان دا لە دواییدا وازیان لێهێنا، چونکە بۆیان دەرکەوت کە دەستدرێژییەکەی تورکیا ئامانجێکی باشی بۆ ئەمان تێدا نییە. ئەمەش وای کرد پیلانەکەی تورکیا بکەوێتە بەر هەرەشەو مەترسی، ئەو پیلانەی نیازی وابوو ناوچەکانی کورد لە ئێران داپچڕێنێو کوردستانێکی یەك گرتوو بخاتەژێر دەسەلاتی ئەستەمبوڵەوە. تورکەکان نەیان دەویست دان بەم

سەرەكەوتنەیان دا بنێن، لەوەی بۆیان نەكرا كوردەكانی ئێران لە سەری خۆیان كۆ بكەنەوە.

ئەوەی بووبووە مایەی مەترسی‌یێكی گەورە بۆ توركیا ئەوەبوو هەستی لادان بە لای رووسیا لە كوردستانی ئێـران دا پەری سەندبوو. لەبەر ئەمە لە سەرەتای ساڵی ١٩١١دا بەگەرمی كەوتنە پڕوپاگندە كردن لەناو كوردەكانی سەر سنووردا دژی رووسیا. هەوڵیاندا بوون كە پەرەسەندنی هەستی دوژمنانەی كورد بەرامبەر رووسیا كوردەكان فڕێ دەداتە باوەش توركیاوە. خۆیان بەمەوە خەریك كردبوو. گاڵوینۆڤ لەم ڕووەوە دەنووسێت: «توركیا هەوڵ دەدا ... كوردەكان هەڵ سوورێنێ ... و خراپەی رووسیای تێدابێت بۆ ئێرانیش هەراو فیتنەیێكی ... بنێتەوە ببێتە بیانوویێك سەرلەنۆی دەست درێژی بكاتەوە سەر ئێران»[١٤١].

ئەوانەی پروپاگاندەیان لەناو كوردەكان دا دەكرد ئەوانە بوون كە هەڵ گری بیـروبـاوەڕی پان ئیـسـلامی‌یـەت بوون و لە قەفقـاسـەوە هاتبـوون، وەك (ئـەحمـەد ئاغـائیێف و چەنـد كەسـانێكی‌تـر). بە واتـەی ئەلڤێـرییێف: «ئـەوانـە بە یارمـەتی‌و پشتگیـری توركیـا هەستی دوژمنـایـەتی بەرامبـەر رووسیـا بڵاو دەكەنەوەو هەوڵ دەدەن كوردەكان یەك بخەن و كوردستانی ئێران بخەنە ژێر باڵ و سایەی توركیاوە». بۆ ئەم مەبەستەو هەروەها بۆ كڕینی سەرۆكـە كوردەكـانی ئێـران ئەو پارەو پوولـە پرش وبـڵاو دەكرایەوە كە وەختی خۆی بۆ سوپای حەمیدی لەناوچوو خەرج دەكرا»[١٤٢]. توركەكان لە ناوچەكانی سەر سنووردا چەك و جبـەخـانـەیـان دەدا بە كوردەكان و بە ئاشكراش دژی نوێنەرانی رووسیـاو سوپـای رووس لە ئێـران دا هانیـان دەدان[١٤٣]. لە ئەنجـامی ئەم هانـدانـەی تورك چەنـد ڕووداوێك ڕوویدا هەرە گەورەكەیان هێنەكەی بیچیراخۆڤ ناو بوو[١٤٤] كاربەدەستانی تورك بە زۆری پشتیان بەیاخی بوونە دژ بە شۆڕشەكەی سالار ئەل دەولە بەستبوور. هەر بۆ نموونە چەند تێبینی بە رێك لەوانە (پـری‌ئـەبـرژینسكی) یاریـدەدەری كۆنسۆل لە خۆی ئەو رایەیان دوویـات دەكـردەوە كە توركیـا یارمـەتی شۆڕشگێـڕەكـانی ئێـران دەدات بۆ ئەوەی كۆسـپ بخـاتـە ڕێـی رووسیـا، لەگـەڵ بەریتانیاش دا بە جووتە هەوڵیان دەدا شۆڕشەكە لەبار بەرن[١٤٥]. ئەم رایـەش رایێكی سەرزاریی‌و رووكـەش بوو هەر لەبـەر ئەمەش رایێكی راست نەبوو. ئەوەی راستی بێت توركیا هەر لە سەرەتای پەیدابوونی شۆڕشەكەی ئێران هەڵوێستێكی دوژمنانەی تیژی بەرامبەر هەبوو[١٤٦]. ئەم هەڵوێستە هەتا لە دەورو زەمانی توركیـای لاویش دا نەگـۆڕدرا. كۆنـەپـەرستـانی توركیا كە دژی شۆڕشی ئێرانی دراوسێ‌یان وەستان و كەوتنە بەرهەڵستی كردنی هەر لەبەر ئەوە نەبوو بە گشتی دوژمنی دیموكراتی‌یەت بوون و نەیـانـدەویست بیـروبـاوەڕی شۆڕشگێـری لە ئێران دا كاربكاتە سەر توركیا بەڵكو لەبەر ئەوەش بوو ئەگەر بهاتبایە شۆڕشەكەی ئێـران سەری بگـرتبـایـە ئەوە سیـاسـەتـە داگیـركـەرانـەكەیان لە كوردسـتــانـی ئێــران دا سـەری نەدەگــرت و كۆسـپـی گەورەی دەهـاتــەرێ. ئەوەی بە زۆری داخی كردبــووە دڵی توركیــای داگیـركـەرەوە كردەوەو چالاكیی ئەنجـومەنە شۆڕشگێڕەكان بوو لە كوردستانی ئێران و ئازربایجان دا، ئەوانەی توانیان ئاسایش لە ناوچـەكــان دا بچـەسپێنـن و بەگــەرمی دژی دەسـتگــاو بەرێوەبەرایەتی‌یە دارزاوەكانی شا تێ‌بكۆشن. لە كۆتایی بەهاری ساڵی ١٩١١دا هێـزەكـانـی دوژمنـانی شۆڕش لە ئێـران دا دەسـەڵاتیـان تەواو پەیـداكـردو و چالاكی‌یـان دەنواند. موحەمەد عەلی پاشا لە باكووری ئێران دا خۆی ئامادە كردبوو بەرەو تاران بروات. سالار ئەل دەولـەش لە ڕۆژ ئاواوە، لە توركیــاوە بۆ پشتگیری كردن و یارمەتی‌دانی شای برای كەوتەڕێ. بە واتەی ئەلڤێـرییێڤ، كاتێـك سالار ـ ئەل دەولـە لە توركیـا بوو لە ڕێی (ئەشخان) ناوی سەرۆكی تاشناقەكان لە وان لەگەڵ ئەندامانی پارتی یەكێتی‌و پێشكـەوتن كەوتـە گفتـوگـۆ. پارەو پوولیـان دایـەو رایان سپارد لەناو كوردەكانی ئێران دا[١٤٧] پروپاگاندە بكات بەو نیـازەی هەمـوو كوردسـتـانی ئێـران و دواییش ئازربـایجان بەلای خۆیدا رابكێشێت، ئەگەر هاتوو سەركەوت ئەوە خۆی بكات بە شای ئێران و دان بە حیمایەتی توركیادا بنێت. لەگەڵ ئەوەش دا ئەم خەبـەرە تەواو راسـت نی‌یـە بەڵام قوت بوونـەوەی سالار ئەل دەولـە لە ناوچەكانی باكووری ڕۆژئاوای كوردستانی ئێران دا ئەم خەبەرەی بەرەو لە راست چوون دەبرد. لە سەرەتادا چوو بۆ ناوچـەكـانی سولـدزو ساوجبـلاق و سەرۆك و گەورەكانی سوپای تورك و مووچەخۆرەكانی دی‌و سەری لە نیشتەنی‌یە كوردەكان داو

لەگـەڵ چەنـد سەرۆکێکی کوردەدا چەنـد جارێـك کۆبـوونەوەی کرد. میللەر لەم ڕووەوە دەنووسێت: «وا بزانم تورکەکان نیازیان وایە کوردەکان شوێن خۆیان بخەن و پەلاماری ئازربایجان بدەن بۆ ئەوەی بیـانـوویێـك بدۆزنـەوە دەستی پێبخـەنـە کاروبـاری ناوەوە»[148]. کردەوەکانی دوایی سالار ئەل دەولەش بە زۆری ئەم ڕایـەی چەسپـانـد. لە سەرەتـادا کەوتـە لەشکـر کۆکردنەوە. زوربـەی لەشکـرەکـەی لە کوردەکـانی خواروو واتە (کوردستانی عیـراق) بوو. لەوانـە شێـخ موحـەمـەد لە خێڵی جاف (خاوەنی چوار هەزار سوارە بوو)و شێـخ موحـەمـەد خەسـرەو کوری شێـخ سەعید لە خێڵی زەنگەنە (خاوەنی دوو هەزار سوارە بوو)[149].

دوای ئەوەی چەنـد هێـزێکی‌تـری کوردەکـانی ئێـرانی بە لای خۆیدا ڕاکێشـا هێـزو دەسـەڵاتی تەواو پەرەی‌سـەند. لە مایـسی ١٩١١دا (٢) هەزار چەکـداری موکـری دایـانـە پاڵی. ئەو دەنگ و باسەش بڵاو بۆوە گوایە شێخ عەبدول قادر نیازی وایە پشتی سالار ئەل دەولـە بگـرێت[150]. لە مایس و حوزەیـرانی ١٩١١دا سالار ئەل دەولە بە هەموو کوردستانی ئێران دا. گەرا گەلێك لە خانەکانی سەقز پشتیان گرت. لەوێوە چوو بۆ سنە، هێـزێکی گەورەی سوارەو پیـادەی کوردی لەگـەڵ دا بوو. لەوێ سالار ئەل دەولـە لە (نـاوەراسـتی تەمـوزی ساڵی ١٩١١دا) بانگی‌دا کە سەرداریی هەموو کوردستانەو کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ بەرەو تاران کشان[151]. هەر لەو کاتەش دا موحەممەد عەلی شا ئامـادەکـردن بەرەو تاران کەوتبـوە ڕێ. گەلێـك لەو هێـزە کوردانـەی لە ریـزی سوپـاکـەی موحـەمـەد عەلی شادا بوون ئەفســەرو سەرۆکـەکـانیـان تورك بوون. سەرکـەوتنی سالار ئەل دەولـە هەتـا ئێـرە بریکـردوو لێـرە بە دواوە وەستـا. زوربەی خێڵەکـانی کوردی ئێـران وازیـان لێهێنا، چونکە هەستیان بەوە کردبـوو کە لەگـەڵ خۆیدا زوڵـم و زۆرداری تورك دەهێـنێ. هێزەکانی شۆرشیش کەوتنە خۆ ئامادەکردن بە نیازی بەرهەڵستی کردنی ئیدیعاکانی سالار ئەل دەولە. خانەکانی (پسفی) لەپێش هەمـووانـەوە وازیـان لە سالار ئەل دەولـە هێنـا، دووای ئەوانیش کوردەکـانی موکـری دەست بەرداری بوون. بەگـزادەکـان لە هەمـوان زیـاتـرو بۆ ماوەیێکی درێـژتـر پشتی سالاریان گرت، بەڵام زۆری نەبـرد هێـزەکـانی ئەوانیش توانـەوە[152]. سالار ئەل دەولە کە وای لێهاتبوو هێزو لەشکری پێنەمێنێ ناچار بوو رابکات و خۆی بگەێنێتە ناوچەکانی خواروی کوردستانی ئێران بەو ئامـانجـەی لەوێ هێـزێکی‌تـر کۆبکـاتـەوەو لە دوا ڕۆژێکی نزیـك دا هەوڵ بدات هەمـوو کوردەکـان لەژێـر سەرکـردایـەتی خۆیدا کۆبکـاتـەوەو بەرەو تاران بیـان بات. لە تەمـوزی ساڵی ١٩١١دا سالار ئەل دەولــە گەیشتــە کرمـانشــا. لە ناوەراستی ئابیش دا بۆئـەوەی بەرهـەڵستی بکـرێت شاری هەمەدانی داگیر کرد. ئیتر لێرە بە دواوە ئەوەی لە توانادا بوو لە هێرش بردن دا بەردەوام بێت. هەوڵ و تەقەللای سالار ئەل دەولە (بە هان دان و پشتگیری تورکیا) لە یەکەم هەوڵ دانی‌دا بۆ داگیرکردنی هەموو کوردستــانی ئێــران و پێــك هێنــانی هێـزێکی دژ بە شۆرش و پەلاماردانی تاران، ئەم هەوڵ دانەی سەری نەگرت.

ئەم ڕووداوانــەی هەرێمـەکـانی سەر سنـووری کوردستـانی ئێـران، بە تیـژی سەرنجی ئەو دەوڵـەتـانـەی ڕاکێشا کە ئێرانیان بەلاوە گرنگ بوو، وەك ڕووسیاو بەریتانیاو ئەڵەمانیا. ڕووسیا لە هەمــوان زیـاتـر بە پەرۆش بوو. چونکـە ئەو ڕووداوانـەی سەر سنووریان بە مەترس یێك دادەنا هەرەشە لە ئاسایشی سنووری قەفقــاس و بەرژەوەنـدی‌یـەکـانیـان لە ئێـران دا، بە تایبـەتی لە ناوچـەکـانی باکـووری ڕۆژئـاواو ناوچـەکـانی ڕۆژئاوادا بکات. گەلێك لە نوێنەرەکانی ڕووسیا لە ڕۆژهەڵاتی نزیك دا لە مێژەوە ترسی خۆیــان دەربــارەی ئەو دۆخـە پیشـان)دابـوو کە لەو دیـو (ئـاراکـەوە) دروست بوو بوو. (نیـازی ئەو دیو ڕووباری ئارازە، واتــە ئێــران ـ وەرگــێــر). هەر لە ساڵــی (١٩٠٥)وە، ب. ڤ. مینورسکی، لەو ڕاپۆرتەی‌دا کە دەربارەی ئەو گەشتەی بە ئاسیــای بچـووك دا کردبـووی نووسیـوی: «. . . بە گشتی کوردستــان بۆ ڕووسیــا گرنگـە، ئەمـرۆ بێت، یان سبـەی هەر گوررانێك بەسەر ئازربایجان دا بێت کە پەیوەندی توندی لەگەڵ ڕووسیادا هەیە بە دڵی ئێمە نابێت. بۆ ئێمە ئەوە پێویستە لەم ناوچـانـەی نزیـك سنـوورەکـانمـان ئەو دۆخەی هەیە وەك خۆی بمێنێتەوە. تێك دانی ئەو دۆخە لەوانەیە لە پێش هەموو شتێکەوە ببێتە هەرەشـەیێك بۆ تورکیا. دەبێ بە هەموو جۆرێك چاومان لە دۆخـەکـە بێت و لە لێکـۆڵینـەوەی نەکەوین و پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین کە هەر پارچەیێك لە ئێران داپچرێت و سەر تورکیا مانای

ئەوەیە ئەو پارچانە لەژێر کارتێکردنی ئاشتی خوازی ئێمە حەز نەردەچن . .» [١٥٣] د. پیلیایێفن تێبینێکی تر لەم ڕووەوە نووسیوێتی : «ئاشکرایە ئێمە حەز دەکەین ئەو ناوچانە بگەڕێنەوە ژێر سایەی حکوومەتی ئێران چونکە بەرژەوەندی بازرگانێتیمان و چاکەی ڕەعیەتەکانمان لەوەدایە . دەبێ بێ‌وەستان وەها بکەین تورکەکان بوەستێنین و نەیەڵین لە خوارووی گوماوێ وان بەولاوە جووڵێنەوە.» [١٥٤] لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٠٥دا، قەشە سێرگێی نێردراوێ ئاینی ڕووسیا لە ورمێ دەربارەی کردەوە نارەوا ناڵەبارەکانی کۆنسوڵی تورکیا لەناو دانیشتووە کوردەکان دا نەنووسێت : «ناوو شۆرەتی ڕووسیای مەزن نەك هەموو ساڵێك بەڵکو هەموو مانگێك لە نووشوستی هێنان دایە . لێرە لە ورمێ ، لەم دواییەدا ناوبانگە دێرینەکەی ڕووسیا گەیشتە کوردستان . گاورەکانی ورمێ و کوردستان چاوەڕوانی ئەوە بوون سەرفرازییان لە ڕێی ڕووسیاوە بۆبێت . .» [١٥٥] کاربەدەستانی ڕووسیای قەیسەری هاتنە سەر ئەوەی بەختە نەختە لە جدییەبی دوحی کوردستان بگەن . سوخوملینۆڤی وەزیری جەنگی ڕووسیا لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٠دا نامەیێکی تایبەتی نارد بۆ ستۆلیپینی سەرەك وەزیران ، لەو نامەیەدا بە جۆرێکی تایبەتی ئەمەی خوارەوە دەست نیشان کرابوو : «. . . داگیرکردنی ناوچەکانی ئێران لەلایەن تورکیاوەو بەهێزبوونی تورکیا لەسەر حیسابی ئێرانی لاواز بە دڵی ئێمە نییە . هەروەها ئەو هەوڵ دانەی تورکیاشمان بە دڵ نییە کە دەیەوێ هەموو خێڵە کوردە شەڕکەرەکان لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا یەك بخات ، ئەمەی لە دواییدا دەگاتە ئەوەی کوردستانی ئێرانیش بکەوێتە ژێر سایەیەوە . سەرکەوتنی تورکیا لەم مەیانەدا توانای شەڕو جەنگی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەهێز دەکات . جا لە جیاتی ئەوەی هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی ئاسایش لەناو خێڵە کوردەکان دا بچەسپێ ، باشتر وایە ڕێگا بدرێت ژمارەیێکی زۆریان لێ‌ڕابکێشین و بە سەدان سوارە لە خێڵە کۆچەرەکانی کورد بگرین.» [١٥٦] لەوە دەچوو دانانی پیلانێکی یەك گرتوو لەلایەن تورکیاوە بۆ داگیرکردنی کوردستانی ئێران هاتبووە ئەوەی پێ‌بگات . بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم نیازەی تورکیا، نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەگەڵ نوێنەری وەزارەتی جەنگ لە ١ ـ ١٤ی مارتی ساڵی ١٩١١ کۆبوونەوە . مایۆر جەنەراڵ ئەڤێریانۆڤ کە گەورەترین پسپۆری مەسەلەی کورد بوو لە وەزارەتی جەنگ دا وتارێکی خوێندەوەو دەری‌خست کە «لەوانەیە یەك خستنی کوردەکان لەسەر دەستی تورکە داگیرکەرەکان بێتەدی ، ئەمەش بۆ ئێمە باش نییە . باشتر بۆ ئێمە ئەوەیە بە هەر جۆرێك بێت دووبەرەکی و نەفرەت لە یەك کردن لەناویان دا پەیدا بکەین» . ئەڤێریانۆڤ لە هەمان کاتیش دا ئەوەی خستە ڕوو کە لەو بڕوایەدا نییە ئەگەر هاتوو شەڕ لەنێوان ڕووسیاو تورکیادا داگیرسا، ڕووسیا بتوانێ سوود لە کوردەکان ببینێ . بەلای جەنەراڵ مایۆر (خۆڵمسین)ی، سیخوری جەنگی ڕووسیا لە تورکیا، باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ڕووسیا بەسەر کوردەکان دا پەرەبسێنێ ئەوە بوو سەرەك خێڵەکانی کورد بە پارە بکڕێن . سەرۆکی بەشی یەکەمی دایەرەی ڕۆژهەڵاتی نزیك لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕووسیا کلێم ناو، زۆر گوێی نەدایە ئەم پێشنیازە . لەبەر ئەوەی وەك خۆی ڕوونی دەکاتەوە : «کوردەکان پێش هەموو شتێك بۆ پاراستنێکی ڕاستەقینە» ، دەگەڕێن بەڵام ئەم کێشەیە وەك کلێم خۆی دانی پیادا دەنێ هەتا ئێستە بەلایەك دا نەخراوە . لە ڕوون کردنەوەیێکی خۆیدا، کلێم ئەو ڕێ‌و شوێنەی دەست نیشان کرد کە دەتوانێ کار بکاتە سەر تورکیا . لەپێش هەموو شتێکەوە ئەوەی بەگرنگ دانا پشتگیری سیاسی بەریتانیا دەست بخەن» ، کە تا ئەو ساتە بەلایەوە گرنگ بوو [واتە بەلای بەریتانیاوە ـ وەرگێر] زۆر لە تورکیا بکات کێشەکەی هێڵی ئاسنینی بەغدا بەو جۆرە یەکالا بکاتەوە سوودی خۆی تێدا بێت . .» . هەرچەندە کارتێکردنەکەی بەریتانیا وەك کلێم خۆی لە دواییدا دەڵێ : «لەوەدایە کە ئەڵمانیا لەسەر هێڵی ئاسنینی بەغداد چۆن لەگەڵ تورکیادا ڕێك دەکەوێ» ، هەرچۆنێك بێت ئێستە دەتوانین پشت بە پشتگیری‌و یارمەتییێکی تەواوی دیبلوماسی بەریتانیا ببەستین» [١٥٧] .

لە ئەنجامی کۆبوونەوەکەو وتارەکەی کلێم دا، ئەم بڕیارانە دەست نیشان کران :

١ ـ دەست درێژی کردنەکەی تورکیا بۆ سەر ئێران هەڕەشەیێکی تەواوە بۆ ڕووسیا . ڕێگا لە بزوتنەوەی هێزەکانی یەریڤان دەگرێ‌و لە چەند ڕوویەکیشەوە دەتوانێ ببێتە مایەی هەڕەشەو

مەترس یێکی تەواو بۆ قەفقاس.

٢ - ئەوەمان لاباش و ڕاستە کوردەکان یەك بگرن بەو نیازەی بۆ ئامانجی دوژمنانە بەکاربهێنرێن. بەڵام بەپێچەوانەوە دەبێ بە هەموو توانامانەوە هەوڵ بدەین کوردەکانی ئێران بەلای خۆمان دا ڕابکێشین بۆ ئەوەی لە تورکیایان دوور بخەینەوە. پاش ئەمەش ئەرکی هەستان و ڕاست بوونەوە دەخەینە ئەستۆی شێخ و سەرۆکی خێڵەکانەوە. بۆ ئەم مەبەستەش وا باشە دەسەڵاتی میرنشین ماکین فراوان تر بکرێت.

٣ - پێویستە لە ڕێی سیاسەتەوە زۆر لە تورکیا بکرێت، جاروباریش نوێنەرانی رووسیاو بەریتانیا بەیەکەوە سەر لەو ناوچانە بدەن کە دووبەرەکی یان لەسەرە.

٤ - پێویستە لە ڕێی هان دان و زۆر لێ کردنەوە هەستی نیشتمانپەروەری لە ئێران زیندو بکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕوو بە ڕووی دەست درێژی کردنەکەی تورکیا بوەستێ.

٥ - ئەگەر هاتوو هەوڵ و تەقەلالای دیبلوماسی سەری نەگرت ئەوسا دەبێ هێزی سوپایی رووسیا خۆیو چەند ناوچەیێکی داگیر بکات.

بەندی ٦، ٧، ٨یش دەربارەی قایم کردنی جێ پێی رووسیا بوو لە ئازربایجانی ئێران دا، لە ڕێی ڕاکێشانی هێڵی ئاسنین هەتا خۆیو تەوریزو هەروەهاش بەهێزکردنی سوپای ئێران و شتی تر[١٥٨]. بەم جۆرە رووسیا بۆ یەکەم جار بڕیاری‌دا بە کردەوە پارێزگاریی بەرژەوەندی‌یەکانی خۆی بکات و لە وشەی ڕووتەوە بێتە سەرکردەوە. سوخۆملینۆف کە ئەنجامی کۆبوونەوەکەی پێگەیشت، سەرلەنوێ لە نامەیێکی‌تردا ستولیپینۆڤی ئاگادارکرد (لە ٨ - ١٥ نیسانی ساڵی ١٩١١دا نووسراوە) کە دەست درێژی کردنەکەی تورکیا بۆ سەر کوردستانی ئێران مەترسی‌یێکی زۆری بۆ رووسیا هێناوەو داوای لێ کردووە بەخێرایی سنوورەکانی نێوان تورکیاو ئێران دەست نیشان بکرێت[١٥٩].

دەربارەی ئەوەی چۆن رووسیا بە شێوەیێکی ڕاستەقینەو بەخێرایی جێ پێی خۆی لە کوردستانی ئێران دا قایم بکات، بیرورای جیاواز هەبوو. هەر بۆ نموونە گالوبینۆڤ ئەوەی بە ڕاست دەزانی چالاکانە دەست بخرێتە کاروباری ناوەوەی خێڵەکانەوە[١٦٠]. بەپێچەوانەشەوە چیرکۆڤی باڵیۆزی رووسیا لە تورکیا ئەوەی بە ڕاست و ڕەوان دادەنا رووسیا ئامانجەکانی خۆی لە کوردستانی ئێران دا لە ڕێی دیبلوماسی‌یەتەوە بەدی‌بێنێ. لە نامەیەکی‌دا کە لەم ڕووەوە بۆ ئیزڤۆلسکی ناردووە نووسیونی:

«بۆ ئەوەی لەسەر کێشەکەی ورمێ و چەند کێشەیێکی‌تر کاربکرێتە سەر تورکیا پێویست ناکات پەنا ببرێتە بەر کوردەکان»، بەتەواوەتیش وازی لەو ڕایە هێنا کە بتواندرێت کوردەکان دژی تورکیا هان بدرێن. هان دانی کوردەکان - چیرکۆڤ دەنووسێت - بۆ ئەوەی لە تورکیا ڕاست بنەوە نەك هەر باشترین بیانوو دەدا بە تورکەکان بۆ ئەوەی کشاندنەوەی هێزەکانیان لە ناوچەکانی ئێران دا بخەن، بەڵکو واش دەکات هێزی سوپایی خۆیان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان دا قایم تر بکەن و ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندی ئێمەدا ڕێك ناکەوێت[١٦١]. بەم جۆرە باڵیۆزخانە داوای دەکرد لەم مەیانەدا زۆر بە ئاگاداری‌یەوە هەنگاو هەڵ بهێنرێت. مینۆرسکی دەربارەی بەرهەڵستی کردنی سیاسەتی داگیرکەرانەی تورکیا لە ناوچەکانی ئێران دا بیرورایێکی مەنتیقی‌تری هەیە. بەڵام داوای ئەوەش دەکات یارمەتی سەرۆکە ئاینی‌یەکانی کورد بدرێت وەك شێخ زەمبیلی‌و یوسف و بابا سەعیدو چەند شێخێکی‌تر. ئەوانەی توانیبوویان دەسەڵاتێکی گەورە بەسەر مریدو خەڵکانی‌تردا پەیدا بکەن واتە لەگەڵ کاربەدەستان دا[١٦٢]. بیرورای مینۆرسکی لەو ڕووەوە یەك نەبوو چۆن رووسیا پەیوەندی خۆی لەگەڵ خێڵە کوردەکان دا قایم بکات و هەروەهاش چی بکرێت بۆ ئەوەی وا کوردەکان بکرێت کردەوەی دوژمنانە دژی رووسیا نەنوێنن و لەگەڵ کەمایەتی‌یە گاورەکان دا ئەوانەی رووسیا خۆی بە پارێزەریان دادەنا، خراپ نەجووڵێنەوە.

کاربەدەستانی قەفقاس داوایان دەکرد بەتوندوتیژی دەست بخرێتە ناو کاروبارو ژیانی ناوەوەی کوردستانی ئێران. ڤارونتسۆڤ - داشکۆڤ لە نامەیێکی‌دا کە بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیای نووسیوە لەوە دەدوێ کە یەکێك لەو هۆیانەی وای کردکوردەکان پەلاماری سەد پیچیراخوفەکان بدەن «سیاسەتە ڕاراییو دوو ڕووەکەمان بوو نە ئەستەمبوڵ و لە ئێران». ناحەزی‌و نارەزایی خۆشی دەربارەی ئەرنی پکمیفسکی بۆ تاران دەربریوە،

...نێردراوەی لە ترسی ئەوەی لەگەڵ تورکەکان دا نەچن بە یەکاو ...وتە رووسیا ـ وەرگێڕ)و هەرا نەقەومێ رازی نەبوو هێزی سوپایی ...ووسیا روو بکاتە خوی‌و ناوچەکانی‌تری نزیکی. «هەروەها ...ڕەزێی خۆم دەربارەی سستی‌و ڕاڕایی سیاسەتەکەش لە ...ستەمبوڵ دەردەبڕم». ڤارنتسۆف ـ داشکۆف لەسەری دەڕوات و ...ێ: «پێویستە نەك هەر بە قسە بەڵکو بە کردەوەش خۆمان ...ێنین، ئەگینا هیچ ناوو هەیبەتێکمان لە رۆژ هەڵات دا ...مێنێ»(١٦٣) لەبەر وسکەیێکی تردا ڤازشۆف ـ داشکۆف داوای کردووە بەخێرایی کێشەی ئەو ناوچانەی دووبەرەکی‌یان لەسەرە یەکالا بکرێتەوەو سنووریان بۆ دابنرێت. داوای ئەوەشی کرد زۆر بە تورکەکان بکرێت دان بەو (دۆخە هەبووەی) ورمێ‌دا بنێت. وتە «بەرامبەر بەوەی تورکەکان مافەکانی ئێمە مسۆگەر بکەن بۆیان هەیە لە ناوچە داگیرکراوەکان دا بمێننەوەو هیچ لایێك زیانی بۆ لایەکەی‌تر نەبێت.».

ڤارنتسۆف بە دڵنیایی‌یەوە دەنووسێ: تورکەکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی پەلاماری ئێمە بدەن.(١٦٤)

بەم جۆرە کاربەدەستانی قەفقاس رایان وابوو کە ئەمڕۆ بێ، یان سبەی شەڕ لەگەڵ تورکیادا روودەدات، لەبەر ئەمە داوایان کرد بکەونە خۆیان. چەند کۆنسوڵێکی رووسیاش لە کوردستانی ئێران ئەم رایەیان هەبوو. هەر لە هاوینی ساڵی ١٩٠٩وە، میللەری یاریدەدەری کۆنسوڵی ئەوسای رووسیا لە ورمێ، سوارەکانی کۆنسوڵخانەی ناردە سەر بەگزادەکان بەو نیازەی سزایان بدەن لەسەر ئەوەی پەلاماری گوندێکی گاورەکانیان دابوو.(١٦٥) سێرگێی قەشەش داوای دەکرد سوارەکانی کۆنسوڵخانە لە ورمێ زیاد بکرێن.(١٦٦) گالوبینۆف لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١١دا، هێزێکی چەکداری بە سەرۆکایەتی ئیڤانۆف ناردە سەر گوندی (سیر) بۆ پاراستنی گاورەکان لە دەست بەگە کوردەکان. بەیەکاچوونێك رووی ـ دا، لە ئەنجام دا کوردەکان لەو گوندە دەرکران.(١٦٧)

پاکلێفسکی نێردراوی رووسیا لە ئێران، وای‌کرد بە توندی سەرزەنشتی گالوبینۆف لەسەر ئەم کردەوەیەی بکرێت. لە نامەیەکی‌دا کە بۆ گالوبینۆفی ناردووە تێی‌دا هاتووە: «پێویستە ئامانجەکانی کۆنسوڵخانە لەیاد نەکەن، سوارەکانتان بۆ ئەوە دانراون کۆنسوڵخانەو ژیان و موڵکی رەعیەتەکانی رووسیا لە ورمێ بپارێزن. نابێ سوارەکانی کۆنسوڵخانە بەشداریی پەلامارادنێکی وەها لە دەوروبەری ئەم شارەدا بکەن. چونکە لەوانەیە رامان کێشێ بۆ ناو گێژاوی دۆخێکی ئاڵۆزاو کە حەزی لێ ناکەین. ناشبێ لەوە دڵ تەنگ بێت کە وازهێنانمان، یان نەویستنمان بۆ بەرهەڵستی کردنی هێرشێکی وەهای کوردەکان وە بە بێ‌هێزی‌و بێ‌دەسەلاتی بخوێندرێتەوە. مەسەلەی بەهێزکردنی سوارەکانی کۆنسوڵخانە لە ئێران دا، کارێکە وەزارەتی کاروباری دەرەوە بڕیاری لەسەر دەداو لەسەر بڕیاری نێردراوەکانەو نەك لە رێی پەیوەندی ناراستەو خۆی هەردوو کۆنسوڵخانەکەوەیە.»(١٦٨)

وەزارەتی کاروباری دەرەوە بەتەواوەتی پشتگیری ئەم هەڵوێستەی پاکلێفسکی کرد. کلیم یاریدەدەری کۆنسوڵی لە ورمێ ئاگادار کرد کە زۆر ئاگادار بێت لەوەی بە ئاشکرا پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان دا هەبێت و یان لە جیاتی تورکەکان سزایان بدات. نێردراوە سوپاییەکەش ئاگادار کرد کە بەبێ فەرمانی نێردراوەکەی تاران نەجوولێنەوە: «کارو ئەرکی ئێمە ئەوە نی‌یە ئەرکی ئاسایش چەسپاندن و هێمنی هەموو هەرێمی ورمێ بخەینە ئەستۆی خۆمان. ئێمە هەر ئەوەمان لەسەر رەعیەتەکانی رووسیاو رێگاوبان بپارێزین.»(١٦٩) پاش ماوەیێك کلیم سەر لەنوێ گالوبینۆفی ئاگادار کرد لەوەی پێویستە چاوی بکاتەوەو نەیەڵێ بە هیچ جۆرێك بەیەکاچوون لەگەڵ کوردەکان دا روو بدات، ئەو کوردانەی تورك هەمیشە لە پشتیانەوە وەستاوە. بێ‌گومان لە یەك داپچڕاندنێکی ئاشکرا لە تورکەکان و تێك چوونمان لەگەڵیان شتێك نی‌یە بە دڵمان بێت.»(١٧٠)

کلیم هەروەها یاریدەدەری کۆنسوڵی لە خوی ئاگادار کرد کە: «هەوڵ بدرێت پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان دا تێك نەچێت و بەرەو تیژ بوون نەڕوات».(١٧١) بەم جۆرە لە پیتربورگ جارێکی‌تر گەڕانەوە سەر سیاسەتی ترس و لەرزو نەیان ویست کێشەکەی کورد ببێتە کۆسپێك لە رێی پەیوەندی نێوان رووسیاو تورکیادا.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە میرنشینەکانی سەر سنووری رووسیاو هەموو ناوچەکانی باکووری رۆژئاوای ئێرانی نزیك بە رووسیاوە هەبوو، ئەوە کاربەدەستانی رووسیای قەیسەری لەمەدا ئامادە نەبوون سەر شۆڕ بکەن و چاو پۆشن و بە قەدەر

ئەنگـوستێـك واز لە ماف و بەرژەوەنـدی خۆیـان بهێنن. هەر لە ساڵی ١٩٠٥ەوە، مینۆرسکی نووسیی: «ئەگەر هاتوو کوردەکان پەلامـاری سنـوورەکـانی یەریڤـانیان ـ دا، ئەوە تەنیا بێ‌لایەنیی ماکین بۆی هەیـە هێـزێکی میللی کۆبکـاتـەوەو ئەو سنـوورانـە بپـارێـزێ.». مینۆرسکی دەربارەی دەوری ستراتیجی میرنشینی ماکـیـن و ئەو دەورەی لە مەیـانی ڕێگـاو بان و بازرگـانییش دا هەیەتی، دەنووسێت: «پاش گەشتەکەم بە ماکۆدا بروام هێنا کە ئەم میرنشینە لە ڕووی پەیوەندی جوغرافی‌یەوە، پەیوەندی‌یێکی زۆر نزیکی لەگـەڵ ئەودیـو قەفقـاس دا، زیـاتـر لەشـوێنی‌تـر بۆ نموونە وەك. لەگەڵ خوی‌دا هەیە، لەبەر ئەمە لەوانەیە زۆر بە ئاسـانی بێتـە ژێـرسـایـەی ئێـمـەوە بە مەرجێك بزانین چۆن ئەم ئامانجە بهێننەدی‌و لە چ ڕێ‌و شوێنێکەوە هەوڵی بۆ بدەین. بە هیـچ جۆرێـك نابێ قەدری دراوسێ‌یـەکانمان نەزانین.»[١٧٢]

سیـاسـەتی ڕووسیـا لە ماکین لەسـەر دوو کۆڵـەکـە دامـەزرابـوو خاوەنی دوو ئامـانـج بوو. یەکـەمیـان: دۆستـایـەتی‌و ئیخلاسی گەورەکـانی ماکین مسـوگـەر بکـەن و دووەم سنـوورەکـانی لە دەست درێـژ ی تورك و سەرۆکـە کوردەکـانی سەر بەو بپـارێزن. ئامانجی یەکەمیان گرنگتربوو، چونکە لە ماوەی شەڕەکەی نێوان ڕووسیـاو ژاپـۆن دا لە کاتێـك دا تورکیـا لەسـەر سنـوورەکـانی قەفقاس هەرەشـەی دەکردوو بووبووە مایەی مەترسیی بۆ ڕووسیا، سەردار هەڵوێستێکی باشیی نەبوو. ڕووسیا گومانی لێ‌دەکردوو بەوە تاوانباری دەکرد لەگەڵ تورکیاو یان ئیسلامەکان دا پەیوەندی هەبێت. مینۆرسکی لەم ڕووەوە ڕای خۆی دەردەبڕێ‌و دەنووسێ کە: «دەربـارەی سەردار ڕای وایـە بەرامبـەر ڕووسیـا نیـازی پاك نی‌یـە بە تایبـەتی لەم دۆخـەی ئیستـەدا..».[١٧٣] لە ساڵەکانی دوایـی‌دا پاش ئەوەی دۆخی دەرەوەو ناوەوەی ڕووسیـا چەسپـا، کردەوە دوژمنـانـەو ناحـەزەکـەی مورتەزا قولی خان دژ ی ڕووسیا نەماو کوژایەوە. کاربەدەستانی ڕووسیاش هەوڵیان ـ دا سەردارو دەست و پێـوەنـدەکـانی بەلای خۆیـان دا ڕابکێشن. لە ساڵی ١٩٠٩ ش دا کە ئاشـووبـە سەری دەرهێـنـا سەردار داوای لە ڕووسیـا کرد ڕێگـای بدات بێتـە تەبـەعـەی، یان هیـچ نەبێ بی‌خـاتـە ژێـر سایەی خۆیەوە.[١٧٤] ئەم داخوازی‌یە پشت گوێ خرا. میخـایلۆڤی یاریـدەدەری کۆنسـوڵی ڕووسیـا، کە ماکـو لە چوارچێوەی بەڕیوە بردنی ئەودا بوو، فەرمانی بۆ هات یارمەتی عیـزەت وڵـلاخـانی ئامـۆزای مورتـەزا قولی خان بدات، ئەوەی پاش سەردار دووەم ڕووی ناسـراو بوو.»[١٧٥] تیـرلێنسکی کە ساڵێــك لەوەو بەر سەری لە ماکـو دابـوو هەستی کردبـوو کە سەردارانی ماکو دابوو هەستی کردبوو کە سەردارانی ماکو بەرەو ڕووسیـا لادەدەن. بە واتــەی ئەو سەردار پێی ڕاگـەیـانـدبـوو، دەتوانێ دژ ی تورکیا ڕاست بێتەوە بە مەرجێك بڕوا بەوە بکات ڕووسیا بەتەواوەتی پشتیگیری دەکات.[١٧٦]

ئەم پشتگیـری کردنــەی ڕووسیـا هاتـەدی. سازۆنـۆڤ لەم ڕووەوە نامــەیێکی بۆ سفیـرچینی باوەڕ پێ‌کـراوی ڕووسیـا لە ئەستـەمبـوڵ نارد تێی‌دا هاتبـوو: «لـە وەزیـری کاروباری دەرەوە بگـەیێنـە کە ئێـمـە ناتوانین وەها دەستەپاچەو بە کەمتەرخەمی‌یەوە سەیری کردەوەکانی تورك لەسەر سنوورەکانی ماکین بکەین کە نزیکـە لە سنـوورەکـانمـانـەوە، دەبێ زۆر بە توندی بەرهەڵستی بکـرێـت و بەخێـرایی کردەوەو چالاکی‌یـەکـانی لە ناوچـەو سنـوورەکـانی ئێـران دا بوەستێنـرێت.»[١٧٧] لەگـەڵ ئەمـەش دا هەرەشەو مەترسیی تورك بۆ سەر ماکو لانەچوو.

پاکلێڤسکی هەر لە کۆتایی ساڵی ١٩١١ەوە نووسی کە زۆر پێویستە ماکین لە دەست درێژ ی تورك بپارێزدرێت و وا بکرێت هێزو سوپای تورك لە ڕۆژئاواوە بەرەو هێڵی خوی‌و سەلماس و ورمێ بگەڕێتەوە.[١٧٨]

(ڤارنتسـۆڤ ـ داشکۆڤ)یش، پێشنیازی کرد هێزێکی تەواو بۆ ماکو ڕەوانە بکرێت (کە تەنیا سەد قۆزاقی لێ بوو) پێك هاتبێ لە یەك هێزی هاوێژەرو چوار تۆپ و دووسەد قۆزاق. داوای ئەوەش کرد هێـزەکـەی خوی‌و هێـزەکـانی ڕووسیـا لە باکووری ئێران دا بەهێزتر بکرێن ڕای چیرکۆڤیش وەك ئەم ڕایە بوو.[١٧٩]

بەم جۆرە کاربەدەستانی ڕووسیای قەیسەری باریان گۆڕی‌و هاتنە سەر ئەوەی گەرم ترو گورج وگوڵانەتر لە جاران بەرژەوەندی خۆیـان لە باکـووری ڕۆژهـەلاتی ئێـران دا بپـارێـزن. ئەمـەش گەیشتـە ئەوەی سیـاسـەتـەکـەیـان لە ڕۆژهـەلاتی نزیك دا تینی تێ‌بکـەوێـت و گورج تر بێت. بەریتـانیـاش پشتگیـری ئەم سیـاسـەتـەی ڕووسیـای کرد ڕووسیـا هەر لەپـاش شۆڕشـەکەی تورکیــای لاوەوە، زۆری لە ئەستــەمبــوڵ کرد واز لە کردەوە

داگیرکەرانەکەی لە کوردستانی ئێران دا بهێنێ. کاربەدەستانی نوێی تورکیا کەوا دیاربوو دەیان ویست وا بکەن دەوڵەتە گەورەکانی بڕوای پێبکەن، هاتن بەڵێنیان ـ دا واز لە زۆر شت بهێنن. لە کۆتایی ئابی ساڵی ١٩٠٨دا زینۆڤیف گفتوگۆیێکی لەگەڵ کەمال پاشای سەدری ئەعزەم و هەروەها لەگەڵ توفیق پاشای وەزیری کاروباری دەرەوەدا کرد. بە واتەی زینۆڤیف کاربەدەستانی تورك وتوویانە: «لەو سیاسەتەی دەربارەی ئێران هەیانە نایانەوێ لاسایی کاربەدەستانی پێشوو بکەنەوەو لەسەر ڕێو شوێنی ئەوان برۆن و بە تەمان نامە بۆ سەرکردەکانی سوپا لەسەر سنوور بنێرن داوایان لێ بکەن بی‌وەستان ئەو شوێنانە بەجێ بهێڵن کە دووبەرەکی‌یان لەسەر نی‌یەو هی ئێرانن. ئەو ناوچانەش کە دووبەرەکی‌یان لەسەرە ئەوە لە پاش ڕۆژدا، یان ڕاستەوخۆ لەگەڵ حکومەتی شادا لەسەریان ڕێك دەکەون و یاخود داوا لە رووسیاو بەریتانیا دەکەن بنە ناوبژی کەریان.». توفیق پاشا بەڵێنی ـ دا کە: «تاریەر پاشا هەمیشە کەسێکی دادپەروەرو لایەن نەگیرەو مایەی پشت پێ بەستنە.». (١٨٠)

بەلام زوو دەرکەوت کە تورکیای لاو واز لە سیاسەتی شەرخوازیی و دوو ڕوویی و زۆرزانی‌یەکەی عەبدول حەمید ناهێنێ، کە لەژێر پەردەکەیدا سیاسەتی داگیرکردن و دەست درێژی کردنە سەر ئێران درواسێی خۆی حەشار دابوو.

لە ساڵی ١٩٠٩وە حکومەتی رووسیا لەسەر کێشەکەی سنوور کەوتە هەنگاو هەڵ هێنانی سیاسی لەگەڵ ئەستەمبوڵ دا. هەر بۆ نموونە ئیزڤۆڵسکی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٩دا، بەم بۆنەیەوە چەند بیروراییکی تایبەتی ـ دا بە ئۆرخان پاشای باڵیۆزی تورکیا. هەموو جار ئەستەمبوڵ بەڵێنی دەدا کە سوپای تورکیا دەست نەخاتە کاروباری ئێرانەوەو ڕێگا نادات هیچ کردەوەیێکی دوژمنانە لە ناوچەکانی سەر سنووری ئێران دژی رووسیا روو بدات. بەلام هەرگیز لەوە نەدەدوا وازلە هان دانی کوردەکان بێنێ هەتا پەلاماردان و دەست درێژی کردنیان کۆتایی پێ بێت. (١٨١)

لەگەڵ ئەوەش دا ئەستەمبوڵ خۆی بەرامبەر پاڵەپەستۆ سیاسی‌یەکەی رووسیا گرتبوو، بەلام ئەوەشی پێ خۆش نەبوو باڵیۆزی تورکیا لە لەندەن پرسیار لە حکومەتی بەریتانیا بکات کە ئەگەر هاتوو رووسیا لە بەیەکاچوونێکی نێوان تورکیاو ئێران دا هاتەکایەوە، ئەوسا حکومەتی بەریتانیا بەدەنگ تورکیاوە دێت؟ وەلامی ئینگلیزەکان (نا) بوو. هەر بەم جۆرەش لە سەرەتای تەموزی ساڵی ١٩٠٩دا، باڵیۆزی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ ئەو فەرمانەی پێگەیشت پشتگیری هەموو لەسەر هەڵ دانێکی رووسیا بکات کە دژی سیاسەتی داگیرکەرانەی تورکیا بێت. (١٨٢)

رووسیاو بەریتانیا کەوتنە ئەوەی بەیەکەوە لەسەر کێشەکەی سنوور لە ڕێی دیبلوماسی‌یەتەوە تەنگ بە تورکیا هەڵ چنن. بۆ نموونە لە ناوەڕاستی نیسانی ساڵی ١٩١٠دا، **باڵیۆزی رووسیاو بەریتانیا**، لەسەر ئەوەی **تورکیا ورمێی داگیرکرد، ئاگاداری‌یێکی توندیان دایە. وەزیری کاروباری دەرەوە پاکانەی بۆ بوونی سوپای تورکیا لە ئێران دا بەوە دەکرد گوایە: «بۆ بەربەست کردنی ئاژاوەو تالانی کردن پێویستە.»** (١٨٣) **سازۆنۆف** بۆ ئەوەی تورکیا لە درۆزنی **بخات پێشنیازێکی ـ دا بە چاریکۆف** بریتی بوو لەوەی هەوڵ بدات **ئەستەمبوڵ ڕازی بکات** بەوەی نوێنەرانی تورکیا **لەگەڵ نوێنەرانی بەریتانیاو رووسیا سەرێك** لەو ناوچانە بدەن **کە لە ورمێوە دەست پێ دەکەن تا ئەو** سنوورانەی کە گومان لەوەدا **نی‌یە هی تورکیان، ئەمەش هەر بۆ** ئەوەی لە دۆخی ڕاستەقینەی ئەو ناوچانە **بگەن. ئەگەر هاتوو** تورکیا ڕازی نەبوو ـ سازۆنۆف دەنووسێت ـ **ئەوە دەبێ سەر** لێ دانەکە سەر بگرێت و بۆ پاراستنیشیان **هێزی چەکدار** لەگەڵیان دا بنێردێت. (١٨٤) جارەهای جاریش حکومەتی رووسیا (لەڕێی دیبلوماسی‌یەتەوە) ئەستەمبوڵی ئاگادار دەکرد لەو کردەوە زۆرداری‌یانەی دژی دانیشتووە گاورەکان و بێگانەکان لە ناوچەکانی سەر سنووردا دەی‌کرد. ئەم دیبلوماسی‌یەتە لە پیتربورگ چۆن بوو لە ئەستەمبوڵیش وەهابوو.

پێشنیازەکەی چاریکۆف لە کۆتایی تەموزی ساڵی ١٩١٠دا لەلایەن بەریتانیاو باوەڕ پێکراوەکەی فەرەنساشەوە پشتگیری کرا. ریفعەت پاشای وەزیری کاروباری دەرەوە ناچار بوو بەڵێن بدات کە ئیتر لەمەو دوا ڕەعیەتە تورکەکان و ناسراوەکانیان. ئەوانەی سوودیان لە پشتگیری کردن و پاراستنی تورکیا دەبینی، زۆر لە

گاورەکان ناکەن و خۆ ئەگەر هاتوو زۆرداریيان لێوەشایەوە ئەوا دڵ ڕەقانە سزا دەدرێن. (١٨٥)

لەو ڕۆژەوەی هەراو هوریای سەر سنووری نێوان تورکیاو ئێران ڕوویداو هەتا ساڵی ١٩١٠، رووسیا نزیکەی (٧٠) ئاگادارکردنی ـ دا بە تورکیا. بەریتانیا پشتگیری زوربەی ئەم ئاگادار کردنانەی کرد. بەڵام ئەنجام و دەست کەوتەکانیان سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو. ڕاستە لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٠دا، تورکیا ناچار بوو بە شێوەیەکی ڕەسمی دەست بەرداری ورمێ و خوی‌و سەلماس و ساوجبلاق بێت و واز لە داو کردنیان بهێنێ (١٨٦) بەڵام رووسیاش هەر ئەوەی بۆ مایەوە چاودێری بەرژەوەندی‌یە کانی خۆی لە ماکۆ بکات. لە (٢٥)ی، حوزەیرانی ساڵی ١٩١٠دا، چاریکۆف ئاگاداری‌یێکی توندوتیژ ی دەربارەی ماکو، دا بە وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا. وا دیارە وەزیری ناو براو لەوە گەیشت کە دەست درێژ ی کردنە سەر ماکۆ قەدەغەیە. (١٨٧)

هەرچەند تورکیا بە ڕەسمی لووتی داژەن و تەنازولاتی کرد، بەڵام لە ڕاستی‌دا ـ وەك لە دوایی‌دا دەرکەوت ـ دەست درێژ ی دەکردە سەر کوردستانی ئێران. ئەم تەنازولاتانەش مەرجی وەهایان پێوە دەبەسترا تەنازولاتەکانی رووت و قووت دەکردەوە. بۆ نموونە تورکیا بەم جۆرەی خوارەوە پێشنیا ـ رەکانی رووسیاو بەریتانیای ڕوون کردبۆوە، کە بە رای ئەو دەبێ هەرێمی ورمێ بکرێت بە سێ بەشەوە:

١ ـ ئەو شوێنانەی گومان نی‌یە هی ئێرانن و تورکیا کەم و زۆر داوایان ناکات.

٢ ـ ئەو شوێنانەی تورکیا بۆ ماوەیێك داگیر کردوون و ئێران تواناو دەسەڵاتی ئەوەی نی‌یە یاساو ئاسایش لەو شوێنانە بچەسپێنێ.

٣ ـ ئەو شوێنانەی دووبەرەکی‌یان لەسەرە، تورکیاش هەتا کێشەکەی سەر سنوور یەکالا نەبێتەوە دەست بەرداری مافی خۆی نابێت. (١٨٨)

بێ گومان لە دۆخێکی وەهادا، تورکیا نەك هەر پەلپ و بیانووی بۆ کردەوە نارەواکانی لە ناوچەکانی سەر سنووردا دەدۆزی‌یەوە، بەڵکو ئەو مافەیشی بە خۆی دابوو لە دوا ڕۆژدا یەکالای بکاتەوە.

لە پیتربورگ بەرە بەرە هاتنە سەر ئەو ڕایەی لە ڕێی پاڵەپەستۆ و زۆر لێ کردنی دیبلوماسیی لە ئەستەمبوڵ، دەست درێژ ی کردنەکەی تورکیا بۆ سەر کوردستانی ئێران کۆتایی پێ نایەت. ئەوەی بە زۆری رووسیای تۆقاندبوو ئەوەبوو کە بیستی تورکیا لەتەك ئەو پاکانەکردنەی بۆ داگیرکردنی ناوچە ستراتیجی‌یەکانی نزیك سنوورەکانی رووسیاو ئێران دەی‌کرد، نیازی وایە بگرە کەوتۆتە ڕێکاپاك کردنەوە بۆ ڕێك کەوتن لەگەڵ ئێران دا دژ ی دراوسێی‌کەی باکووری (واتە رووسیا. . وەرگێر). چەند،دەستەو تاقمێك لە تاران ئەم دەنگ و باسەیان بەدڵ بوو. بەرامبەر بەمە سازۆنۆف نامەیێکی بۆ باڵیۆزی رووسیا لە ئەستەمبول نارد تێی‌دا هاتبوو کە رووسیا ناچارە لە وشەوە بێتە سەر کردەوە. (١٨٩) یەکێك لەو هۆ گەورانەی وای‌کرد پاڵەپەستۆی دیبلوماسیی رووسیا بۆ سەر تورکیا سەرنەگرێت، ئەوەبوو (وەك سازۆنۆف دانی پێدا دەنێ‌و ڕوونی دەکاتەوە)، کە پشتگیری کردنەکەی بەریتانیا گەرم وگوڕ نەبوو. چونکە کاربەدەستان لە لەندەن وایان دەخوێندەوە کە مادام سوپای رووسیا لە ئێران دایە ئیتر ناتوانن پەیوەندی‌یان بەو کێشەیەوە لەوە زیاتر بێت.

دەست خستنە دوولایی‌یەکەی بەریتانیاو رووسیا بۆ کاروباری ناوەوەی ئێران بەو نیازەی شۆڕشەکەی لەناو بەرن، پەیوەندی نێوان بەریتانیاو رووسیای تێك داو دووبەرەکی خستە نێوانیانەوە. بەریتانیا بەڵێنی ـ دا بە رووسیا تەواو پشتگیری بکات و یارمەتی بدات ئەگەر بێتو هێزەکانی رووسیا لە چەند ناوچەیێك کە نزیکن لە ناوچەکانی نفوزی بەریتانیاوە لە ئێران بکشێنە دواوە. سازۆنۆف کە ئەم داخوازی‌یەی هێنایەدی بڕوای وابوو کە دەست پێ کردنەوەی زۆر لێ‌کردنی دیبلوماسیی بۆ سەر تورکیا بەهێزتر دەبێت و ئەنجامی دەبێت ئەگەر ئەم هێزە نوێ‌یەی (واتە بەریتانیا ـ وەرگێر) لەپشت، بێت. (١٩٠) هەر وەهاش ڕووی ـ دا.

تورکیا یارمەتی‌و پشتگیری لە ئەڵەمانیاشەوە دەست نەکەوت. بەرژەوەندی ئەڵەمانیای ئیمپریالیست لە کوردستان دا پاش شۆڕشەکەی تورکیای لاو ئەوەندەی‌تر پەرەی‌سەند. مەشق پێ‌کەرەکانی ئەڵمان لە ئازربایجان کەوتنە ڕێك خستنەوەی هێزی حەمیدی. ئەڵەمانەکان جموجۆڵێکی تەواویان لە ـ

ـرێـمـتـانی ئێـران دا هەبـوو، ئەمـە پێتـربـورگی تەواو تۆفـاند. ـتـێـت ئەو دەنگە و باسە گەیشتە وەزارەتی کاروباری دەرەوە گوایە ـتـوـێـمـانی) سیخـوری ئەڵـەمانی ناسراو لە تەورێز نیازی وایە ـمـتـێـت بە ناوچەکانی میانداوو، خوی‌و کاتورو ماکودا بکات، ـتـیـ خێرا نامەیێکی تایبەتی نارد بۆ سەرۆکی دیبلوماسی‌یەکانی ـمـی ئەوراق لە تفلیس تیێدا هاتبـوو: «ئـەم گەشتـەی بە دڵ ـوـیـە. دەبێ خێرا خانی ماکین ئاگادار بکرێت ڕێگا نەدات بە ـتـیـمـن بچێت بۆ ماکو. هەروەها پێویستە ـ کلیم لە سەری ـەروـت ـ لەژێر پەردەی چاودێری کردن و پاراستنی‌دا نەهێڵدرێ ـجـو ون بێت و ڕێگـا نەدرێت لەگـەڵ دانیشتووەکان پەیوەندی ـیـیـ بکات.»[191] لە سەرەتای هەڵگەرانەوەکەی ٢٣ی تەموزی ـاڵی ١٩٠٨دا، پشتگیـری ئەڵـەمـانیـا بۆ تورکیـا لە ڕووی ـەلامردانەکەی بۆ سەر ئێران ئاشکرا بوو. زینۆڤیف لەم ڕووەوە ـوـیـسـوێـتـی: کە فۆن شینی سەرەك سکـرتێـرانی وەزارەتی ـکـروـبـاری دەرەوە، بە عوسمـان پاشـای باڵیـۆزی تورکیـای لە ـەرـیـن ڕاگەیاند ئەو هێزەی تورکیا کە نێردراوە بۆ ورمێ بە نیازی ـپـرـسـتـنی ئاسـایش و یاسـاو ڕژێم، هەروەهـا بۆ پاراستنی ئەو ـمـەمـانـانـەی لەوێن، وا دیـارە ئەو هێـزە کەمـەو بەش ناکات. ـدـێـشـتـوانی ئەو ناوچـانـە لە هاتنی هێـزەکـانی رووسیـا بۆ ـئـزربایجانی ئێران نارازین و داوا دەکەن تورکیا هێزەکانی خۆی ـبـهـێـزتـر بکـات. لەبـەر ئەمـە حکـوومەتی ئەڵەمانیا ئامۆژگاریی تورکیا دەکات ڕێ‌و شوێنێکی گونجاو بۆ ئەمە بدۆزێتەوە.

باڵیۆزی تورکیا لە بەرلین ئاگادار کرا کە لە فۆن شین بگەیێنێ کە دوو بەتالیۆنی‌تر نێردرا بۆ ورمێ.

پەراوێزەکان:

٩٧ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خـوانـەکـەی ئێـران»، ١٩٠٨.، باسی. ١١٩٨، لاپەرە. ٢٨٠

٩٨ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەرە. ٤١٣ ـ ٤١٤

٩٩ ـ ئاف پ ر، بەشی. «بیعسـەیـەك لە ئێـران»، ١٩٠٨.، باسی. ٨١، لاپەرە. ٢١

١٠٠ ـ ئاف پ ر، بەشی. «بـاڵیـۆزخـانـە لە..»، ١٩١٠.، باسی. ١٥٩٩، لاپەرە. ١٠٩

١٠١ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خـوانـەکـەی ئێـران»، ١٩٠٨.، باسی. ١١٩٨، لاپەرە. ٤٤٧

١٠٢ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١٠.، باسی. ٦٦٦، لاپەرە. ٣٠

١٠٣ ـ هەمـان سەرچـاوە، ١٩٠٩.، باسی. ٦٦١، لاپـەرە. ٤٧٤، باسی. ١١٩٩، لاپەرە. ٦٤

١٠٤ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئەوراقی..»، ١٩٠٩.، باسی. ١٧٧، لاپەرە. ٤٤، ٤٥، ٥٩.

١٠٥ ـ ئاف پ ر، بەشی. «بیعسـەیـەك لە ئێـران»، ١٩١٠.، باسی. ٦٠، لاپـەرە. ١٠، «خـوانـەکـەی ئێـران»، ١٩١٠.، باسی. ١٢٠٠، لاپەرە. ٢١٥

١٠٦ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئەوراقی..»، ١٩٠٩.، باسی. ١٧٧، لاپـەرە. ١٤٥؛ بەشـی. «بیعسـەیـەك لە ئێـران»، ١٩١٠.، باسی. ٦٠، لاپـەرە. ١٠، بەشـی. «ئـەرشیفی سیاسی»، ١٩١٠.، ١٠٣٨، لاپەرە. ٧٧

١٠٧ ـ تساگ ف ئی ئا، بەشی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی. ٦٠، لاپەرە. ٣١٠

١٠٨ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەرە. ٣١٠.، ئاف پ ر، بەشی. «خوانەکەی ئێران»، ١٩١١.، باسی. ٦٧٢، لاپەرە. ١٢١. لەگـەڵ ئەوەش دا تورکـەکـان لە ناوچـەکـانی سەر سنـووردا یارمـەتی‌یێکی زۆریـان لە عەبـدول قادرەوە دەست کەوت بەڵام هەرگیز باوەڕیان پێ نەدەکرد. (ئەمەش هەروا لە خۆیەوە نەبوو). تورکـەکـان لەو دەسـەڵاتـەی عەبـدول قادر دەسڵەمینەوە کە هەتا دەهـات پەرەی دەسـەنـد. هەر بۆ نمـوونـە عەبـدول قادر لە ناوچـەکـانـی سەر سنـووردا بنکـەیـێکی نەتـەوەیی کوردی دامەزراندبوو. بۆ سوودی خۆی باجی لە هەموو بنە ـ ماڵەیێك دەسـەنـد. بگـرە هەتـا باڵیـۆزی تورکیـا لە تاران داوای کرد بی‌گەڕێننەوە بۆ ئەستەمبوڵ.

١٠٩ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خـوانـەکـەی ئێـران»، ١٩١٠.، باسی. ٦٦٨، لاپەرە. ٨٦

١١٠ ـ هەمان سەرچاوە، باسی. ٦٦٧، لاپەرە. ٩٠

١١١ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خـوانـەکـەی ئێـران»، ١٩٠٦ ـ

١٩١٠ . ، باسی . ١٢٠١ ، لاپەڕە. ٢٦٩
١١٢ هەمان سەرچاوە، باسی . ١٢٠١ ، لاپەڕە. ٢٦٩ ؛ تساگ
ئی ئا، باسی . ٧٩٧ ، ١٩١٠ . ، فایلی . ٨٠ ، باسی . ١٤٠ ،
لاپەڕە. ١٧
١١٣ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١٠ . ، باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە.
١٠٨ ، ١١٢ ؛ تساگ ئی ئا، بەشی . ٧٩٦ ، ١٩١٠ . ، فایلی .
١٩١ ؛ باسی . ٢١٣ ، لاپەڕە. ٣٠ ـ ٣١
١١٤ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٢٠٠٠ ، لاپەڕ. ٢٣٣ ، ٢٣٤
١١٥ ـ ئاف پ ر، بەشی . «بیعسەیەك لە ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٦٠ ، لاپەڕە. ٨٨ ، ٩٤ ، ١١١ .
١١٦ ـ ئاف پ ر، بەشی . «ئەوراقی . . »، ١٩١٠ . ، باسی .
١٦٩ ، لاپەڕە. ١٠
١١٧ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە. ١١٢
١١٨ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩٠٩ . ، باسی . ٦٦٢ ، لاپەڕە.
٦١
١١٩ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١٠ ، باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە.
٢٤٤ ـ ٢٤٥
١٢٠ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١١ . ، باسی . ١٢٠٢ ، لاپەڕە.
٣٩٨
١٢١ ـ تساگ ڤ ئی ئا، بەشی . ٢٠٠٠ ، فایلی . ١ ، باسی .
٣٩٠٨ ، لاپەڕە. ١٩ ـ ٢٠
١٢٢ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ١٩
١٢٣ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١١ . ،
باسی . ١٢٠٣ ، لاپەڕە. ٢٤١ ـ ٢٤٢
١٢٤ ـ هەمان سەرچاوە.
١٢٥ ـ ئاف پ ر، بەشی . «بیعسەیەك لە ئێران»، ١٩١١ . ،
باسی . ١٣٣ لاپەڕە. ١٣٠
١٢٦ ـ ئاف پ ر، بەشی . «بالیۆزخانە لە. . »، ١٩١٢ . ،
باسی . ٧٤٠٠ ئا. لاپەڕە. ٣٤ ـ ٣٥
١٢٧ ـ «کەرەستەی لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵات»، بەرگی . ٢ ،
لاپەڕە. ٣٥٥
١٢٨ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ١١٩ ـ ١٢١
١٢٩ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٦٦٨ ، لاپەڕە. ٤٤
١٣٠ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩٠٦ ـ ١٩١١ . ، باسی . ١٢٠١ ،
لاپەڕە. ٢٠ . بەدرخان یاریدەدەری کۆنسوڵی ئاگادار کرد لەوەی
کە ئەگەر بێتو ئەو داخوازییە بێتەدی، ئەوە گەلێك لە خێڵەکانی
بەگزادە خزمەت گوزاریی رووسیا دەکەن» (هەمان سەرچاوە،
١٩١٠ . ، باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە. ٥٣ ـ ٥٥
١٣١ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١٠ . ، باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە.
٥٣ ـ ٥٥ . قەرەپەپاخ خێڵێکی تورکە. خوورەوشت و
کلتوورێکی زۆریان لە کوردەوە وەرگرتووە، قەرەپەپاخەکانی
سولدوز لە ڕۆژانی شەڕەکەی نێوان رووسیاو تورکیا ١٨٧٧ ـ
١٨٧٨ ، لە موتەسەریفییەتی وانەوە کۆچیان کرد.
١٣٢ ـ ئاف پ ر، بەشی . «بیعسەیەك لە ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٦٠ ، لاپەڕە. ٧٧
١٣٣ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ١١١ ـ ١١٢ ؛ بەشی .
«خوانەکەی ئێران»، ١٩١٠ . ، باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە. ٥٦
١٣٤ ـ ئاف پ ر، بەشی . «بیعسەیەك لە ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٦٠ ، لاپەڕە. ٨٩ ؛ باسی . ١٢٠٠ ، لاپەڕە. ٥٦
١٣٥ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١١ . ،
باسی . ٦٧٢ ، لاپەڕە. ٥٢ ، بەشی . «بیعسەیەك لە ئێران»،
١٩١١ . ، باسی . ١٣٣ ، لاپەڕە. ٤٦
١٣٦ ـ هەمان سەرچاوە، بەشی . «بالیۆزخانە لە. . . »،
١٩١١ . ، باسی . ١٦٠٢ ، لاپەڕە. ١٠١ ، ١٠٢ .
١٣٧ ـ ف . مارتینس، کۆبوونەوەی هاوپەیمانەکان و
ڕێك کەوتن، جلدی . ٨ ، لاپەڕە. ٦٧٣ ـ ٦٧٤
١٣٨ ـ ئاف پ ر، بەشی . «خوانەکەی ئێران»، ١٩١٠ . ،
باسی . ٦٦٦ ، لاپەڕە، ١١١
١٣٩ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١١ . ، باسی . ٦٧٢ ، لاپەڕە.
٢٧
١٤٠ ـ هەمان سەرچاوە، باسی . ١٢٠٤ ، لاپەڕە. ١٩
١٤١ ـ هەمان سەرچاوە، باسی . ٦٧٢ ، لاپەڕە. ٦٧ ؛ بەشی .
«بالیۆزخانە لە. . »، ١٩١١ . ، باسی . ١٦٠٢ ، لاپەڕە. ١٠٢

ـ ...

ـ ئاف پ ر، بەشی. «باڵیۆزخانە..»، ١٩١٠.، باسی.
. لاپەڕە. ٥ ـ ٦.

ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکــەی ئێـران»، ١٩١١.، ...
١٢٠٠، لاپـــەڕە. ٢٠٩؛ ١٩١٢.، باسی. ١٢٠٥.
... ٧٦

ـ ... سالی ١٩١١دا، کاتێـك پەلێـك لە هێـزی قۆزاق بە ...
... ـەتی بێچیرخـانۆڤ لەخـویـەوە بەرەو ورمێ دەچـوو،
... ەکان کە سەربـازی تورکیـان لەگەڵ دابوو، پەلاماریان دا.
... ـەکـان زیـانیـان لێ کـەوت بگـرە هەتـا بێچیـریـانۆڤیش
... کرا. (ئـاف پ ر، بەشی. «بـالیۆزخانە..»، ١٩١١ ـ
... باسی. ٣٥٥٦، لاپەڕە. ٤٥ ـ ٤٧).

ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکـەی ئێـران»، ١٩١٢.،
... ١٢٠٥، لاپەڕە. ٧٤

ـ م.س. ئیڤانۆڤ، ئەو کەرەستانە دەخاتە بەردەم کە ئەوە
... محەمەد عەلی شاو عەبــدول حەمیــدی دووەم
... کەوتن بۆ لێـدانی شۆڕشـەکەی ئێران. سەیری: (م.س.
... ۆڤ، شۆڕشەکەی ئێران لە ساڵی ١٩٠٥ ـ ١٩١١دا بکە.
مۆسکۆ، ١٩٥٧، لاپەڕە. ١٨٩).

ـ هەنــدێــك لە پان ئیســلامی یــەکـان کە لە رووسیـاوە
جوویوون بۆ کوردستانی ئێران، ئامۆژگاریی وەهاییان وەرگرتبوو.
وەکو (کارابیکۆڤ و کەسانی تر، بەو نیازەی نفوزی رووسیا قایم
... کەن و کوردە شیعی و سونی یەکان ئاشت بکەنەوە، بەم بۆنەیەوە
... ی ئەوە دەکـرا گوایـە تورکــەکــان هەوڵیــان دەداو، لەو
هەوڵــدانــەشیــان دا زۆر جار مەبــەستیـان بەدی دەهـات، بۆ
سوودبینین لەو ناحـەزی و پروپـاگـانـدانـەی لەنـاو کوردو ئەرمەنە
ئاشنـاقــەکــان دا دژی رووسیـا دەکـراو یاری یـان بەو هەستی
ناحـەزی یـە دەکـرد کە لەنـاو ئەرمـەنە نەتەوە پەرستەکان دا دژی
سیاسەتی رووسیای قەیسەری لە قەفقاس دا هەبوو. تاشناقەکان
بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا دوژمنایەتی نێوان کوردو ئەرمەن
خۆش بکــەن. زۆریـــان لە دانیشتـــووەکـــان دەکـــرد بچنـە ناو
پارتەکەیانەوەو بە پارەو پوول یارمەتی بدەن و ئازاری ئەو ئەرمەن و
ئاسووری یانەیان دەدا کە جل و بەرگی کوردی یان لەبەر دەکرد.
(ســـەیــری: «کـــۆکـــراوەی دەستـــاوێـــژی سیاسی دەربـارەی
ڕووداوەکـــانـــی ئێـــران لە کۆتـــایی ساڵی ١٩٠٦وە هەتـــا ٣١ی
کانـــوونی یەکـــەمی ساڵی ١٩١١»، بەرگی. ٦، س پ ب.،
١٩١٣، لاپەڕە. ٨٣).

١٤٨ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکـەی ئێـران»، ١٩١١.،
باسی. ١٢٠٢، لاپەڕە. ٣٢٥

١٤٩ ـ ئاف پ ر، بەشـی. «بــاڵیــۆزخــانــە..»، ١٩١١ ـ
١٩١٣.، باسی. ٣٥٦٦، لاپەڕە. ٢٤ ئاف پ ر، بەشی

١٥٠ ـ ئاف پ ر، بەشی خوانــەکــەی ئێـران، ١٩١١، ١٢٠٢
لاپەڕە ٤٤٠

١٥١ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئەوراقی..» ١٩١١ باسی. ١٧٤،
لاپـــەڕە. ١٥١، ١٥٣، بەشی. خوانـەکـە ی ئێـران»، ١٩١١.،
باسی. ١٢٠٢، لاپەڕە. ٤٣٧

١٥٢ ـ ئاف پ ر، بەشـی. «بــاڵیــۆزخــانــە..»، ١٩١١ ـ
١٩١٣.، باسی. ٣٥٦٦، لاپەڕە. ١١٠٥

١٥٣ ـ «کەرەستەی لێکۆڵینەوەی..»، بەرگی. ١، لاپەڕە. ١٨

١٥٤ ـ د. بیلیـــاییف، تێبینی دەربـارەی ناوچـەکـانی باکـووری
ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لاپەڕە. ١٩ ـ ٢٠

١٥٥ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکــەی ئێران»، ١٩١٠ ـ
١٩١٧.، باسی. ٤٤٨١، لاپەڕە. ١٩ ـ ٢٠

١٥٦ ـ تساگ ف ئی ئا، بەشی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی.

٦٠، لاپەڕە. ٧٠، ٧٢ ـ ٧٤

١٥٧ ـ هەر لەم ماوەیەدا لە مەیانی سیاسەت دا باسی ڕاکێشانی هێڵە ئاسنینــەکــەی بەغــدا ـ کەنـداوی عەرەب لە گەڕدا بوو.
بەریتــانیــا هەوڵی دەدا ئەم دەستکــەوتـە لە چنگ ئەڵــەمــانیـا دەربهێنێ، لەمەش دا چاوی لە یارمەتیو پشتگیری دیبلۆماسی ڕووسیاوە بوو.

١٥٨ ـ تساگ ف ئی ئا، بەشی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی. ٦٠، لاپەڕە. ١٦٢ ـ ١٦٨

١٥٩ تســاگ ف ئی ئا، بەشـی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی. ٦٠، لاپەڕە. ١٩١ ـ ١٩٢، ١٩٤.

١٦٠ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکـەی ئێـران»، ١٩١١. ، باسی. ٦٧٢، لاپەڕە. ٥٢

١٦١ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩٠٦ ـ ١٩١٠. ، باسی. ١٢٠١، لاپەڕە. ١٤١

١٦٢ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١١. ، باسی. ١٢٠٢، لاپەڕە. ٩٤

١٦٣ ـ ئاف پ ر، بەشی «ئەوراقی»، ١٩١١، باسی ١٢٥ لاپەڕە لاپەڕە ١٤٣

١٦٤ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ٤٢٥ ـ ٤٢٦

١٦٥ ـ هەمــان سەرچــاوە، ١٩٠٩. ، باسی. ١٣٠، لاپــەڕە. ٢٤٦ ـ ٢٤٧

١٦٦ ـ تساگ ئی ئا، بەشی. ٧٩٧، ١٩١٠. ، فایلی. ٨٠، لاپەڕە. ١ ـ ٣

١٦٧ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکــەی ئێـران»، ١٩١٠ ـ ١٩١٢، باسی. ٥٦٠، لاپەڕە. ٩٤

١٦٨ ـ هەمــان سەرچــاوە، باســی. ٥٦٠، لاپــەڕە. ٩٥. گاڵوبینۆف، داوای یارمەت کرد لە یاریدەدەری کونسوڵ لە خوی.

١٦٩ ئاف پ ر، بەشی. «خــوانــەکــەی ئێــران»، ١٩١١. ، باسی. ١٢٠٤، لاپەڕە. ٢٩٧

١٧٠ ـ هەمان سەرچاوە، ١٩١٢. ، باسی. ١٢٠٥، لاپەڕە. ٩٠

١٧١ ـ ئاف پ ر، بەشی. «خوانەکەی ئێران ب»، ١٩١٠ ـ ١٩١٢، باسی. ٥٦٠، لاپەڕە. ٩٧

١٧٢ ـ «کــەرەستــەی لێکــۆڵینــەوەی. .»، بەرگی. ١، لاپــەڕە. ٣٧، ٥٠

١٧٣ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ٣٧

١٧٤ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئەوراقی. .»، ١٩٠٩. ، باسی. ٣٨، لاپەڕە. ٤٨١

١٧٥ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئــەرشیفی سیــاسی»، ١٩٠٩. ، باســی. ١٠٣٦. بروسکــەکــەی چاریکــۆڤ لە ٢٣ ـ ٧ ـ ١٩٠٩دا. چاریکــۆڤ لە هەمــان کات دا ئاگــادار کردنێکی دەربارەی ئەوە نارد (کە نابێ بیر لەوە بکرێتەوە) سەردار بکرێت بە (ڕەعیەتی) ڕووس.

١٧٦ ـ ئاف پ ر، بەشی «خــوانــەکـەی ئێـران ١٩١٠، باسی ٦٣٧ ڕاپۆرتێك لە ٢٢ ـ ٧ ـ ١٩١٠دا

١٧٧ ـ ئاف پ ر، بەشی. «ئــەرشیفی سیــاسی»، ١٩١٠. ، باسی. ١١٥، لاپەڕە. ١٧

- ئاف پ ر، بەشی. «ئەوراقی..»، ۱۹۱۱.، باسی.
. لاپەڕە. ٥٥٥

- هەمـــان سەرچـــاوە، لاپـــەڕە. ٥٧٦، باســی. ١٤٩،
۱۹۷ - ۱۹۸، ۲۲۱

- ئاف پ ر، بەشی. «خـــوانـــەکـەی ئێـران»، ۱۹۰۸.،
۱۱۹۸، لاپەڕە. ٢٤٤

- هەمـــان سەرچـــاوە، ۱۹:۹.، باسی. ٦٦٢، لاپـەڕە،
٥٣، ٥٦

- هەمان سەرچاوە، باسی. ٦٦٣، لاپەڕە. ٤

- هەمان سەرچاوە، ۱۹۰۸ - ۱۹۱۰.، باسی. ۱۲۰۱،
٩١

- هەمان سەرچاوە، ۱۹۱۰.، باسی. ٦٦٧، لاپەڕە.

- هەمـــان سەرچـــاوە، باسی. ۱۲۰۰، لاپـــەڕە. ١٦٨.
چەند مانگێک پێش ئەمە ئیزفۆلسکی بوو بە باڵیۆز لە پاریس و توانی وا
بکات فەرەنسا سەربکەنە سەر ئەستەمبوڵ.
هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ١٣٥).

١٨٦ - تساگ ف ئی ئا، بەشی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی.
٣٦٦، لاپەڕە. ١٦٣

١٨٧ - ئاف پ ر، بەشی. «خـــوانـــەکـەی ئێـران»، ۱۹۱۰.،
باسی. ۱۲۰۰، لاپەڕە. ١٦١

١٨٨ - تســـاگ ف ئی ئا، بەشـی. ٢٠٠، فایلی. ١، باسی.
٦٠، لاپەڕە. ٧٥ - ٧٦

١٨٩ - ئاف پ ر، بەشـی. «بـــاڵـیــۆزخـــانـــە..»، ۱۹۱۰ -
۱۹۱۱.، باسی. ۷۳۹۹، بەشی. ١١١، لاپەڕە. ٩ - ١٠

١٩٠ - تساگ ف ئی ئا، بەشی. ٢٠٠٠، فایلی. ١، باسی.
٦٠، لاپەڕە. ١٤٧.

لەگـەڵ ئەوەش دا دیبلومـاسیـیـەتی بەریتانیا بە سەرزاریو بە ڕەسمی پشتگیـری ڕووسیـای دەکـرد بۆ سەرکـردنـە سەر تورکیـا (دەربـارەی ئەو ڕووداوانـەی پەیـوەندییان بە کوردستانی ئێرانەوە هەبوو)، بەڵام جاسووسەکانی بەریتانیا بە تایبەتی لە کوردستانی تورکیـــادا دژی بەرژەوەنـــدییـــەکـانی ڕووسیـا دەجـووڵانـەوە. ئینگلیـزەکـان و دوای ئەوان فەرەنسییـەکـان چاویـان بە تایبەتی بڕیبووە کوردەکانی دەرسیم. ئۆلفیرییڤ لەم ڕووەوە دەنووسێت: «ئەوەی بە زۆری بەریتانیای قارس کردووە، ئەوەیە قزڵباشەکان (نیازی لە دانشتوانی دەرسیمە - وەرگێڕ) هەستێکی تایبەتییان بەرامبـــەر ڕووسیـا هەیـە.»، ئەوان دەیـانـەوێ «بـوونی گیـانیو مەعنەوی خۆیان لە دەرسیم قایم بکەن». (ئاف پ ر، بەشی. «باڵیۆزخانە..»، ١٩١١.، باسی. ١٦٠٢، لاپەڕە. ٥٣ - ٥٤).

١٩١ ئاف پ ر، بەشی. «خـــوانـــەکـەی ئێـــران»، ۱۹۱۱.،

# الأكراد خلال انبعاث الحركات الثورية في تركيا وايران

## ترجمة د. كاوس قفطان

يتكلم المؤلف عن حركة الـردة التي قادها محمد علي شا ودرجة مساهمة الأغاوات الأكراد فيها. يتكلم بعد ذلك عن التغير السياسي الذي حصل على النظام في تركيا، ذلك التغير الذي لم يؤد الى تحول في سياسة تركيا في المناطق الحدودية المتاخمة لأيران وأن السلطة الجديدة التي كثيراً ما نددت بسياسة عبد الحميد العدوانية اتخذت في الاخير نفس السياسة بل مارست سياسة اكثر عدوانية، والتي ادت اخيراً الى تعطيل نشاطات اللجنة الدولية التي انيطت بها حل مشكلة الحدود.

وأن انسحاب القوات التركية من بعض المناطق الحدودية كانت شكلية ولغرض التأثير على شعور الرأي العام الأوربي، أن القوات الكردية هاجمت بعد ذلك تلك المناطق.

مارست تركيا الفتاة سياسة جديدة وهي الأعتماد على الأكراد في التعرض لأيران وحثهم على مهاجمة المناطق الأيرانية وبالتالي تبيض وجوههم امام الرأي العام العالمي ووضع الأكراد في موضع المتهم والمعتدي. لاشك ان هذه السياسة ادت الى تعقيد الوضع الدخلي. إن هذه السياسة بدلاً من ان تؤدي الى رفع شعبية تركيا في كردستان ادت الى نتائج عكسية حيث أن عدداً كبيراً من الرؤساء الأكراد اظهروا عدم رضاهم تجاه عدوان تركيا وكانوا يخافون من أن تشتد قبضة تركيا عليهم وناشدوا اكثر من مرة قناصل روسيا في تلك المناطق مساعدة روسيا لهم.

والسلطة الأيرانية بدلاً من التقرب من الأكراد واستغلال الوضع كانت بالعكس تطلب منهم السكوت وعدم الأتيان بشئ تؤدي الى اثارة تركيا.

بعد ذلك يأتي الى ذكر بعض الرؤساء الأكراد الذين خدموا تركيا ويشير بشكل خاص الى الشيخ عبد القادر الشمديناني ويتكلم بالتفصيل عن حياته ودوره السياسي في المنطقة. وبعد ذلك يتكلم بالتفصيل عن تأريخ المنطقة سواء كانت ايرانية أو تركية او كردية مشيراً الى دور الدول الاجنبية خاصة روسيا وبريطانيا فيها. ويشير بشكل خاص الى دور روسيا وتخوفها من قيام تركيا نتيجة عدوانها على كردستان ايران بعقد اتفاق من وراء ظهرها مع ايران وعلى هذا الأساس بدأت روسيا باستعمال سياسة أخرى اي سياسة الفعل بدلاً عن سياسة الكلام. وبريطانيا التي كانت تساند روسيا رسمياً إلا انها في الواقع لم تساندها فعلاً لخوفها من سيطرة روسيا على المنطقة.

ساعدت روسيا وبريطانيا ايران في القضاء على الثورة الأيرانية لكن هذه المساعدة او هذا التضامن الوقتي ادت الى الأحتكاك بينهما وظهور العديد من المشاكل.

لغات تشریحیه

اخطار

اشبو لغات تشریحیه‌ده یالکز تشریحی اصطلاحاتله بسیط لغتلری گوستریلدی
زیرا لغات بسیطه‌دن‌ده لغات مرکبه ترکیب اولنور. مثلا (صدغی = Temporal) (فکی = Maxillaire) کلمه‌لری معلوم
اولدیغی حالده مرکب اولان (صدغی فکی = Temporo-Maxillaire) کلمه‌سی ده‌خی معلوم اولور.

اخطار دیگر

اصطلاحات تشریحیه‌ده بو صورتله مترادف اسملرله ترکیب اولنمش اولان کلمات
مرکبه مترادف اسملرینک اضافه‌سیله حاصل اولور. نقبه تونیه ونقبه فالوتیه گبی

حسین بەرزنجی

ئاڵ وگۆڕی مەنصەبی
دوو شەخسی
عالی‌جاهـ کرا
مەحموداغای زل
حەکیم باشی،
حەمامچی (بابەجان)

- سالم -

# سەرگوزەشتەیەکی کورتی دکتۆر حسین أفندی باباجان

## پێشەکی

جاران لە کوردستان دا نەخۆش رووی دەکردە دەرمانگرو حەکیم بۆئەوەی ئێش و ئازاری کەم بێتەوە لە نەخۆشی‌یەکەی ڕزگاربێت. حەکیمی ئەو سەردەمە لە گیای چیاکانمان دەرمانیان دەگرتەوەو چارەسەری نەخۆشیان پێ‌دەکرد لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە پزیشکی باوەڕپێکراو زانستگایان تەواوکردو روویان کردە وڵات. یەکێك لەمانە حسین ئەفەندی باباجان بوو، کە ئەم بنەماڵەیە لە بنەچەوە دەستی حەکیمی‌یان هەبووە. حسێن ئەفەندی چووە ئەستەمۆڵ لەوێ زانستگای پزیشکی تەواوکردو یەکە دکتۆری کوردبوو کە هاتبێتە کوردستان خزمەتی هاونیشتمانانی خۆی کرد.

لەم نووسینەمان دا تیشکێك دەخەینە سەر ژیانی ئەم پزیشك و ئەدیبە کە مایەی ریزو قەدرزانیی نەوەکانی کوردە.

* * *

دکتۆر (حسێن) کوڕی ( میرزا بدیع)ی حەکیم باشی باباجانە، کە بە (ملك الاطباء)یش ناوبراوە. ئەم (میرزا بەدیع)ە، زیرەك و هەڵکەوتووی کات و سەردەمی خۆی بووە لە زانستی پزیشکی‌دا، وەکوو لە گۆڤاری (کاروان) ژمارە (١٩)ی نیسانی (١٨٩٤). . مامۆستا محمدی مەلا کەریم، ناوی بردووەو وێنەی دوو کاغەزیشی پێشان داوە کە لە دوو کتێبی پزیشکی‌یەوە وەرگیراون و لە کاغەزی کتێبی دووەم دا، بەم جۆرە



باسی میرزا بەدیع باباجان هاتووە: (تم ایضا حسب رغبة جناب المستغني عن الالقاب، ملك الاطباء، العامل على منشأة من الحذق، میرزا بديع حكيم باشي، في بلدة السليمانية، في ايام حكومة ذي الجاه العالي والمقام المعلى، ذي قاعدة من المجد والمنعة، باسط أرض الامن والأمان، منبع الجود والاحسان، اعني امير الامراء العظام عبدالله باشا ابن المرحوم المبرور الساكن في الجنان سليمان باشا حاكم بابان طاب ثراه وجعل الجنة مثواه، وأنا الحقير اقل الدعاة عبدالرحمن النوتشي الاورامي الساكن في بلدة سنندج في شهر جمادي الثانية في سنة (١٢٦٢ هـ).

جا مامۆستا مەحەممەد دەڵێ: نازناوی باباجان لە لایەن میری میرانی بابانەوە پێی بەخشراوە، ئەمەیش لە کاتێك دا بووە کە (میرزا حکیم باشی) هاتووە بۆ شاری (سلیمانی) دەبڕوانێ هەموو شارەکە شڵەژاوەو دڵ تەنگ و غەمناکن.. بازاڕو دایەرە داخراوە؛ دەپرسێ هۆی ئەمە چی‌یە؟ پێی دەڵێن کوڕی میری میران (پاشا) مردووە، خەڵکەکەش چوون بۆ ئەوێ. ئەمیش دەچێتە ئەوێ‌و داوا دەکات لەو ئاوەی بۆ بهێنن کە مردووەکەی پێ شۆردراوە، خەڵکەکەش لەو ئاوەی بۆ دێنن و تەماشای دەکات بە چەند شتێك دا بۆی دەردەکەوێ‌و دەڵێ: ئەم کوڕە نەمردووە! گوایە ئەو ئاوەی کە مردووی پێ دەشۆردرێ.. جیاوازی هەیە لە گەڵ ئاوی ئاسایی کە زیندوو خۆی پێ دەشوات.. کە جۆرە گۆڕانکاری‌یێکی بەسەردا دێ، مەگەر هەر ئەو جۆرە زیرەك و

هەڵکەوتوو و بلیمەتانەی وەك میرزا بەدیع بی‌دۆزنەوەو بی‌زانن.

جا داوای کردووە کوڕە مردووەکەی پیشان بدەن، بۆی دێنن و سەری دەخاتە سەر ڕانی‌و دەس دەکات بە شیلان و دەرمان کاری کردنی. دەڵێن کوڕەکە دەپژمی‌و چاو دەکاتەوەو دەڕوانێ سەری وا لەسەر ڕانی پیاوێکە وا دەزانێ کە باوکییەتی، بۆیە یەکەم وشەی ئەوە دەبێ دەڵێ: (بابە گیان)، ئیتر بابەگیان بوو بە (بابە جیان ـ باباجان)و ئەم نازناوەی بە سەردا براو بوو بە (میرزا بەدیع باباجان)و لە ساڵی (١٢٤٨)، (سلیمان پاشا) میری میرانی (بابان) فەرمانی بۆ دەردەکات کە دێی (ئۆمەرەکوێر)، هەموو جۆرە بەرهەم و بەڕێوەبردنی بۆ میرزا بەدیع بێ‌و هیچ کەس مافی بەو دێیەوە نەبێ. وێنەی ئەو فەرمانەیشی بە فۆتۆگراف گیراوەو لە هەمان ژمارەی دیاری کراوی (کاروان)دا پێش چاو خراوە. وە دێی دیکەشی داوەپێی کاتێ منیش ـ نووسی ئەم نووسراوەیە ـ چاوم بە مامۆستای نیگارکێشی بە ناوبانگ (بدیع حسێنی بدیع باباجان) کەوت، ئەویش ئەم ڕووداوەی باپیری خۆی سەلماندو نووسراوەکەی مامۆستا (محمد مەلا کەریم)ی بە تەواو دایە قەڵەم و، وتی: [مامۆستا (محمد) ئەتوویەتی گوایە دوو میرزا بدبع بووە، بەلام من دەڵێم نەخێر یەك میرزا بدیع بووە کە باپیرمەو ئێستاش من بدیعم]. کەوابوو هەر یەك میرزا بەدیع بووە لە کاتی خۆی‌داو لە زانستی پزیشکی‌دا زۆرپسپۆڕو زانا بووە.. پیاوێکی چاك و خواناس بووە. حەزرەتی (کاك ئەحمەدی شێخ) کچی میرزا بەدیع مارەدەکات بۆ شێخ (محمد)ە گچکەی کوڕی، کە دایکی (حاجی سەید عومەرو حاجی سەید حەسەن و زەینەب خان) بووە واتە مامی (شێخ مەحموودی نەمر)ە، خێزانی میرزا بەدیع بووی (ئامینە خانم) بووەو لە نەوەی (زولاڵ ئاغا)یە، کە یەکێ بووە لە (دوانزە سوارەی مەریوان). کەوابوو لەم دایك و باوکە هەرێزە ڕۆڵەیێکی مەزنی وەکو (دکتۆر حسێن ئەفەندی) کەوتووە ئەوە، دوور نی‌یە ئەمیش لە زیرەکی‌و زانستی پزیشکی‌دا وەکو باوکی بلیمەت و زانا بووبێ. سەرەڕای ئەمەیش ئاشنای وێژەو ئەدەب بووەو شاعیر بووە دکتۆر حسین ئەفەندی لە ساڵی (١٨٧٠) زایەنی‌دا لە گەڕەکی (مەڵکەندی) شاری سلێمانی هاتووەتە دنیاوە، دەستی بە خوێندن کردووەو لە سەردەستی باوکی‌دا.. کاری دکتۆری‌و دەرمان گەرێتی (حەکیمی) یا (الطب والصیدلة) فێر بووەو چارەسەری زۆر نەخۆشی کردووە. چووەتە خزمەتی کاك ئەحمەدی شێخ و خوێندنی ئایینی‌و ڕێزمان و شەریعەت و ڕەوشت و خواناسی‌و سلوکی لا فێر دەبێ‌و تەریقە تیشی لێ وەردەگرێ.

جا کە دەبێتە خوێندەوارێکی باش و زانا «دوانزەعیلم».. مرخی خۆی خۆش دەکات لە تەواو کردنی خوێندنی پزیشکی، کە باوکی ئەمری خوا دەکات و باپیری دەی‌گرێتە خۆی‌و زیاتر هانی دەدات، بەلام دایکی دەبێتە کۆسپ و تەگەرە لە ڕێی‌داو، کاتێ دەبیسێ لە ولاتی عوسمانلی دا بۆ یەکەم جار کۆلیجی پزیشکی کراوەتەوە، پەنا دەباتە لای کاك ئەحمەدی شێخ و بۆ ئەوەی تکا لە دایکی بکات و بی‌نێرێ بۆ (ئەستەمبول). هەرچی چۆنێ دەبێ دایکی بڕیار دەدا، چونکە کاك ئەحمەد پێی دەڵێ کوڕەکەت با بچێ بۆ (کۆی سنجەق) بۆ خوێندن و تۆیش چاکەت پێ دەبەخشرێ.. بەم چەشنە دایك ڕازی دەبێ‌و دەڵێ ئێمە لە کوێ‌و (کۆی سنجەق) لە کوێ؟! لە دوایی‌دا دەنگ ناکات و دەڵێ: مادام کاك ئەحمەد جەنابت بڕیارت داوە با بڕوا. جا کە حوسەینی کوڕی بکەوتایە بیری، ئەم گۆرانی‌یەی ئەوت بە (کۆیە)دا نەی‌دەزانی کە حوسەین چووە بۆ تورکیا (ئەستەمبول):

«گوارەی گوێچکەم سێ گۆیە
ئاوابێ شاری کۆیە
حوسێنە چکۆڵەی لێ‌یە»

حوسێن لە یەکەم کۆلیجی پزیشکی وەر دەگرن و پاشان بە پلەیێکی زۆر باش و زیرەکانە لە ساڵی (١٩٠٤ز)دا تەواوێ دەکاو باسێکی گرنگ و نایاب پێش کەشی کۆلیجەکە دەکات کە بریتی بووە لە (٤٠٠) پەڕە، هەمووی لە بابەت خوێندنەکەی‌و سەرەتای بیرو تاقی‌کردنەوەکانی خۆی بووە.. بەلام بە داخەوە چنگمان نەکەوتووە. جا بە گوێرەی دەستووری ئەو کاتە لەدوای بڕیاردان بە شانازی‌یەوە بڕوانامەی دەدەنێ‌و وێنەی بڕوانامەکە لە پەراوێزی ئەم وتارەدا دەخەینە پێش چاو، ئینجا حکوومەتی عوسمانلی زۆر بە خۆشحاڵی‌یەوە بە پلەی (مقدم طبیب) دای‌دەمەزرێنن لە سوپای چوار دا، ئەمیش زۆر دڵسۆزو پاك بووە لە کارو پیشەی خۆی‌دا.. بۆیە پاش ماوەیێك دەکرێتە پشکێنەر یاپشکن (مفتیش)ی لیژنەی پزیشکی (تجنید)ی شارەکانی

(کەرکووك و هەولێرو سلێمانیو دیالەو موسڵ) کە ئەوسا بە سەریەکەوە بە (ولایة الموصل) ناویان دەبرد. وە گەلێ خزمەتی تری جۆراو جۆری نواندووەو راپۆرتی پێشکەش کاربەدەستانی لەشکرو سوپای عوسمانلی کردووە لە بارەی بەرگری کردنەوە لە نەخۆشی. بەم جۆرە سوڵتان (عبدالحمید) فەرمانێکی بۆ دەر دەکات کە بیێتە کلیل بە دەستی (کعبەی شریف) لە شاری (مەککە).. سەرەرای دکتۆریەکەی خۆی، بەڵام دکتۆر حسێن خۆشی لێنایەو بیانو دەدوزیتەوە دەڵێ: دایکێکی پیرم هەیەو رازی نابێ لێی دوور بکەومەوە، سوڵتانیش پێی دەڵێ ئەمە شەرەفێکی گەورەیە کەم کەس لایەقی ئەو شوێنەیە، بۆیە تۆمان بۆ ئەم کارە هەڵ بژاردوە چونکە پیاوێ چاکی.. ئەویش داوای بەخشینی لێ دەکات بۆ ئەم کارە.. جا سوڵتان زویر دەبێو نەفی دەکات بۆ (یەمەن)و دوو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، پاشان دێتەوە بۆ (عیراق)... بۆ دڵنەوایی کردنی پلەیێکی دیکەی دەدەنێو دەبێتە قائمقامی سویا، بێگومان ئەمەیش لەو کاتەدا بووە بە قائمقامی سویا واتە - عەمید. کە سوڵتان (عبدالحمید) لە سەر تەخت لابراوە. وە بە هاتنی (محمد رشاد)ی پێنجەم دکتۆر حوسێن داوای کردووە خانە نشین بکرێ. ئەمەیش دەقی بروانامەکەی دکتۆر حوسێنی کوری میرزا بەدیعی باباجانە کە بە زمانی تورکی نوسراوەتەو گەلێ لە زاناو دکتۆرو پرۆفیسۆرەکانی تورك و ئەڵەمان وفەرەنسا مۆریان کردووەو ناویانی تێدایە.

**دەقی بروانامەکە بەم جۆرەیە:**

نومرو

---

۲۲۲

دار العلوم الحکمیة اولان مکتب طبیهٔ ملکیة شاهانەنك اشبو سنهٔ در سیەسی ختامندە منعقد مجلس امتحان عمومیەدە ولی نعمت عالم وسبب آسایش نوع بنی آدم شوکتلو عظمتلو قدرتلو پادشاه بو علی سیرت و شهنشاه فلاطون فکرتە افندمز حضرتلرینك حضور لامع النور ملوکانە لرنك بالجملة وزرای عظام و وکلای فخام حاضر اولدقلری مالك علوم طبیە و جراحیەنك دورە، در سیە سنە تماماً و منتظماً مداومت ایتمش اولان [اوتوز درت یاشندە سلیمانیەلی حسینی بدیع افندی] ذکر اولنان مکتب ملکیە خواجە لرینك یدینە ویردکلری شهادتنا مەلر موجبنجە فنون طبیّەدن علم حکمت طبیعیة وفن کیمیا و علم تشریح و علم النباتات و علم حیوانات.و فن صیدلانی و فن جراحی صغیر و فسیولوجیا و مبحث الامراض و مفردات طبیّە وحفظ الصحّة وعلم الامراض الداخلیة و الخارجیة وطب قانونی وتشریح مرضی وعملیّات جراحیة وفن قبالة واصول سریریهٔ طبیة وجراحیە وجلدیە وکحالیە فنلرندە کندویە ایراد اولنان مسائلی علناً حل ایدوب جواب شافیسنی ویرمش وتعلیم وتدریسنە اقتضا ایدن بش عدد مجلس امتحانلرندە اظهار مهارت ایتمش اولدیغی تحقق ایلدیکندن محضاً طرف بأمر الشرف ملوکانەدن دار العلوم حکمیە اولان مکتب طبیهٔ شاهانەیە بیدریغ وارزان بیوریلان رخصت همایونلری موجبنجە بز کە مکتب مذکورك ناظر و معلمیین بر وجە مشروح مومی الیهك اسئلەی غوامض طبیە وجراحیە دە اظهار حذاقت ولیاقت ایلدیگنە بناء علم طبیە وجراحیە دە دوقتور تعبیر اولنان استاد و معلم رتبەسی عنواننی کافة امتیازاتیلە برابر مومی الیە بالتبلیغ ممالك محروسة المسالك شاهانەدە کیف ما یشاء اجرای فنون طبیە وجراحیە ایلمسنە رخصت کاملە وردیکمزی حاوی بالاسی طفرای غرّای شاهانە ایلە متوشح وجملە مزك مهر و امضا لریمز ایلە ممضی اشبو اجازتنامە املا وید مومی الیە اعطاء اولنمشدر. في ٤ ذي القعدة سنة ١٣٠٢ وفي ٢٣ تموز سنة ٣٠٢ سرّ کاتب طبیە: مکتب طبیە ملکیە مدیری دار العلوم شاهانە مۆری - سید محمد المختار، ابراهیم لطفی، کنعان نوری.

معلمین:

مۆر - علي محمد، احمد حلمي، ..........، فیض الله، نعیم، عبدالرحمن صائب.

مۆرەکانی - مکتبی طبیە ملکیە مدیری دار العلوم حکمهٔ شاهانا ومکاتب طبیە وامور طبیە ملکیە ناظری:

حسین صبري، ادهم بن احمد، .......،

مظهر حسن، السید محمد شاکر ١٢٨٨، نافذ ثریا، مارشۆ.

وە ئەم فەرمانی بروا نامەیە بە زمانی فەرەنساویش نوسراوەتەوەو لە خوارەوەیش مۆرێکی گەورەو چەن ئیمزاییکی پێوەیە. وە لە سەرووی بروانامەکەدا طورەی شاهانەی پێوەیە

ـ ـجۆر نموونەی إستنساخەکەدا بەرچاو دەکەوێ.

ـت ئەبوبەکری کوری خوالێ خۆش بوو گێرایەوە کە گوایا ـ خر وتـوویـەتی هیـچ شەوێـك نەبووە بەسەر کاغەزو و کتێبەوە ـ ی نەکــەوێ، هەمــوو شەوێـکـیش کتـێب و نوســراوم ـــــ ـنە و چاوی هەڵگـرتـووە چونکـە خەوی پیـا ئەکـەوت و ـــنە نەکەوتە سەردەم و چاوی.

ـ ـیعـ وتی ئەم (ملحمـەی فلکیـاتـەی) واداناوە سێ‌مانگ ـــــ ـ ـێ بەرۆژ وو بووەو لەگــەڵ کەم کەسـا قســەی کردووەو ـ ـنە ـ وریکـەوە ئەو ماوەیـە بەدەگمـەن خەڵکی بینیوەو قسەی ـ ـجیــری کردوتـــەوە زۆرجــاری واسـوە کە دوعـای بەســەر ـ ـنـ خوێنـدووە ـ ـ ـ ـ ـ ـی بەشێـوەیـەکی نەفسی ئەو ـ ـیـەی چارەسـەر کردووە. هەروەهـا خێزانەکەی ووتوویەتی ـ ـ هەرگیز پشتوێنی لە پشتی نەکردوەتەوە، چونکە ئەیووت ـ ـیـ خواردووە کەوا لە کاروپیشـــەی خۆمـــا دڵســۆزو ساغ ـ نەگــەر هات و لە نیــوەشــەوا نەخــۆشێــك پێــویستی بە ـ ـت بوو چۆن ئەتوانم بە پەلە بگەمە سەری ئەگەر پشت ـ ـ.

هەروەها مامۆستا ئەبوبەکر وتی لە بابەت لێدانی دڵەوە کە ـ ـ ـ نی‌کردووە بە گوێرەی ئەو لێدانە بە هەڵبەست وڵامی ـ ـەی [تیك تاك. . تیك تاك] کە زۆر راست و تەواو دەبێت، ـ ـە جێی سەرسورمانیان. بەڵام ئێمە ئەو هەڵبەستەمان دەس ـ ـوت. هەروەکـو گەلێ هەڵبـەستی دیکـەی نەماوە، یان ماوە ـ ـی ئێمەنەکەوتووە.

ـ ـپێش خانەنشینی ئیتر بە هەمیشەیی لە شاری (کەرکوك) ـ ـیشێ و لە خانــووە گەورەکــەی خۆیدا، لە گەرەگی (اخي ـ ـین = ئاخــونــد حوسینێ)ی نزیـك بە مزگـەوتی نائب. ئەو ـ ـوەی باخچەیێکی نایابی گەورەی هەمە جۆرە گوڵ و داری ـ ـیـ بووە. . تا ئێستاش شوێنەواری باخ و ماڵـ ـی ـ ـوەتەوەو پێی ـ ـێن (ماڵی باباجان). لە بەر ئەوەی جەنابی یەکەمین کەسێ ـ ـوە لە کوردستان داو بەڵکو لە عراق دا کە بروانامەی دکتۆری بە ـ ـست هێنــاوەو لە یەکـەمـین دەرچـــووانی کۆلیجی پزیشکی عوسمـانلی بووە هەروەکـو لە پێش دا رامـان گەیاند، وە شاعیرو ئەدیب و زاناو قسەخۆش بووە. . ئارەزووی بە کۆڕو دانشتنی ناو ـ ـوانی بەرێزو ئەدیب و بنووسانی سەردەمی خۆی کردووە. وە

شوێن و رێگاکەیشی گونجاو و شیاوی ئەوە بووە کە خەڵکی بە زۆری سەردانی بکەن، وە لە بەر چەند هۆیێکی‌دیش هەمیشە باخچـەو حەوشـەو دیـوەخـانـەکـەی جمـ[illegible]هاتـووە لە میـوانی هەمـەجـۆر. . بە تایبـەتی زانـاو دانای بە تواناو شاعیرو ئەدیب و هەڵکەوتووەکانی ئەو کات و سەردەمەی شاری کەرکوك. دکتۆر بە شێـوەییکی بەردەوام لەگـەڵ ئەم بەرێـزانەدا پەیوەندی‌و هات و چۆی یەکتریان کردوە: سەید ئەحمەدی خانەقای مشهور، شێخ عەلی تاڵـەبـانی، شێخ کەریمی شۆریجـە، دەروێش ئەفەندی مفتی. . کە مفتی شاری کەرکــوك بووە، سەیــد محــەمــەد جەبـاری ، دەدە هجـری کاکـەیی، مەلا مەحـمودی مەزناوی، مامۆستـا مەلا عەلی حیکمـەت سیامـەنسوری، ئەمین ئەفەنی خادمی سوجادە، رەفیق ئەفەنی عەلی ئەفەنی کە نائبی شاری کەرکوك بووە لە ساڵی چلەکان دا. . کاك بەدیع کوری دکتۆر دەڵـێ: باوکـم لە هەڵبــەستێکی جوان دا باسی خێڵی (خــادم السجـادە)ی کردووە، بە داخـەوە دەستمـان نەکـەوت. هەروەها شێخ نەجمەدینی شۆریجە کە بە (صابیری) بە ناوبانگە. . ئەو کاتە لاو بووە لای ماڵی خاڵوانی خێڵی خادیمی سوجادەی ناو براوا خوێنــــدوو یەتــی، زۆر کاتـی خۆی لەوێ رابــوواردوە. هەروەهـا شـێخ محەمەدی کەرەدانی بەرزنجی، مەلا ئەحمەدی قازی، مەلا خدری هەورامی سید عەبـاس چیمـەن. ئەحـمـەد بەگی ئەڤەجان و زوری‌تر، وە لەگەڵ (شێخ رەزا)دا. . ئەوە هەر مەپــرســە کە چەنـدێ ئاشنـای یەك بوونـەو بێ‌یـەك هەڵیـان نە کردووە، تەنـانـەت رۆژێکیـان شێخ رەزا دەچێتە ناو باخچەکەی ماڵی دکتۆرەوە، دەبینێ لە هەر چەشنە دارێکی وەکو: (پرتەقاڵ و لیمۆو دارخورماو نارنج و چنارو هەنار) جووتێکێ ناشتووە تاکی تێـدانی‌یـە، وە لە زۆربـەی باڵندەو ئاژەڵە کێویی‌یەکانیش وەکو: (ئاسکە، کەڵەکێویی، کەروێشك، سیمۆرە، ئەسپ، بولبول، عەنقودو، کەو) جووتێکی راگرتووە. . تەنانەت جووتێ تاوسی لە هیندوستانەوە بۆ هاتووە. جا شێخ رەزا روو دەکاتە دکتۆرو پێی دەڵێ: جەنابت لە هەموو شتێ دوان دوانت هەیە، تەنها لە یەك شت دا نەبێ تاکت هەڵ بژاردووە. دکتـۆر زیـرەکـانە دەڵێ تێت گەیشتم!؟ باوەر بکە خوا یار بێ ئەویش جووت دەکەم. پاش ماوەیێـك ژنێکی‌دیکـە دێنێ‌و دەیـان کاتـە دوو، جا دکتـۆر وەکـو جاران دەرنــاکـەوێ. . یانێ کەم کەس دەیبینێ‌و لە ماڵ نایـەتـە

دەرەوە، شێخ رەزا. بەم بۆنەیەوە ئەم چەند دێڕە بۆ دکتۆر دەنووسێ:

**«لە ترسی ئافرەتەکانی ئەمێستا واقی ووڕە**
**حوسێن ئەفەندی دکتۆر ئەڵێ مریشکی کرە»**

یان بە ئەمین کوڕی وتوە:

**«دوو جانەوەر لە نەسلی جانی أبن جان**
**ئەمینی حاجی کەریم و ئەمینی باباجان»** (1)

لە دوای ئەمانە خێزانە پێشینەی دکتۆر دەڵێ: باشە دکتۆر بە قسەی شێخ رەزات کرد.. کەوا سواری کەری کردیت و سەریشی تاشیت؟! واتە بە پەنی کردیت. مامۆستا بەدیع کوڕی دکتۆر دەڵێ لە بیرمە کە دایکم دوعای لە شێخ رەزا دەکرد لە پاش کۆچ کردنی و دەی‌وت: رەبی شێخ رەزا لە قەبریش دا نەحەسێتیەوە چونکە بویتە هۆی ژن هێنانی حسێن و پەیدا کردنی (هەویە = هەوێ)بۆ من. وابزانم دکتۆر منالی نەبووە لەم ژنەی دوەمی و لەوانەیشە ژنی دیکەی هێنابێ.. وە وا دیارە ژنێکی هەبووە کە بەر چاوی نەبووەو نەزۆك و تەمەن گەورە بۆیە دکتۆر لەم شیعرەدا دەڵێ:

**[ (بەهێ خان) گەرچی نەجیبە ئەمما**
**ژنی عاقر شەجەری بێ سەمەرە**
**بەخوا من ژنی وام خۆش ناوێ**
**چونکە هەم سوحبەتی (عاسە)ی گەوەرە**
**خۆ منیش نیوە ژنێکم هەیە ئەمما**
**سەرەیە عاقرەیە دز نەبەرە**
**یاخودا هەر سێ بە رۆژی بمرن**
**مەرگی ئەم سیانە نیشانەی زەفەرە**
**نیگەری تالیعی هەر تالیع بێت**
**تا فەلەك مەطلەعی شەمس و قەمەرە]**

ئەم بەهێ خانەو عاسەی گەوەرو نیو ژنەکەی دکتۆر وەك یەك وابوونە دەڵێن: بەهی خان ژنی سید ئەحمەدی بابارسول بووە گوایە، لە دوای ئەم بەسەر هاتەی دکتۆر، رۆژێك شێخ رەزا دێت بۆ باخچەکەی دکتۆرو سەردانی دەکات، جا ئەو کاتە وەرزی دارناشتن دەبێ واتا سەرەتای بەهار، لە هەمان کات دا مەلا قادری ترێ‌خۆر.. بەڵێنی بە دکتۆر داوە کە نەمامی نارنج و لیمۆی بۆ بنێرێ، دکتۆریش لە سەر بەڵێنەکەی مەلا قادر دەنێرێ بۆ نەمامەکان، کەچی مەلا قادر وەڵامی بۆ دەنێرێ و دەڵێ نەمامی وام نی‌یە.. چونکە بەفرێ زۆر باری و نەمامەکانی هەموو وشك کردن! لە راستیش دا بارینی ئەو بەفرە زۆرە چەند نەمامێکی دکتۆریشی وشك کردبوو. بەڵام مەلای ترێ‌خۆر لە بەر بەرچاو تەنگی لە دڵی نەهاتووە چەند نەمامێکی بۆ بنێرێ هەر چەندە ناوێکی زل و بە ناوبانگیشی هەبووە لای دکتۆر بە بەخشندەیی، جا کاتێ دکتۆر ئەو وەڵامەی مەلای بیستوە کە گوایە هەموو نەمامەکانی فەوتاوە! ئەم قسەیە لە مێشکی دکتۆرەوە دوور بووەو وتویەتی هەر دەبێ دە پانگزە نەمامێکی مابێ؟. جا لە گەرەگی مالی دکتۆردا خانمێکی بێوە ژنی خانەدانی چاو تێر بووە کە ناوی (عاسمە)ی حاجی خدر بووە، بەم مەسەلەیەی زانیوەو بە دکتۆر دەڵێ: ئێمە نەمامەمان زۆرەو باخچەکەمان ها لە خزمەتت دا. دکتۆریش بەرامبەر بە مەلای بێ بەڵێنی و چاو تێری و سەخاوەتی و بە تەنگەوە هاتنی باجی (عاسمە خان) وتوویەتی:

**[بۆ (کەرەم) مەڵلای (ترێ‌خۆر) شوهرەتێکی وای هەیە**
**عادەتا (حاتەم) لە چاویا مەنزیلەی عەنقای هەیە**

**تەجروبەم کردو نەمامم ویست لەئەو بۆ باخچە کەم**
**چاوی خۆی شۆر کردو فەرمووی کێ نەمامی وای هەیە**

**بەینی بەینوڵلا درۆ بوو شوهرەتی مەڵلای خەسیس**
**(عاسمەی حاجی خدر) سەد گورگی وەك مەڵلای هەیە ].**

بە ناردنی باجی عاسمە نەمامەکان بۆ دکتۆر.. باخچەکەی رێك جوان دەبێتەوەو دارەکانی وەك جاران جووت دەبنەوە. دیسان دەستە دەستە پیاوە بەرزو زاناو ئەدیب و شاعیرەکان.. رووبان کردوەتەوە ماڵە خۆشەکەی دکتۆر کە جاری وا بووە خۆی دەی‌ناردە دوایان بۆ نان خواردن و خورماخواردن یان ترێ خواردن و زیافەت رایانی هێشتووە. لێرەدا چەند سەرگوزەشتەو یادگارییەکی دکتۆرو هاوەڵانی بۆ یادگار تۆمار دەکەین کە لە پێشەوەیش بە سەر چەند بەشێکی کەمی‌دا تێپەڕین.

١ ـ جارێکیان لە مانگی رەمەزان دا، ئێوارەیێك دکتۆر حەزی کردووە لەگەڵ مامۆستا مەلا مەحموودی مەزناوی کە سەرۆکی

ـــيـانی (کـەرکـوك)و مەلایێکی بەرێـزو بەرز بووە، پێکـەوە ەرسانـگ بخـوێن و لەوێ ڕۆژ وەکـەی بشکێنێ، مەلا مەحموود تحیـك دوا دەکـەوێو دیـار نابێ. . دکتـۆریش خزمەتکارەکەی نعێری بە دوایداو لەگەڵ ئەم تاکە شیعرەی بۆی دەنووسێ:

«منتظر تو است حسین طبیب
نصرٌ من الله وفتحٌ قریب»

تـا بانـگ نزیـك بووەتــەوە چاوەڕوانی تۆ دەکــەم، بەڵکــو بنرمەتیو پشت کۆمەکی لە خواوە بێت بۆمان و دەروازەیەکمان لێ بکـاتــەوە؟! جا بۆ ڕۆژ و شکـانـدنـەکـەی بێ یا هەر دەروازەی خۆشیو بەختـەوەریو ئەوەی لە دڵی دکتـۆر وگـەلێکی دی وەکـو ئەودا هەبووە.

٢ ـ هەروەها جارێکیان شێخ ڕەزا لە شێخ عەلی برای زوێر ئەبێو توڕشـی دەسـت کورتیو نەبـوونی دەبێ، وەهیچی وای نامێنیو دەچێ بۆ لای دوکتۆر هانای بۆ دەبات کە ئاشتی بکاتەوە لەگـەل شێخ عەلی برایداو تکـای بۆ بکات. دوکتۆریش دەڕوا دەبینێ واهـەنـدێ دەس و پێـوەنـدو دەروێش لەوێ وەستـاوون، شێخ عەلیش لەو کاتەدا لەوێ نابێ. دەڵێ با بە عەرەبی قسە بکـەیـن تا شێـخ عەلی دێتــەوە، نەوەك ئەم دەروێشـانــە لە قسەکانمان تێبگەن و بەجۆرێکی نالەبار بیگەیەنە شێخ علي، چونکە شێخ ڕەزا دەمی خۆی نەپاراستووە مەبەستی ئەوە بووە کە شێـخ ڕەزا هیـچ قسـەی لە شێـخ علي نە دەخـواردەوە و قسـەی پێدەکرد، نەوەکو ئەم قسانەی پێبگاتەوە.

کە شێخ علي لەدوورەوە پەیدا دەبێ شێخ ڕەزا دەڵێ (أذهب الـی فرعــون انــه طغـی) شێــخ علی گوێی لێدەبێو دەزانێ دوکتۆری بۆ ئەوە هێناوە کە تکای ئاشت بونەوە بکات، دەڵێ ڕەزا خوا بەقـوربـانی دوکتـۆرت بکـات نیـەتم نەبـوو لەگەڵت ئاشت ببمەوە برۆن بەرانێك و ڕۆن و برنج و پێویـستیدیکەی بۆ بەرن با بێدەنگ بێ.

٣ ـ دکتــۆر هەر وەکــو هاوڕێو خۆشــەویـستی لە شاری کەرکـــوك دا زۆر بووە، هەروەهـــا لە دەرەوەی کەرکـــوکـیـش هاوڕێی هەبووەو هاتوونەتە سەردانی. . یا ئەم چووەتە لایان، جارێکیـــان (فـەتـاح پاشـا) کە زۆر بەنـاوبـانـگ بووە لە شاری (بـەغــداد) خاوەن کارگـەی قومـاش بوو، زۆر خۆشـەویـست و هاوڕێی دکتۆر بووە، هاتووەتە سەردانیو سێ شەو و سێ ڕۆژ لە لای دکتۆر ماوەتەوەو بە دکتۆری وتووە هێشتا تێر نەبوومە لە دیدەنیت!.

٤ ـ لەگەڵ (مەلا فەندی) هەولێر یش دا گەلێ ئاشناو دۆستی یەك بوونەو هاتووچووی یەکتریان کردووە، هەروەها هاتووچۆی ماڵی (صـالـح زەکی بەگ) و (حـەمدی صاحبقرانی شاعیر) کە خزمی ماڵی دکتـۆر بوون، کردووە لەگـەل ماڵی شێـخ عومـەری بیارەیش دا کە خێزانەکەی خوشکی دوکتور بووە (حەلاوە خانی بەدیع باباجان) هاتوچوی بووە.

٥ ـ حەماغای کۆیە نەخۆشییێکی بووەو هەموو ساڵی لێی هەڵ داوەتـەوە. . نەخـۆشییـەکەش لە ئەنجامی شوێنی شیرێك دابوە کە لێی دراوە لە کاتی خۆیدا پەیدا بووە، جا نازانین لە غەزادا بووە، یان بە هۆیێکی دیەوە. . بووە هەموو جار هەر دەبـوو دکتـۆر حوسێن برۆیشتـایـە بۆ چارەکردنیو ماوەیێك لەوێ لای خۆی دەیهێشتەوە تا تێر تەسەلای دەهات زور خۆشی دەویست.

٦ ـ دکتۆر حوسێن: سەرەڕای ئەوەی خۆی بە (موخلیس)و قوتابیو بچووکی کاك ئەحمەدی شێخ دەزانی، زۆر زۆر ڕێزو نوازشی بووە بەرامبەر شێخ مەحمودی مەزن چونکە تاقە هیوایێك بوو لەو سەردەمەدا بۆ ڕزگاریو سەرۆکی کوردو قارەمان و ئازاو چاونـەتـرس وشـۆڕشگێـر بوو، داوای مافی ڕەوای گەلی کوردی دەکـــرد. وە لە بەر ئەوەی نەوەی کاك ئەحمـەدی شێـخ بوو کاك ئەحمەدی شێخیش گەلێ فەزڵی هەبوە لە سەر دکتۆر. هەروەها پیـــاوێکی هەڵکـەوتـوو و ئەدەب دۆست و خوێنـدەوارێکی چاك بووە، پێویـست بە باس کردن و ڕوون کردنەوە ناکات کە چەندێ دیـــاریـیـەوە بەنـاوبـانگـەو، وەکـو ڕۆژ بە ئاسمـانی کوردەوایو شوێنانی غەیرە کوردیشەوە دیارە، جا کە شێخی پایە بەرزو نەمر بۆ هینــدستــان دەبــرێو لە خاك و نیشتمــانـەکـەی خۆی وور

دەخـــرێتـــەوە. . لە سەر مافی گەلـــەکـــەی، دکتـــۆ ئەم پارچـە هەڵبەستەی بۆ دادەنی‌و دەڵێن: بۆیشی ناردووە. ئەمەیش هۆنراوەکەیە:

**«چیمە لە خاڵی ماهی رووی [illegible] جەبینەوە**
**چیمە لە بۆنی عەترو گوڵی یاسە مینەوە**

**چیمە لە سەیری فەسڵی بەهاران و سەوزەوار**
**گیایی سەوزو شینی دڵ کە بهاوێتە شینەوە**

**دنیا لە لام ئەوەندە بە تەنگە دێتە بەر نەزەر**
**هیچ ویسعەتێ نی‌یە بە سەماو و زەمینەوە**

**مەزڵووم ئەخاتە بەر دەستی زۆرداری بێ ئەمان**
**رەحمی نی‌یە بە ئاهو دڵی پر گرینەوە**

**لایە نەهەنگە میللەتی بێچارە قووت ئەدا**
**لایە پڵینگە هەڵمەتی بردۆتە چینەوە**

**خەم خواری عالەمی بەشەرم هەر کەسی کەبێت**
**خۆ داخی ئێوە خاسە گری خستە ژینەوە**

**دائیم دوعایی خۆشیی ئێوەم لە سەر دەمە**
**یادت ئەکەم هەمیشە بە قەلبی حەزینەوە»** (٢)

ئێستـاش با پێکـەوەبـە هەنـدێ لە بابـەت بەرهـەمی ئەدەبی‌و زانستی پزیشکێتی دکتۆر حوسێن شادو ئاشنابین. . وتمان دکتۆر حوسێن دانراوو پەرتووکی هەبووە، لەگەڵ ئەوەش دا هەڵبەستی زۆریشی بوو. هەڵبەستەکانی زۆربەی کەوتوونەتە لای بنەماڵەی (حـەسـەن بەگی جاف)، چونکـە لە پاش کۆچ کردنی دکتـۆر، منـداڵـەکـانی ئەو فام و بیـروپـان نەبـووە کە بەرهـەمـەکانی خوا لێ‌خـۆش بوو بپـارێــزن. بۆ نمـوونـە کتێبی بروانـامـەی دکتۆری‌یەکەی. . هەووەکو مامۆستا (ئەبوبەکر حوسێنی باباجان) بۆی گێـرامـەوە، دەڵـێ (٤٠٠) پەر بوو هەمـــووی لە بابـەت تەنـدروستی‌و پزیشکـایەتی‌و هەندێکشی تاقی‌کردنەوەکانی خۆی بووەکـە لە باوکیـەوە وەری گرتبـوو. جگـە لەم پەرتـووکە، دکتۆر کتێبێکی بە نرخ و نایابی بووە بە ناونیشانی (ملهمه فلكيات)، کە پوختەی بیرو باوەرو تاقی کردنەوەو دەرمان کاری‌و تیمار کردن بووەو بە شێـــوەیێکی زانستی‌و ئەدەبی دایـــرێـــژتـــووە، جا لە بەر زیـــرەکی‌و سەرکــەوتن لە وتـوویـــژداو وەڵام دانـەوەی پرسیـاری هەمەجۆر، بوونی بنەرەتێکی پزیشکی لە مێشکی‌دا بووەتە هۆی ئەوەی لەقـەبی (استـاذ)ی پێ بـەخشـرێ بەرامبـەر بە دکتۆرای ئێستـــا. لەو کۆرەی کە بروانـــامـــەکـــەیـــان پێ داوە، سوڵتـان (عبـدالحميـد) خۆی‌و داروەستـەکەی ئامادەی بوون. . چونکە یەکـەمین دەورە بووە کە کرابـووەوە، ئاشکـرایشـە دکتۆر حوسێن یەکـــەمین کورد بووە کە ئەم بروانـــامـــەیـەی بە دەس هێنـاوە لە عێراق دا. . چونکە هیچ بەڵگەیێك نی‌یە کە کەسێکی دی وەکو ئەو (اطروحة)ی (٤٠٠) پەرەی پێشکەش کردبێ، وە وەکو ئەو گفتوگۆو لێکدانەوەی لە سەر کرابێ، وە ئەو هەموو پرسیارانەی کە ئاراستـەیـان کردووە وەڵامی دابێتەوە، وە دانی پێدا بنێن و ئەو پلەیەی پێ بدەن و هەموو هاوەڵانی کە دامەزراوون لە سوپادا بە پلەی (رئيس طبيب). بەڵام ئەم لە بەر ئەو هۆیانەی باس کرا پلەی (مقدم طبيب)ی پێ دراوە؟ وە پاش ماوەیەکیش پلەی زیاتر بەرز بووەتەوە. ئەم زیرەکە، ئەم بلیمەتە، ئەم هەڵکەوتووە، نەك هەر لەو جۆرە بابـــەتـــانـەدا باس کران شارەزا بووە. . بەڵکـو لە زۆربەی زانستەکان دا مامۆستاو شارەزایێکی تەواو بووە، مامۆستا ئەبـوبـەکـری کوری دەڵێ لە زانستی (جـەفـر)ا زۆر زاناو، کەم هاوتای هەبووە. کەچی ئیستا بروا ناکەم (جەفر) زانێ مابێ‌وە لە زانستـەکـانی (فلكيـات، بيطـره، بلاغەو بديع و ئەدەب و نحوو سەرف دا رمل ريازيات، زراعة) وهتددا؛

زانابوو، دکتۆر شارەزای چوار زمانی گرنگی ئەو سەردەمەی خۆی بووەو کەســـەرەرای زمـــانـــە زگمـــاکی یەکـــەی خۆی کە کوردی‌یـــەوە زۆر ئارەووی لە خوێنـدنـەوەی ئەدەبیـاتی عەرەبی، تورکـی، مارسـی، فەرەنـســـایـی بووەو، زۆر کتێبی زانستی بە

زمـانی فەرەنسی خوێنـدووەتـەوەو سوودی لێ وەرگـرتـوون. وە بەراستی خزمەتی گەل و وڵات و زمان و زانستیو ئەدەبی کوردی کردووە؛ چونکـە لەو کاتـەدا نووسین بە کوردی خزمـەت بوو، فێـرکـردن و خوێنـدەواریو ڕێگـا پێشـان دانی گەلـەکـەی بۆ پێشکەوتن و، زانینی تەندروستیو بڵاوکردنەوەی ڕەوشت و ئایین و فێـرکـردنی هەستی کوردایـەتی بۆ ژیـانێکی خۆشبـەختـانـە هەر خزمـەت بوو. گەلـێ جار بۆ ئیش و ڕاوێـژو پرس و کار هەڵ سورانـدن و یا بۆ تیـمـارگـەریو دەرمـان کاری کردنـی گەلـەکـەی، (شێـخ مەحمـود) بانگی دەکـرد، دکتـۆریش کەم تەرخەمی نە دەکردو دەچوو وە دەیفەرموو هەموو کاتێ ئامادەم بۆ هەر خزمەتێك بۆ گەل و وڵاتەکەم و جەنابتان.

لێرەدا وا چەند نموونەیێکی هۆنراوەی ئەدەبیو زانستیێ دکتۆر حوسێن دەخـەینـە پێش چاو، نازنـاوی شیعـری شاعیـر (شهید) بووە، وە هەڵبەستەکانی وەکو وتمان هەمە جۆرن. جارجاریش هەر (حـوسێن)ی دانـاوە، بۆ نمـوونـە: لە بابـەت ئێسکـەکـانی بڕبڕەی پشت و مل (فقرات)ەوە ووتویەتی:

ای که میخواهی عددهای فقار
بشنو از من تا بگویم آشکار
(عنق) هفت و (ظهر) باشد دوازده

(قطن) پنج و (عجز) سه ای هوشیار
(عصعص) أمد نیز سه در آخرین

باشد این نظم از (شهید)ت یادگار

هەروەها نووسیویەتی: ملاحظة:

«وقص چون فقرات صدر است چون خارج اینها بود در این ابیات داخل نمود» (ب، ن، د حسین ابن میرزا بدیع حکیم)

وە بە قاعدەی لەف و نەشر:
(عنق و ظهروقطن با عجز و با عصعص هفت با دوازده و پینج و سه آمده اند).

دیسان لە خوارەوە ـ نووسیویەتی:
(بن ده کذا حسین شهید)

| عنق | ظهر | قطن | عجز | عصعص | |
|---|---|---|---|---|---|
| — | — | — | — | — | دو مرتبه. |
| ٧ | ١٢ | ٥ | ٣ | ٣ | |

ئەمانەی لە حاشییەی کتێبێکی باوکی خۆیدا نووسیوە هەروەکو مامۆستا بدیع بۆی ڕوون کردینەوە.

هۆنراوەیێکی دی شاعیر دەکەینە دیاری، دکتۆر لەم هۆنراوەیەدا: ستـایشتی ڕێبـازی قادریو ئامـۆژگاری شێخانی ئایینیو بەراورد کردن لە نێوانی ڕێبازی نەقشەبندیدا دەکات. هەروەها نامە هۆنـراوەکـەی دکتـۆر بۆ شێخێکـە بە ناوی (ئیبـراهیم)و تێیدا سەرزەنشتی دەکـات وە نزیکـەی ٦٠ دێـرە شیعـر زیـاتـرە کە لە کۆتاییە کەیدا دەڵێ:

در سحر گاهان چو زوّاران زخاك مرقدش
اقتباس نور سازد شمع مهر خاوری

نقشبندی تا از و در یافت شاه نقشبند
گشت شاه نقشبندان بر سریر سروری

گرچه در عالم طریقتها فراوان است لیك
نیست بالأثر طریقی از طریق قادری

شد محب خاندان غوث گیلانی حسین
زن بدرگاهش بود صد بو علیّ و انوری
مرغ جانم هر زمان گوید بأهنگ سماع
قادری ام، قادری ام، قادری ام، قادری».

دکتـۆر لە کاتی خۆیدا لەماڵی عەلی ئەفـەنـدی کەریمی شەیـدایی لە (سلێمـانی) مێـوان دەبێ، ئەو شەوە کوڕێکیـان دەبـێ، دەڵێن دوکتـۆر دەبێت تۆ ناوی بنێیت ئەمیش بەم تاکـە

شیعره ناوی دەنێت نوري:

(١) پسر نورو پدر نوریست مشهور
أز ئینجا فهم کن نور علی نور

ئەم نوری‌یــە نوری علي یە کە دەرمــانخــانــەی هەبــوو لە سلێمانی بەناوی خۆیەوە کە لە ژێردەستی دوکتۆر حسێن دا فێر بوو بوو بەبێ خوێندەواری قوتابخانە، تاقی کرایەوەو بروا نامەی (صیدلیە)ی وەرگرت و بە پلەیێکی باش لە سەربازی قبوڵ کرا بە ئەفسەری دەرمانخانەو گەیشتە پلەی «رائد.»

پاشـان خانـەنشین بووەو دەرمـانخـانـەی دانـاوە لە سلێمـانی بەناوی ئەجزاخانەی نوری علي. لەم ساڵانەی دوایی‌دا کۆچی دوایی کرد هەمـــوو جارێ سەردانی دەکـــرد بۆ ماڵی کوڕەکـــانی دوکتۆر واتە کاك أبوبکرو مامۆستا بدیع.

ناو براو بۆ کاك ئەبــویـەکـری کوڕی دوکتـۆر گێـڕاویـەتیـەوەو وتویەتی من تا ئێستاش بۆ ماڵ و مناڵەکانی خۆمان زۆرجار ئەو داوودەرمـان و گژ و گیـایـانـە بەکـار دێنم کە دوکتۆر حسێن فێری کردووم و زۆر بە سوودن و ئاســانـن و ئاڵــۆز نین. زوو زوویش ئەنجامیان دەردەکەوێ.

کۆچی دوایی

---

ساڵی ١٩٢٤ لە کەرکــوکــەوە بەرەو سلێمــانی بەســواری کەوتوەتەڕێ کاك ئەبوبەکری کوڕی دەڵێ: بۆ سەردانی خزمانی چووە. جا کە دەگـاتـە سەر جۆگـە ناوەکـەی لای (تـاسلوجـە)، دەڵێن گوایە لەو کاتەدا کە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆ دەبێ.. لە قەراخی جۆگـەکـە، دکتـۆر بە سەر ماینـەکەیەوە دەبێ‌و خەریکی نان خواردن بووەو ڕەشمەو لغاوی ماینەکەی بە دەستەوە نەبووە، سەر قافڵەچی بەدکـــارو کار نارەوا.. ئەمـــە بە هەل دەزانی، لە دواوە دەنگێ لە ماینەکەی دکتۆر دەکات و بە قامچی لێی دەدا، ماین دادەپـەڕێ‌و باز دەدا. دکتـۆریش لە ماینـەکـەی دەکـەوێتـە خوارەو دەگـلێ‌و پشتی دەشکێ. پاش ماوەیێـــك بە یەك جاری چاو لێك دەنێ‌و دەبێتە میوانی گردی سەیوان لەسلێمانی.

*** سەرچاوەکان ***


**١ - بنەماڵەی باباجان لە کەرکوك بە تایبەتی دوو کوڕە دڵسۆزەکەی**

**أ - مامۆستا بدیع باباجان، نیگارکێشی وێنەکانی ناو مێژووی ئەدەبی کوردی.**

ب - مامۆستا ابوبکر باباجان کە ئێستا خانەنشینە.

٢ - شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد - دانراوی عەلی کەمال باپیر ئاغا ساڵی ١٩٧٠ چاپ خانەی ڕاپەڕین لە سلێمانی.
٣ - گۆڤاری کاروان ژ - ١٩ - ساڵی - ١٩٨٤.

٤ - دیوانی شێخ رضای طاڵەبانی.

٥ - مینای شکستە نووسینی ماموستا نەجمەدین مەلا کە ئێستە هی (حەمەبۆر)ە

٦ - دەقی بڕوانامەکەی دکتۆر حسین - ١٩٠٤ - کە پارێزراوە لای بنەماڵەکەی‌و وێنەکەیشی لێرەدا بەرچاو دەکەوێ.

٧ - چەند کتیب و لاپەڕەو بەیازو، دەسنووسی دکتۆر حسین و میرزا بدیع حکیم باشی یا (ملك الاطباء).

٨ - نامەیێکی دکتۆر بۆ شێخ کەریمی شورجە - لە نامەخانەی (صابیری)لە تەکیەی شۆرجەی قەرەحەسەن. پارێزراوە.

٩ - بنەماڵەی زانیاران - مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس - ساڵی - ١٩٨٤ - بەغداد.

١٠ - چەند کەسانێکی بە تەمەن تایبەتی ماموستا حمەبور خۆی‌و نامەخانەکەی.

— حـــ ـ ڕۆشنبیری نوێوه :

ـــمیت نه سه‌یـری ڕۆژنـــامـــه‌ی (ئـومێـــدی ـــــ ـ د چووم به‌و چه‌نـد دێـره که‌وت که له بۆنـه‌ی ـ ـ ـ ع دکتۆر حسین دا نووسـرابوو . به پێویستم ـ ـــم به سه‌ربـــاره‌ی باســه‌کـــه‌ی کاك حسین ـ حـ ـ ـمدا بلاوی‌بکـه‌مه‌وه . به‌وهیوایه که ئه‌مه به ـــ ـ ـ وکاری بێ‌پرس نه‌زانن .

(بیمار)

ـ حـ مؤسف

ــــ ـ عدیثه وا خۆی نواندەوه
ـــ ـ ـ ـ ـ تی‌دا گه‌شانده‌وه

**دقتۆر حسین شه‌هید ، هونه‌رپه‌روه‌روئه‌دیب بادی ئه‌جه‌ل چراغی حه‌یاتی کوژانده‌وه .**

دقتـۆر حسین ئه‌فه‌ندی باباجان که حه‌یاتێکی مه‌دیدی له عالـه‌می طه‌بـابـه‌تـا صه‌رف وته‌قـریبـه‌ن چل سال بوو وجـودی وه‌قفی خزمـه‌تی به‌شـه‌ریـیـه‌ت کردبوو له‌م چه‌ند ڕۆژانـه‌دا بۆزیـاره‌ت له که‌رکـوکـه‌وه حه‌رکـه‌ت ده‌کـا بۆ سلێمـــانـی له ئه‌ثـنــای ڕێـگــا به سائقــه ته‌جــاوزه‌ن نه‌خــۆش ئه‌کــه‌وێ‌و شه‌وی مواصـــه‌لـه‌تی له سلیمـانی عازمی‌داری جینـان ده‌بێ حه‌قیقـه‌تـه‌ن وه‌فـاتی بۆقه‌ومی کورد له ضایعـات مه‌عدووده ، حه‌ضره‌تی باری مه‌رحووم نائلی مه‌غفـــه‌ره‌ت وعائله‌ی که‌ده‌ردیـده‌یشی مه‌ظهـه‌ری صه‌بری جه‌میل بفه‌رموێ .

**٦ كـانـون أول ١٣٣٩ امید استقلال ـ لاپه‌ره (٣)**
**٢٦ ربيع الآخر ١٣٤٢**

ملخص البحث

# حسين افندي باباجان الشاعر والطبيب

حـــبـ عمر البرزنجي

ـ ـــة (١٨٧٠) في محلة مكنـدى في مدينـة السليمانية ـــ حقيقي حسين بديع باباجان وكان والده (ميرزا بديع ـ ـ ـ (ملك الاطبـاء) اوحكيم باشى وكـان عالمـاً بالامـور عـــ وخفايـا امـورهـا عاش في الأيـام الأخيـرة لامـارة بابان ـــعـ ـية عبدالله پاشا بن سليمان پاشا البابانى.

ـــ الدكتور حسين على يد والده الألمعي ثم اصبح احد ـــ ومريدي حضرة كاك احمد الشيخ وعند فتح اول كلية ـــة في مدينـة اسطنبـول في تركيـا التحق بالكليـة المـذكورة ــــعمة شيخه واستاذه الحاج كاك احمد الشيخ ونظراً لذكائه ـــ ـط ولتفـوقـه في دروســه حيث قدم رسالة مكونة من ٤٠٠ صفحة حول موضوع دراسته قد منح لقب (الاستاذ) وعين في الجيش العثمـاني برتبـة مقـدم طبيب ثم ترقى الى رتبـة عميـد ومفتش ولايـة المـوصـل وبعـد فتـرة زمنيـة قصيـرة احيـل على التقـاعـد حسب رغبتـه الشخصيـة وكان مخلصاً وفياً صادقاً في عمله ويعتبر من الشعراء الكبار رغم تفوقه العلمي في العلوم الطبيـــة وكـــان يجيب على بعض الاسئلة الطبيـة بالشعـر ولـه اشعـار باللغـات الكـرديـة والتركية والفارسية وهي كثيرة ومتفرقة وقسم منها مفقود كما له كتب اخرى مثل (ملهمة الصحيات) و(لغـات تشـريحيـة) و(شـرح الاعضـاء) وغيـرها كما مبين في نمـاذج خطيـة من خط يده الكـريمـة توفى رحمـه الله في عام ١٩٢٤ عندما كان يسافر الى مدينة السليمانية حيث وقع من على فرسه وتوفى على اثره.

# ئەودیو دەروونناسی

# parapsychology

نووسینی ــــــ دوکتۆر عبدالستار طاهر شریف

پێشەکی پێویستە واتای زاراوەی ئەودیو دەروونناسی Parapsychology بزانین، ئایا ئەم زاراوەیە «ئەودیو ـ دەروونناسی» بوارێکە لە بوارە زانستی یەکان، یان نا؟ ئەگەر ئەودیو دەروونناسی زانستەو ساغ بۆتەوە وەك بوارەکانی تری زانستی، دەبێ بەڵگەکانمان بمان گەیێنێتە کوێ؟

ئەم پرسیارانەو کۆمەڵێ پرسیاری تریش لەم ڕووەوە بەرەنگارمان دەبنەوەو چاوڕوانی وەڵام دانەوەن.

ئەودیو دەروونناسی بە پێی بۆچوونی زانستی، بەرەو زانین و ئاشکراکردنی دیاردەکانی ئەودیو سروشتمان دەبات. ئەو دیاردە نامۆو نادیارانەی تا ئێستا ڕوون نەبوونەتەوەو جێگای سەر سوڕمانن. لە بواری گیان و (غەیبی یات)دا دەسوڕێنەوە، کەواتە ئەودیو دەروونناسی، هەموو ئەو شتە نامۆو نادیارو نائاشکرا سەیرانەو لە توانست بەدەرانە دەگرێتەوە. ئنجا ئەم دیاردانە، دیاردەی فیزیاوی بن، یان دەروونناسی و کیمیاوی و ئەفسانەیی بن و . . . هتد. کەوا بە شێوەیێکی سەیرو نەبینراو و نەبیستراو خۆیان دەنوێنن. بۆ نموونە خوێندنی هەندێ دوعاو وشەی سەیر سەیری نەبیستراو لەلایەن هەندێ کەسانەوەو جوولانەوەی دەنکە جۆو هەڵگەڕانی بەقەد دیوارو ڕچکەبەستنی سەدان دەنکەجۆ یەك لەدوای یەك وەك ڕچکە مێرووله لە ئەنجامی خوێندنی ئەم جۆرە دوعاو وشانەدا، دەبێ بخرێتە چ قالبێکەوە. ؟!

ب تەقالبی ئەفسانە، یان قالبی ئەفسوون، وەیان بخرێتە ناو قالبی ئەو و دەروونناسی یەوە؟

ئەگەر ئەم کردەوەیەو دەیان وسەدان کردەوەی تری لەم بابەتە، بە بابە دەروونناسی دابنێین، ئەوا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ ئەم زانستە زان کی کۆن و سەرەتایی یەو لەناو کوردەواری خۆمانیش دا زۆر باو ە. بەڵام زوربەی زۆری خەڵکی بە کردارێکی ئەفسوونیان لە قەڵە دەداو تا ئێستاش هەروای لە قەڵەم دەدەن.

ەندێ لە زانایانی ئەم بوارە زاراوەی (ئەودیو دەروونناسی) یان دانە ە بۆ (پاراسایکۆلۆجی) هەروەها «ماکس دیوار» زاراوەی (پار ایکۆلۆجی) بۆ داناوە. تا ئێستاش هەردوو زاراوەکان جێگای لێک ینەوەن و وا دیارە پڕ پێستی بابەتەکە نین، هەرچەندە تا ئێستا زاراو (پاراسایکۆلۆجی) باوەو زاراوەیێکی تر ئەم جێگایەی پڕ نەکردۆتەوە، ئێمەش لەم توێژینەوەیەمان دا زاراوەی (ئەودیو دەروونناسی) مان بەکارهێناوە:

دەربارەی ئەودیو دەروونناسی وەك زانستێك، تا ئێستا جێگای لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەو بە تەواوی لەسەر واتای ئەودیو دەروونناسی وەك زانستێك زاناکان و قوتابخانە جۆراو جۆرەکانی یەکیان لەسەر نەگرتووە. بە گشتی ئەم زانستە لەسەر دیاردە نادیارەکان و تەم ومژاوی یەک دەدوێ و خۆی پێ یانەوە خەریك کردووە، کەوا لەژێر دەسەڵات و تێگەیشتنی هۆشی مرۆڤ دا نین. لەوانە کارتێکردنە سەر هەر شتێ بتەوێ کاری تێ بکەی بەبێ بینینی و ئەو شتەش لە شوێنێکی زۆر دوور بێ لێتەوە، وەك کارتێکردنە سەر کەسێك لە شاری سلیمانی بە بێ ئەوەی ببینی لەکاتێك دا تۆ لە شاری بەغداوە بتەوێ کاری تێ بکەی یان یەکێ بیەوێ لە شاری دهۆکەوە کارت تێ بکاو تۆش لە شاری بەغدا بی. . وەیان زانینی ڕووداوێك پێش ئەوەی ڕووبدا.

لە دێهاتەکانی کوردستان بە زۆری لە ساڵانی پەنجاکان دا چاومان بەم جۆرە کردەوانە دەکەوت و، لەو کردارانە خوێندنی هەندێ شتی نەبیستراو کە کابرای ناسراو بە ئەفسوونباز دەی خوێندەوەو پاشان گوێلی جۆی ڕۆدەخست ورچکەیان بە قەد دیواردا دەبەست

(صلاح نصر) لە یادداشتەکەی دا دەڵێ : « شێخێك هەبوو ناوی (شێخ دونیا) بوو، ئەم شێخە جێگای باوەڕی «جمال عبد الناصر) بوو گوایە هەستی بە هەندێ ڕووداو دەکرد پێش ڕوودانی، لەوانە : زانینی کاتی شەڕی ساڵی ١٩٥٦ پێش ئەوەی شەڕەکە بقەومێ. سەیر ئەوەیە (جمال عبد الناصر) باوەڕێکی زۆری بەم شێخە هەبوو، جێگای موتمانەشی بوو (شێخ دونیا) دەی وت: زۆری نەماوە ئامێرێك (جیهازێك) دروست بکا . بە هۆیەوە زاڵ بێت بەسەر تیشکی کەون و بەکارهێنانی دژی (ئیسرائیل)و تێکدانی ئابوری یان و لەناودانی ژیان لە (ئیسرائیل)دا ( ٣ : ل ٥٨).

زۆر جاریش وا ڕوودەدا باوك، یان دایك، یان هەر کەسێکی تر خۆشەویستێکی لە شارێکی زۆر دوور لێ وەی دەژێ، کاتێ کە لەناکاو دەمرێ، یان تووشی بەسەرهاتێکی ناخۆش دێ، یەکسەر ئەو باوکە یان دایکە لە شیرین خەودا ڕادەپەڕێ و هەست بە ڕووداوەکە دەکا. . ئەم دیاردەیە زۆر ئاشکراو ناسراوە، جێگای گومان لێ کردن نی یە، لەبەر ئەوەی ڕووداوەکانی و حاڵاتەکانی یەك و دوو نین، بەڵکو لەم

[illegible] زۆر دیوەو زۆرمانیش لەسەریان خوێندوّتەوە . . .
[illegible] ڕووداوێك بە هەزاران (کیلۆمەتر) لێتەوە دوور بێ و لە [illegible] بە هەمان دەقیقەو چرکە لە شیرین خەویش دا بێ [illegible] ڕووداوەکە ببینی، یان لە مێشکت دا بزرنگێتەوە، ئەم [illegible] باوەڕی پێنەکەین و دانی پێدا نەنێین، هەر بۆیە [illegible] بابەتی ئەودیو دەروونناسی یەوە.

[illegible] تریش هەیە، ئەویش ئامادەکردنی گیانی مردووەکان و [illegible] (الأشباح)[1]، یان چارەکردنی هەندێ نەخۆشی [illegible] غەیبی و زۆر سەیر، دوور لەو شێوانەی کە زانراو و [illegible] بە ڕێگای بیربازی یەوە (التخاطر)[2] دوو کەسی دوور [illegible] قسە دەکەن، یان دۆزینەوەی ئاوی ژێرزەوی و [illegible] کردنی شوێنەکەی، بە هۆی گۆچانی هەڵهێنەرەوە [illegible] (لاستنباء)[3]. بە ڕێگای بەکارهێنانی دارێکی ڕووتەوە [illegible] دارەدەسێکی ئاسایی بتوانرێ شوێنی ئاوی ژێر زەوی لە [illegible] چەند گەزێك لەژێر زەوی‌دا دیاری بکرێ، وەك ئەو [illegible] ئێستا بۆڕی ئاوی شکاو لە ماڵەکان و کۆشك و تەلارەکان دا [illegible] کۆنکریت)و خشتەکانەوە، یان لەناو دیوارەکان دا دەدۆزێتەوەو [illegible] ئەو شیشانە بە ڕێگای جیهازی کارەبایی یەوە یان [illegible])یەوە کار دەکەن و جێگای لێکۆڵینەوەو لێدوان نین بەڵام [illegible] یەکانی ئەم گۆچانە هەڵهێنەرە، یان دارەدەستە ڕووتەچی [illegible] ئاوی ژێر زەوی دەدۆزێتەوەو مرۆڤ سودی لێوەرئەگرێ. . [illegible] گۆچانەکەی حەزرەتی (موسی) بە یەکێ لە (موعجەزەکانی) [illegible] لە قەڵەم بدەین و بێدەنگ بین لە ڕاستی‌دا، خۆ ناتوانین لە [illegible] ئەم دیاردەیەش بێدەنگ [illegible] بۆیە ئەمەش دەخەینە پاڵ کردەوەیێك لە کردەوەکانی ئەودیو [illegible]یەوە.

[illegible]یەکی تریش هەیە جێگای لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیە، ئەویش [illegible]کردنەوەی لەشە لە سەرر زەوی‌داو جولاندنەوەی لە شوێن خوێ‌داو [illegible]کردنەوەی لەلایەن یەکێ لەوانەی بەم کارە هەڵ ئەسن و [illegible]یان هەیە لەم بوارەدا، بەبێ ئەوەی دەست لە لەشەکە بدا، [illegible] شتێ هەڵی بگرێ، بەڵکو تەنها بەسەیرکردنی لەشەکەو زیاد [illegible]بوونەوە لێی، تا لەناکاو هەر لە خۆیەوە بەرز دەبێتەوەو لە ئاسمان [illegible].

ئەم ڕرووداوانەو دیاردەیانە، زۆر جار ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکان [illegible]یان نووسن، بەتایبەتی ڕۆژنامەو گۆڤارە زانستی یەکان و ئەکادیمیەکان) یش جاری وا هەیە ئەم ڕووداوانە بڵاو دەکەنەوە. [illegible]ڵام ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکانی تریش زیاتر بایەخ بەم ڕووداوانە [illegible]دەن و بە ڕووداوی (واقعی)و ڕاستی یان لە قەڵەم دەدەن. هەر چەندە ڕووداوەکان زۆر نا ئاسایین.

لێکدانەوەی زانستی و دەروونی ئەم ڕووداوانەو باوەڕپێکردنیان لەلایەن خەڵکی یەوە، وا شی دەکاتەوە کەوا خەڵکی حەز لە بیستنی شتی سەیرو نامۆ دەکەن، خۆ یاساکانی سروشتیش توانینی لێکدانەوەیانی نی یە. . لەلایێکی ترەوە دراساتی زۆریش هەیە لەسەر بوونی هێزێکی نادیارو بەتین، لە ژیانی مرۆڤ دا بە جۆرێك کەوا ئەو هێزە نادیارانە لە ناخی مرۆڤ دا دەتوانن ئەم ڕووداوانە ڕوون بکەنەوە.

لە ساڵی ١٩٦٧دا لەرینەوەیکی سەیر لە لایەن (جیهازێکی) زۆر تازەو ئاڵۆزەوە لە یەکێتی سوڤێت دا تۆمارکرا لە ئەنجام دا ئاشکرا بو کەوا ئەم لەرینەوەیە لە ئەنجامی تێپەڕبونی (بیربازیی) دوو کەسەوە بووە لەنێوان مۆسکۆو لینینگرادا . وەڵام دانەوەی مێشکی ئەو کەسانەی لە دوورەوە نامە هێمایی یەکانیان وەردەگرن، زانا سۆڤێتیەکان دەڵێن، کەوا توانیویانە هێماکانی (رموز) نامەکان بە هۆی ئامرازەکانەوە هەڵ وەشێننەوەو تێیان بگەن. هەروەها توانیویانە قسەکانی نێوان ئەو دوو کەسە لە مەسافەی (٦٠٠) شەش سەد کیلۆمەتردا کە بە ڕێگای بیربازی‌یەوە وتوویژیان دەکرد تۆمار بکەن (١ : ل ٥).

(دریك) سروشتی دیاردە گیانی‌یەکانی دابەش کردوّتە سەر:

أ ـ پەیوەندی‌کردن لەگەڵ گیانە کۆچ کردووەکانی ئەو دونیا.

ب ـ پەیوەندی‌کردنی هۆشیی، کە دەبێ تاك توانینی پەیوەندی‌کردنی هەبێ لەگەڵ یەکێکی تردا، هەرچەندە دووریش بێ لێوەی و بە بێ ئامرازە ماکی‌یە (المادية) زانراوو ناسراوەکانی پەیوەندی‌کردن.

ج ـ جوولاندنەوەی لەشەکان و کارتێکردنە سەر لەشە مایەکێتی‌یەکانی‌تر بەبێ دەست لێدانیان.

د ـ تاکێك زانینی دوارۆژ و خوێندنەوەی رابوردوی ژیانی.

ه ـ باوەڕکردن بە تارمایی‌یەکان . . (الأشباح).

و ـ دیاری‌کردن و دەست نیشان کردنی شوێنی ئاوی ژێر زەوی بە هۆی گۆچانە هەڵهێنەرەکانەوە. (٢ : ل ١٩٤).

دەربارەی بواری ئەودیو دەروونناسی‌یەوە. هەرچەندە هێشتان جێ‌پێی خۆی نەکردوّتەوە لە ڕیزی زانستی‌یەکان دا وەك زانینێکی تاقیکراوە، سەرەڕای ئەوەش سرنجی زوربەی زۆری دەروونناسەکانی ڕاکێشاوەو جێگای توێژینەوەیانن.

( دریك) دەڵێ : « پێویستە پەنا ببردرێتە بەر ڕووکاری زانستی دروست لە جیاتی ئەو گومان کردنانەی لە دەوروبەری حەڵقەیێکی بەتاڵ دا دەسورێنەوە هەندێ لە دیاردەکانی کە بینراون لێکدانەوەیەکی گونجاومان بۆ نەدۆزیوەتەوە، هەر بۆیە ناتوانین لێکیان بدەینەوە وەك بەرچاو دەکەون.

(ڕاین) J.B.Rhine لە هەندێ لە تاقیکردنەوەکانی‌دا بۆی دەرکەوتووە کەوا هەندێ کەس هێزی تایبەتیان هەیەو بەو هۆیەوەش هەندێ زانیاری‌یان لا دروست دەبێ کەوا لە سەروی ئاستی هەستی مرۆڤایەتیەوەیە. ئەم بوارە وەك پێویست بایەخی پێ نەدراوە، ئەم بایەخ نەدانەش دەگەڕێتەوە بۆ گرانی و قورسی توێژینەوە زانستی‌یەکانی ئەم

بواره ئەمە لەلایێکەوە، لە لایێکی تـرەوە دەروونناسەکانیش لایەنگیری ئەوە ناکەن دراسەت لەسەر شتی تەم و مژاوی بکرێ (٢ : ل ١٩٨)

**سەرەتاییکی مێژوویی:**

زانایانی دەروون لە دێر زەمانەوە تێبینی هەندێ دیاردەی سەیرو نامۆو تەم ومژاوی‌یان دەکردو سەریان سوور مابوو بەرامبەر ئەو دیاردە سەیرانەو دوور لە توانینی لێکدانەوەی هۆشیی. کەواتە بە شێوەیێکی سروشتی یان زانستی لێك نەدەدرانەوە، بەڵکو پێویستی‌یان بە جۆرە لێکـدانـەوەیێکی ئەفـسـانـەیی یان غەیبی هەبـوو دوور لە هەمـوو لێکدانەوەیێکی زانستی‌یانە. هەندێ لە زانایانیش هەوڵیان دەدا جۆرە لێکدانەوەیێکی مام ناوەندی‌و گونجاویان بۆ بدۆزنەوە، وەك ئەوەی گوایا گیانی مرۆڤایەتی خاوەند تایبەتەکانی خۆیەتی‌و تا ئێستا دەست نیشان نەکـراون و هەنـدێ هێـزی غەیبی‌یش هەن، هۆشی مرۆڤـایـەتی‌و ئامێـرەکـانی زانستی توانینی ئاشکـراکـردن و دەست نیشـان کردنیـانی نی‌یە. وەك ئەو لێدوانانەی لەسەر هۆیەکانی نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان دەکـران، ئایـا هۆیـەکـانی پەیـوەنـدی‌یـان بە شەیتانەوە هەیە یان هەر شتێکی سروشتی‌یە، بەتایبەتی لە چەرخی هەژدەیەم دا ئەمەش بۆتە هۆی دەسـت کردن بە تۆژ یـنـەوەی بەرنـارمـەیی، بە ئامـانـجـی ئاشکـراکـردنی سەرچـاوەو سروشتی هەنـدێ لە دیـاردە لە هۆش بە دەرەکان، کە مرۆڤ پێیان هەڵ دەسان و جێگای سەر سوورمانی هۆش بون بۆ نمـونـە دەتـوانیین ئەم جۆرە ڕووداوانـە بخـوێنینەوە لە کتێبی (دەروونـنـاسیی نەزانـراو) ( علم النفس المجهـول) نووسینی (امیـل بواراك Emile Boirac) دا، کە لە ساڵـی ١٩٠٨ لەکـەڵ کۆمـەڵـێ تۆژ ینـەوەی‌تـر کەوتـە ڕوو کە لە ساڵانی ١٨٩٣ و ١٩٠٣دا لە چاپ درابوون ئەم نووسینانە دیاردەکانی سەرووی دەروونی‌یان باس دەکرد (٤ : ل ٢).

لە ناوەنـد زانـا ناسـراوەکـانـی ئەم بوارەدا چاوەمـان بە ناوی (شـارڵ ڕیشێ)ی فەرەنسی‌و (ڕاین)ی ئەمـریکی دەکـەوێ‌و ئەم دوو زانایانە لە بواری ئەودیو دەروونناسی‌دا تۆژ ینەوەیێکی زۆریان هەیە نۆشـداری[٤] دەروونـنـاسی ، شارڵ ڕیشێی فەرەنسی لە گۆرەپـانی ئەودیـو دەروونـنـاسـی‌دا بڵاوبـوەوە دوای لە چاپ دانی کتێبـەکـەی Letraite demê tal Psychigue لە ساڵی ١٩٢٢دا، پاشان بە زمانی ئینـگـلیـزی چاپ کرایـەوە بە ناوی (سی ساڵ لە تۆژ ینـەوەی دەروونی)دا.

(ڕیشێ) پێش زانـا ئینگلیـزەکـان بەردی بناغـەی ئەم زانستی‌یـەی دامەزراندوە. لە زانا ئینگلیزەکانی ئەم بوارە (گۆرنی)یە Gurney . لە گەڵ (مایرز)و Myers و کرووکس Crookes .

ڕیشێ لە پێشـەکی کتێبـەکـەی‌دا دەڵێ: «ئەوانـەی بە تەمـان و چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لەم کتێبەدا چاویان بە ژمارەیێك بیرکردنەوەی تەم و مژاوی بکـەوێ لەسـەر دوا ڕۆژی مرۆڤ و ئەفـسـانـەو دەروێشایەتی تووشی هەناسە ساردی دەبن من هەوڵ دەدەم شتێکی زانستی بنووسم نەك خەون. هەر بەم پێ‌یە من خۆم دەبەستمەوە بە ڕاستێتی‌و لێکدانەوەی دروستەوە.

ڕیشێ لە نووسینەکانی‌دا هەوڵی داوە سێ لایەن لە دیاردەکان ڕوون بکاتەوە:

١ - بینین (استبصـار): توانینی هەستکـردنی جیـاواز لەگـەڵ توانینی سروشتی زیندودا.

ڕیشێ سوورە لەسەر بوونی ئەم دیاردەیەو، لەو باوەڕەی مرۆڤ خاوەنی (توانینێکی بە دەر)ەو (خارق) کۆمەڵێ نموونەشی بۆ ئەم بۆچوونەی هیناوەتەوە.

٢ - تیلیکانیـس: Telekinesis :

دیمـەنێکـە لە دیمـەنـەکـانی گواستنەوەی مایەکێتی کە جیاوازە لە گەڵ هەمـوو توانینـە ناسـراوەکـان دا ئەمەش ڕوو دەدا بەبێ دەست دانە ئەو شتەی کەسەکە مەبەستی جوولانەوەیەتی‌و لە دووریش یەوە ڕادەوەستێ ئنجا ئەگەر شتەکە مرۆڤ بێ یان شتێکی مایەکێتی بێ، لە زرووفێکی تایبەتی‌دا ئەنجام دەدرێ.

٣ - هینانە بەرهەمی مایەکێتی ئۆکتوپلازم Ectoplasm

ئەم دیاردەیەش بە لەشایەتی (التجسد)یش ناسراوە Materialization ئەمەش ئەوە دەگەێنێ کەوا مایەکێتی لە لەشی مرۆڤێکەوە دەردەپەڕێتە دەرەوەو دیمەن و وێنەی بوونی مایەکێتی وەردەگرێ، وەك کەل و پەل و زیندەلەشەکان.

ڕیشێ هەوڵی داوەو خۆی خەریك کردوە بە تۆژ ینەوەو دراسەت کردنی نەست یان ئەودیو هەستەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی ڕێبازی تۆژ ینەوەی زانستی‌یانە، بۆ زانینی ئەوەی کەوا ئەم دیاردە نەستی‌یانە دەگەڕێنەوە بۆ مرۆڤەکە بۆ خۆی یان بۆ هێزێکی دەرەوە. کەوا مرۆڤ دەستی تێدا نی‌یە.

ڕیشێ، هەرچـەنـدە زوربەی تاقیکردنەوەکانی، خۆیان ڕانەگرتوە و نەچەسپاون وەك ڕاستی‌یە ڕانستی‌یەکان، بۆ ئەوەی بڕیاری بوونی دوو ڕاستێتی گەورە ئەنجام بدەن، ئەم دوو ڕاستی‌یانەش ئەمانەن:

١ - هۆشی مرۆڤ کەرەستـەی‌تـری هەیـە جگـە لە کەرەستـە ناسراو و زانـراوەکـانی زانیـاری کە جیـاوازن لەگـەڵ کەرەستـە هەستی‌یـە ئاسایـیـەکـان دا، وەك بینین و (الاستبصـار)[٥] لەگەڵ کرداری (پسی) psi - factor (مـەبـەست لەکـرداری (پسی) دیـاردەکـانی سەروی سروشتی‌یەوە کە پەنا دەبەنە سەر هۆش.)

٢ - (تجسد) لە شایەتی، کەواتە بوونی هێزەکان و چوونەسەر دیمەنی لەشێکی مایەکێتی‌و ڕەفتارکردنیان وەك بابەتی‌یە مایەکێتی‌یەکان شتێکی چەسپاو و ڕاستە.

بەڵام ڕیشێ خۆی نەی‌تـوانیـوە لێکـدانـەوەی باوەڕپێ‌کـراو بۆ ئەم ڕاستی‌یانە بێنێتەوە (٤ : ل ٣).

... راین J.B Rhine کۆمەڵێ دراساتی تاقیکردنەوەیی دەربارەی ... دەروونناسی‌یەوە کردووە و لە زانکۆی (دیوك) لە ولایەتی ... کلرولانیا)ی ئەمریکی‌دا، (ڕاین) توانیویەتی ئەودیو ... وەك بابەتێك بخاتە سەر ڕێرەوێکی تازەوە، وەك ... کردنی دیاردەکانی ئەودیو دەروونناسی بۆ تاقیکردنەوە ... یەکەن بە شێوەیێکی وردو دڵنیاوبوون لەسەر ڕاستی‌و ... ونیان.

... هەڵسەنگاندنەکان:

... ی هەموو ئەو تۆژینەوانەو دراساتانەی لەسەر ئەودیو ... کراوە، ئەو ئەنجامانەی داویەتیە دەستەوە دەڵێن سەرەڕای ... . تا ئێستا کۆمەڵێ پرسیار ماونەتەوە بێ وەڵام دانەوە، ... ەزای بەرنامەیی‌تی تۆژینەوەکانی و ئەو گومان لێ‌کردنانەی ... پشتیان دا دەسوڕێنەوە، بەڵێ تا ئێستا ڕاو بۆچوونی هاوچەرخ ... ی ئەودیو دەروونناسی‌دا خۆی لەم چەند پرسیارانە، دەنوێنێ: ... نەتوانین بدوێین لە سەر ئەنجامە زانستی‌یەکانی بوارەکانی تۆژینەوە ... یەکان؟ ئایا دیاردەی لە هۆش بەدەر (الخارقە) هەیەو ڕاستێتی ... بەدەرانە دەچەسپێندرێ بە جۆرێکی وردو تا ببێتە شتێکی ... کراو؟ ئایا ئەودیو دەروونناسەکان کە لەگەڵ یەکتردا جیاوازی‌یان ... ە ڕاکانیان دا، بەتەواوی ڕێك کەوتوونە لەسەر ئەم دیاردەیانەی ... سەری دەکەن؟

... دیاردەی ئەودیو دەروونناسی هەیە، بە ئەودیو دەروونناسی ... ری‌و لە ڕاستیش داو لە (واقع دا) لە فرت و فێڵ و ... خەڵەتاندن و یاری‌کردنی ئەفسونانە بەدەرنیین؟

... ەگەر بێت و سەیری هەندێ دیاردەی وەك سایکۆکانیسس بکەین psychokinesis کە بوونە مایەکێتی‌یەکان بەبێ (واسطە)ی مایەکێتی‌و ... دەست لێدانی ئەو لەشانە لەسەر زەوی بەرز دەکاتەوە، بە پێی ... تی تاقیگەکان (المختبریة) دەگەینە ئەنجامی زۆر لاوازو ئاوات بڕ ... وونە ڕاکانی کۆمەڵەی (بەلجیکی) کە بایەخی بە دراسەتی ئەم جۆرە دیاردانە داوەو ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە زانایان و پسپۆڕانی ... اون لە بوارە جۆراو جۆرەکانی زانستی‌دا هەمویان سوورن لەسەر ئەوەی کەوا ئەم دیاردانە بەبێ (واسطە)ی مایەکێتی ڕوو نادەن.

جولیان توندریو) Julien Tondriau لە کتێبەکەی Fakiris دا کە لە ... ی ١٩٥٢ نووسیویەتی دەڵێ:

هەموو ئەم دیاردە ئەودیو دەروونناسی‌یانە جۆرە فرت و فێلێکن، بە ڕێگای جۆرە داوەپەتێك و جیهازە ئۆتۆماتیکەکانەوە، یان کیمیاویەکانەوە ئەنجام دەدرێن هەر لە ساڵی ١٩٣١دا خەڵاتێکی گەورەی (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار فەرەنکی لە پاریس داندرا بۆ هەر کەسێ بتوانێ خامەیێك (قلم) کە دایان نابوو لەسەر پارچە جامێك دا بی جوڵێنێتەوە، دوای ئەوەی زاڵ بوو بوون بەسەر هەموو زرووفەکانی دەورو بەری خامەکەدا، کەسێك نەی‌توانی کارەکە ڕاپەڕێنێ.

دوای ئەم ئەنجامە سەلبی‌یانە، پێویستە بزانین ( روبرت ئامادۆ) چۆن بۆ مەسەلەکە دەڕوا. (ئامادۆ) دەڵێ : کەس ناتوانێ بە یەکجاری‌و بەبێ گومان کردن بڵێ ئەم دیاردە ئەودیو دەروونناسی‌یانەی لە سەروی سروشتی‌یەوە کە لە نێوانە مایەکێتی‌یەکان دا ڕوو دەدەن، نیین و ڕوو نادەن. . ئەو تاقیکردنەوانەی لەم بوارەدا کراون و تاقیکاری ناسراو گەورەو گەورەش تاقی‌یان کردۆتەوە، بەڵگەیێکی قسەبڕیان نەداوەتە دەستەوە لەسەربوونی دیاردەمایەکێتی‌یەکانی سەروی سروشتی‌یەوە، ئنجا ئەم دیاردە مایەکێتی‌یانە لە ڕێگای تاقیکارە گەورەکانەوە، یان غەیری ئەوانەوە نەگەیشتوونەتە ئەنجام و ئێمەش تەنها تاقیکردنەوەییکمان نەدیوە دووپات کرابێتەوە لە هەمان زرووف و مەرجەکانی یەکەم جاری تاقیکرانەوەکەدا، کەوا پسپۆڕەکان پێی قایل بن، لەگەڵ ئەمەش دا ناتوانین ئینکاری بوونی دیاردەکانی سەروی سروشتی‌یەکان بکەین. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانیین و دان بەو ڕاستی‌یەدا بنێین کەوا هیچ بەڵگەیێك نی‌یە، بەڵکەیێکی بن بڕ لەسەر ڕوودانی دیاردەیێکی بەم جۆرە.

لە ئەنجامی تۆژینەوە دەروونیەکان دا هیچ دیاردەیێکی ئەودیودەروونناسی لەم جۆرە بابەتانە نەماون کەلکی دراسەتی زانستی‌یانەیان هەبێ، تەنها دیاردەکانی، پێزانینی[٦] سەروی هەست کردن نەبێ.

هەروەها (ڤیکونت برتران دی کریساك) لە کتێبەکەی‌دا بە ناوی (الپاراسایکولوجی والعلم) (ئەودیو دەروونناسی‌و زانستی)، ساڵی ١٩٤٨. گە یشتۆتە ئەوەی کەوا تاقیکردنەوە دەروونی‌یە کانی ڕابوردو لەم بوارەدا سەرکەووتو نەبوونەو گەلێ کەم و کورتی‌یان هەیە. لەساڵی ١٩٤٦ (دوکتور ڕاین)یش هەمان ڕای هەبوەو وتویەتی:

زۆر زەحمەتە بەڵکو مەحاڵە بەو تۆژینەوەیانەی تا ئێستا کراون بتوانین بەڵگە بێنینەوە لەسەر ڕوودانی سایکۆکا نیس (pk)، لەبەر ئەوەی زەبتی تەواو و هەوڵ دان و تێبینی تەواویان بۆ نەکراوە. بۆیە پێشنیار ئەکا دراساتی تازە بکرێت و بەرنامەی وردتریانیش بۆ بەکاربهێنرێ. (٤: ل ٥ ـ ٦)

هەندێ لە زانایان و دەروونناسانیش وا دەبینن کەوا کەمی دراسات و تۆژینەوەو هەوڵدانی خستنە ژێرباری ئەم جۆرە دراساتانە بۆ تاقیگەکان و تاقیکردنەوەیان بە ڕێگای تاقیگەکانەوە، نابنە کۆسپ و بەڵگە بۆ باوەڕپێ‌نەکردنی ئەم دیاردە بەدەرانە لەبەر ئەوەی مێژوی کۆن و تازە پڕە لەم جۆرە بابەتانەو مرۆڤیش هیچ کاتێك چاوەڕانی نەکردووە شتی وا ببیستێ یان بیانبینێ، بە جۆرێك نەتوانێ ڕوونیان بکاتەوە، یان هۆیەکانی بزانێ، بەڵام ڕووداوەکە ڕووی داوە، بتەوێ یان نەتەوێ.

ئەنجامەکان:

دوای ئەم هەموو تۆژینەوانەو دراساتانەی لەم بوارەدا کراون دەبێ بگەینە چ ئەنجامێك؟ ئایا دەبێ ئەوە بسلمێنین کەوا ئەودیو دەروونناسی زانینێکە وەك زانینەکانی ترو تایبەتێتی بەرنامەیی و بابەتێتی زانستییانەی هەیە لە ڕووی دانانی گریمانەو[7] تاقیکردنەوەی گریمانەکانەوە؟ ئەگەر ئەودیو دەروونناسی مەرجەکانی تاقیکردنەوە زانستییەکانی بەسەردا (تطبیق) بکرێ و هەر بە گێرانەوەی قسەی ئەم و ئەو باوەڕیان پێنەکرێ ئەوا دەتوانین بیخەینە خانەی زانستییەکانەوە، لەگەڵ ئەوەش دا ئەودیو دەروونناسەکان تا ئێستا بەردەوامن لەسەر دراسات و تۆژینەوەکانیان لەم بوارەدا و ئەمەش بە پێچەوانەی بەردەوام بوونی تۆژینەوە زانستییەکانەوە نییە.

زوربەی زۆری ئەودیو دەروونناسەکان باوەڕیان بە دیاردەکانی ئەودیو دەروونناسی هێناوە کە پەیوەندییان بە زانینی سەروی هەستییەوە هەیە Extra - sensory - perception ، کە هێمای Esp) ی بۆ دانراوەو هەوڵی شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم دیاردانەو زرووفی پەیدابوونیان دەدەن.

ئەو دیاردەیانەی سەروی هەستکردن کە (ڕاین) بایەخی پێدابوون بریتیبوون لە بابەتی بیربازێتی (التخاطر) Telepathy لەگەڵ بینین (الاستبصار) clairoyance دا .

هەرچەندە بدوێین لەسەر بابەتی ئەودیو دەروونناسیو تاقیکردنەوەکانێ باوەڕناکەم وا بە هاسانی سوودی لێوەربگرین. لە بەرئەوەی تا ئێستا زانیارییێکی بیردۆزانەی تەواومان لەسەری نییەو ئەوی هەشە تا ئێستا هەموو تەم ومژاوین و بە تەواوی خۆیان نەچەسپاندووە. بە هەرحاڵ ئەم بۆچوونەمانیش ئەوە ناگەیێنێ پشتی لێبکەینەوەو لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشێین و پاڵ بدەینەوە تا وڵاتە پێشکەوتووەکان لەناکاو وەك بوارەکانی تری زانستی غافل گیرمان بکەن.. هەر بۆیە خەریکە بابەتی ئەودیو دەروونناسیش جێگای خۆی بکاتەوە لە بواری شەڕی دەروونیدا بەتایبەتی لەنێوان یەکێتی سۆڤێیت و ئەمریکادا.

ئێمەش لێرەدا لەم نووسینەمان دا چەند لاپەرەییێکمان تەرخان کرد، وەك بەردێکی بناغەی ئەم بابەتە بە زمانی کوردی ، ئومێدەوارین ڕۆشنبیران و نووسەران و زانایانی کورد دوای ئێمە بەتایبەتی: ئەوانی شارەزاییان هەیە لەم گۆرەپانەدا بایەخی تەواوی بدەنێو شان بەشانی بوارە زانستییەکانیتر پەرەی پێبدەن.

ئەم هەوڵدان و تەقەلایانەی ئەمرۆ لە چەرخی زانستیو ( هۆشی ئەلکترۆنی)دا بەردەوام بن دەگەینە ئەوەی وشەی (ئەودیو) لەبەردەم (دەروونناسی) لابدرێو وشەی (ئەودیو دەروونناسی) ببێ بە (دەروونناسی)ی تەواو.

## سەرچاوەکان


١ - اوستراند، شيلاو شرور، لين « علم نفس الحاسة السادسة»

دار الطليعة - بيروت ط ١. ١٩٧٩ ترجمة هنرييت عبودي.

٢ - دريك، ريچارد. م. «علم نفس الشواذ» ترجمة الدكتور ابراهيم يوسف المنصور - كلية التربية - جامعة بغداد الترجمة غير منشورة وبدون تأريخ.

٣ - مجلة المصور - المصرية العدد ٢١٣٢٠٢ فبراير ١٩٨٦

٤ - المنصور ، ابراهيم يوسف « الضواهر الپاراسايكولوجية بين الحقيقة والخيال» جامعة بغداد - كلية التربية. الدراسات العليا - البحث غير منشور ١٩٨١/٥/٩

٥ - المنصور، ابراهيم يوسف « التصور وقابلية التصور والمحاكمة العقلية » ٢٦ شباط ١٩٧٨ البحث غير منشور

٦ MARX , MELVIN.H. «Introduction to psychology.» new york MANiLLAN Publishing co. INC . 1976


**پەراوێز:**

**(١) زاراوەی «تارمایی» مان بۆ الشبح داناوە.**

**(٢) زاراوەی (بیربازی)مان لەجیاتی التخاطر داناوە ، کە واتە لە جیاتی Telepathy .**

**(٣) «گۆچانی هەڵهێنەر» مان لەجیاتی زاراوەی عصا الاستنباء کە واتە dowsing داناوە.**

**خەبیریش زاراوەی (گۆچانی پشکنین)ی پێشنیارکردووە.**

**(٤) نۆشدار: الطبيب.**

**(٥) الاستبصار یان (التصور) imaging شارەزاییەکە دەربارەی زانین و بینینی شتێك ڕووی نەدابێو هەستی پێبکەی ئەم کردارە لەگەڵ شارەزاییە بابەتییەکان دا (الموضوعية) ئەو جیاوازییەی هەیە ئەویش لێرەدا هەڵوێستی بە ئاگاهێنانەوەی (الموقف التنبیهي) یەکسەری تێدا نییە. کەواتە کردارێکی هۆشییە وەك هەموو کردارێکی هەست کردن، لە ئەنجامی شارەزاییدا. لێرەدا لە کرداری بینین (الاستبصار) سەیری شتەکە ناکەین بەچاو بەڵکوو بە (چاوی هۆشی) سەیریدەکەین. (٥: ل ٥).**

**- خەبیر (ڕوون ڕوانین)ی پێشنیار کردووە.**

**(٦) پێزانین: الادراك.**

**٧) گریمانە: فرضيە.**

# الباراسايكولوجي

## *parapsychology*

الدكتور عبدالستار طاهر شريف

[illegible] حث الى موضوع الباراسايكولوجي وذلك بتعريف [illegible] باراسايكولوجي . هذا الموضوع الذي يكتنفه [illegible] درجة كبيرة . وسبب هذا الغموض يعود الى عدم وجود [illegible] موضوعية لدينا حتى الآن بحيث نتمكن من وضع [illegible] سايكولوجيا.

[illegible] حث كشف النقاب عن ظاهرة الباراسايكولوجيا كظاهرة [illegible] فوق طبيعية، هذه الظاهرة التي تنضوي تحت واجهة [illegible] قوى الطبيعية للروح او النفس. كما ويلقى الضوء على [illegible] الظواهر الباراسايكولوجية التي لاتزال بحاجة الى فهم [illegible] علمية دقيقة لذلك نرى بان موضوع الباراسايكولوجيا [illegible] من الموضوعات التي أخذت حيزا كبيرا وواسعاً من [illegible] الشرق والغرب بها، ومهما يكن فالبعض من العلماء [illegible] باراسايكولوجيا ينطوي على وقائع ملموسة وثابتة، رغم [illegible] العلمي للعديد من ظواهره.

[illegible] ويتطرق البحث الى بعض ظواهر الباراسايكولوجيا المنتشرة [illegible] منذ مئات السنين.

[illegible] هتم البحث بطبيعة الظواهر الروحانية كالاتصال بالأرواح [illegible] الى العالم الآخر، والاتصال العقلي بين شخصين بعيدين [illegible] لآخر وبدون وسائل الاتصال المادية المألوفة، وتحريك [illegible] والتنبوء عن المستقبل والاعتقاد بالاشباح وتحديد مواقع المياه بواسطة عصا الاستنباء، مع تفسير لكثير من الظواهر التي تعتبر خارقا للطبيعة.

ويتطرق البحث الى عدد من الدراسات الاجنبية التي قام بها علماء معروفون في ميدان علم النفس، كدراسة الاستبصار والتليكانيسس Telekinesis وهي شكل من اشكال النقل المادي الذي يختلف عن اي من القوى المعروفة، وهو يحدث بدون تماس وعلى بعد، وهو يشمل البشر والموضوعات المادية الاخرى، وتحت ظروف خاصة. ودراسة اللاشعور او ماوراء الشعور.

وبحث موضوع ظاهرة (التجسد) وتنسيب هذه الظاهرة الى الاوكتوبلازم، كظهور ارواح الموتى او حتى الاحياء ، او خاصة في الظلام الحالك او وجود أثار تترك وتدل على وجود الارواح والاكتوبلازم مادة يفترض وجودها وهي من نوع غير معروف وتمكن مشاهدتها في الضوء الخافت، وهي تنفصل عن جسم الوسيط وتأخذ اشكالا تشبه وجود الادميين او ايديهم او اجسامهم.

وقد عالج راين العالم الامريكي الظواهر فوق الحسية معالجة احصائية، مما يسهل اجراء التجارب على هذه الظواهر تحت ظروف مختبرية دقيقة كما ويسهل تفسير النتائج في ضوء الاحتمالات.

وفي الختام يتطرق البحث الى الانتقادات الموجهة الى الباراسايكولوجيا مع اهم النتائج التي توصلت اليها بعض البحوث العلمية حول هذه الظاهرة

# بەنداو

**- ئامادەکردنی -**
**ئەندازیار: رزگار صالح**

گومانی تێدا نی یە کە ئاو لە گرنگ ترین پێك هێنەرەکانی ژیانەو رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لە بژێوی مرۆڤ و سەرتاپای زیندەوەران دا. . . لەبەر ئەوە هەر لە زووەوە مرۆڤ هەوڵی داوە بەپێی تواناو پێویستی خۆیو لەپێناوی دابین کردنی گوزەرانیدا بەربەرەکانی رووداوە سروشتییە جۆربەجۆرە پر مەترسی یەکانی کردووەو لەپێناوی مانەوەیدا بەهەزاران مێشکی داهێنەرو بلیمەت ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووە. . . یەکێکیش لەو دەست کەوتە گرنگانەی مرۆڤ کە بەدیهێناوە بیرۆکەی گل دانەوەی ئاوە بە هۆی بەنداوەوە،[1] کە ئێمرۆ لە گەورەیی و قەبارەو پتەوی و دەست کەوتی و بەتەمەنی دا گەیشتۆتە ئەوپەری تەکنۆلۆژیا. . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نووسین لە بارەیەوە هەروا ئاسان نی یە، بەلام ئەوەی لێرەدا دەمەوێ باسی لێوە بکەم پوختەیەکەو زیاتر باسێکی گشتی لە خۆگرتووەو ئەمەش و نیازەی لە سنووری باسێکی زانستی رووت دەربچم و بە شێوەییکی وا، وا لە خوێنەر بکەم شارەزایی ییکی کەم لە جۆرو سوودو چۆنیەتی دروست کردنی بەنداودا پەیدابکات. .

**مەبەستەکانی دروست کردنی بەنداو**

(١) خۆراك لە سەرووی ئەو پێویستیانەوەیە کە مرۆڤ بەردەوام پێویستی یەتی و لە رێی کشتوکاڵەوە هەوڵی بۆ دەداو دابینی دەکات، ئەمیش لە رێی بارانەوە، یاخود هەندێ سەرچاوەی کەمەوە توانیویەتی بەشی خۆی مسۆگەر بکات، بەلام کەم بارانی ساڵێك، کەم دەرامەتیو برسێتی و گرانی بەدەمەوە بووە. جا هەر لەم پێودانەوە لە رێی گل دانەوەو هەڵ گرتنی ئاوەوە توانیویەتی متمانەی لەسەر ئاوی باران نەمێنێ و ئاوی تەواو مسۆگەر بۆ هەموو کێڵگەکانی مشوور بخوات. .

(٢) چاکردنی زەوی یە کشتوکاڵی یەکان لەو شۆرەکاتەی[2] کە هەیەتی، پێویستی بە ئاوێکی ئامادەو نەبراوە هەیە بە جۆرێك دەستی بەسەردابگیرێ. .

(٣) دڵنیاکردن و پاراستنی دانیشتوان و خانوو و بەرەکانیان لەو لافاوانەی کە لە ئەنجامی بارانێکی زۆرو لەپڕا روودەدەن و روودەکەنە ناوچە نیشتەنی یەکان، ئەمەش پێویستی بە گل دانەوەو قەدەغەکردنی ئەو لافاوە هەیە. .

(٤) دوای بەکارهێنانی «خەڵووز، نەوت، گازی سروشتی، بۆ بەدیهێنانی وزەی کارەبادا، سەیرکرا ئاو لە بارترین و هەرزانترین سەرچاوەیە، بەتایبەتی ئەگەر ولاتەکە سەرچاوەیێکی ئاوی دەوڵەمەندو نەبراوەی لەخۆگرتبێ. . ئەمەش چونکە بە ئاسانی بەکاردێت و بە ئاسانیش دەستی بەسەردا دەگیرێو، هیچ پاشماوەیێکی پیس و ترسناکی لەدوا جێ نامێنێ کە دەوروبەرەکە پیس بکات، ئەمەش سەرەرای ئەوەی هیچ لەو ئاوە کارنابێ و چۆن روودەکاتە ئیستگەی بەدیهێنانەکەوە، هەروا لێی دەچێتە دەرەوە. . ئەو ئیستگەیەش پێی دەوترێ «ئیستگەی کەهرۆئاوی»[3] . .

(٥) سەرچاوەییکی هەمیشەیی و دەوڵەمەندە بۆ بەکارهێنانی ئاوی خواردنەوەدا، ئەمەش دوای ئەوەی ئیستگەی پالاوتن و پاکژکردنەوەو تۆری دابەش کردنی بۆ دەخولقێنرێ.

(٦) رێرەوێکی لەبەرو بێ مەترسی یە لەلایەنی کەشتی رانی یەوە. .

(٧) ناوچەکەی دەبێتە هاوینەهەوارێکی چوار وەرزەو شوێنی گەشت وگێل.

• حەوزێکی لەبارو گونجاوە لە پەرەپێدانی سامانی ـسی د..

* * * *

ـێش ئەوەی بێینە سەر پێداویستی یەکانی نەخش کێشان و[٤] ـیست کردنی بەنداو. پێویستە بەراووردێکی سەرەکی و ـعی ی نێوان نەخش کێشانی پرۆژە ئاوی یەکان و پرۆژە ـرەیی یەکانی تر بکەین....

ـە پرۆژە ئاوی یەکان دا بەتایبەتی بەنداو، توانا و پتەوی و ـرگەگرتن و تەمەن و چوستی و چالاکی، متمانە دەکەنەسەر بارو ـحی ئەو ئاوەی ڕووی تێدەکات... دەتوانین بڵێین ئەم ـرۆژە زیندوون... چونکە ئاو هەمیشە لە گۆڕان دایەو دەمێ ـدەمێ کەمە، هەردەمە بەگوڕم و تەوژمێکی تایبەتی یەوە ـرێ دەنوێنێ و بێگومان بارو هەڵس وکەوتی پرۆژەکەشی لە ـگۆڕان دایە... ئەمە ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە ئاو شتێك نی یە ـژێر دەسەڵاتی مرۆڤ دا بێ و بتوانێ بە ئارەزووی خۆی ـەی سووڕێنێ ساڵ هەیە بەفرو بارانێکی زۆر ڕوو دەکاتە ـچەکەو ئاوی دەریاو ڕووبارو زێ و چەم و کانی یەکانی زیاد ـەکەن و لەوانەیە لافاوێکی زۆریان بەدەمەوە بێت و ساڵیش هەیە ـرێ برانەو چاوی کانی و چەمەکان کوێردەبنەوەو ڕووبارو ـەریاکانیش کەم ئاو دەبن... لەبەرئەوە ئەم پرۆژانە دەبێ زۆر ـە وردی و بە پێش بینی یێکی تەواوی باران و سەرچاوە ـوی یەکان و کەشی ئەو ناوچەیە نەخش بکێشرێ.... بەڵام ـرۆژەکانی تر تا ڕادەیێکی زۆر لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤ دایەو ـەی توانا و بەرگەگرتنی ئەو دروست کراوە مامەڵەی لەگەڵ دا ـەکرێ.. بۆ نموونە لە دروست کردنی بینایێك دا.. هەر لە ـەرەتاوە بۆ «بار»[٥] ێکی دیاری کراو و زانراو و مەبەست، نەخش ـەکێشرێ. واتە بەرگەگرتن و توانای ئەم بینایە زانراوەو بە هێندی ـەوەش کەرەسەی تێدا بەکار دەهێنین و زیاتر نا، لە حاڵەتی ـەکارهێنانی بیناکەش دا لەو توانایە زیاتر باری ناکەین، بۆ ـموونە ئەو بینایەی کە بۆ قوتابخانەیێك بنیات دەنرێ نابێ بە ـزووقەو ئاسن باربکرێ چونکە ڕاگیری ناکات و هەرەس دەهێنێ.. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە سەلامەتی و مانەوەی ئەم بینایە بە دەست خۆمانەوەیە.

جا لەبەرئەوە بۆ نەخش کێشانی هەر بەنداوێك گەلێ زانیاری و تاقی کردنەوە و پشکنینی تایبەتی و جیاوازمان پێویستە کە لە پرۆژەکانی تردا لەوانەیە هەرگیز پێویست نەبن.. وەك «هایدرۆلۆژیای ئەندازیاری، هایدرۆلیك جیۆفیزیك، فۆتۆگرامیتری، نەخشەکێشانی شارستانی، دەوروبەرزانی، زانستی کەلەپوور، زانستی جوگرافیای سروشتی و ئابووری، ... هتد».

* * *

**ئەو لێکۆڵینەوەو زانیاری یانەی لە نەخش کێشان دا پێویستن:**

هەروەکو لە سەرەتادا باسی مەبەستەکانی هەڵ ساندنی بەنداومان کرد، پێویستە پێش ئەوەی دەست بدەینە نەخش کێشان و جێبەجێ کردنی بەنداوەکە، بەراووردێکی ئەو دەست کەوتە گرنگانەو لەدەست چووەکان بکرێ، وەك لە خوارەوە لەدەست چووەکانمان بە شێوەیێکی گشتی دەست نیشان کردووە، جا ئەگەر دەست کەوتەکان گەلێك گەورەتر ـ زیاتر ـ بوو لە لەدەست چووەکان، ئەوا بڕیاری هەڵساندن و جێبەجێ کردنی بەنداوەکە دەدرێ و بەپێچەوانەشەوە..

ـ ئەو ناوچەیەی ئاوی بەنداوەکە دایدەپۆشێ، لەوانەیە ڕێکەوتی دەڤەرێکی کەلەپووری بە بەهاو مەزن بکات و لەناوبردنی شتێکی مەحاڵ بێ..

ـ بوونی دێهات و ناوچەی نیشتەنی لەو دەڤەرانەدا ئەمەش پێویستی بە دابین کردنی ڕێ و جێ و گوزەرانی نوێ یە لە ناوچەیێکی تردا..

ـ گۆڕینی ڕێگاوبان و هێڵی کارەباو تۆڕی ئاوخواردنەوەو گەلێ پێویستی تر بۆ ئەو ناوچەیە..

ـ کارتێکردنی ئەو بەنداوە لەسەر دەوروبەر، لەوانەیە ببێتە مەکۆی مێشوولەو مەگەزو نەخۆشی یێکی زۆر بخەنە ناوچەکەوە..

ـ کاریگەریی بەنداوەکە لەسەر ئاوی ژێر زەوی چ لە دیوی بنەوانەوەو[٦] چ لە دیوی ئاوەڕێژگەوە[٧] ...

- ئەو رووبــارەی بەنــداوەکــەی لەســەر دروسـت دەکــرێ ناوچەیێکی زۆر متمانەی ژیانی کردۆتە سەر، لەبەرئەوە پێویستە بە هێندی پێویستی‌یەکانی ئەو ناوچەیە ئاوی تەواو بە بەردەوامی بەربدرێتەوە بۆ سەر رووبارەکە. .

- کاریگەریی بەنداوەکە لەسەر گوزەرانی ماسی‌و سامانیان. . .

- پێـویستی‌یـەکـانی ئاسـایش و پارێزگاری و ئیش پێ‌کردنی‌و دەست پیاهێنانی بەردەوامی پێك هێنەرەکانی بەنداوەکە. . .

- ئەو کۆمـپــانیــایــەی پرۆژەکــە هەڵ دەســوورێنێ، ئایــا ناوخۆیی‌یە، یان دەرەکی‌یە. . ئەمەش پەیوەندی بە تێچوونی[٨] پارەی ناوخۆو دەرەوە هەیە. . .

**هەنگاوەکانی نەخش کێشانی بەنداو**

دوای ئەوەی ناوچــە ئاوی‌یــەکــە دەست نیشـان دەکـرێ‌و بە یارمـەتی هەنـدێ لەو زانسـتـانـەی ناومـان بردن، دڵنیـا دەبین لە بوونی سەرچاوە ئاوی‌یـە دەوڵـەمەندەکەو بوونی کەشێکی لەبار، هەروەهــا دوای بەراووردی نێــوان دەست کەوتـە (راستـەوخـۆو ناراستــەوخــۆ)کــان و لەدەســت چووەکــان، ئیـتــر بریــاری دروســت کردنــی دەدرێ‌و لێــرەوە قۆنــاغی نەخش کێـشــان دێتەکایەوە. . کە ئەم هەنگاوانە دەگرێتەوە. .

**هەنگاوی یەکەم:**

ئەو ئاوەی دەمانەوێت گلی‌بدینەوەو ئەو پرۆژەو پێویستی‌یانەی هەمـانــەو متمـانــە دەکـەنە سەری، لەسەر سەرچاوە ئاوی‌یەکانی ناوچـەکـە بەنـدن، لەبـەر ئەوە وردی لە پشکنین و دیاری‌کردن و پێش بینی‌کـردنی ئەو سەرچـاوانـە، دڵنیایی‌و بەردەوامیی چالاکی پرۆژەکــانمــان دەداتێ، . . . جا ئەو زانســتــەی ئەم باسـانـەی لەخـۆگـرتـووە هایـدرۆلـۆجیـایـە،[٩] کە سەرچاوە ئاوی‌یـەکانی دیــاری‌کــردووەو چۆنیــەتی مامــەڵـەکـردن لەگـەڵیـان دا، ئەم سەرچاوانەش بە شێوەیێکی گشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

(١) ئاوی سەرزەوی «Surface Water»

ئەو ئاوانە دەگرێتەوە کە لە سەر زەوین، واتە ئاوەڕۆو گوزەریان لەسەر زەوی‌یەو دیارن وەك رووبارو دەریاچەو گۆماوەکان. . یان ئەو ئەمبــاراوە سروشـتـیــانــەی کە بۆ مەبــەســتــی تایبــەتی دروست کراون. ئەمــانــە هەر هەمـوویـان سەرچـاوەی سەرەکی ئاوی بەنداوەکە دەبن جگە لەو بارانە وەرزی‌یانەی کە پێش بینی هێندو کاتەکەی دەکرێ.

(٢) ئاوی ژێرزەوی «Ground Water»

مەبـەسـت لەو ئاوانـەیـە کە لە «ئـاوی سەرزەوی» جیادەبنەوەو ئەویش لە ئەنجامی مژینیانەوەیە لەلایەن چینەکانی ئەو زەوی‌یەی کە رووی تێ‌دەکـەن و ئەو چینـە زەوی‌یـانـەش بە هێندی کێشی خۆیان لێی‌گل دەدەنەوەو لە ئەنجام دا بە رۆخەکانی‌دا دادەچێ‌و تارێ هەبێ دەڕوا، بێ‌گومان ئەم کارە بەردەوامە هێندی ئەو ئاوە زیاد دەکات و لە ئاستەکەشی بەرز دەکاتەوە. جا ئاست و نزیکی ئەم سەرچـاوانـە لەسـەر زەوی‌یـەوە لە ناوچـەیەکەوە بۆ ناوچەیێك دەگۆڕێن و لەوانەیە ئاستێکی بەرزیان هەبێ‌و بە ئاسانی مسوگەر بکرێن و لەوانەشە تەقەلاو پارەیێکی زۆری بوێت ئەگەر ئاستێکی نزمی هەبێ، جا بە شێوەیێکی گشتی ئاستی ئەم جۆرە لەسەر ئەم هۆکارانە بەندە.

* جیولوجیای ئەو ناوچەیە: کە چۆنیەتی پێك هاتنی چینەکان لە رووی ماددەکــان و پتــەوی‌و فشـەڵی‌و توانـای گل دانـەوەی ئاو دەگـرێتـەوە. ئەمـەش چەنـدە ئەو چینـانە توندو تۆڵ و سەخت و بەیـەکـداچـووبێ توانـای گل دانـەوەی ئاوێکی زۆرو بەردەوامی دەبێ‌و بەمە بەرەبەرە ئاستی ئەو ئاوە بەرزدەکاتەوەو بەپێچەوانەشەوە. .

* - بری باران و بەفر بۆ سەرناوچەکە (دەڤەرەکە)، کە زیادی‌و کەمی‌یان کار دەکاتە سەر هێندو ئاستی ئەو ئاوانە.

* رێچکەو ئاوەڕۆی ئەو ئاوانەی بە ناوچەکەدا تێ‌پەڕ دەبن.

* بوونی جۆگـەی ئاودێـری‌و پاشـاوی زەوی‌یە کشتوکاڵی‌یەکان و پاشاوی شارو دێهاتەکانی ئەو ناوچەیە.

* پلەی گەرمی ناوچەکە کار دەکاتە سەر هێندی بە هەڵم بوون.

* بوونی رووەك «خۆرسك، یان کشتوکاڵی».

ئەمانە هەر هەموویان کەم تا زۆر کاریگەریان هەیە لەسەر ئەو ئاوانـە، جا ئەم ئاوانـەش بە گەلێ شێـوە سوودیـان لێ وەرگیراوە ئەویش لە رێی کارێزو بیرەئاسایی‌و ئیرتیوازی‌یەکانەوە. .

جا ئەوەی لە بواری نەخش کێشانی بەنداوەکەدا گرنگەو رۆڵی خۆی دەبینێ هێندی ئەو شێوانەیەو ئەو ئاوانەی کە هەر سوودی لێ‌وەرنەگیراوە و لە چینەکان دایە.

هەتا ئەو شێوانەی ـ سەرەوە ـ زیادبن لە ناوچەکەدا بێگومان کار دەکەنە سەر نزم کردنەوەی ئاستی ئاوی ژێرزەوی‌و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو زەوی‌یەی کە دەبێتە ئەمباراوی بەنداوەکە پێویستی بە ئاوی‌تر هەیە بێ گرێتەخۆی‌و بەمەش هێندێ لەو ئاوەی کە لە ئەمباراوی بەنداوەکەدا مەبەستمانە گلی‌بدەینەوە دەچێتە چینەکانی زەوی‌یەوەو بە فیڕۆ دەڕواو بەپێچەوانەشەوە کەمی ئەو شێوانە لە بەرژەوەندی هێندی ئاوی گل دراوەی بەنداوەکە دەبێ‌و. دەش توانین ـ دەبێ بکرێت ـ کە ئاست و گوزەری ئەو ئاوانە لە چینەکانی زەوی‌دا دیاری‌بکرێت. ئەویش نە ڕێی نەخشەی کنتوری‌و نەخشەی ئاسمانی‌و چاڵەکانی بۆرەوە ـ کە دوایی لە باسی پشکنینی ناوچەکەدا دێینە سەری ـ .

لەگەڵ زانینی ئەم هۆکارانەدا، بە یارمەتی ئیستگەی کەش و هەواو زانستی هایدرۆلۆجیای ئەندازیاری‌یەوە، بە ڕێگای بیرکاری‌و ئەندازەیی نوێ، دەست نیشانی «پێش بینی» بارانی ساڵانی داهاتووی ناوچەکە دەکرێت، ئەمەش گرنگی‌یێکی سەرەکی هەیە لە دیاری‌کردنی قەوارەو دەست کەوتی بەنداوەکەدا . . .

**دووەم: پشکنینی ناوچەکە (دەڤەرەکە):**

مەبەست لە پشکنین، دەست نیشان کردن و دیاری‌کردنی لەبارترین و گونجاوترین شوێنە؛ تاوەکو لە کاتێکی کورت و بە کەمترین تێچوون بەنداوەکەی تێ‌دا ئەنجام بدرێ . .
پشکنینەکەش ئەم لایەنانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

**(١) جیۆلۆجیای شوێنی بەنداوەکە:**

پشکنین و دیاری‌کردنی جۆری ئەو چینانەی کە لەشی بەنداوەکە هەڵ دەگرێ گەلێك گرنگە، چونکە لەشی بەنداوەکە کێشێکی ئێجگار گەورەی هەیە، ئەمەش پێویستی بە چێنکی پتەو و سەخت هەیە بۆ ڕاگرتنی . . جا لەبەرئەوە زانستی جیۆلۆجیاو شان بەشانی تاقیگەکانی زانستی خۆڵ، جۆرو توانای ئەو چینانەمان بۆ دەست نیشان دەکەن و بەمە لە کەم وکوڕی‌یەکانیان دڵنیا دەبین و چارەسەریشیان بۆ دەدۆزێتەوە . .

**(٢) پشکنینی جیۆلۆجی ناوچەکە «بنەوان»**

بریتی‌یە لەپشکنینی ئەوچینانەی کەکەوتۆتە دیوی بنەوانەکەوە، ئەمەش دوو ناوچە ئەگرێتەوە:

ناوچەیەکیان: ئەوپانتایی‌یە ئەگرێتەوە کە ئاوەکەی هەڵگرتووە، وەك ووتمان بەنداو هەڵئەسێ بەگەل دانەوەی ئاو . لەبەر ئەوە ئەبێت شوێنێکی وا بکرێتە ئەمباراو چینەکانی ئەوەندە کەربێ[١٠] کە کەمترین ئاو بدەڵێنێ، چونکە ئەگەر چینەکان فشەڵ بن ئەواناتوانرێ نەئاوی تیا هەڵبگیرێ ونەبەنداوەکەش خۆی ڕائەگرێ.

ناوچەی دووەمیش: هەردووشانی بەنداوەکەیە کە بەدرێژایی ئەمباراوەکە کشاون . . ئەم ناوچەیەش بەردەوام بەرتەوژم و شەپۆلی ئاوەکە دەکەوێت و لە بەر ئەوە ئەبێت ئەوەندە پتەوو سەخت بن، کە بەرگەی داخوران و[١١] دارمان بگرن، تابتوانن بەردەوام ئاست و قەوارەی ئاوەکە ڕابگرن. . .

**(٣) تۆپۆگرافیای شوێنی بەنداوەکە**

تۆپۆگرافیای ئەو شوێنەی بەنداوەکەی لەسەر هەڵئەسێ، بەرزی‌و نزمی‌و هەڵکەوتنی شوێنەکە ئەگرێتەوە، ئەمەش یارمەتیمان ئەدا لەدۆزینەوەی لەبارترین شوێن کە بتوانین بە ئاسانی بەنداوەکەی تیا بەرزبکەینەوە. . .

**(٤) تۆپۆگرافیای شوێنی بنەوانەکە:**

لێرەدا بریتی‌یە لە دەست نیشان کردن و دیاری‌کردنی شوێنێکی وا کە ئەو ئاوەی دەمانەوێت بتوانێ گلی‌بداتەوە، واتە هەڵکەوتنی ناوچەکە وەها بێت کە بتوانێ هێندی ئەو ئاوەی پێویستە لەخۆی‌بگرێ. . جا ئیتر فراوانی شوێنەکە دەگرێتەوە، یا چاڵی‌و قوڵایی . .

**(٥) پشکنینی بورکانی‌و بومەلەرزە:**

ئەمەش بە متمانەکردنەسەر پشکنین و زانیاری‌و تاقی‌کردنەوە پێشینەکانی ئەو ناوچەو دەوروبەرە، چەندین تاقی‌کردنەوەو پشکنینی جیۆفیزیکی ناوچەکە ئەنجام دەدرێ تا لە دڵنیایی ناوچەکە ئاگاداربین، چونکە لەوانەیە لاوازترین بومەلەرزەو ڕاوەشان هەرەس بە بەنداوەکە بهێنی، ئەمەش سەرەڕای ئەوەی زیانێکی گەورەی لەدوایە، مەترسی‌یێکی ترسناکی بەدەمەوە دەبێ . .

**(٦) گرتن و ئامادەکردنی وێنەی هەوایی‌و ئاسمانی ناوچەکە تا لە لێکۆڵینەوەکان دا سوودی لێ‌وەربگیرێ . .**

گرنگ ترین ئەو هەنگاوانەی لەم پشکنینانەدا بەجێ دەهێنرێن ئەمانەی خوارەوەن:

* چاڵەکانی تاقی‌کردنەوە: لە رێی ئەم چاڵانەوە کە نموونە لە چینــە جیــاجیــاکــان وەردەگیــرێ‌و لە تاقیگــەدا لە جۆرو پێك هاتووەکانی‌و پتەوی‌یان دەکۆڵرێتەوە.

* چاڵـەکـانی بۆر: ئەم چاڵانـەش تا قوڵایی پێویست و جیاجیا هەڵ دەکەنرێن و بۆ چەندین مەبەستی وەك: ئاخنین و راپەراندنی ئاوبرژێر بەنداوەکەو زانینی هێندی توانای ئاودزین «prmeability» و دیاری‌کردنی ئاستی ئاوی ژێرزەوی ناوچەکە.

ئەم چاڵانــەش تیــرەکـانیـان لەنێـوان (١٠٠ ـ ٢٣٠٠) ملم دەبێ.. و زیاتر لە «١٠» چاڵ لێ‌دەدرێ تا زۆرترین و فراوانترین پشکنین بە دەست بهێنن.

* تاقی‌کـردنـەوە جێـوفیـزیکی‌یەکان: ئەمانەش لە پێوانی جوولە بورکانی‌و بوومەلەرزەیی‌یەکان دەکۆڵێتەوە.

* تاقی‌کردنەوە لابوری‌یەکان و بریاردان بەسەر ئەو نموونانەی کە لە ناوچەکەوە دەهێنرێن بۆ پشکنین.

**سێیەم: پێش بینی‌کردنی گەورەترین «لافاو»و کاتی‌گەرانەوەی.**

دوای ئەوەی قەوارەی بەنـداوەکـەمـان دیـاری‌کرد «واتە قوڵی‌و پانی‌و درێژی ئەمباراوەکە» برو ئاستی ئەو ئاوەی گلی دەدەینەوە دیـاری دەکـرێ، ئیتـر لەمـە زیـاتر مەترسی هەیە لە رووخاندنی بەنـداوەکـەو مەتـریشی بۆ سەر ناوچـەکـەو پێی دەوترێ لافاو.. لەبــەرئـەوە لە کاتی نەخش کێشـانی هەربـەنـداوێـك دا دەبێت پێش بینی کات و بری گەورەتــرین هەمـان لافـاو بکـرێ کە لە ساڵـەکـانی لەوەبـەری ئەو ناوچـەیەدا رووی داوە.. هەروەها لە هەمــان کات دا ئەم پێش بینی‌یــەش رۆڵێکی گرنگی هەیــە لە دیاری‌کردنی قەوارەی ئەو ئاوەی کە گل دەدرێتەوەو بەنداوەکەی لەسەر نەخش دەکێشرێ...

بۆ پێش بینی کردنی دووبــارە بوونــەوەی گەورەتــرین لافـاو لەنێـوان چەنـد ساڵێکی لەوەبەردا، ئەندازیارە شارەزاکان گەلێك باس و لێکۆڵینەوەیان خستۆتە روو و گرنگ ترینیان ئەمانەن:

* Plotting Position دیارکردنی شوێنی رووداوەکان.

* Gumble distribution دابەش کردنی گەمبڵ

* person Log distribution دابەش کردنی لوگارتیمی بیرسۆن..

ئەوەی لێـرەدا باسی دەکـەین، رێگـەی یەکـەمـە چونکـە ئەم رێگـەیـە پێـویستی بە زانیـاری‌یێکی بیـرکاری‌و ئەندازیاری کەم هەیەو تێ‌گەیشتنی ئاسانە، سەرەرای ئەوەی کورتە..

ئەم رێگـەیـە پێش بینی رووداني هەمـان ئاوەرۆی[12] لافاو، یان زیاتر دەکات لە هەر ساڵ و کاتێك دا کە بمانەوێت ـ ئەمەش متمانە دەکاتە سەر تەمەنی ئەو بەنداوەی کە دروستی دەکەین، ئەمەش دوایی باسی لێوە دەکەین ـ

رێگەکەش لە چەند یاسایێکی ساکارو هێڵکاری‌یێك پێك هاتووە..

P = 1 / tr

گەرانــەوەی ـ رووداني ـ هەمــان لافــا، یان گەورەتــر لە هەر ساڵێك دا بمانەوێ: P

ئەو ساڵەی دەمانەوێ لافاوە گەراوەکەی تێدا پێش بینی: tr بکەین..

ئەم کاتــەش بریتی‌یــە لە تێکـرای ئەو ساڵانـەی کە هەمـان لافاوی رووداو، یان گەورەتر جارێکی‌تر دەگەرێتەوە، یا روودەداتەوە.

بۆ ئەم مەبەستەش، ئاوەرۆی لافاوی چەند ساڵێکی لەوەبەر دەهـێـنــرێ «n». «لــە ٢٥ ساڵــەوە تا ١٥٠ ساڵ» پاشــان لە خشتەیێك، لە گەورەترین ئاوەرۆوە بۆ بچوکترین ئاوەرۆی لافاو ریز دەکرێ‌و ژمارەیان لێ‌دەدرێ «گەورەترین ئاوەرۆی لافاو ژمارە (١) وەردەگـرێ.. بەو جۆرە تا بچـوکتـرین ئاوەرۆ کە دوایـەمین ژمارە هەڵ دەگرێ»...

ئەم ژمارانەش نیشانەی «m» یاندەدرێتێ، پاشان بەپێی ئەم یاسایە نرخی P دەدۆزرێتەوە:

$$P = \frac{m}{n + 1}$$

ژمارەی ئەو ساڵانەی وەرگیراوە: n

بۆ نمـوونـە: ئاوەرۆی لافـاوی «٥٠» ساڵ وەردەگرین «م٣ چرکە»، کە بریتین لە «٥٠» ئاوەرۆی لافاو (١٩٣٠، ١٩٢٧، ١٨٢٥، ٢٠٠٠، ١٦٨٥، ... هتد هەتا «٥٠» ئاوەرۆکە تەواو دەبێ»

واتە n = ٥٠

بەم جۆرەی خوارەوە خشتەکە رێك دەخەین:

| ئاوەڕۆی لافاو «Flow» م٣/ چرکە | m | $P = \frac{m}{n+1} \times 100$ |
|---|---|---|
| max: 2000 | 1 | $\frac{1}{50+1} \times 100$ |
| 1930 | 2 | $\frac{2}{50+1} \times 100$ |
| 1927 | 3 | $\frac{3}{50+1} \times 100$ |
| 1925 | 4 | $\frac{4}{50+1} \times 100$ |
| 1985 | 5 | $\frac{5}{50+1} \times 100$ |
| ⋮ | | ⋮ |
| min flow | n = 50 | $\frac{50}{50+1} \times 100$ |

پاشــان هەردوو نرخی «flow ,p» لە هێڵکــاری‌یێــك دا دەنوێنرێ، ئەم پەیوەندی‌یەش هەمیشە بەم شێوەیە دەردەچێت:




ئەگــەر بمــانــەوێت تەمەنی بەنداوەکە نەخش بکێشین بۆ «100» ساڵ: ئەمــە ئەوە دەگــەیــەنێ کە ئەو کاتــەی دەمــانــەوێ پێش بینی پێش بینی گەورەترین لافاوی بۆ بکەین بریتی‌یە لە «tr = 100» کەوابوو لە ڕێی یاسای:

$$P = \frac{1}{tr}$$

$$P = \frac{1}{tr} = \frac{1}{100}$$

و بەنواندنی لەسەر هێڵکاری‌یەکە p لە «100» دەدرێ، کە دەکاتە «١٠ د» و لەســەر تەوەرەی «x» دیــاری دەکــەین و بە ستــوونی بۆ ســەر ڕاســتــەهێڵەکــە بەرز دەبینــەوە تا دەیبــڕێت، لە خاڵی بڕینــەکــەوە بە ئاسۆیی بەرەو تەوەرەی «Y» دەکشێین تا دەیبڕێ و لەوێ نرخی «flow» یا ئاوەڕۆی لافــاوەکــە دەخــوێنینــەوە. ئەمــەش گەورەترین لافاو لەو «100» ساڵەی دوایی دا ڕوودەدا..

ئەگــەر هاتــوو تەمــەنی بەنــداوەکــەمــان بۆ لافاوێکی دیاری‌کراو نەخش کێشــرا، ئەوا کاتی گەڕانــەوەی ئەو لافــاوە دەدۆزینــەوە کە تەمەنی بەنداوەکە دەنوێنێ..

ئەمــەش بە هۆی هێڵکــاری‌یــەکەوە نرخی «p» دەدۆزینەوە و پاشان «tr» لە یاساکەوە دەدۆزینەوە..

**چوارەم: تەمەنی بەنداوەکە:**

مەبەستمان لە تەمەنی بەنداوەکە ئەو ماوەیەیە کە دەتوانێ هێندی ئەو ئاوەی تێدا گل دراوەتەوە، پێویستی ئەو پرۆژانەی متمانە دەکەنە سەری بە شێوەیێکی تەواو و چوست جێ‌بەجێ دەکات..

وەك باســمــان کرد ئاوی ئەمبــاراوەکــە، یاخــود لە ئەنجــامی بارانــەوەیــە، یان لە ڕێی ئاوی دۆڵــەکــە، یان ڕووبــارەکەوەیە، یان هەردووکیــانــە.. ئەوەی لەڕێی ئاوەڕۆی دۆڵ و ڕووبــارەکــەوە بۆی دێت، بریتی‌یــە لە کۆی هەمــوو ئەو ئاوانــەی کە لە زەوی‌یــەکــانی دەوروبــەری‌یــەوە تێی دەڕژێ و بێ‌گومان لەگەڵ خۆیان دا قوڕ و لیتەو خۆیێکی زۆر ڕائــەمــاڵن و دوایین هەواریــان ئەمبــاراوەکە ئەبێت و ئەمەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئەبێ و چین لەسەرچین کەڵەکە ئەبێ و لەقەوارە و هێندێ هەڵگرتنی ئاوی بەنداوەکە کەم ئەکاتەوە و نیشتووەکە[١٣] تابێت ئاستی ئاوی بەنداوەکە بەرز ئەکاتەوە و بەرەبەرە چالاکی‌یەکانی کەم ئەبێتەوە، واتە ئەوپرۆژانەی کەمتمانەیان کردۆتە سەری، چوستیــان کەم ئەبێتــەوەو ئەوکــاتــە زیــانیــان زۆرتــر ئەبێ لەقــازانجیان.. لەبەرئەوە لەجیهاندا بەردەوام ئاتێستا گەلێك بەنداو هەیــە لەجیهــانــدا کە ئەونیشتــوانــە پڕی کردوونــەتــەوەو توانــای گل دانەوەیان نەماوەو هەروا بەجێ هێڵراون..

ئەمــەش ئەوە ئەدابــەدەستــەوە کە هەموو بەنداوێك بۆ تەمەنێکی دیاری‌کراو دروست ئەکرێ و ئەوپرۆژانەشی کەلەسەر دروست کراوە بۆ هەمــان ماوە بە گوڕن و دەســت ئەدەن.. ئەم تەمــەنــەش لە ئەنجامی لێکۆڵینــەوەی باری جیــۆگــرافی وتــۆپــۆگرافی ناوچەکەو لافــاوی دیــاری‌کــراو و ئەوســەرچاوە پیشە سازی وکارگەیی‌یانەی کە کەوتــۆونــەتــە سەر ڕووبــارەکەو ئەرکی دانیشتوانی ناوچەکەو هێندی زەوی‌یــە کشتــوکــاڵی‌یەکانی دەوروبەری وگەلێك هۆی‌تر کەڕۆڵی

سلبی‌یان هەیە لەپڕ کردنەوەو تەسك کردنەوەی ئەوپانتایی‌یەدا . .

لەگەڵ ئەوەشـا ، زانـایـان توانیـویـانـە هێندی نیشتوو و خڵتەی کەڵـەکەبووی ساڵانەی ئەمباراوەکە دیاری‌بکەن و بە بەراووردکردنی لەگەڵ قەوارەی بەنـداوەکـەدا ، تەمـەنێکی نزیکـەیی بۆ بەنـداوەکە دەست نیشان دەکرێ . .

لێـرەدا ڕەنگـە بپـرسین : ئەی بۆ چارەسـەرێکی ئەو خڵتـەیـە نەکەین؟! یاخود بۆچی بەردەوام لە پاکردنەوەی ئەمباراوەکەدا نەبین!؟

دەتوانرێ تا ڕادەیێك دەست بەسەر ئەو نیشتوو و خڵتانەدا بگیرێ کە ڕوو دەکەنە بەنداوەکە، ئەویش لە ڕێی :

* دروست کردنی[١٤] پاشـاوی تەواو و پێـویست بۆ هەمـوو ئەو زەوی‌یـە کشتـوکـاڵی‌یـانـەی کە لە دەوروبـەری ڕووبـارو بەنداوەکەدان . . تاوەکو ئەو خوێ‌و پاشماوانەی ڕادەماڵرێن ، یا لە کاتی پاکـژکـردنـەوەی زەوی‌کـان لەو خوێ‌یـەی هەڵیان گرتووە ، ڕوونـەکـەنـە بەنـداوەکـەو . . بەڵکو پاشاوەکان ڕێ‌ی تایبەتیان بۆ بکرێ کە دووربێ لە بەنداوەکەوە . . .

* گۆڕینی ڕێڕەوی پیسی‌و پاشەڕۆکی کارگە پیشەسازی‌یەکان .

* سەوزکردن و ناشتنی ناوچە ڕووتەنی‌یەکان بە دارستان ، تا لە کاتی باو بۆران دا هێندێکی زۆر لە ڕاماڵراوەکان گل بدنەوە . .

* هەندێ ڕێگەی‌تر کە زروف و باری ناوچەکە بڕیاری لەسەردەدا . . .

بەڵام ئەم چارەسـەرانـەو هی‌تـریش ، قەدەغـەی تەواوی ئەو ڕامـاڵـراو نیشتـوو و خلتـانـە ناکاو تێچوونەکەش خۆی لە قەرەی تێچـوونی دروست کردنی بەنـداوێکی نوێ دەدا . . لەبـەرئـەوە شارەزایـان لەوە دڵنیـابـوون کە دروست کردنی بەنـداوێکی نوێ گەلێك هەرزان ترو لەبارترو چالاکترە لە پاکردنەوەو دەردانی نیشتووەکانی . .

**جۆرەکانی بەنداو:**

ئەو بەنداوانەی کە تائیستا لە جیهان دا جێ‌بەجێ کراون ، بە شێوەیکی گشتی لە ڕووی کەرەسەی دروست کردنەوە ، دەکرێن بە دووبەشی سەرەکی‌یەوە :

**یەکەم: بەنداوی خۆڵین «گڵین» Earth - Dam**

ئەم جۆرە بەنـداوە لە خۆڵ «گـڵ» دروسـت دەکـرێ ، ئەو کەرەسـەیـەش دەستـەی نەخش کێشـان بڕیـاری لەسەر دەدەن و لەوانـەیـە لە ناوچـەکەدا دەست بکەوێ ، یاخود لە شوێنێکی‌ترەوە بۆی بهێنرێ .

لەم جۆرە بەنـداوە لای خۆمـان بەنـداوی حەمـریـن جێ‌بـەجێ‌کـراوەو لەم دوادوایی‌یـەش دا بەنـداوی موسـڵ و ، لە ڕۆژئاوای وڵاتیش دا بەنداوی حەدیثە تەواوبوون . .

هەروەهـا لە جیـهـان دا ژمـارەیـێکی زۆر جۆرە بەنـداوە جێ‌بەجێ‌کراوەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەزیادبوون و پێشکەوتن دایە ، تەنانەت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لە ماوەی ساڵانی (١٩٤٥ ـ ١٩٥٧)دا زیاتر لە «٦٠٠» بەنداوی خۆڵین جێ‌بەجێ‌کراوە . . .

هەروەها جۆرێکی‌تریش کە پێی دەوترێت « Rock fill Dam » لەڕووی دروست کردن و جێ‌بـەجێ‌کـردنـەوە هەمـان شتە بەڵام «بـەرد Rock » بەشێـوەیێکی سەرەکی ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە پێکهاتنی‌دا ، بەنداوی «دەربەندیخان» لەم جۆرەیە .

**دووەم: بەنداوی بەردین یا کۆنکریتی:**

**Masonry - Concrete Dam**

بەنـداوی کۆنکـریتی گەشـەسەندن و پێشکەوتنێکی سروشتی بەنداوی «بەردین»ە ، کە لە سەرەتادا بە بەرد هەڵیان دەسان ، . .

بەنـداوی کۆنگـریتی ، یا بەردین لە ناوچـەکـەیێك دا دەست دەداو لە بارە ، کە بنـاغـەو بنچینـەکـەی بەردین بێ‌و مەتـرسی داچـوون و ترازانـی زۆر کەم بێ ، ئەویش بەلایـانـی کەمـەوە (١٠م) بێ لە سەر ڕووی زەوی‌یە سروشتی‌یەکەوە . .

بەنداوی کۆنکریتی ، یا بەردین پێویستی بە دەستێکی کاراو وردەکـاری‌یێکی بێ‌هـودەو گوێـزانـەوەیێکی بێ‌شـومـاری لە ڕادە بەدەرو ڕێـك خستن و بەفیـڕۆچـوونی کەرەسـەیێکی زۆر ، ئەمانە هەر هەمـووی دەبـوونـە هۆی تێچـوون و کاتێکی وەها زۆر ، کە سوودەکـەی ئەوەنـدەی هیـلاکی‌و مانـدووبـوونەکەی نەدەهێنا . .

بەڵام لە بەکارهێنانی کاری کۆنکریتی‌دا ئەمانە چەندین جار کەم بوونەوەو بە ماوەیێکی زۆرکەمتر ڕاپەڕێنرا . .

ـ بەڵام سەرەڕای ئەمەش جاروبار هەر پەیڕەوی «بەردین» دەکرێ ئەم جۆرەش لە ڕووی ئەنـدازیـاری‌و میکـانیکی ئەندازیاری‌یەوە دەکرێن بە چەند جۆریکەوە ، لەوانە :



١ ـ **بەنداوی کێشی Gravity - DAM**

ئەم جۆرە بەنـداوە برگـە برگـە[١٥] نەخش دەکێشرێو پاشان رادەپەڕێنرێو هەر برگەیەش متمانە دەکاتە سەر کێشی خۆی.. بێ گومان لە کۆنکریت دروست دەکرێن

٢ ـ **بەنداوی کەوانەیی Arch - Dam**

لەم جۆرەدا، ئەو پەستـانـەی ئاوەکـە دەیخاتـە سەر لەشی بەنداوەکە دەگوێزرێتەوە بۆ سەر هەردوو لاتەنیشتەکانی بەنـداوەکـە، ئەم لاتـەنیشتـانـەش بە قەد پاڵی هەر دووشـانی دۆڵەکە، یان ڕووبارەکەوە، بە ئاوێتەبوونێکی تەواو و بە مادەیێکی پتەو و سەخت هەڵ دەسپێرێن..

نموونەش لەم جۆرە، بەنداوی دوکانە کە لە ساڵی ١٩٥٩دا لەسەر زێی بچووك دروست کراوە..

بەرزی ئەم بەنداوە (١١١م)، لاتەنیشتەکانی بە کۆنکریتی شیش[١٦] بەنـد دروست کراوەو تا بەرگـەی ئەو پەستـانـە بگـرێ ئاوەکە دەیخاتەسەری.

٣ ـ **پاڵپشتە بەنداو Buttress- Dam**

ئەم جۆرە بەنـداوە، لە ڕوویـێـکـی تا رادەیـێـك تەنـك پێك هاتووەو بە زنجیرەیێك پاڵپشت ڕاگیراوە ـ ناوەکەشی لەمەوە هاتـووە ـ و بەرزی ئەم جۆرە لەنـێـوان (٣٠ ـ ٩٠)م دایـەو درێژیشیان خۆی دەدا لە (١٠٠ ـ ٢٥٥٠)م.. لە جیهان دا.

ئەم جۆرە گەلێـك ڕەوشتی پەسـەنـدو گونجـاوی تێدا هەیە، کۆمپانیاکان بڕیاری دروست کردنی بەنداوێك دەدەن لەم جۆرە بێ، ئەویش لە:

* لایـەنی ئابـووریـیـەوە: کە ڕەسـەیێکی کەمی دەوێ، بە جۆرێـك لە هەمـوو جۆرەکـانی تر کەمتـرەو زۆر نزیکەی ٢/٣ی کەرەسەی بەنداوی کێشی دەوێ.
* بە ماوەیێکی زۆر کەم ڕاپـەڕێنرێ، ئەمـەش ئەوە دەگـەیـەنێ دەستی کارای کەمتر ئەوێ، سەرەڕای ئامێرو دەزگامیکانیکی‌یەکان..
* تێچوونێکی کەم..
* هێزو پاڵەپەستۆیێکی کەم دەکەوێتە سەر بناغەکەی، ئەمەش یارمەتی ئەوە دەدات کە لەسەر زەوی‌یێکی لاوازیش ڕاپەڕێنرێ..

هەندێ ڕەوشتی‌تریش...

**چۆنیەتی دیاریکردنی جۆری بەنداو:**

بڕیاردانی جۆری بەنداوێك لەسەر چەند هۆکارێك بەندە:

(١) جیولوجیای ناوچەکە. ئەگەر بەردین بوو ئەوا جۆری دووەم کە کۆنکریتی‌یە زیاتر دەست دەدا.

(٢) تۆپۆگرافیای ناوچەکە.

ئەم هۆکـارە «بـەتـایـبـەتـی»، ڕۆڵێکی گرنـگ دەبینێ لە دەست نیشـان کردنی جۆری بەنـداوەکـەدا، ئەگـەر شوێنـەکـە سەخت و فراوان بوو «بەری بەرلاَ بوو» ئەوا گەورەترین پانتایی گل دانـەوەی ئاومـان دەداتێو سەرەڕای ئەوەی ناوچـەیـێـکی دەوڵـەمـەنـدە لە خۆڵ و کەرەسـەی دروست کردنی بەنداوەکەدا، لەبەرئەوە بەنداوی خۆڵین زۆر لە بارترە، بەڵام ئەگەر شوێنەکە دەربـەنـدێـك، یا گەرووێـك بوو لە نێـوانی دوو شاخ دا، ئەوا بێ‌گومان چینەکانی سەخت و بەردینیو پانتایی‌یێکی کەمیشمان دەداتێ بۆ گل دانـەوەی ئاو، لەبـەرئـەوە دروست کردنی بەنداوی بەردین، یا کۆنکریتی لەبارو ئابوری‌ترە. جگە لەوەی لە کاتی دروست کردنی ئیستگـەی کەهـرۆئـاوی یەکەشی‌دا سوودێکی

زیاتری لیٚدەبینین. .
(٣) لایـەنی تێچـوون: بەنـداوی خۆڵین ئەگەر بەراوورد بکەین لەگـەڵ بەنـداوی بەردین، یا کۆنکـریتیداو بە هەمـان قەبـارەو گەورەیی، ئەوا خۆڵینـەکـە گەلیٚ‌گـەلیٚ ئابـوری ترە لە بەنـداوە بەردەکە بەتایبەتی ئەگەر کەرەسەکەش لە ناوچەکەدا بیٚ. .
(٤) هێندی ئەو ئاوەی کە مەبەستمانەو دەمانەویٚت گلی‌بدەینەوە، ئەگـەر ئاوێکی زۆرمـان ویست، ئەوا پێـویستی بە بەنـداوێکی گەورە هەیەو هەروەك وتمان خۆڵین لە بارترەو بەپێچەوانەشەوە. .
هەروەهـا هەنـدیٚ هۆی‌تـریش کە لە کاتی نەخش کێشـان و پێویستی‌دا سەر هەڵ دەدەن. .
**پێکهاتووەکانی بەنداو:**
بەشێوەیێکی گشتی هەموو بەنداوێك لەم بەشە سەرەکی‌یانەی خوارەوە پێك هاتووە. . بەلاٚم بەپێی جۆری بەنداوەکە، کەرەسەو چۆنیەتی جیٚبەجیٚ کردن و هەڵ سوڕاندنیان دەگۆڕیٚت. .
**یەکەم: لەشی بەنداو**
بریتی‌یە لەو بەشەی کە ڕێی لەئاوەکە گرتووەو گلی‌داوەتەوەو بەشی سەرەکی بەنداوەکە پێك دەهێنیٚ. . ئەم بەشەش لە دوو دیو پێك هاتووە:
دیوی یەکەم دیوی بنەوان:
ئەم دیـوە ڕووی لە ئەمبـاراوەکـەیـەو ئاوە گل دراوەکـەی کەوتـۆتـەسـەرو پەستـان و تەوژمی پەیتـاپـەیتـاو بەردەوامی لە ئەستـۆگـرتـووە. . ئەم بەشـە جگـە لە بەشێکی کەمی نەبیٚ کە دەکـەوێتـە سەرووی ئاستی ئاوەکەوە، ئیتر هیچی‌تری دیارنی‌یەو ئاو بەریگـرتـووە. . ئەم بەشـە کەمـە دیـارەش. . بۆ حاڵـەتی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوەکەیە تا سەرنەکەویٚ بۆ سەری بەنداوەکە. .
ئەم دیـوە دەشیٚ لێـژ بیٚو دەشیٚ ئەستـونی بیٚو لەوانـەشـە کەوانەیی، یا بازنەیی هاتبێتەوە ـ ئەمانە بەپێی نەخش کێشان و جۆری بەنداوەکە دەگۆڕیٚ ـ
**دیوی دووەم ـ دیوی ئاوەڕێژگە:**
ئەم دیوەیان ڕووکاری بەنداوەکەیەو پشتی لەبنەوانەو هەمووی دیـارە و پاڵ پشتی دیـوی بنـەوانـەو ئەم دیـوەش دەشیٚ هەمـان شێوەی ئەندازەیی دیوی بنەوانی هەبیٚو دەشیٚ کەمێك جیاوازی هەبیٚ، ئەمەش جۆری نەخش کێشانەکە بڕیاری لەسەر دەدا. .
لە ڕێی ئەم دیوەوە ئاوەڕێژی ڕووبارەکە بەر دەدرێتەوە. .
**دووەم: ئاوەڕیٚ Spill - Way**
هەروەك باسمـان کرد بەنـداوەکـە لەسـەر گەورەترین لافاوی ڕووداو نەخش دەکـێشـریٚ، بەلاٚم لەگـەڵ ئەمـەش دا دەشیٚ لافاوێکی گەورەتر کە لە توانای بەنداوەکە بەدەربیٚو، ڕووبکاتە بەنـداوەکـە، لەم حاڵـەتەدا بیٚ‌گومان بەنداوەکە بەرگەی ڕاگرتن و گل دانـەوەی ئەو هێنـدو تەووژمـە گەورەیـە ناگـریٚو لە ئاکـام دا ئاوێکی زۆر بەسـەر بەنـداوەکـەدا تیٚپـەڕ دەبیٚو ڕوودەکـاتـە ناوچەکە، بەمە بەنداوەکەش هەرەس دێنیٚو ناوچەییێکی زۆریش دەکات بەژێر ئاوەوە. . . لەبەرئەوە دەبیٚ ڕیٚ‌ییێکی یەدەك بۆ ئەو ئاوە زیـادەی کە لە توانـای هەڵ گرتنی بەنـداوەکـەدا نی‌یـە، بدۆزرێتەوە. بەجیٚبەجیٚ‌کردنی ئەم ڕیٚ‌یە ئیتر ئاوەکە بیٚ ئەوەی هیچ بەلاٚییێکی بەدەممەوەبیٚ ملی ڕیٚ دەگریٚ بۆ ڕووبارەکە. . ئەو ڕیٚ‌یەش «ئاوەڕیٚ»یە، کە بریتی‌یە لە ئاواڵەجۆگەییێکی بەردین، یان کونکـریتی پێـك هاتـووە، کە لەلاییێکی، یان هەردوولای بەنـداوەکـەوەو لەسـەر زەوییێکی ساغـەوە «نـەك لەسـەر لەشی بەنـداوەکـە» بە لێـژ ییێکی زۆرو پانی‌ییێکی گۆڕاو «لـەسـەرەوە تەسـك و بەرەبـەرە تا خوارەوە گەورەتـرین پانی وەردەگـریٚ» لە سەرەوەی بەنداوەکەوە بۆ خوارەوە ڕاکێشراوە. .
جا بوونـی ئاوەڕیٚ‌یـێـك، یان دووان لەسـەر گەورەیـی بەنداوەکەو بارو دۆخی ناوچەکە بەندە، ئەمەش نەخش کێشەکان بڕیاری لەسەر دەدەن. .
ئیش کردنی ئەم ئاوەڕیٚ‌یانە بەپێی جۆری بەنداوەکەو پێویستی دەگـۆڕێن، لەوانـەیـە هەمیشـەکـراوە بیٚو ڕاستـەوخـۆ ئاوی لیٚ‌بێتـەخـوارەوە، یاخـود بە هۆی دەرگـای ئۆتـۆمـاتیکی، یان میکانیکی‌یەوە ئاویان پێدا بێتە خوارەوەو گرنگترینیان پێی دەوتریٚ «دەرگای دەهۆڵی» «Drum Gate» . . و لەوانەیە چەند دانەیێك لەم دەرگایانە لە دەمی ئاوەڕۆیێك دا دابنرێن. . .
بەلاٚم ئەو ئاوەی دێتـەخـوارەوە، خێـرایی‌و تەوژمێکی گەورەی هەیـەو بەمـەش وزەییێکی گەورەی هەڵگـرتـووەو لەگـەڵ کەوتنـە زەوی‌دا ئەو ناوچەیە هەڵ دەکەنیٚو بەرەبەرە قوڵی‌و داخۆرانەکەی زیـاد دەکـات و دەبێتـە هۆی پەیـداکـردنی گۆمـاوێکی گەورە لە

دامێنی بەنـداوەکـەداو ئەمـەش مەتـرسی‌یێکی گەورەی هەیـە بۆ بەنـداوەکـەو دەبـێ چارەسـەری بۆ بدۆزرێـتـەوە، ئەویش دروست کردنی رۆخانەی تایبەتی‌و پتەوە لەو دامێنەدا وەك باسی دەکەین ـ ئەمەش لە خۆی‌دا بەشێکی سەرەکی‌و گرنگی بەنداوە ـ

**سێ‌یەم: رۆخانە Stilling - Basin**

رۆخـانـە بریـتـی‌یـە لەو شوێـنـەی کە کەوتـوتـە دامێنی «ئاوەرێ»کەوەو ئاوەکە دەگرێتە خۆی‌و هێواشی دەکاتەوە.

هەروەك وتمـان ئەو ئاوەی دێتـەخـوارەوە وزەیێکی گەورەی هەڵگـرتـووەو مەترسی لەدوایە، لەبەرئەوە دروست کردنی رۆخانە بۆ کەم کردنەوەی ئەو وزە بەرزەیەو بەرێ‌کردنی ئاوەکەیە بەبێ‌زیان . . .

گەلێك جۆر رۆخانەمان هەیە کە هەریەکەی بەپێی پێویست و داواکردنی جۆری ئەو بەنداوە بەکاردەهێنرێ ـ یا راستتر دروست دەکرێ ـ.

بەڵام بە شێـوەیێکی گشتی شەش جۆرمـان هەیـە و، هەر جۆرەش لە چەند پێك هاتوویێك پێك دێن وەك لە خوارەوە باسی پێك هاتووەکان دەکەین و پەنجە بۆ جۆرەکانیش رادەکێشین:

(١) تەختی رۆخانە:

بریتی‌یـە لە پانتـایی زەوی رۆخـانـەکـە و ئەم تەختەش بەپێی گەورەیی‌و داوای «ئـاوەرێ»یـەکـە، دیـاری دەکـرێ‌و هەمیشە لە گەورەتـرین پانـایی ئاوەرێکـە پانتـرەو درێـژ ی‌یێکی زۆری هەیە چونکە چەندین پێك هاتووی‌تری لە ئامێزگرتووە . .

ئەم «تەخت»ەش بە کۆنکریتی شیش بەند دروست دەکرێ تا بەرگەی ئەو تین و ناوەی ئاوەکە بگرێ . .

(٢) خلیسکەبلۆك:

ئەم بلۆکـانـە بە شێـوەیێکی ئەنـدازەیی دروست دەکرێن و لە دەمی رۆخـانـەکـەدا بە دووری‌یـێـکی نەگـۆڕو بەپێی پانی رۆخانەکە، ژمارەیێکی پێویست و تەواو دادەرێژ ێ.

ئەم بلۆکانە بۆ جیاکردنەوەو پەرش کردنەوەی شەپۆلە ئاوەکانەو هەنـدێ شەپـۆل بەسـەریـان دا تێ‌پـەڕ دەبن و هەنـدێکی‌تـریان لەنێـوانیـانـەوە تێ‌پـەڕ دەبن، بەمـەش کەمێـك لەو وزەیـەی هەڵی‌گرتووە ونی دەکات.

ئەم بلۆکانەش لە کۆنکریت دروست دەکرێن . .





(٣) بەرکەوتە بلۆك:

ئەم بلۆکانەش لە کۆنکریت دروست دەکرێن و لە ناوەڕاستی ڕۆخانەکەدا بە ڕیزێك، یان زیاتر دادەڕێژرێن و بە جۆرێك کە رووری نێــوان ئەو ڕیــزانــە ئەوەنــدە بێــن کە ئەو ئاوەی دێـت بەســەریـان دا، بەر هەمـوو ڕیـزەکـان بکـەوێ، چونکـە ئەگـەر نزیـك بن ئەوا ئەو ئاوە تەنهـا بەر بەرکـەوتـەکـانی ڕیـزی یەکـەم دەکەون. . . لە ئەنجام دا هەندێکی تر لەو وزەیەی هەڵی‌گرتووە ونی دەکات، ئەمەش تەنها لە جۆری سێ‌یەم دا هەیە.

(٤) بەرکەوتە بلۆکی بەردەوام:

ئەم جۆرە لە ئەرك و پێــك هاتن دا هەروەك سێ‌یــەم وایــە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە پێکەوە دادەڕێژرێن و دەبنە یەك پارچەو بە پانی ڕۆخانەکە درێژدەبێ. .

(٥) بەرکەوتەی ڕاڕەوی:

بریتی‌یە لە بەرکەوتەییێك و ڕاڕەوە بلۆکێك ـ کە لە بەرکەوتەکە نزم ترەوە بە ئێژی‌ییێك لەگەڵ تەختی ڕۆخانەکەدا یەك دەگرێتەوە.

کاتێك ئەو ئاوەی دێت، بەر بەرکەوتە بلۆکەکان دەکەوێت و هەنـدێ لە وزەکـەی ون دەکـات و پاشـان بەخێـرایی‌ییێك بەسەر ڕاڕەوە لێژەکان دا بازدەدا. . ئەم بەشەش لە جۆری دووەم دا بە شێـوەییـێکی سەرەکی بەکـاردەهێنـرێ‌و لە جۆری سێ‌یـەم و چوارەمیش دا بە پێی پێویست بەکاردەهێنرێ. .

دوو جۆری‌تـر ڕوخـانـە هەیـە کە پێنجـەم و شەشـەمن، بەڵام بەکـارهێنـان و پێـك هاتنیـان لە بواری بەنـداوودا نی‌یەو پێویـست ناکات باسی لێوە بکەین. .

**چوارەم: دەرئاوی بەنداو Out - Let**

هەروەکو وتمان لە کاتی دروست کردنی بەنداوێك دا لەسەر ڕووبارێك، ئاوەڕۆی ڕووبارەکە هەر دەمێنێ، ئەویش لە ڕێی بەردانــەوەییکی بەردەوامی بەنــداوەکــەوە دەبێ «بێ‌گـومـان ئەو بەردانــەوەیــەش بە پێی بوونی ناو ئەمبـاراوەکـە دەبێ»و لە ڕێی

تایبـەتی یـەوە دەبێت کە پێی دەوترێت «دەرئـاو» و لە هەر بەنـداوێـك دا جۆرێـك و بە ڕێگـەیێکی تایبـەتی چارەسـەر دەکـرێ. . بەنـداو هەیـە «دەرئـاو»ەکـەی کەوتـۆتـە سەر تەپلی سەری[18] بەنـداوەکـەو وەك تاڤـگـەیـێـك بەردەوام پێی‌دا دێتەخوارەوە. . یاخود هەر لەو تەپلی سەرەوە لچێکی کۆنکریتی بۆ کراوەکـە لە لەشی بەنـداوەکـە هاتـۆتـەدەرێ و بەمـەش ئاوەکـە ڕاستـەوخـۆ بەسـەر لەشی بەنـداوەکـەدا نایـەتـەخوارەوەو کەمێك دووریش دەدا لە زەوی، ئەمەش زیاتر لە بەنداوی کونکریتی و بەردین دا دەبنیـرێ و پەیـرەوی دەکـرێ، یاخـود لە ڕێی بۆرێی گەورەگـەورەوە کە کەوتـۆتـە ژێـر لەشی بەنـداوەکـەوەو دەمی بۆری‌یەکان لە دامێنی بەنداوەکەدا کراونەتەوەو تێکەڵی دۆڵەکە، یان ڕووبـارەکـە دەبن. . ئەمـەش لە بەنـداوی خۆڵین «گڵین»دا پەیرەوی دەکرێ. .

بەڵام جۆری یەکەم لە خۆڵین دا دەست نادا، چونکە خۆڵ ئاوکێشەو بە ماوەی چەند سەعاتێك بەنداوەکە هەرەس دەهێنێ. .

پێنجەم: ئاوبر Cut - off

ئەگـەر هاتـوو بنـاغـەی بەنـداوەکـە ڕاستـەوخۆ لەسەر زەوی‌یە ساغەکە بێت، ئەمە بەس نی‌یە بۆ ئەوەی بەنداوەکە بە جێگیری و هاوسـەنگی بمێنێتـەوە، تەنـانـەت ئەگـەر بنـاغەکەش زۆر پتەو و سەخـت بێ. . . چونکـە زۆر بە ئاسـانـی ڕێچکـە بۆ خۆی دەدۆزێتەوەو لە درزو کەلەبەرو کەلێن و کونیلەی نێوان تاشە بەردو خۆڵی بنـاغـەکـەوە دزە دەکـات و لە ئەنجـام دا لەگـەڵ خۆی‌دا دەنکـۆڵـە وردەکـانی خۆڵـەکـە ڕادەمـالێ و لە کونیلەی دەنکـۆڵـە گەورەکـانی تونـد دەکـات، ئەم دەنکۆلانەش شێ هەڵ دەگرن و بەمـە دەبێتـە مادەیێکی لینجی لکێنـەرو دەنکـۆڵـە گەورەکان توند دەبـەستێ بەیـەکـەوەو تاوای لێ‌دێت ئاوەسوو دەبن و ئیتر ڕێگەی ڕۆشتنی ئاو نادەن، ئاویش ناچـار ڕێ‌یێکی‌تـر دەگـرێتـەبەرو بەم جۆرە چەنـدین ڕێچکـە پەیـدا دەبێ و کەلـەبەری گەورەگەورە لە زەوی‌یـەکـەدا پەیـدادەبێ و لە ئەنجام دا زەوی‌یێکی فشەڵی لاواز دەردەچێت کە مەتـرسی‌یێکی گەورە دەخـاتـەوە. . بەوەی کە ناتـوانێ بەنـداوەکـە ڕابگـرێ و پەلاییکی‌تـریشەوە ئاوی بنەوانەکە هەمـووی ملی ڕێ‌دەگـرێ بەو نیـازەی لێـرەوە دەربچێ و بەمەش ناتوانرێ ئاو لە ئەمباراوەکەدا هەڵ بگیرێ. .

هەروەك چۆن بەنـداوی «دۆڵجـارۆك» کە لە ٢٥ی تشـرینی دووەمـی ١٩٢٥ دا لەوێلز، ١/٢م داچـوو و لە ئەنجـام دا ئاو هروژمی بردو بووە هۆی ڕوخاندنی چەند بەنداوێکی بچووك و شانزە کەسیشی خنکاند.

لەبـەر ئەوە گرنگی دان و وردی لە چارەسـەرکـردنی پتـەوی بنـاغـەو قەدەغـەکـردنی، یا دوورخستنـەوەی ڕێچکەی ئاو لەژێر بەنـداوەکـەو، لە بنـەمـا سەرەکی‌یـەکـانی نەخش کێشـان و جێ‌بـەجێ‌کـردنی بەنـداوەکەیە. . ئەمەش بەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ:-

(١) ڕاکێشـانی ئاوبـرێکی گونجـاو و پتـەو و، کە. ر بەدرێـژایی بەنـداوەکـەو لەژێـریـەوە ئاوبـریش بریتی‌یـە لە هەڵکـەنـدنی خەنەکێکی قوڵ «قوڵیەکەی متمانە دەکاتەسەر جۆری چینەکانی زەوی و قەوارەی بەنداوەکەو جۆری ئەو مادەیەی کە بۆ پڕکردنەوەی ئەو خەنەکە بەکاردەهێنرێ؛ پانی ئەم ئاوبرە لە «٢»م زیاترەو بە پانی ڕووبارەکە، یان دۆڵەکە هەڵ دەکەنرێ. . ئەم خەنەکە، یا بە کۆنکـریت، یا هەر تێکـەڵـەیێکی گونجـاو و لەبـار بێت و پتەو بێت، وەك «تێکـەڵـەی پنتـۆنـایت - چیمەنتۆ» ئەمەش چین چین پردەکـرێتـەوەو دەکـوترێتـەوە [جـۆری ئەم مادەیـەش نەخش کێشـەکـان بڕیـاری لەسـەر دەدەن]، بەڵام ئەوەی مەرجە لەسـەر سروشتی ئەو مادە پرکـەرانـە، ئەوەیـە لەبـەردەستـا بن و توانـای ئەوەیـان هەبێ کە بەتـەواوی لەگـەڵ چینـەکـانی زەوی‌دا ئامێتە ببن، تاوەکو هیچ چینێکی لاواز نەکەوێتە نێوانیانەوە، لە ئەنجام دا ئەو ئاوەی دزە دەکات ناچار دەبێ بە قووڵایی ئاوبرەکە ڕۆبچێ بەمەش ئاوەکە لە بناغەی بەنداوەکە دووردەکەوێتەوەو تا ڕۆش بچێ؛ وزەی کەمتر دەبێتەوەو کاریگەری کەمتر دەبێ. .

جا شوێنی ئەم ئاوبرانەش، یا تەنها ئاوبرێکەو کەوتۆتە دەمی لەشی بەنـداوەکـە لە دیـوی بنەوانەوە، یا دەکەوێتە ناوەڕاستەوە، یاخود دووانەو دەکەونە هەردوو دەمی لەشی بەنداوەکەوە یەکێ لە دیوی بنەوان و ئەوی‌تریان لە دیوی ئاوەڕێژەوە. .

(٢) ئاخنینی[19] چینەکانی ژێربناغەو ئاوبرەکە:

مەبەست لەم ئاخنینە لێدانی چاڵەکانی بۆرەو پڕکردنەوەیانە - ئاخنینیانە - بە تێکەڵەیێکی کەر کە ئامێتە بێ لەگەڵ چینەکان دا ئەمەش بەم جۆرە دەبێ:

کۆمەڵێك ـ یۆرێك ـ لە چاڵەکانی بۆر لێدەدرێ کە دووری نێوان هەریەکەیان نزیکەی «٢م» بێت، لە بناغەی ژێر ئاوبرەوە بە شێـوەیـێـکی سـتـوونی، یان لار لێدەدرێن و هەریـەك لەم چالانەش تیرەکەی لە «٥٠ملم» کەمتر نی یە، پاشان بە تێکەڵەی «ئاو ـ چیمەنتۆ ـ قور» یاخود، بەتێکەڵەی کیمیایی دەئاخنرێ. . ئەم تێکەڵەیە پاش ئەوەی دەئاخنرێ بە دەورویشتی چاڵەکان دا بلاودەبێتەوە لە ئەنجام دا لەگەڵ هەموو چاڵەکان دا ئامێتە دەبێ‌و رێگرێکی کەری پتەو پێك دێنن. .

بەلأم ئەم چارەسـەرانـە بۆ هەمـوو ناوچـەیێـك نی یە، چونکە ئەگەر ناوچەیێك زەوی‌یەکەی فشەڵ و نالەبار بێ ئەوا ئەم ئەرك و تێچـوونـەی تێدا بەکـارنـاهێنـرێ‌و وازی لێدەهێنری ـ هەردوای قۆناغی پشکنین ـ بەلأم ئەم چارەسەرانە بۆ زەوی‌یەکە کە جێی رەزامەندی بێ، یاخود کەم کوری‌ییکی کەمی هەبێ. .

بۆ نموونە لە ساڵانی ١٩٧٦ ـ ١٩٧٧دا وانیازبوو بەنداوێك لە ناوچـەی کەوڵـوس ـ کە دەکـەوێتـە باکـوری رۆژهـەلأتی سلێـمـانـی‌یـەوەو سەرووی گونـدی شانـەدەری کەوتـوە ـ ئەنجـام بدەن بۆ ئەم مەبـەستـە کۆمپـانیاییکی پۆلۆنی کەوتـە پشکنینی ناوچـەکـەو لەدوایی‌دا بۆیـان دەرکـەوت کە خاکەکەی فشەڵەو توانایێکی لاوازو کەمی هەیە لە گل دانەوەی ئاوداو هەنگـاوەکـانی چارەسـەرکـردنیش لە فریـای ناکـەون. . لەبەرئەوە پێ کشانەوەو کۆمپانیا ش ماڵ ئاوایی لێ‌کرد[٢٠] . .

**شەشەم: هەردوو شانی ئەمبارا کە**

بریتی‌یـە لە هەردوو لای «راسـت»و «چـەپ»ی ئەمبـاراوەکە، هەروەك باسمـان کرد. ئەم دوو بـە بەردەوام کەوتـوونـەتـە بەر شەپـۆڵ و تەوژمـی ئاو، لەبـەر ـەوە بەردەوام لە داخـوران و دامـاڵین دا دەبن. . ئەمـەش داوا رووکارێکی سەخت و توندو تۆڵ دەکـات، هەتـا بەرگـری ئـ داخـورانـە بگـرێ‌و ئاست و قەوارەی ئاوی ئەمباراوەکە بە نەگۆ ی‌و هاوسەنگی بهێڵتەوە. .

بۆ نمـوونـە: گەورەتـرین کارەسـ تی جیهـانی کە بەم هۆیەوە رووی دابێ ئەوەبـوو کە لە بەنـداو ڤایـۆنتی ئیتـالی‌دا لە ٩ ی تشـریـنـی یەکـەمـی سالّـی ١٦٣ دا رووی‌دا، ئەم بەنـداوە «٢٠٦» م بەرزبووە وبە دووەمینی ب .او دانراوە لە جیهان دا لە بەرزی‌و گەورەیی‌دا، لەناکاوێك دا ێك لە شانەکانی دەرمێتە ناو ئەمبـارەکـەوەو دەبێتـە هۆی بەرزکردنەوەی «١٠٠»م لە ئاستی ئاوی ئەمبـاراوەکـە، لە ئەنجـام دا ئاوێکی هێگجـار زۆر سواری سەری بەنداوەکە دەبێ‌و بەرەو ناوچەکەی بەردەمی مل دەنێ‌و بووە هۆی کوشتنی «٣٠٠» کەس و وێـران کردنی ناوچـەیـەکی زۆر، ئەم بەنداوە هەروا بێ‌بەکارهینان بەجێ‌هێڵراوە. .

**حەوتەم: ئیستگەی کەهرۆئاوی**

وەك باسمـان کرد، یەکێـك لە مەبـەستەکانی دروست کردنی بەنـداو بەدی‌هێنـانی وزەی کارەبـایـە، جا سەرچـاوەییکی وەهـا دەوڵـەمـەنـدو هەمیشـەیی‌و هەرزان؛ جێی سەرچـاوە هەژارە گرانبـەهـاکـانی گرتەوە، ئەویش بە دروست کردنی ئیستگەییکی کەهـرۆئـاوی کە چەنـد تۆربینێکی تێـدا دانراوەو هەرکە تەووژمە ئاوێکی بەرز دەبـریت بەنـاو ئەو تۆربینـانـەدا، دەسـورێنـەوەو لە ئەنجام دا تەزووی کارەبا بەدی‌دەهێنرێ‌و ئاوەکەش لە دەرئاوێکی ترەوە بێ‌ئـەوەی لێێ‌کـاربێ دەچێتـەدەرەوەو بە هۆی هەنـدێ دەزگای‌ترەوە تەزووەکە دەگوێزرێتەوە. .

جێی ئەم ئیستگـەیـەش متمـانە دەکاتە سەر چۆنەتی بەنداوەکەو نەخش کێشـانی، لەوانـەیـە لە دیـوی بنەوانەوە بێت و لەوانەیەلە دیـوی ئاوەرێـژ وە بێت و کەمـەیکیش لە بەنـداوەکەوە دوور بێ، هەروەك لە بەنداوی موسڵ دا، (٨)کم لە بەنداوەکەوە دوورە. . یا لەوانەیە بە شێك بێ لە لەشی بەنداوەکە.

**هەشتەم: دابڕ** Fuse

ئەم تا رادەیـێـك گشـتـی نی‌یـەو مەرج نی‌یـە لە هەمـوو بەنداوێك دا بەدی‌بکرێ. . دابڕ بریتی‌یە لە دیوارێکی بەردین، یا کۆنکریتی کە بەدرێژایی (٥٠ ـ ٢٠٠)م و لە شانێکی، یان هەردووشـانی لەشی بەنـداوەکـەوە، رادەکێشـرێ، ئەم دابـڕەش توانـاو بەرگـە گرتنی کەمترە لەوانـەیـە لە کاتی لافاوێکی گەورەدا «ئاوەرێ»کە توانای دەرکەن و بەرێ‌کردنی ئەو لێشاوە گەورەیەی نەبێ‌و ببێتـە مەتـرسی بۆ بەنـداوەکـە، بەلأم ئەم دابـڕە بەرگـەی کەمترە لە بەنداوەکەو پێش ئەوەی بەنداوەکە هیچی بەسەربێ، ئەم دەتـەقێ‌و ئاوەکـەی لێـوە دەردەچێ‌و بەمەش لەشی بەنداوەکە بەسـەلأمـەتی دەمێنێتـەوە. . ئەم دابـڕەش لە بەنـداوی موسڵ دا بەدی دەکرێ کە لە شانی بەنداوەکەوە بە کۆنکریت راکێشراوە. . .

لەوانــەیــە هەنــدێ بەشیتــریش بەشــداری پێــك هاتنی بەنداوێکی دیاریکراو بکەن بەڵام ئەوەش جۆرو پێویستی ئەو بەنداوە داوای دەکات و گشتی نییەو پێویست ناکات لێرەدا ناوی بهێنین چونکە لە سنووری باسەکە دەردەچین.

* * * *

**پەراوێزەکان:**

(١) بەنــداو «DAM» : لــە راستیدا بەرامبــەر وشــەی «DAM»، گــەلێــك وشــەو زاراوەمــان هەیــە وەك «بــەست، بەربــەست، ئەستێلك»، بەڵام ئەمــانیش لە زانستــەکــەدا جێیــان دەبێتــەوەو بەکارهێنانی خۆیان هەیەو لە شوێنی خۆیدا بەکاری دەهێنین.

(٢) شۆرەکات: خوێ

(٣) ئیستگەی کەهرۆئاوی: Hydro - Electric Station

(٤) نەخش کێشــان: «Design» لەراستیدا واتــاو مەبــەستی «Design» زۆر بەربــڵاوتــرە لەوەی هەنــدێ کەس وشــەی «ئەندازەگرتن»یان، بۆ بەکار هێناوە.. چونکە ئەندازەگرتن تەنها پێــوانی دووریو قەبــارەو رووبــەر دەگرێتــەوە. بەڵام وشەکە لەم پێوانانە زیاتر دەبەخشێو بەڵکو چی رەوشتی ئەو دروست کراوە هەیــە گرتــوویــەتیبە ئەستۆ وەك «رەنگ، شێوە، قەبارە، کێش، ناسکیو پتەوی، تەمەن، جۆری ماددەکە، ....،

(٥) بار: Load

(٦) دیوی بنەوان: up. stream ئەو دیوەیە کە ئاوەکەی گرتۆتە ئەستۆ

(٧) ئاوەرێــژگــە: down - stream ئەو دیــوەیــە کە رووی لە رووبارەکەیەو پشتی لە ئەمباراوەکەیە.

(٨) تێچوون: الکلفة Cost

(٩) هایدرۆلۆجیا Hydrology: زانستی ئاو: زانستێکە تایبەتە بە لێکــۆڵینــەوەی سەرچــاوە ئاوییــەکــان و چۆنیــەتی پێــوان و دابین کردن و بەکارهێنانیان...

(١٠) کەر: الصماء: Imperm eable

(١١) داخوران: التعریة: Erosion

(١٢) ئاوەرۆ: التصریف Flow

(١٣) نیشتوو: Sede mentation

(١٤) پاشاو: المبزل Drainage channel

(١٥) برگە: Sectiom

(١٦) کۆنکریتی شیش بەند: الخرسانة المسلحة - Reinforced Concrete

(١٧) ئاواڵە جۆگە: القنوات المفتوحة Open - channel

(١٨) تەپلی سەری بەنداو Crest

(١٩) ئاخنین Grouting

(٢٠) ئەم زانیاریەم لە سەرۆکی دامەزراوەی گشتی بەنداوەکان - المؤسســة العــامــة للســدود - وەرگــرتــووە ئەویش مامۆستا خضر ئیبراهیم بوو کە ئیستا جێگری وەزیری ئاودێرییە..

**ئەو سەرچاوانەی ئەم باسەی لێئامادەکراوە.**


(1) j.p. OUAYLE, KEMPE'S ENGINEERS, MORGAN -GRAMPIAN BOOK, PYBLISHING CO.LTD, LONDON,.88th, EDITION, 1983.

(2) A.C. Towrt, R.C. Hoather AN D F.M.Law, WATER SUPPLY, PUBLISHED BY EDWARD ARNOLD. LONDON, 2nd EDITION, 1974.

(3) R.J. Mitchell, EARTH. STRUCTURE ENGINEERING. LONDON. First EDITION, 1983.

(4) A.Cc. Melean AND C.D. Gribble, GEOLOGY FOR CIVIL ENGINEER, LONDON, Third Edition, 1982.

(5) T.C. Collocott AND A.B. Dobson,
CHAMBER TICTIONARY OF SCIENCE AND THCHNOLOGY, LONDON.
Revised Edition, 1983.

(٦) د. عزيز نوري كريم، دراسات جدوى اقتصادية لتصميم السدود والخزانات، وزارة الاسكان والتعمير، المؤسسة العامة للمباني، محاضرات كلية الهندسة، جامعة بغداد، ١٩٨٥.

(٧) عبدالرحمن محمد امین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگییەکەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٧.

(٨) عبدالرحمن محمد امین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم. کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٩.

# السد "DAM"

اعداد
المهندس: رزگار صالح

انّ الماء من اهم مكونات الحياة ومستلزماتها، له دور خطير وهائل في حياة الانسان والكائنات الحية كافة. ومن ثم بذل الانسان منذ القدم جهوداً كبيرة وسعى سعياً حثيثاً من اجل ضمان البقاء والاصرار على الحياة يتحدى الكوارث الطبيعية في حدود طاقاته وآفاق طموحاته وحاجاته. لذا كرّس آلاف من المبدعين والعباقرة ومحبيّ الخير للأنسانية حياتهم وربيع عمرهم لتحقيق عوامل الوجود وتأمين العيش الهنيء الرغيد بعيداً عن تهديد الكوارث القاتلة المدمرة كالقحط والمجاعة والفيضانات الطاغية التي تجعل الارض يباباً فتمحو كلّ صور الحياة وتزيلها.

ومن الاهداف والنتائج التي حققها هؤلاء العلماء ووصلوا اليها هي إقامة وبناء السدود أمام السيل الجازف العارم بغية ضمان كمية هائلة من المياه في موسم الفيضانات والأمطار لغرض استخدامها في ارواء مساحات زراعية شاسعة في مواسم الجفاف وقلة المياه وغيرها.

ولكي يكونوا في مأمن من السيول والفيضانات المفاجئة المدمرة، بالأضافة الى الثروة السمكية الهائلة وتربيتها وزيادة انواعها ومن اجل خلق مناطق سياحية للمواطنين وغيرهم، كذلك توليد الطاقة الكهربائية من أكبر النعم في الحضارة المعاصرة تمنحها السدود منحة لمن يريدها بواسطة مياهها الهائلة وبديلاً عن بقية المصادر القديمة...

انّ سدود اليوم غيَره بالأمس حيث وصلت ذروة التكنولوجيا وقمتها في ضخامتها وسعتها ومتانتها ومردوواتها وعُمرها.

وقد تنوعت وتعددت ألوانها حسب الظروف الجيولوجية والمناخية والطبوغرافية للمنطقة وتكاليفها ودرجة الحاجة اليها... كالسد الترابي «Earth Dam» والسد الحجري أو الكونكريتي «Masonry - Concrete Dam» ولكل منهما أنواع وألوان عديدة صُممت لأغراض معينة.

في مستهل بناء كل سدّ تجري كشوفات هايدرولوجية وجيولوجية واقتصادية وافية دقيقة للمنطقة، بعد ذلك ويقرر اقامة السد أولاً، لانه يقارن مابين (مردودات السد) «اندثار السد والخسائر الناتجة منه»، ولغرض اقامته ينبغي ان تكون المردوودات اكبر بكثير من الاندثار والخسائر التي لابد منها..

وبعد ذلك يصمم السد حسب متطلبات المنطقة وكمية المياه المطلوبة والطبقات الجيولوجية اضافةً الى المشاريع التي تعتمد عليه.. كالطاقة الكهربائية ومشاريع الري واسالة المياه.. الخ..»

**«السّد» بشكل عام يتكون من الأجزاء التالية:**

(١) جسم السد:

الجزء الهام والخطير، وهو أكبر جزء للسد يقوم بحصر المياه.

(٢) المسيل:

يسيل فيه مافاض وزاد من المنسوب المصمم للسد، فيجري في هذا الجزء الذي يتكون من قناة مفتوحة التي تمتد من اعلى السد الى اسفله تدريجياً.. وبذلك يصان السد والمنطقة من المخاطر والاضرار الجسيمة والهدم.

(٣) احواض المتهدئة:

تقام هذه الاحواض في سفح المسيل واحد تلو الآخر لتخفيف زخم المياه وطاقتها حتى لا يهدّم اساس السدو جسمه أخيراً.

(٤) المبزل «المنفذ الخارجي»

وهو المجرى الرئيسي في السد الذي يجري منه الماء - المفروض - المستمر للمنطقة...

(٥) قاطع المياه:

هذا الجزء يكون تحت جسم السد وعلى عرض النهر وفائدته منع مرور الماء - المتسرب في طبقات الأرض - تحت جسم السد والذي يهدّ كيان السد من الاساس.

(٦) جانبا السد:

يقعان على جانبي السد الأيمن والأيسر ويتعرضان للموجات العنيفة المستمرة للماء المتموج ولذلك ينبغي أن يكونا قويين تعمل الزخم الهائل كي يحول بينه وبين هدم الجانبين.

(٧) المحطة الكهرومائية:

يصمم في التصميم الاساسي للسد مكان لنصب محطة لتوليد الطاقة الكربائية مع مراعاة نوعية السد وحجمه وسعته..

# وەرزو ساڵنامەی کوردی
# لە پەندو قسەی نەستەقی کوردی دا

د. شوکریە ڕەسوڵ

## پێشەکی:

(پەندی پێشینیان بەشێکی گرنکی فۆلکلۆرە. بەرزیو جوانیی زمان، لایەنی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕامیاریو فەلسەفی ژیانی گەلی کوردمان بۆ دەردەخات. . پەندی پێشینیان کە بەشێکە لە فۆلکلۆر. . کۆمەڵێ تاقی کردنەوەی خۆشیو ناخۆشی چینەکانی گەل دەردەبڕێو لە شارەزاییو پسپۆڕیی پێشینانەوە سازبووە، لە دڵ و دەروونیانەوە هەڵ دەقوڵێو لەسەر زاریان بۆ پتەوکردنی قسەکانیان بەکاری دەهێنن.

پەندی پێشینیان لە ئەنجامی ڕووداوێکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دروست بووە، بووە بە دەستوورو یاسایەکی ژیانی کوردەواری. بە بۆنەی هەموو ڕووداوێکەوە پەند بەکارهاتووە.)

«کورد بیری لەوە کردۆتەوە کە یاسای سروشت و مرۆڤ هەمیشە لە گۆڕان دایە. ئەم گۆڕانەیش بە پێی گۆڕانی دیاردەکانی سروشت و دەوروبەری مرۆڤ بە ئەنجام دێ. یەکێ لەو دیاردە سروشتییانەی ژیانی گەل، گۆڕانی دەوروبەرو ئاوو هەواو وەرزەکانی ساڵە. کە هەریەکەیان جۆرە ناوێك و جۆرە خاسیەتێکی تایبەتیان بۆ ڕازاندنەوەی دەشت و کێوو هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەگەڵ وەرزەکاندا دروست کردوە. ئەم گۆڕان و هەڵسوکەوتەی خەڵك، ئەرك کێشانیان لە ژیان دا بووەتە هۆی دروست بوونی وەرزەکانی ساڵ بە هۆی سوڕانەوەی زەوی بە دەوری ڕۆژدا، سوڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا، ساڵنامەیەکی کوردی پێك هێناوە، لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی شێوەی ژیانی گەل و ئاوو هەوای ناوچەکە دروست بووە، ئەمەش بە هۆی هەڵاتن و ئاوابوونی ڕۆژو دەرکەوتنی ئەستێرەکانی «گەلاوێژ و حەوتەوانەو سیوەیل و کاروان کوژەو قوتب» حسابانی ساڵ و مانگ و وەرزەکانیان زانیووەو تەجروبە کراوە. لای کوردەوار هەرکاتێ ڕۆژ لەلای دەستە ڕاستەوە گەڕایەوە بۆ لای دەستە چەپ، ئەمە سەرەتای زستانە، کاتێکیش گەیشتە ئاوابوونی ئەستێرەی گەلاوێژ نیوەی زستانە، هەرکە لە جێگای ئاوابوونی ئەستێرەی تەرازوو ڕەت بوو، سەرەتای بەهارە، ئینجا کە گەڕایەوە بۆ لای دەستەڕاست، ئەوە نیوەی هاوینە، خۆ ئەگەر ئەستێرەی گەلاوێژ هەڵات، ئەوە نیوەی هاوینە، هەرکاتێ بەرانبەر تەرازوو بۆوە، ئەوا سەرەتای پایزە، کە گەیشتەوە جێگای گەلاوێژ، ئەوەیش نیوەی پایزە، هەروەختێکیش گەڕایەوە بۆ لای دەستەچەپ، ئیتر سەرەتای زستانە. [1] جا بە هۆی تاقی کردنەوەی ئەم شێوانەو سیستێمی ناوچەکە، [2] لە پەندی پێشینان دا ئەم لایەنانە ڕەنگی داوەتەوە. ئەگەر بڕوانینە هەڵکەوتی نەخشەی کوردستانی عیراق و جۆری ئاوو هەواکەی بە پێی ناوچەکانی، بۆ هەروەرزێك، چەندین پەندو قسەی نەستەق [3] لە ڕازاندنەوەو خەملاندنی وەرزەکەدا کە وشیاریو دنیا دیدەیی کورد لە پەندی پێشینان دەردەخات وتراوە.

لەم لێکۆڵینەوەدا، کە ڕەنگە هێشتا دەستی لێکۆڵەرەوەی نەگەیشتبێتێ دەمانەوێ هەندێ لایەنی شاراوەی پەندی کوردی بە پێی ساڵنامەی کوردیو وەرزەکانی ساڵ و ئاوو هەوای ناوچەکە، هەڵکەوتی باری جوغرافی ناوچەکە باس بکەین.»

## پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی لە ڕووی ئاوو هەواوە

«ئاشکرایە کوردستانی عێراق لە چەند زەویو زارێکی دەشتاییو کەژاوی پێك هاتووە. ئەم وڵاتە لە ٦٪ پێوانەی عێراقی گرتۆتەوە. سنووری لە باکوورەوە لە چیای بێ‌خێرەوە

دەست پێ دەکات. لە باکووری ڕۆژئاواوە لە نزیك زاخۆوە بە چیای سپی ڕیزی لای دهۆك و چیای ئاکرێدا (کە شاری ئاکرێ بەلاپاڵیەوەیە). ئەنجا بە چیای هەیبەت سوڵتان و چیای سەگرمەو قەرەداغ دا دەڕوات. لە باشوورەوە لە بەستەکەی دەربەندیخان دا دوایی دێت. ئینجا بەرەو سنووری ئێران درێژ دەبێتەوە.»

ئەم چیاو سروشتانە دیمەنی ڕەسەن و تایبەتی یان بە ناوچەکە بەخشیوە. ئەم ناوچانە بە هۆی بارو هەڵکەوتی ڕووی خاکی عیراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی لە ڕووی ئاوو هەواو پلەی گەرماو سەرماو ڕووەکەوە، جیاوازە.

ئەگەر گەشتێك بە ناو ئەو پەندو قسەی نەستەقانەدا بکەین کە پەیوەندی یان بە وەرزەکانی ساڵەوە هەیە دەبینین ئەوانە لەسەر بنچینەو بناغەی ئاوو کەش و هەوا دانراون و بە پێی بەرهەم و زیاد بوونی بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵەوە گرنگی بە ئاوو هەواو کەشەکان دراوە. «بە گشتی ئاوو هەوای کوردستان بە پێی پلەی گەرماو سەرما دەگۆڕێ. هاوینی ناوچەی گەرمیان گەرمەو بەهارو پایزیشی کورتە. هەرچی ژووررووی کوردستانە ئاوو هەوای کوێستانی یە. واتە زستانی درێژو ساردەو بەفرو بارانێکی زۆر دەبارێت و بەهاریشی زۆر کورتە، زۆرجاریش بەهار لەگەڵ زستان دا یەك دەگرنەوە.

کەواتە بارو دۆخی جوغرافی کوردستان کارێکی گەورەی لە ئاوو هەواکەی کردووە. وەرزەکانی ساڵ بە گوێرەی ناوچە جیاوازەکانی گەرمیان و کوێستان دەگۆڕێن و وەرزەکانیش هەریەکەیان بەسەر ساڵ دا بە گوێرەی دابەش بوونیانەوە دابەش دەبن. هەروەرزێکیش بەسەر چەند مانگێك دا دابەش دەبێ و مانگەکانیش هەریەکەیان ناوێکی تایبەتیان هەیە لەناو مانگەکانیش دا چەندین زاراوەی جۆراوجۆر پەیدابووە، هەرکامێکیان بگری نیشانەی ساردی و گەرمی و تایبەتیەتی خۆی هەیەو بە هۆی بەرووبوومی کشتوکاڵەوەو چۆنیەتی تایبەتیان لێك دەدرێتەوە. ئەم ئاوو هەوایەش کارێکی زۆری لە جۆرەکانی ڕووەك کردووە. هەر بۆ نموونە لە ناوچە شاخاوی یەکان دا چەندین جۆرە گوڵ و گیاو شینایی دەڕوێت. ئەم گوڵ و گیایە دەشت و دەرئەخەمڵێنێ و ئەوە دەردەخات کە ناوچەی چیا چ کارێك دەکاتە ئەو هەمندە بارانەی لەم ناوچەیەدا دەبارێ و باخ و باخاتی دارمیوەی هاوینە بە تایبەتی ترێ و گوێزو چوالەو قەیسی و قۆخی پێدا بلاوبۆتەوە. ئەم جیاوازی بەرووبوومە وەك دەرکەوتووە، تەنها بە هۆی زەوی یەوە نی یە، بەڵکو ئەم هۆیانەش کاری تێ دەکات:

١ - دووریان لە هێڵی یەکسانی یەوە.

٢ - زۆری بەرزی زەوی.

٣ - چڕی ڕووپۆشی ڕووەك.

ئەمانە لە گۆڕانی ئاووهەوای وەرزەکانی ساڵ دا هۆیەکی سەرەکین. کورد بە هۆی جیاوازی ئاوو هەواو ڕەگەزەکانی یەوە کە باو بارانە توانیویەتی حسابێك بۆ ساڵنامەی بەپێی کات و[٤] شەوو ڕۆژو هەفتەو مانگ و وەرزەکانی یەوە بکات. (پەندی پێشینیانی کوردی جێگایەکی تایبەتی لەم بابەتە گرتووە کە لە ئەنجامی تاقی کردنەوەو هەڵسەنگاندنی بەرووبوومی ساڵانەو کەم بوونی بەرهەم و هۆیەکانی کەم و زۆری بەرهەمەوە توانیویانە بیروڕای خۆیان لە ڕستەیەکی کورتی پرواتاو زاراوەیەکی تایبەتی ئەو وەرزەدەربڕن. ئیتر لەمەوە پەند بۆ وەرزەکان سەری هەڵ داوەو وەك لە پێشەوە دەست نیشانمان کردن هەموویان لە ئەنجامی تاقی کردنەوەوە دروست بوون لەگەڵ هەڵسوکەوتی ژیان و مل ملانێ کردن بووە لە سروشت دا.)

## وەرزەکانی ساڵ لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا

ئاشکرایە ئاوو هەوای ناوچە شاخاوی یەکان بە پێی پلەی گەرماو سەرما، یاخود لە ڕووی باو بارانەوە دەگۆڕێ کە هەریەکە لەم ڕەگەزانە کاری گشتی لە ئاوو هەوای کوردستان کردووەو بە شێوەیەکی گشتی لە کوردستان دا دوو وەرزی سەرەکی بە ئاشکرا دیارە:-

(١) وەرزی گەرما، یا هاوین

(٢) وەرزی سەرما، یا زستان

وەرزی زستان

---

لە تەشرینی دووەم (بەفرانبار) کە مانگی یەکەمی زستانە تا

کۆتایی (ئازار) یاخود (بانەمەڕ) دەست پێ‌دەکات... ئاوو هەوا لە زستـان دا بە پێی ناوچـە جیـاوازەکـان کە (بـا) دەگـرێتـەوە دەگـۆڕێ. لەم وەرزەدا هەورێکی زۆر رووی ئاسمـان دەگـرێ‌و بارانێکی زۆر دەبارێ، لەم مانگەدا (بەفرانبار) شەو درێژ و رۆژ کورتـەو (چلە)ش دەست پێ‌دەکـات. لە ژووررووی کوردستـان زستانێکی سەخت و سەرماو سۆڵە دێت و بارانێکی زۆر دەبارێت بە تایبـەتی لە (٢١)ی کانـوونی یەکـەم (رێبـەندان) تا کۆتایی کانوونی دووهەم (رەشەمە) کە (برجی پیرەژن)[٥] یاخود سەرمای پیـرەژن و پیـرە سەرمـای پێ دەڵێن. لەم کاتـەدا دنیـا زۆر سارد دەبێت و زەوی دەبیـەستێ‌و بەفـرێکی زۆریش لەسـەر چیـاکـانی کوردستـان دەبـارێت و لە داوێنی چیـاکانیشەوە کۆ دەبێتەوەو زۆر جاریش رێگـاویــان دەگیــرێت. لە مانگی (رێ بەنــدان) کە بەفرەگەورە کەشی پێ ئەڵێن. کە هاتووچۆکەم ئەبێتەوە بە تایبەتی لە هەنــدێ شاری وەك دهــۆك، ئامێــدی‌و رەوانــدزو زاخــۆو سلێمـانی‌و کۆیـەو پێنجـوین و چوارتـابـەم بۆنـەیەوە گەلێ پەندی پێـشـیـنـــان لە زووی ساردی ئەم وەرزەوە دروسـت بووە کە رەنگدانەوەو خاسیەتی ئەم مانگە دەردەخات وەکو:

**بە زستان جارێك ئـەڵێن ساردە**[٦]

**یـــاخـــود**

**یەك جار بە زستان ئەڵێن ساردە.**

کورد بەپێی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەم وەرزەدا هەر لە مێژەوە بۆی دەرکەوتووە کە زستان ئەگەر لە سەرەتاوە سارد بوو ئەوە ئەو وەرزە هەر سارد دەبێ، هەر بۆیـە لە پەنـدێکی تردا زیـاتـر ئەوە چەسپیووە کە: سەرمای زستان لە ئەووەڵەوە دیارە.[٧]

خۆ ئەگـەر سەرەتـای زستـان سارد نەبێت ئەوە لە کۆتـایی‌دا دنیـاسـارد دەبێت و بە پێچـەوانـەی پەنـدی سەرەوە.... لەم بارەیەوە کورد دەڵێ:

**زستان یا سەر وەشێنە**

**یـا دوا وەشـێـنـە**[٨]

ئەگـەر زستـان دنیـا خۆش بوویێ بە لای کوردەواری‌یـەوە شتێکی سەیربووە چونکە سفەتی زستان ساردی‌و سەرماو سۆڵەیە جا ئەگـەر زستـان خۆش بوویێ لە کۆتـایی‌دا جەزرەبـەی خۆی هەرگەیاندووە بۆیە کورد (خۆشی زستان و زەردەخەنەی دوژمنیان بە یەك چاو تەماشاکردووە) وەك دەڵێ:

**(بە خۆشی زستان و زەردەخەنەی دوژمن باوەڕمەکە)**[٩]

کورد بە هۆی هەوریشەوە توانیویەتی حسابی باران بارین بکات ئەویش بە هۆی رەش و سووری‌و تاریـکـی‌و روونـی هەورەوە، ئەگـەر هەور ـ دوور کەوتــەوە ئەوە باران نابـارێت و کاروان بە ئاسانی دەڕوات.... ئەگەر لە قبلەوە هەور تاریکی کرد ئەوە باران دەبارێ‌و ئەگەر باران خۆشی کردەوە ئەوە نیشانەی خۆشی‌یە لەم بارەیەوە کورد وتویەتی:

**هـەور رۆیی بـۆ شـارەزوور**

**کاروان برۆ بۆ رێگەی دوور**

هەر لەم رووەوە پێشینـان باوەڕیـان وابـووە ئەگـەر هەور بەرزو بەری ئاسمان رووناك بێ ئەوە باران نابارێ، یاخود ئەگەر هەور سپی بێ‌و بای لەگـەڵ دا بوو دەرەوێتـەوەو دوور دەکـەوێتـەوە پێشینیان لەم رووەوە وتوویانە:

**هـەوری تـاڵە**

**گرمـەو نالـە**

**چەخماخەی جەخت**

**بـارانی سەخـت**

کورد هەر لەم وەرزەدا، واتــە وەرزی زستــان. ئامـۆژگـاری جوتیار دەکات ئەگەر هەوری سوور هات نیشانەی کەم بارانی‌یەو ئەگـەر هەوری رەشیش هات ئەوە نیشـانـەی شەستـە بارانەو لەم بارەیەوە لە پەندی پێشینان دا ئەو تاقی‌کردنەوەیە دەرکەوتووە کە دەڵێ:

**هەکە هات عەڤری سور لە بەیانی**[١٠]

**خـوە بـدە بـن بـە یـارانـی**

**هەکە هات عەڤری رەش لە هێڤارانی؟**

**خـوە بـدە بـن نـەهـانـیـانـی**[١١]

لە پەنـدێکی تری پێشینـان دا کورد گەیشتـۆتـە ئەوەی کە لە هەر شتێك دا جۆرە سفەت و خاسیەتێکی تایبەتی دەربخات.

**لە زستان شەوێ**

**لە پیران تەوێ**

**لە بۆرە سواران هەوێ**[١٢]

لە پەنــدێکی تــردا زیــاتـر خاسیـەتی ئەم وەرزەو وەرزەکـانی‌تـر دەردەکـەوێ وەك ئەوەی وەرزی زستــان لەبـەر ساردی‌و سەرمـاو سۆڵـەی مرۆڤ حەز بە ئاگـرو گەرم کردنـەوەی خۆی دەکـات بە

پێـــچـــەوانـــەی وەرزی بەهـــار. کە مرۆڤ ئارەزووی چوونـە سەیـــرانیـــەتی و بەروبـوومی زەوی زۆر دەبێت و ئاژەڵ و پەلـەوەر زاوزێ دەکـــەن بە فراژی دەکـەون، وەرزی هاوینیش میـوە زۆر دەبێت و ڕەزو بێستانیش بە میوەی هەمە چەشنە دەڕازێتەوە وەك لەم پەندەدا دیارە:

**زستانان ئاگرو ئەز**
**بـواران ئـەزو پەز**[13]
**هاوینان ئـەزو ڕەز**[14]

لە ناوچـــە شاخـــاوی‌یـەکـان دا مانگی شوبـات بە مانگی سارد دادەنـــرێ کە بەفـرو باران دەبـارێ‌و هەر زیـاتـر بۆ سەلمـانـدنی ئەوەش کورد دەڵێ:

**شوباتی بەفرو باتێ**
**کـــچ ژ گـیـاتـێ**
**کـور ژ داراتـــێ**

لە ڕووی زستانەوە مرۆڤ هەوڵ دەدا لەم وەرزەدا خۆی پۆشتە کاتەوەو بەرگی گەرم لەبەر کات بە پێچەوانەی هاوینەوە مرۆڤ هەوڵ دەدا جل و بەرگی سووك لەبـــەر کات لەبـــەر گەرمی ئاوو هەوا جا لەم ڕووەوە پێشینـــان ئامـۆژگـاری خەڵکیان بە پەندیکی کورتی پڕ واتـــا کردووە، کە زستـــان چەنـد جل و پەڕۆوپیتـاڵ لە خۆی بپۆشێ‌و چی دەست کەوت لە بەری بکات باشترە، وەك دەڵێ:

**زستانان پینەو پەڕۆ**
**هاوینان ورد ورد بڕۆ**[15]

وەرزی زستان بریتی‌یە لە چەند مانگێك، هەر مانگەش لە ڕووی ساردی‌و جۆری بەرووبوومی‌یەوە ناوێکی تایبەتی هەیە، هەر مانگەش چەند حەوتوویەکی هەیە کە هەریەکەیان نیشانەی خۆی‌و ڕووداوو چیـــرۆکـێـکـی لەو ماوەیـــەدا بە هۆی ساردی‌و بەرووبوومی ئەو کاتەوە دەردەخات وەك مانگی (بەفران بار) کە مانگی یازدەیە یەکەمی مانگی زستانەو مانگی (ڕێبەندان) کە ناوەڕاستی زستانەو بەفرو بارانێکی زۆر دەبارێت و ڕێگاوبان بە بەفر دەگیرێ‌و بەفر ڕێژەیەکی تایبەتی لە ئەستووری داگیر دەکات بە تایبـــەتی ناوچـــە سەختـەکـانی وڵات. لەم مانگـەدا (چلەی زستان) دەست بێ دەکات.[16] کۆتایی زستان لە مارت دایە کە مژدەی بەهـارو نەورۆزو گولانـە. وەرزی زسـتـان وەك لە پەندی پێشینـــان دا ڕەنگی داوەتـەوە بەسـەر (دە) حەوتوودا دابەش بووەو هەر حەوتوویەکیش ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەك:

| ناوی هەفتەکان | سەرەتای هەفتەکان بە مانگی کوردی |
| --- | --- |
| ١. پێدڵخە (بەرخندە) | ١٢ی بەفرانبار |
| ٢. بێرەندە (بێڵندە) | ١٩ی بەفرانبار |
| ٣. میرەم | ٢٦ی بەفرانبار |
| ٤. ئۆغەن | ٣ی ڕێبەندان |
| ٥. پیت | ١٠ی ڕێبەندان |
| ٦. پاڵوز (پاڵ) | ١٧ی ڕێبەندان |
| ٧. خدر | ٢٤ی ڕێبەندان |
| ٨. ئەلیاس (پشکۆی هەوا) | ١ی ڕەشەمێ |
| ٩. پشکۆی ئاو | ٨ی ڕەشەمێ |
| ١٠. پشکۆی زەوی | ١٥ی ڕەشەمێ[17] |

بە لێکدانەوەی حەوتووەکان بە ناوی تایبەتی مانگەکانی زستان دا بۆمان دەردەکەوێ بێدڵخە (بەرخند)و (میرەم) لە حەوتووە هەرە ساردەکانی وەرزی زستانە کە زریان و باوبۆران و ڕەهێڵەو ساردی دەست پێ دەکات. هەرچی حەوتەی میرەم و ئۆغەنیشە کە ناوی ژن و مێردێکە.[18] دەگێڕێتەوەو چیرۆکێکی فۆلکلۆری‌یان لەسەر وتراوەو لەبەر ساردی زستان و گۆڕانی ئاوو هەوای ئەو مانگە بە هەفتەی پێنجەم و شەشەمی هەفتەکانی ڕێبەندان دەڵێن پیت و پاڵۆس یاخود (پیت و پاڵۆز)[19] (پاڵ). بەم بۆنەیەوە سەرمای ئەم مانگە هەرچەندە ڕێبەندانە لەبەر بەفری زستان بەڵام لە ڕووی کەشەوە هەواکەی زۆر ساردە لەم ڕووەوە، ئەم دوو هەفتەیە لە پەندی پێشینیانی کوردی‌دا ڕەنگی داوەتەوە کە:

**پیت پاڵۆز ساڵ بووئاڵۆز.**

یـــاخـــود:

**پیت ئەگەر لە خۆت نەریت بە کەرتك دەبیت.**

یـــا:

**پیتی پیت کرد سالی فیت کرد.**

هەردەر یارەی هەفتەی پاڵوزیش وتویانە:

**پاڵوز سالی کرد ئاڵۆز.**

یــاخـــود:

پــال دەپــاڵــێـنـێ.

دوابــەدوای هەفتـەی پیت و پاڵـۆس هەفتـەی خدرو ئەلیـاس دوابــەدوای یەك دێن لە یەکـەم ڕۆژی ئەو حەوتـەیـەدا بای وادە هەڵ دەکـات، بەفـر دەتـوێنێتـەوە. ئیتـر ساردیو سری نامێنێ، مژدەی هاتــنــی نەورۆزە ـ چونــکــە هەژدە ڕۆژی بۆ نەورۆز ئەمێنێ [٢٠] . . . . و پەنگری هەوا بەر هەفتەی ئەلیاس دەکەوێ کە سەرەتـای هەفتـەی یەکـەمی مانگی ڕەشـەمێ دەکـات. . . . دەربــارەی خۆشی ئاوو هەواو بەفــر توانـەوەو مژدەی خۆشی ئەم مانگە کورد وتوویە:

خدرو ئەلیاس ساڵیان کرد خەلاس

کورد بۆیــە وای وتــوە، چونکـە حەزرەتی خدرو ئەلیـاس لە کاتی تەنگانەدا فریای خەڵك دەکەون. لە سەرماو سۆڵەی چلەی زستان ڕزگاریان دەکەن. لەم دوو هەفتەیەدا. ئاوو هەوا خۆش دەبێت و کەش بەرەو گەرما دەچێت هەر لەم بارەیەوە لە پەندی پێشینان دا ئەم ڕاستی‌یە دەرکەوتووە کە دەڵێن:

کــە هــات خــدر
عارد دەبێ پەنگر [٢١]
پەیدادەبێ کەنگر

خۆ کە هەفتــەی ئەلیــاس هات ئەوە بە تەواوی دنیــا خۆش دەبێو ساڵیش لە سەرما ڕزگاری دەبێ. کورد لەم بارەیەوە وتوویەتی:

کە هات ئەلیاس سەرما دەبێ خەلاس [٢٢]

یــاخـــود:

کە هات ئەلیاس ساڵ دەبێ خەلاس [٢٣]

هەفتــەی ئەلیــاس واتـە (پشکـۆی هەوا)و پشکـۆی ئاوو پشکــۆی زەوی بەرمــانگی (ڕەشــەمێ) [٢٤] دەکـەون کە مانگی کۆتـایی ساڵـەو کۆتـایی زستـانیشـە لە ساڵنـامەی کوردی‌دا، لەم مانگەدا دەشت و دەر لەبەر شین بوونی گوڵ و گیا ڕەنگی ڕەش هەڵ دەگـەڕێت. هەر بۆیـە وتوویانە (ڕەشەمانگ)وە هەندێکی‌تر ئەم مانگەو ناوەکەی بە چەند شێوەیەك لە ناوی (ڕەشەمێ) یان کۆڵیـوەتـەوەو بۆ هەریـەکـەشیـان نیشانەو بەڵگەی تایبەتی هەر لە ناوەکەوە باس دەکەن.

هەروەك لەگــەلێ ڕووەوە ڕوونمــان کردەوە مانگی ڕەشــەمێ مژدەی خۆش و هاتنی وەرزێکی خۆشی بەدواوەیەو گوڵان دەست بە پشکووتن دەکەن: سرووشت بەرەو ڕازانەوەو جوانی دەڕوات، ئاژەڵ و مەڕو ماڵات دەبووژێنەوە، بەرووبوومی زەوی‌و ئاژەڵ لە زۆر بوونــایـە. . . بەم بۆنـەیـەوە ئەم مانگـە لە گەلێ ڕووەوە لە پەندی پێشینان دا ڕەنگی داوەتەوەو هەریەکەیان مەبەستێك دەگەیەنێ:ـ

ڕەشەمە ڕەش و تووشە
نە (کا) ماوە نەپووشە

---

ڕەشـەمێ ڕەشـەمێ‌یـان
دەغڵ براوە لە کەندوان
بە شەڕ دێنێ بوك و خەسووان

بەم شێوەیەش دەوترێ:

ڕەشــەمــە ڕەشــکـــی ڕەوان
بە (تار) دەکا (چار)و کـەندوان
بە شەڕ دێنێ بووك و خەسووان
ڕۆژ دەبێتە (سار)
نان دەبێتە (نار) [٢٥]
ڕەشەمەو ئادار ـ دوونە دەبنە چار
زك دەبێتە چار ـ پیاو دەبێتە قار
کات دەبێتە عەبدا ـ نان دەبێتە کار

پێشینیــان بۆ هەر وەرزێـك لە وەرزەکـانی ساڵنـامـەی کوردی پەندو حەکایەت و سەرگوزشتەو دەمەتەقێ‌یان درووست کردووە. کە لە ئەدەبـی سەرزاری‌دا ڕەنـگـی داوەتــەوەو بووە بە موڵــك و سامانی نەتەوەی کورد: چونکە لە گیان و سەرچەشمەی ژیانی ئەوان هاتــۆتــە دەرەوەو پسـپــۆڕان و شاعیــرانیش ئەم ئەدەبــە سەرزاری‌یـەیـان بۆ پتەوکردنی هۆنراوەکانیان وەرگرتووەو شیعریان بەســەر وەرزەکـــانی ساڵ دا وتــووە. یەکێ لەو شاعیـرانـەی کە تابلۆیــەکی ساڵنــامــەی کوردی بۆ نەخشــانـدووین مامـۆستـا نەجمــەدین مەلایـە. بێجگـە لەم شاعیـرە گەلێ شاعیـری وەك پیـرەمێـردو گۆران و کامـەران موکـری لە جوانی وەرزەکـانی ساڵ دوواون و گەلێ هۆنــراوەیـان هۆنیـوەتـەوە کە لە واقعی سروشتی کوردوستانەوە هەڵ قولاون هەروەها یەکێکی, وەك نەجمەدین مەلا لە هۆنـراوەیـەکی‌دا وەرزی زستـان، بە دەیـەمین مانگی دانـاوە،

ئێمەش لە کوتاییە باسی . ئەم وەرزە بە پێویستمان زانی لە ئەدەبی نووسراودا[٢٦] تۆماری بکەین. با بزانین شاعیر چۆن نەخشەی وەرزی زستانی بۆ نەخشاندووین و سیفەتی تایبەتی ئەم وەرزەی چۆن بۆ دەرخستووین کە لە کاتێك دا دەڵێ:

دەیەم بەفرانبار سەرەتای زستان
ئەوەی پێ ئەڵێن بەهاری مەستان
سپی پۆش دەبێ دەشت و هەردو شاخ
ئیتر نابینی سەوزە لەناو باخ
یازدەمین مانگیش کە (ڕێبەندان) ـە
بۆ ئامشۆی دۆست سەخت و گرانە
بەفر ئەبارێ تا پشتێنەی پیاو
هاوین دڵ گەرمین ئەیکەین بە بەفراو
دوازدەمین مانگی (ڕەشەمێ) دادێ
مژدەی نەورۆزو گوڵانی هاپێ
بەم پێیە ساڵ و مانگمان تەواوە
لە زۆرداری چەرخ کورد نەگۆڕاوە

## وەرزی بەهار

ئەگەر وەرزی زستان بە ساردی‌و بەفرو باران و سەرماو سۆڵە ناسراوە ئەوە بەهار بە وەرزێکی خۆش و سەیران و گەشت و گوزار ناسراوە کە سروشت بەرگی جۆراوجۆر دەپۆشێ ئاوو هەوا دەگۆڕێ سەرما تینی جارانی نامێنێ. تەمەنی ئەم وەرزە لەچاو وەرزەکانی‌تردا کورتەو جاروبار خەڵکی کوردستان پشت بە ئاوی باران دەبەستن بۆ کشتوکاڵ بە تایبەتی (گەنم و جۆ) ئەو بارانەش لە هەمان کات دا سوودی لە زۆربوونی شێی زەوی هەیە و زەوی سەوز دەبێت و سەوزەش زۆر دەبێت. هەندێ میوەو ڕووەکی جۆراوجۆریش پێ‌دەگا، لەوەرگای ئاژەڵ زۆر دەبێت لەم وەرزەدا زۆر چەشنە گوڵی خۆرسك شین دەبێ. وەك گوڵەنیسان، نێرگز، سۆسەن، لالەی هێرۆ، لاولاو، گوگەم، قیزبەلە، هەلاڵە، مێلاقە، شلێرە بەیبون، حاجیلە، خەزێمە، ئاگرو، شمری شاق، کوریکە، شەقلە شوانانە، یاخود چارەچەقیلە، زەردە لەگەڵ گوڵەباخ. . . . هەریەکە لەم گوڵانە جۆرە بۆن و بەرامێکیان هەیەو لەگەڵ ئەمەش دا دەشت و کێوو هەردو چیا دەرازێننەوە. لە ئەدەبی نووسراودا مامۆستا نەجمەدین مەلا دەربارەی جوانی ئاوو هەواو بەرووبوومی ئەم وەرزە لە (ساڵنامە)کەی‌دا بەم جۆرە لە وەرزی بەهار دەدوێ:

یەکەمین مانگمان کە خاکەلێوە
ئارایش دەری هەردەیەو کێوە
جەژنی نەورۆزو شایی‌و هەڵپەڕکێ
لە یەکەم ڕۆژی ئەم مانگەدا دێ
مانگی دووەمین کە بانەمەڕە
دەشت و کێو بە گوڵ جوان و بە فەڕە
دۆستانی ئازیز کوری دڵداران
ئەچنە سەرچنار بۆ بن چناران
لە دوای ئەو دادێ ئەم جا جۆزەردان
دەست ئەدەنە داس جووتیارو سەپان
ئەمە سێ مانگەی کزەی بەهارە
پاش و پێش ناکا هەر بەم بڕیارە

هەروەك مامۆستا نەجمەدین مەلا لە شیعرەکەی‌دا ئاشکرای کردووە کوردیش لە ئەنجامی گۆڕانی وەرزەکانی ساڵەوە یەکەم ڕۆژی ئەم وەرزەی بە ساڵی تازە داناوە. کە دەکاتە (٢١)ی ئادارەوە[٢٧] یەکەم ڕۆژی بەهاریشە لە هەمان کاتیش دا جەژنی نەورۆزە (١ی مانگی نەورۆز) ە. کەواتە بەهار یەکەمین فەسڵە لە چوار فەسڵەکەی ساڵ. بە پێی ئاوو هەوای نێو کورەی باکوری گۆی زەوی لەو ڕۆژەوە دەست پێ‌دەکات کە ڕۆژ دەچێتە کەلووی شەك لە ٢١ی ئازارەوە. کە ڕۆژی وەرگەڕانی بەهاری پێ دەوترێ شەوو ڕۆژ بەرامبەرن و[٢٨] ڕۆژی ڕزگاربوونە لە سەرماو سوڵەو زەیقەتی زستان.

بەم شێوەیە ساڵی کوردی لە مانگی نەوروزەوە دەست پێ دەکات و لە مانگی ڕەشەمێ کۆتایی دێت.

لە ڕووی ئاوو هەوای ئەم وەرزەوە دەتوانین ئەوە دەست نیشان بکەین کە ئاوو هەوای بەهار کاری لە گەڵێ ڕووەکی خۆرسك و ڕووەکی دی کردووە. ئەم گۆڕانی ئاوو هەواو باران بارینی ئەم وەرزە تێروبری‌و بزوێنی‌و جۆرەکانی ڕووەکی لەسەر وەستاوە، کارێکی زۆری لەو ڕووەکانەش کردووە کە بە شێوەی لاوەکی ڕواوون و بوونەتە هۆی زۆربوونی شیرو پەنیرو گۆشت و خوری‌و بەرووبوومی ئاژەڵ. بە شێوەیەکی گشتی مەڕومالات کە

سەرچاوەی ژیـان و دەرامـەتە دەبووژێنەوە. . . . خۆشی بەهارو زۆربــوونی بەرووبــوومی ئاژەڵ لە پەنـدی پێشینـانی کوردیدا رەنگی داوەتەوە. دەربارەی ئەم وەرزە کورد دەڵێ:

**بزمان لە سارا**[٢٩]

**رۆن لە بەهـارا**

مانـگی ئادار کە بە یەکـەم مانـگی بەهــار دەژمێــردرێ بە پیت ترین مانگی ئەم وەرزەیە کە شیرو دۆو پەنیرو ماست زۆر دەبێت. لەم بارەیەوە کورد دەڵێ:

**ئادار ناچێت بە بێ دۆ**

**نیسان ناچێت بە بێ جۆ**[٣٠].

یــــاخـــود:

**ئازار ناچێ بە بێ دۆ**

**نیسان نـاچێ بەبێ شۆ**[٣١].

بەم شێوەیەش دەوترێ:

تـار بـەبێ دۆ ناروا

نیسان بەبێ جۆ ناروا[٣٢]

مانگی ئادار بەوە بەناوبانگە کە شیرو پەنیرو کەرەو رۆن زۆر دەبێ، لەبـەر زۆربـوونی بەروبـوومی زەوی. هەربۆیە لە پەندی پێشینان دا ئەوە دەردەکەوێ کە لەم مانگەدا هەمیشە مەشکە بە دارەوەیە کە دۆو کەرەش دروست دەکات:

**ئادارە مەشکە لەدارە**[٣٣]

یــــاخـــود

**ئـادار مەشکە لە دار**[٣٤]

**لێرەش نە: لە ژەنگار**

پەندێکی‌تری کوردی دەڵێ:

**هـەژدەی ئاداری**

**دەنگ کرل بهارێ**

**مـەشـکـال دارێ**

**نـە ل هــێــرە**

**لچیایێ شنگارێ**[٣٥]

لە مانگی ئاداردا وردە تینی گەرما زیاتر دەبێ‌و حسابی زستان بە تەواوی نامێنێ بە تایبەتی رۆژانی هەژدەو بیست و یەکی ئەم مانگەدا مژدە بە بەهار دەدات کە سەری دارو بنی دار بە تەواوی دەخەملێ‌و ئاژەڵیش تێر گژوگیا دەخوات و چیاکانی کوردوستان لە جوانـی ئەم مانگــە بەرگێکی‌تــر دەپــۆشن. وەك لە پەنــدی پێشینان دا دەرکەوتووە:ـ

**بەفری ئاداری.**

**بکەوێ هەتا گوێ دارێ**

**نـامێنی تـا ئـێوارێ**[٣٦]

ئەم پەندە بەم شێوەیەش دەوترێ:

**مانگی ئاداری**

**بـەفر دەبارێ**

**هەتـا گـروپـکی دارێ**

**نامێنێ هەتا ئێوارێ**[٣٧]

پەندێکی‌تر لە رۆژەکانی مانگی ئادار دەدوێ‌و زیاتر خاسیەتی ئەم مانگەو ناوەراست و کۆتایی ئەم مانگەمان بۆ روون و ئاشکرا دەکات:

**هەژدەی ئاداری**

**دەنگ کر ل بوهارێ**

**مەشکا ل دارێ**

**نەلهێرە**

**لجیا شنگارێ**[٣٨]

پەندێکی‌تری پێشینیان دەڵێ:

**لە حەڤدەو هەژدەی ئاداری**

**مەلەك دێتە خوارێ**

**دەنگ دەکا ل بهارێ**

**بەفر دەکەوێ**

**هەتا گویێ دارێ**

**نامێنێ هەتا ئێوارێ**

هەروەها پەندێکی تر بەم جۆرە لە کۆتایی مانگی ئادار دەدوێ:

**بیست و یەکی ئادار**

**سەری دارو بنی دار**

**تێر خواردنی بزن و کار**[٣٩]

بێـجگــە لە مانگی ئادار، مانگی دووەمی بەهــار. ناوی گوڵان یاخود (بانەمەرو شەستەباران)یشی پێ دەڵێن لەم مانگەدا زیاتر بەرووبوومی کشتوکاڵ شین دەبێت بە تایبەتی دانەوێڵەی پۆلی گەنم و جۆ دەس بە پێك هێنانی گوڵ دەکەن.[٤٠]

لەم مانگەدا گوڵی دانەوێڵەی ئەو پۆلە پەیدا دەبێت و بۆیە پێی دەڵێن مانگی «گوڵان».

پەندی پێشینان لەم مانگەش دا ڕۆڵی تایبەتی خۆی وەرگرتووەو لەم بارەیەوە کورد وتویەتی:

**هەژدە لە نیسانێ**
**گێشە لە عەردی**
**کو لۆ لە ئاسمانی**[٤١]

**هەر دەربارەی مانگی گوڵان کورد وتوویەتی:**

**تەڤە کا بارانی**
**لە هەیڤا نیسانی**
**چێترە لە باگردانێکی زێری**
**نیڤا مەیدانی**[٤٢]

یــاخـــود:

**تە ڤەکا بارانی**
**لە هەیڤا گولانی**
**دوێت ما ل خوراسانی**

**وەرزی هاوین:**

---

ئەم وەرزە دوابــەدوای وەرزی بەهــار دێــت. ئەم وەرزە لە مایسەوە (جۆزەردان) تا سەرەتای ئەیلول درێژە دەکێشێ. . پلەی گەرمــاو تەمــەنی درێــژی ئەم وەرزە نزیکــەی چوار مانگــە. مانگـەکـانی ئەم وەرزە لە ڕووی گەرمی یـەوە جیـاوازییان هەیە. مرۆڤ لە مانگی مایس دا هەست بە گەرمایەکی زۆر دەکات و وردە وردە گەوما تینی زیاتر دەبێ ئەویش لە مانگی حوزەیران دا - پووش پەر) چونکە ئەم مانگە شێی زۆر دەبێت و ڕۆژی ئەم مانگە درێژەو دوازدە سەعات زیاتر دەخایەنێ.

لەم مانگــەدا ئاسمــان سایـەقـەی سامـاڵـەو هەوری نی یـە. ڕۆژیشی زۆر گەرم و وشکــە بەتـایبـەتی لە گەرمیـان. بەڵام لە کوێستان و ناوچە شاخاوی یەکان دا لەبەر فێنکی ئاوو هەوا مرۆڤ زۆر هەست بە گەرما ناکات وەك لە گەرمیان دا هەیە.

لە ڕاستی دا سنــوور دانــان بۆ مانــگ و وەرزەکـانی ساڵ کارێکی گران و دژ وارە. لە زۆر کات دا مانــگــەکــانــی هاویــن درێــژە دەکێشێ کە لە مانگی مایسەوە (جۆزەردان) تا سەرەتای مانگی ئەیلول و وەرزی زستانیش لە تەشرینی دوهەمەوە تا شوبات.[٤٣]

مانگە بنەرەتیەکانی وەرزی هاوین پووش پەڕو خەرمانان و گەلاوێژ ن.[٤٤] مانگی پووش پەر یاخود پووش کاڵ ناوەکەی بە خۆیەوەیەتی کە لەو کاتەدا لەبەر ووشك و برنگی و تینی گەرمی پووش زۆر وشــك و ناســك دەبێت و لەبـەر وشکی ڕەنگـەکـەی (کــاڵ) هەڵ دەگــەڕێت. هەروەهــا لە نیـوەی ئەو مانگـەدا بای (هـۆرە) یاخـود (شـەرا) هەڵ دەکـا بۆ ماوەی دوو مانـگ بایەکی یەکجـار گەرمـە (پێچەوانەی بای شەماڵ)[٤٥] هەڵ دەکات و ئاوو هەوای ئەم مانگە زۆر گەرم و وشك برنگ دەبێتەوە تووتن و بامیەو باینجــان و تەمــاتـەو بیبـەر «بژارو ناوکێـڵ» دەکـرێت. مانگی خەرمـانـانیش کە دووەم مانگی هاوینـە (جۆخێنان و زەخیران)ی پشی پێ دەڵێن کە کاتی هەڵگـرتن و لە عەمارکردنی بەرووبوومی دانەوێڵەی پێویستە بۆ زستان. ئەو مانگە زۆر گەرمە لە گەرمیان زیان لە زۆربەی بەرهەمی کشتووکاڵ دەدات و[٤٦] هەمووی بەر چلەی هاوین دەکـەوێت، میـوەجـاتی هەنجیرو تووتن و کاڵەك و خەیارو ترۆزیش پێ دەگات.

مانگی گەلاوێــژیش دنیــا بەرەو فێنکی دەروات، ئاوو هەوا خۆش دەبێ لە میوەجات هەموو جۆرە هەنجیرێك زۆر دەبێ، هەندێ جۆرە ترێ پێ دەگەن و قۆخ و هەڵوژە زۆر دەبن.[٤٧]

بە شێــوەیــەکـی گشـتـی گەرمـتــرین مانگی هاوین مانگی خەرمـانـانـە کە لە ئەدەبی سەرزاری بە تایبەتی پەندی پێشینانی کوردی ڕەنگی داوەتەوە. دارو درەخت، گژوگیا دەبێتە پووش و پەڵاش وەکــو خرنــوفـکی لێ دێ و گەڵاکــانی هەڵ دەوەرێ. بۆ نمـوونـە لەم ڕووەوە کورد دەربـارەی مانگی حوزەیـران زیـاتر لە هەموو مانگ ئانی تر پەندی دروست کردووە، لە هەموو شیان دا نیشانەی تەڕی ئەو مانگە دیارە:

**حزیران خنزری**
**چوتشت خۆ لەبەر ناگرێ**
**ژ بلێ خرنوفکی و داراترێ**

بەم شێوەیەش ئەوترێ:

**حزیران خنزری**
**چ خوّل بەرناگری**
**ئیلامیوە تری**
**بنێ شاڤری**[٤٨]

ھەندێکی تری کورد کە زیاتر گەرمایی ئەم مانگە دیارە هەژدەی حوزەیرانەوە دەڵێ:

**هەژدەی حوزەیرانێ**
**دەشت چوو قابانێ**

یـــاخـــود:

**خەزیرانێ**
**چرینگە چرنیگا داسانێ**[٤٩]

لە پەنـــدێکـی تردا ئەوە دەســەلـمێـنێ کە لەم مانگــەدا ترێ پێ دەگات و دەکەوێتە بازارەوە:

**تێرماو یاخێ**
**ترێ کەفتە ناف ئاخێ**[٥٠]

یـــاخـــود:

**طەباخێ گورێ رابیژ ئاخێ**
**میە گرت کە ماخێ**
**میوەیش کەتنە مشتاخێ**[٥١]

ماوەی گەرمـی هاویـن چل ڕۆژە دەڕۆژە دە ڕۆژی کۆتـــایـی حوزەیران تا کۆتایی تەموز دەکەوێت. کە مامۆستاو شارەزایانی ساڵنـامـەی کوردی حسـابی چلەیـان کردووە دواین را دەربـارەی چلە مامۆستا کەریم شارەزا بە وردی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری‌دا بەم شێوەیە لێکی داوەتەوە کە لە ٢١ی حوزەیرانەوە کە بەرامبەر (٣١) جۆزەردان دەوەستێ. تاکـو دەگـاتـە (١٤)ی تەمووزی ڕێکەوتی (٢٣)ی پووش پەڕ) دەکـــەوێتـە پێش چلەوە. لە ڕۆژی (١٥)ی تەمـــووز ڕێکـــەوتی (٢٤ی گەلاوێـــژ) ئەمـەیـان ڕاستـە چلەی هاوینـــە. . . . کەواتـــە چلەی هاوین گەرمتـــرین کاتی وەرزی هاوینـەوە نەبێ هەر لە پەنـدی کوردی‌دا ئەمـە ڕەنگی دابێتـەوە، بەڵکـو لە پەنـدی پێشینـانی عەرەبیش دا ڕەنگی داوەتەوە.[٥٢] لە پەندی پێشینانی کوردی‌دا لەم بارەیەوە وتوویانە:

**چل وچل، ماڵا خۆببە، سەری مل**

یـــاخـــود:

**چلە چلی پشتی چلێ**
**ماڵا خوە ببە سەری ملێ**

وە نەبێ وەرزی هاوین هەر لە ڕووی ئاوو هەواو بەرووبووم و بەرهەمەوە دەوری خۆی ببینێ هەروەها ئەم وەرزەش چووەتە ناو پەندی پێشینانەوە لەم وەرزەدا لە ڕووی ئابووری‌یەوە مرۆڤ وەك وەرزەکانی تر هێندە پارەو پول بۆ جل و بەرگ سەرف ناکات، ئەمــەش بەختی هەژارە کە کەم دەرامــەت و بێ‌پـارەو پوولـە لە هەرکوێ بێ دەتوانێ بژی. ئەم وەرزە بە لای هەژارەوە وەکو زێڕ وایە. بەم بۆنەیەوە پێشینان دەڵێ:

**هاوین بەڕەی فەقیرە**[٥٣]

یـــاخـــود:

**هاوین چۆخێنی فەقیرە**[٥٤]

یـــان:

**هاوینەو زێڕینە**[٥٥]

یـــا:

**هاوینە دارو بەردی زێڕینە**[٥٦]

لە وەرزەکـــانی ساڵنـــامـەی کوردی‌دا بۆ هەر وەرزێـك جۆرە خواردن و میـوەیـەك بەنـاوبـانگـە. ئەگـەر وەرزی زستان ترخێنەو ماشێنـەو ساوەرو گەنمـە کوتـاوی بە کەشـك، نیسـك و دانـدۆك بێت، ئەوا لە وەرزی بەهاردا کنگر ماسی‌و ماستاوو پەنیرو دۆیەو لە پایزیش دا دولمەو دۆینەو پەلپینەو دوخەوا (ماستی بە ماست و کفتـەی دەخـەنـە ناو دەی‌کـولێنن) لەگەڵ تولەکەو کاردوو پونگە، هەر بۆیە وتوویانە: دوو شت پێویستە لەم وەرزەدا:

**هاوینان دۆ، زستانان جۆ**

لە بۆنەیەکی تایبەتی‌دا کورد بۆ هەر شتە، کاتی خۆی بۆ داناوە وەك:

**کەنگرو ماست بە وادەی خۆی**

وەك لە وەرزەکانی تردا ڕوونمان کردەوە وەرزی هاوینیش لە ئەدەبی نووسراودا جێگای خۆی کردۆتەوە. یەکێکی وەکو مامۆستا نەجمەدین مەلا، بەم هۆنراوەیە لە وەرزەکانی ساڵ دوواوە، وە هەروەرزەشی بە پێی مانگــەکـانی دابـەش کردووەو خاسیـەت و نیشانەی ئەو مانگەی دەرخستووە، بۆ نموونە:

دوابـــەدوای وەرزی بەهـــار مانـگـی پووش پەڕ بە چوارەمـین مانگی ساڵ دادەنێ‌و دەڵێ:

**چوارەمین پووش پەڕ ئیتر هاوینە**
**گەرما ئاگری بە هێزو تینە**
**مرگ ئەکاتە بەر ڕووتەڵەو هەژار**
**بۆ دەوڵەمەندیش هاوینە هەوار**[٥٧]

دەربارەی مانگی پێنجەمی ساڵیش کە بە خەرمانان ناوی ناوە دەڵێ: **مانگی** پێنجەمیش کە خەرمانانە

**گەنم و نیسك و نوك بکرە هەرزانە**
**بەرە چەی زەوی خۆی دەخاتە گەر**
**زورداران دەیخۆن هەرار برسیو لەڕ** (٥٨)

**وەرزی پایز (خەزان)**

---

ئەم وەرزە سێیەمین وەرزی ساڵە. مانگی گەلاوێژ کە گەڵای درەختەکان لەبەر زیاد نەبوونی درەخت هەڵ دەوەرێن، دنیاش بەرەو ساردی دەڕوات. لەم وەرزەدا خەڵك گەلاو چڕوی داران کۆدەکەنەوەو ڕیزیان دەکەن بە نیازی هەلگرتنیان بۆ ئالیکی زستانەی ئاژەلیالی (٥٩) و مانگی سەرماوەزیش دوابەدوای گەڵاڕێزان دێت کە وەرزێکی ساردەو ئاوو هەوای کوردستان سارد دەبێ زۆرجاریش باران دەبارێ هەر لە نیوەی ئەم وەرزەدا بارانێکی تێکڕایی دەبارێت کە دەغڵ و دان و گیای پێ سەوز دەبێ‌و وشکەوەرد جوتی پێ‌دەکرێ. واتە نووکی گاسن لە وشکی زەوی‌گیر دەبێ‌و بەمەش دەڵێن پەڵە. پەڵەی پچووك کە لە بارینی باراندایەو پەڵەی گەورە واتە بارانی دووهەم جارە پاش بارانی پەڵە (٦٠)

لە ڕووی بەروبوومی کشتوکاڵ و زۆربوونی بەرهەمەوە لە هەندێ شوێنی کوردستان دا جۆ دەدورێتەوە، هەرمێ‌و قۆخ و سێوی سەردەشت دەمێنێ. . گوڵ و گەڵا دەست بە وەرین دەکەن، درەختەکان بەرگیان نامێنێ. . لە پەندی پێشینانی کوردی‌دا هەر لە ڕووی ئامۆژگاری‌و سوود بەخشینەوە ئەو پەندە دروست بووە کە نیشانەی هەوا سارد بوونەو ئامۆژگاری مرۆڤ دەکات کە لە پایزدا زوو بچێتە ژوورەوە لەبەر تەندروستی‌و ساغی لە هەمان کاتیش دا ئامۆژگاری ئەوەش دەکات کە لە بەهاردا مرۆڤ لەبەر خۆشی هەوا زوو بچێتە سەربان و لەم بارەیەوە کورد وتوویەتی:

**پایزان هەڕوە بنەبانی خانی**
**بواران هەڕوە سەربانی** (٦١)

هەر لە ڕووی ئامۆژگاری‌یەوە ئەوەش لە پەندی پێشینانی وەرزی پایزدا دیارە کە شیری ئەم وەرزە بە سوودوبەکەڵکە خواردنەوەی باشە هەروەك چۆن خواردنەوەی شیری بەهار بەلای دنیا دیدەکانەوە باش نی‌یە بدری بە خەڵك هەر بۆیە لەم بارەیەوە پەندی پێشینان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە:

**ماستی پایزا بدە عەزیزا** (٦٢)
**شیری بهارا بدن نەیارا**

کورد ئەوەی بۆ دەرکەوتووە شەوانی پایز درێژ و ڕۆژی کورتە بە پێچەوانەی بەهارەوەیە ڕۆژی درێژ و شەوی کورت لەم بارەیەوە پێشینان دەربارەی میوانی خۆشەویست و ئازیز ئەوەیان بەلاوە خۆش بووە کە میوانی ئازیز هەمیشە بمێنێتەوە. وەك درێژی شەوو ڕۆژی پایزو بەهار بەم بۆنەیەوە کورد وتویەتی:

**یاخوا بە خێر بێت میوانی ئازیز**
**بە ڕۆژی بەهار بە شەوی پایز**

لە کوتایی ئەم وەرزە ئەوەمان بە باش زانی کە پایزی ساڵنامەکەی مامۆستا نەجمەدین مەلا بکەین بە نموونەو مانگەکانیشی ڕەزبەر. خەزەل وەر سەرماوەز داناوەو دەڵێ:

**ئەم جا حەوتەمین مانگی ڕەزبەرە**
**سینی بۆ میوان میوەی لەسەرە**
**ترێ‌و هەرمێ‌و قۆخ سێوی سەردەشتی**
**بەرەچەی ڕەزان باخی بەهەشتی**
**لە دوای ئەو هەشتەم مانگی خەزەل وەر**
**درەخت رووت ئەبێ لە گەڵاو لەبەر**
**بلبلی شەیدایش بە جۆش و کوڵ**
**ئەگری‌و ئەناڵێ بۆ نەمانی گوڵ**
**مانگی نۆیەمین کە سەرماوەزە**
**سەرما ئەهێنێ‌و دوایی پایزە**
**بۆلانەو باکیش کزن لە سەرما**
**بۆ بەرگە و خۆراك ئەکەونە سەما**

## ئەنجام

---:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە پەندو قسەی نەستەقی کوردی ڕەنگدانەوەی ژیانی گەلی کوردە. لەناو پەندو قسەی نەستەقی کوردیش دا ئەم لایەنانەمان لە ئەنجام دا بۆ دەرکەوت:

١ - ئاوو هەواو سروشت بوونەتە هۆی درووست بوونی ساڵنامە.

٢ ـ وەرزەکان بە هۆی سووڕاندنەوەی زەوی بە دەوری خۆردا دروست دەبن.

٣ ـ لە وەرزەکانی کوردیدا دوو وەرز لە ڕووی ئاوو هەواوە بە زەقی دەرکەوتووە کە ئەویش:

أ ـ وەرزی سەرما.

ب ـ وەرزی گەرما.

هەر وەرزە لە ڕووی سەرماو گەرماوە خاسیەتی خۆی هەیە.

٤ ـ زستان و مانگەکانی ئەم وەرزە گەلێ زاراوەی جۆراو جۆرییان نەخشاندووە کە هەریەکەیان لە خاسیەتی ساردیو خۆشیو ناخۆشی، ساردیو فێنکی حەوتەکان دروست کردووە. ژمارەی حەفتەکانی ناوچە ساردەکان زۆرترە لە چاو ناوچە گەرمەکان دا.

٥ ـ سەرەتای دەست پێ‌کردنی ساڵی تازەی کوردی لە وەرزی بەهارەوە لە (٢١) ئازاردا دەست پێ‌دەکات کە ڕۆژی بەرووبووم و پیت و بەرەکەتی زەوییە.

٦ ـ پەندەکان گەلێ ڕووی ژیان و سروشتی کوردەواری بۆ دەرخستووین و لە ڕووی بەرووبووم و باری ئابووریەوە گەلێ ئامۆژگاری لەو پەندانەدا بۆ نەخشاندووین کە بەرهەمی پێشینی کوردەو کورد بە هۆی ئەو پەندو تاقی کردنەوە باری ژیان و هەڵوێستی تایبەتی بەرامبەر بە کات و مانگ و وەرزەکان دەربڕی. بەگشتی لە وەرزەکانی ساڵنامەی کوردیدا گەلێ لایەنمان بە پێی سروشت و داب و نەریتی کوردەواری بۆ ڕوون بووە. وەك دروست بوونی گەلێ زاراوەی ڕەسەنی کوردی کە [illegible] لە خۆیدا فەرهەنگی زمانی کوردی دەوڵەمەند کردووە [illegible] پیرەژن، بانەمەر، تیرمە، مشتاخان، کەپرەشینە، [illegible] هیلانەمەرە، پیت و پالوز، میرەم، ئۆغەن، تار، [illegible] سەرماوەز، چۆ خینان، بەندرخە.... هتد.

[illegible] پەندی قسەی نەستەقی وەرزەکان بە پێی [illegible] و دیالیکتەکان دەگۆڕێن، ئەوەیە لە [illegible] پەندی وەرزەکان بە زۆری دەردەکەوێ کەچی لە [illegible] تێدا بە پێچەوانەوە.

[illegible] ـ هەر لە ناو پەندەکان دا ناسنامەی دیالێکتەکان [illegible] کە ئەو پەندانە سەر بە چ ناوچەو دیالیکتێکن.

[illegible] ـ لە ڕووی ڕوخسارەوە پەندی ساڵنامەکان بە پێی گۆڕانی وشەو دیالیکتەکان دەگۆڕێن و لە ناوەڕۆك دا گۆڕان بەدی ناکرێ.

١٠ ـ کێش و سەرواى پەندەکان بە پێی پەیڕەو دوو بەیتیو سێ بەیتیو چوار بەیتی دروست بووە. لە سەرکێشی پەنجە کێشراون.

١١ ـ چڕی دەربڕین لە ڕووی واتای پەندەکانەوە.

١٢ ـ ناوی مانگە تایبەتییەکانی ساڵی کوردی دوانزە مانگە لەگەڵ بارو دۆخی سروشت دەگونجێ.

ناوی مانگەکانی ساڵنامەی کوردی بە پێی وەرزەکان:

### ١ ـ زستان:

١ ـ سەرماوەز/ بەفران بار/ داروەر.

٢ ـ ڕێبەندان/ چلەشور/ کامێش تران.

٣ ـ ڕەشەمە/ مێش پەڕ/ بازەباران.

### ٢ ـ بەهار:

١ ـ خاکە لێو/ نەورۆز/ ئادار/ ئاخەلیوە/ دارپشکتو/ هەرمێ پشکتوو.

٢ ـ بانەمەڕ/ گوڵان/ شەستەباران/ هیلانەمە/ تیرەخور.

٣ ـ جۆزەردان/ بەختەباران/ باران ووشان/ باران بران.

### ٣ ـ هاوین:

١ ـ پووش پەڕ/ پووش کاڵ/ جۆخێنان/ مرداره مانگ.

٢ ـ خەرمانان/ تیرمە/ حزیران.

٣ ـ ڕەزبەر/ گەلاوێژ/ تەباخی/ میوەگەنان/ مشتاخان/ کەپرەشینە.

### ٤ ـ پایز:

١ ـ ڕەزبەر/ گەڵاڕێزان/ کۆچەرین/ نێری‌بەردان/ ئیلون.

٢ ـ خەزەڵ وەر/ باران پەڵە/ کەوبەدار.

٣ ـ سەرماوەز/ بەروبەز/ گردوز/ گاخور.

**لێکدانەوەی هەندێ لەو زاراوە گرانانەی کە لە مانگەکانی ساڵنامەی کوردیدا هەیە:**

١ ـ بانەمەر: لەم مانگەدا مەرو ماڵات دەچێتە دەشت و بانوان لە خانوان دەردەچێت ئەمەش کاتێکە کە مەڕداران لە کوردستان بۆ لەوەڕاندنی حەیوانەکانیان سەردەکەون بۆ کوێستانان، فەسڵی چوونە هەواران.

ـ مانگی دووەمی بەهار لە (٢١) نیسانەوە تا (٢١)ی مایس [٦٣]

٢ ـ بەختەباران: سێیەم مانگی بەهارە بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە خۆی لەو مانگانە نییە بە شێوەیەکی ئاسایی بارانی تێدا ببارێ بەڵام ڕێی تێدەچێ ببارێو ڕێشی تێدەچێ نەبارێ بارین و نەبارینی (بەبەختە) [٦٤]

٣ ـ بازەبەران: ـ

هەفتەی دوایی زستانە کە هەتاو هەموو ڕۆژێ جێگەی ئاوابوونی خۆی دەگۆڕێ.

٤ ـ بای وادە/ بای وەعدە، بای وەشت:

ئەمە بایەکی سووکە کە بارانی بەدوادا دێت. ئەو بایەیە کە هەژدە ڕۆژی دەمێنێت بۆ نەوروز هەڵ ـ دەکاو بەفر دەتوێنێتەوە. [٦٥]

٥ ـ بەروبەز: ـ لەم مانگەدا بەرووکەم دەبێت و مەڕوماڵات بە شوێن بەرووداد دەبەزن بۆیە دەڵێن: حیوان بەروبەز دەکات.

٦ ـ پەڵـە: بارانێکی تێکـراییـە لە ناوەڕاستی پایزدا دەبارێ دەغـڵودان و گیـای پێ دەڕوێو جووتی پێدەکـرێ. یاخـود پارچەیەك لە هەور یا لە دەغل یا لە هێندێ شتیتر: (پەلەیەك) بیستان یا تووتنم هەیە [٦٦]

٧ ـ هێلانەمە: یانی مانگی هێلانان چونکە لەم مانگەدا باڵندە هێلانە دادەنێ.

٨ ـ جۆخینان/ خەرمانان:

واتە لەم مانگەدا جۆخین و خەرمانان دێنەگۆڕێ.

٩ ـ نیری بەردان:

لەم مانگەدا نێری تەگە بەر ئەدەنە ناوبزن

١٠ ـ کردوز:

لەم مانگەدا بەراز دێتەکەڵ، دەیکا بە گەردو تۆز بۆیە دەڵێن:

گرد وزی بەرازان

١١ ـ سەرماوەز: سەرماوەرزە یانی گەڕی سەرمایە.

**سەرچاوەکان:ـ**


١ ـ شێخ محمدی خاڵ ـ پەندی پێشینانی کوردی ـ سلێمانی / ١٩٧١

٢ ـ شێخ محمد خاڵ /فەرهەنگی خاڵ ـ سلێمانی/ ١٩٦٠.

٣ ـ عومەر شێخەڵلا دەشتەکی ـ پەندی کوردی ـ بەغدا/ ١٩٨٠.

٥ ـ عەلی مەعـروف شارەزووری ـ پەنـدی پێشینـانی کوردی، بەغدا ـ ١٩٨١.

٦ ـ عبدالرحمن حمە امین (زەبیحی) قاموسی زمانی کوردی ـ بەرگی دووەم ـ بەغدا.

٧ ـ مەعروف قەرەداخی ـ فەرهەنگی کشتوکاڵی ـ بەغدا ـ ١٩٧٢.

٨ ـ محمد رسول هاوار، دیوانی پیرەمێرد ـ بەغدا ـ ١٩٧٠.

٩ ـ قەناتی کوردوییف ـ کومەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی ـ بەغدا ـ ١٩٧٦.

١٠ ـ گوردن هستد: اسس الجغرافية الطبيعية للعراق.
ترجمة الدكتور جاسم محمد خلف ـ بغداد ـ ١٩٤٨.

١١ ـ گۆڤاری کاروان: ژمارە ١٣. هەولێر ـ ١٩٨٣.

١٢ ـ گۆڤاری کاروان: ژمارە ١٧. هەولێر ـ ١٩٨٤.

١٣ ـ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ: بەغداد ١٩٨٤. ژ ١٠٢.

١٤ ـ گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ: بەغداد ١٩٨٤. ژ ١٠١.

١٥ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ بەرگی (٧) بەغداد ١٩٨٤.


**پەراوێز:**

(١) ـ بڕوانە ساڵنامەی کورپاشا ١٩٨٤. ل١٧،

(٢) لای هەرکیـان کاتێ باران دەبـارێ، بەم شێـوەیـە دیـاری دەکـەن: ئەگـەر ئاسمـان لە شوێنێکـەوە بروسکـەی دا، بەوە دوورونـزیکی هەور دیـاری دەکـات. خۆ هەتـا هەور بە ڕووی ئاسمانەوە بێ، ئەوە نیشانەی باران دوریی‌یە، یا بە پێچەوانەوە،

باران نزیکە کەواتە بەفرو باران بە دوورونزیکی هەور دیاری دەکەن.

(٣) پەندی پێشینان:

١ ـ لە رووی واتای فەرهەنگی‌یەوە: بە واتای عیبرەت و دەرس وەرگرتن لە ڕووداوێك.

٢ ـ لە رووی واتای گشتی‌یەوە:

پەنـدی پێشینـان: ڕستـەیـەکی کورتی پڕواتـایـە. لە ئەنجـامی تاقـی‌کـردنـەوەی ژیـان و بیـرو باوەڕی گەل و ڕووداوەوە دروسـت بووە. زۆربـەیـان کێش و سەروادارە، چەشـنـە مۆسیقایەکی تایبەتی‌یان هەیە.

قسـەی نەستەق: بە واتای حیکمەت، یاخود (حِکَمْ)ی عەرەبی:

قسـەی نەستەق: ڕستەیەکی کورتە، زۆر جار خاوەنی نادیارە وەك بەشێکی فولکلۆر، زۆرجاریش دانەرو خاوەنی دیارە قسەیەکی بە توێکڵ و پڕمانای زانایان و پیاو ماقوڵانە. هەندێ جار لە وێنەی ئیدۆمە لە ڕووی درکەو لێکچوونەوە. وەك:

ئەڵێی بەردی بن گۆمە

ئەڵێی ئیسکە بەرو پشتی بۆ نی‌یە.

یاخود:

قسە بیگێڕە، بیبێژە، بیوێژە.

(٤) کات لە فۆلـکلوری کوردی‌دا بە تایبـەتی لە شیعـری دوو بەیتی دڵداری‌دا ڕەنگی داوەتەوە وەك:

بـە قوربانت بم ڕۆژی نۆ جاران

سوبح و نیوەڕۆ عەسرو ئێواران

(٥) برجـی پیـرەژن: برێتی‌یـە، لە حەوت ڕۆژ، چوار ڕۆژی ئەکـەوێتـە کۆتـایی شوبـات و سێ ڕۆژی بەر مارت واتـە هەژدە ڕۆژی دەمێنێ بۆ بەهار. پیرەمێردی شاعیر بە هۆی بەفربارینی شاری سلێمانی‌و دیمەنی ئەو بەفربارینە لە وەرزی زستان دا بەم شێوەیە وەسفی برجی پیرەژن دەکات

کە پیرەژن سەرو پۆیلەی بە شینی چلە تێك ئالاّ

بـەهار بەت داری پیر دەژێتەوە دێتە قەدوبالاّ

بڕوانە پیرەمێردی نەمر ـ بەغدا ـ ١٩٧٠. ل١٣٦

هەروەها بە بۆنەی چلەی زستانەوە کورد ئەم بەیتەی وتووە کە دەڵێ:

ئـەتـرسـم بـمرم بـە چـلـەی زستانی

قەل و داڵ بم خوا کەس پێم نەزانێ

(٦) شێخ محمـدی خاڵ (پـەنـدی پێشینـانی کوردی سلێمانی ١٩٧١ ل١١٥.

(٧) شێخ محمدی خاڵ.... ل٢٧٩

(٨) عومەر شێخ الله دەشتەکی ـ پەندی کوردی ـ ل٥٤

(٩) شێخ محمدی خاڵ.... ل١٠٥.

(١٠) عەڤر: هەور

(١١) ساڵی ١٩٨٤ لە مامۆستا حمەبۆر (هوشەنگ) ئەم پەندەم وەرگرتووو.

(١٢) شێخ محمدی خاڵ... ل٣٩٣ ـ هەوێ: غار، تەوێ = تاوێ.

(١٣) بواران = بەهاران (١٤) دەشتەکی ـ ل٤٥.

(١٤) شێخ محمدی خاڵ.... ل١١٥.

(١٦) زۆر لە پسپـۆڕو شارەزایـانی ساڵنـامـەی کوردی چلەی زستـانیـان خستـۆتـە ناوەڕاستی سێ مانگـەی ئەو وەرزەوە پێیـان وتووە: پێش چلەو ڕاستە چلەو پاش چلە.

(١٧) بڕوانـە ڕۆشنبیـری نوێ. ـ ساڵنـامـەی کوردی ـ کەریم شارەزا. ل٥٨. ژ. ١٠١. بەغداد ١٩٨٤.

(١٨) لە یەکێ لە ڕۆژەکانی ئەو حەوتەیەدا ژنێکی (میرەم) ناو دەچێتە کوڵی (جل شوشتن) ئەو کاتەی میرەم چووە کەش خۆش بووە چاوەڕوانـی ڕۆژێـکی وا دژواری نەکـردووە. بەڵام دوایی باران بەسەری‌دا دەبارێت و زریان و بۆران هەڵ دەکات و ڕێگەی گەڕانەوەی لێ‌دەبڕێ.

پاش گەڕان و سوورانـەوە هیـچ پەنـاو پەسێـوێـك نادۆزێتـەوە خۆی تێ‌دا حەشار بدات و لە تەڕو ساردی ڕزگاری بێت تەنها ئەوەنـدە نەبێت تووشی کەلاکـو (لاشـە) ڕەشـە ولاغێك نەبێت، ورگی هەڵ دەدڕێ‌و دەچێتـە ناوی‌یـەوە. ئیـدی دوایی لەسەرمان لەنـاوی ڕەق دەبێتـەوە. بۆیـە بەو حەوتـەیـە دەڵێن (حـەوتـەی میرەمێ) چونکە کاتەکەی کەشی تیادایە. وەکو کەشی ئەو کاتە بووە کە (میرەم)ی پێ‌چووە. ئوغەنیش حەوتەی شەشەمو ناوی میردی (میـرەمێ)یـە کاتێ میرەم دەچێتە کوڵی، ئیتر ناگەڕێتەوە ئوغـەنیش کاتێ لەوحـەوتـەیـە لە کاروان دەگـەڕێتـەوە کە وا ئاخـروئـۆخـری مانگی ڕێبـەنـدانی‌یـە کاروانچی دەرگـایـان لێ‌دەکرێتەوە کە دێتەوەوە بەو هەواڵە دەزانێت کە میرەم مردووە.

دەڵێن:

میرەم دەبینێ، ئۆغەن دەشکێنێ

- بڕوانــە: گۆڤــاری کاروان ژمـارە ١٧ هەولێـر ١٩٨٤ . ل٧٣ مێژووی ساڵنامەو ڕۆژ ژمێری کوردی - نافع کاکە.

(١٩) مامۆستا کەریم شارەزا هەفتەی پیت و پاڵوزی بە هەفتەی پێنجەم و شەشەمی هەفتەکانی داناوەو هەرچی مامۆستا نافع کاکە یشە بە هەفتـەی حەوتـەم و هەشتـەم. . ئێمـە ڕاکـەی مامـوستا شارەزا بە ڕاست دەزانین چونکــە بە شێــوەیـەکی زانستی ناوی هەفتەکانی مانگی زستانی دابەش کردووە بەسەر (دە) هەفتەداو بەراوردی لەگەڵ مانگی ڕۆژئاواییش کردووە و پشتی بە گەلی ڕای پسپـوران و شارەزایـانی ساڵنـامـەی کوردی بەستوە، ڕاکانی ئەوانــەش ڕەت دەکــاتـەوە کە هەڵـەیـان لە دابـەش کردنی ئەم هەفتانەو مانگە کوردییەکانی وەرزی زستان کردوە.

- بڕوانە گوڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ١٩٨٤. ل٥٨. ژ - ١٠١

(٢٠) قاموسی زمانی کوردی زەبیحی - بەرگی دوو. ل ٣٥.

(٢١) بڕوانە گۆڤاری کاروان. . . ژمارە ١٧ - هەولێر ١٩٨٤ل ٧٥ * پەنگر = پتەو.

(٢٢) هەمان سەرچاوە. . . . ل٧٥.

(٢٣) هەمان سەرچاوە. . . . ل٧٥.

(٢٤) ڕەشەمێ - ڕەشەما لە ڕەشەمە لە کوڵەمانگ.

١ - دەڵێن لە هەورامـان ئەگـەر ئافـرەت لەبـەر هەتاودا بمێنێتەوە ڕەنگی دەم وچــاوی ڕەش هەڵ دەگــەڕێت لەبـەر ئەوەی ڕەنگی خۆیــان سپـی یــەو زوو پیــوەیــان دیــاری دەدات بۆیــە دەڵێن (ڕەشەمێ). (بڕوانە ڕۆشنبیری نوێ - بەغدا ١٩٨٤. ژ ١٠١).

٢ - ڕەشــەمێ بەو کاتــە دەڵێن کە پشیلەو ڕێــوی بە بادێن و بە چەنــد پشیلەیــەك دوای یەك دەکــەون. هەڵبــەزین و وارەوارو شەڕەشەقەکی وادەکەن بە تایبەتی پشیلە کە حەسانەوە لە خەڵك حەرام دەکـەن. بۆیـە دەڵێن (ڕەشـەمێ). بە واتـا سەبـارەت بە مێیــەی پشیلەکــان ئەو ڕۆژە ڕەشــە پەیــدادەبێت. بڕوانــە: فەرهەنگی کشتوکال - مەعروف قەرەداخی مەردۆخی، بەرگی، ل١٥٦.

٣ - هەندێ دەڵێن ڕەشەماە - ڕەشەمانگ) کە لەو مانگەدا دەرو دەشت شین هەڵ دەگەڕێ.

(٢٥) ئەو کۆمەڵە وشەیەی لە کەوانەدایە (تار - چار - سار - نار) هەمــووی گۆڕینی پیتی (ل)ی سلیمــانی یـە لە شێـوەی کۆیـەو دەوروبەری دەبێت بە (ڕ)ی سووك.

(٢٦) ڕۆشنبیری هەر میللەتێك لە دوو بەشی سەرەکی پێك دێت -:

١ - ئەدەبی سەرزاری خولقێنەری گەل کە بە (فۆلکلۆر)ناو دەبرێ

٢ - ئەدەبی نووسراو (الادب المدون) کە بەرهەمی زادەی بیری شاعیران و نووسەرانە لە شێوەیەکی بەرزی هونەریدا.

(٢٧) عبدالرحمن محمد امین زەبیحی - قاموسی زمانی کوردی - بەرگی دووەم - بەنداد ١٩٧٩ل٢٢١ - ل٢٢٢.

(٢٨) گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - بەرگی ٧. ل٤٦٩.

(٢٩) سارا = دەشت. (٣٠) خاڵ - ١٢.

(٣١) ئایشـێ خان - گەڕەکی چوارباـغ - سلیمـانی/ ١٩٨٣ تەمەنی (٥٠) ساڵە.

(٣٢) عەلی مەعروف - ل٣٤. تار: پێنج ڕوژەو یەکەم هەفتەی مانگـی مارتــە - دوو ڕۆژی بەر کۆتــایـی زستــان و ڕۆژێ بەر سەرەتای بەهار دەکەوێت.

بڕوانـە/ مەعـروف قەرەداغی - فەرهـەنگی کشتـوکـاڵ - بەغـدا ١٩٧٢ - ل٧٧.

(٣٣) خاڵ - ل٣٠٦.

(٣٤) عەلی مەعــرووف. . . . . ل١٣ * ژەنگــار = شنگـار، سنجار قەزایەکە لە سەروو شاری موسڵەوە.

(٣٥) لە زاری محەمەد عەبدولقادر ساڵی ١٩٨٤دا وەرم گرتووە.

(٣٦) خاڵ. . . . . . . ل١١٨.

(٣٧) لە زاری خەڵکەوە گوێم لێبووە.

(٣٨) لە زاری محمـــد ئەحمــەد پاریــزگــای دهــۆك تەمـەنی ٢٦ساڵە. خوێندەوارە.

(٣٩) عەلی مەعروف - ل٢٩.

(٤٠) زەبیحی - قاموسی زمانی کوردی - لە بەرگی یەکەم - ل١١.

(٤١) عەلی مەعروف - ل١١٣.

(*) كتێ لەلێكۆڵینەوەی ئەم بابەتە برومەوە. . گۆڤاری ئوتونۆمی ... بەندێكی هاوچەشنی لە مانەی ئێمەی بڵاوكرد بۆوە ... (رۆستەم باجەلانی) یەوە لەو پەندانەش سوودم ... گرت.

(*) ... = مانگی نیسان.

(*) گیشە = گەلاوێژ = تایە) ـ (عەرد ـ زەوی) (كولو = كو = ... ێرە.

(٤٢) لە زاری محەمەد عەبدولقادر ـ خەڵكی شێخان ـ تەمەنی ٣٠ ساڵە مامۆستایە.

(٤٣) بروانــە ـ گوردن هستــد ـ الأسس الطبیعیــة لجغـرافیـة العراق. ص١٠٦.

تعریب (جاسم محمد خلف) بغداد١ ١٩٤٨.

(٤٤) ئەم ناوانەشیان پێدەوترێ (پووشوكاڵ ـ جوخێنان ـ مرداره ... نگ).

(٤٥) فەرهەنگی كشتوكاڵ ـ مەردۆخ ـ بەرگی دوو ـ ل ١٢.

(٤٦) گۆڤـاری شۆرش و كشتـوكـاڵ ـ پاشكـۆی كوردی ـ ژمارە ٢. ل ٢٦.

(٤٧) رۆشنبیری نوێ ـ بەغداد/ ١٩٨٤ ـ ل٦٠.

(٤٨) شاڤری ـ ناوی گیایەكە، (٤٩) لە زاری مامۆستا حەمە بۆرەوە ساڵی/ ١٩٨٤ وەرم گرت.

(٥٠) وشەی تیرما ـ تەموز، تەباخی هەندێ دەڵێن (ئابە) بەڵام لە ساڵنــامــەی كۆرپـاشـای مەلا ئەحمــەدی سەردەرەیی‌یـەوە وا لێك دراوەتەوە كە تەباخ لە ئەسڵ دا دەباخە یانی ترێ لە باخی دەكرێو دەكرێتە مێووژ.

(٥١) لە زاری واجــدە ناوێكـەوە خەڵكی زاخـۆوە وەرم گرتـووە ساڵی ١٩٨٤، نەخوێندەوارە تەمەنی ٣٤ ساڵە

(٥٢) لەم ڕووەوە پەندی عەرەبی دەڵێ:

آب یحرق المسمار بالباب
یكثر العنب ویقل الرطب

یاخود: عشره من آب تحرگ المسمار بالباب.
یاخود: عشره من آب یفتح من الشته باب
یاخود: عشره من تموز تیبس الماء بالكوز.

(٥٣) عومەر شیخەللا. . . . ل٨٠.
(٥٤) هەمان سەرچاوە. . . . ل٨٧.
(٥٥) هەمان سەرچاوە. . . . ل٨٧.

(٥٦) رۆستــەم باجــەلانی ـ گۆڤــاری ئۆتــۆنــۆمی ـ هەولێـر/ ١٩٨٣. ژ ـ ٥ ـ ل٩٢.

(٥٧) گۆڤاری كاروان ـ هەولیر ـ ١٩٨٣ ـ ژمارە ١٣ ـ ل٣٩ ساڵنامەی كوردی.
(٥٨) هەمان سەرچاوە. ل٣٩.

(٥٩) گۆڤــاری كاروان ـ هەولێــر ١٩٨٤ ـ ژ ١٣ ـ مێــژووی ساڵنامەی كوردی نافع كاكە.
(٦٠) مەعرووف قەرەداغی مەردۆخی ـ فەرهەنگی كشتوكاڵ ـ ل ٧١ ـ بەغدا/ ١٩٧٢.
(٦١) دەشتەكی. . . . ل٢٩.

(٦٢) قەناتی كوردوییف ـ كومەڵە تێكستی فۆلكلوری ـ بەغدا/ ١٩٧٦. ل٢٢٨.
(٦٣) بروانە: عبدالرحمن محمد امین زەبیحی: قاموسی زمانی كوردی بەرگی دووەم (ب) ل٥٩. بەغداد ١٩٧٩.

(٦٤) هەمان سەرچاوە ـ ل ١٤٠
(٦٥) هەمان سەرچاوە = ٧ ـ ٨
(٦٦) شێخ محمدی خاڵ فەرهەنگی خاڵ: ل٤٢. سلێمانی ١٩٦٠

# فصول السنة والتقويم السنوي
# في الأمثال والحكم الكردية

د. شكرية رسول
جامعة صلاح الدين ـ أربيل

تأمل الكردي قانون الطبيعة والحياة وأدرك بانه في تطور مستمر، وهذا التطور يتحقق بموجب تطور ظواهر الطبيعة ومحيط الانسان، وان أحد مظاهر حياة الشعب الطبيعية هو تغيّر البيئة والمناخ خلال فصول السنة، وقد خلقت هذه التغيرات أسماء ومصطلحات عديدة من جهة وانعكست في طرق معيشة الشعب وأفكاره وأخيلته من جهة أخرى.

ونتيجة لتعامل الشعب مع فصول السنة ومكابداتهم في حياتهم خلالها وجد تقويم شعبي للسنة فعرفوا في إطار تجاربهم وبواسطة تغير مواقع غروب الشمس وشروقها ومواعيد بزوغ الانجم وملاحظة تغير أماكنها في السماء حسابات الأشهر والسنة.

ان هذه الظواهر والتجارب قد انعكست في سجل الأدب الشعبي فقد قيل أمثال وحكم خاصة بكل فصل وكل شهر بأساليبه ومناسباته وتغييرات المناخ فيه. وأوردت الباحثة أمثلة عديدة من جوامع الحكم والأمثال تظهر فيها علاقة تغييرات المناخ بالحياة الاقتصادية والاجتماعية لأفراد الشعب وقد استنتجت في ختام بحثها مايلي:

١ ـ ان المناخ والطبيعة قد خلقا التقويم السنوي.

٢ ـ ان الفصول تنشأ نتيجة دوران الأرض حول الشمس.

٣ ـ يتجسد كل من الصيف والشتاء اكثر من بقية الفصول فيما يتعلق بالمناخ فلكل من البرد القارص والحر خاصيته المتميزة.

٤ ـ نتجت عن أشهر الشتاء مصطلحات مختلفة تخص البرد وسقوط الثلج والمطر وايام اعتدال الطقس خلال أسابيعها المعروفة بأسماء خاصة. وان عدد أسابيع المناطق الباردة اكثر من عدد أسابيع المناطق الحارة.

٥ ـ تبدأ السنة الكردية في فصل الربيع وفي ٢١/ آذار والذي هو يومُ خصب الأرض وعطائها.

٦ ـ تظهر لنا الأمثال جوانب من حياة وطبيعة الشعب وفيها نصائح وتجارب السلف.

٧ ـ تختلف احصائية الأمثال والحكم المتعلقة بالفصول حسب اختلاف المناطق واللهجات.

٨ ـ تظهر من بين الأمثال هوية اللهجات ومنابتها المحلية.

٩ ـ ومن حيث الشكل فقد يظهر بعض التغيير في كلمات ولهجات الأمثال الخاصة بالتقويم، أما مضامينها فواحدة.

١٠ ـ تتشكل الأمثال حسب الوزن والقافية على أبيات ثنائية وثلاثية ورباعية وهي منظومة على الوزن المقطعي.

١١ ـ تركيز التعبير عن معاني الأمثال.

١٢ ـ أسماء الاشهر الخاصة في السنة الكردية والبالغة اثنى عشر شهراً تنسجم مع الظروف الطبيعية للمنطقة.



باژێرێ جزیرێ د سالا ١٩٠٩ ـ ئان دە

«کونراد برویسر»

عبدالفتاح علي يحيى بۆتاني

# بورجا بەلەك

# د جزیرا بوتان دا

جزیرا بۆتان یا کو دکەڤە راژێری دەریا وانێ «١»، جهەکی ـند هەیە ل جەم تەڤایا گەلێ کورد، ئەوژی ژ بەر دیرۆکا وی ـ دێرین وخەبات وکێفەراتا وی یا گەلێری وکەفت ولەفتا ـەردەوام و درێژە ژ بۆنا هەبوون و سەرخوەبوونا گەلێ کورد جزیر ب خوە وەلاتێ کاردۆخییایە، کو دیرۆکڤانێ ئەغریقی «زەینەفون» دزڤستانا سالا «٤٠١» ئان دا بەری زاینی، دەما ـ زکێشیا لەشکەروپاتەوخۆرێن ئەغریقی دکر ڤەگەریان و دێ دستانێرا بورین، داباش و پەسنێ کاردۆخیا دایە ڤـ اندن.

ـرا ژی زانا «مینورسکی» جزیر ب دەرگۆشا پەیدا بوونا گەلـ ـورد دده حسێب کرنێ ودبێژە : ـ کو کورد دجزیرێدا بەلاڤ بوونەو تێداژی بزاڤا گەلێری سەرێ خوە هلدایە».

گرۆڤا دیرۆکی ژ بۆ کەڤناریا جزیرا بۆتان ئەوشون وارو شوپێن پرت و بەلاڤن تێدا.

ولۆ شاعرێ کوردێ نەمر حاجی قادرێ کۆیی «١٨١٥ ـ ١٨٩٧م» وب وێ باوەرییێ کو گەمیا یان (سەفینا) نوح پێغەمبەر «س» ل سەر چیایێ جودیو دجزیرا بۆتاند دە راوەستایە، پشتی لەهیا گران «طوفان» جزیر حسێب دکە ژهەموو ئاڤانێین دنیایێ کەڤنار تر دەما دبێژی :ـ

ئێستاکە جزیرە بێ موحابە

مەعمورەئێ ئەوەلە لە دونیە

گەلەك شورشێن رزگاری خواز دژێ ئوسومانلیا دجزیرا

بۆتـــان دە، خاسمـــە بازارێ جزیـــرێ سەرێ خوە هلدایـــەو رابـوویـە، لەورا میرێن بۆتان ددەسپێکا دەیناندنا میر نشینییێ دســەد سالیـا دۆزدێ یێ زانیی‌دە، سەروستـۆژداگیـرکـارێن دەرەکـــەرا خوار نە کرنـــەو نە چەمـانـدنـە تم وتم ژ ی هێڤیو داخوازا وان ئازادیو سەرخوە بوون بوویە.

بێ گـــومـــان ئەڤ کارێ هان جزیـــر کرە بنگـەهـەك مەزن ژ راپەرینێن گەلێرا، پێرا ژ ی رۆلا ئابوریو سیاسیو چاندا تەڤـــایـییـا جزیـــرێ گاڤ ب گاڤ ب پێشکـــەت و کاری سەرکێشیا تەڤ میرنشینیا کوردا بکی.

شاعرێ کوردێ مەزن و نەمر مەلایێ جزیری ڤێ پێشکەتن وشیـان وهـەرەکـەتێ کوور، کوور دشیعرێن خوەدا دیار دکە، سەرکـــەتن و پیشڤـــە چوون وژ ییێ درێـژ ژمیـرێ بۆتـان را دخـوازیودڤێ کوبازارێ جزیـرێ ببـە پایتـەختـا هەرحەفت ئەقلیما دەما دبێژ ی:-

ماجزیرێ شوبهێ دارێ تەختێ هەفت ئقلیم بت
هەم ب حوکم و سەلطانەت ئەسکەندەر وفەغفوربی
نەی تنێ تەبریزو کوردستان ل بەر حوکمێ تە بی
سەد وەکی شاهێ خوراسانێ دفەرواریێ تە بی

x x x

گەرچ دەر ئقلیمێ رابع هاتە تەختێ سەلطەنەت
پاد شاهێ هەفت ئقلیمان سەلام کارێ تە بی «٣»

x x x

هەر ووســا هۆزان و فەیـلەســۆفـێ کوردێ مەزن و نەمـر ئەحمـــەدێ خانێ «١٦٥٠ ـ ١٧٠٧»ز هێـــز وشیـــانێ میـــرێ جزیـرێو ناڤـداریـا وی دنێڤ عەرەب وتـرك و فرسادە دڤـان مالـکـێ ژ یـــری‌دە ددە کەشـێ‌و دبێـــژە جهێ شەهنـــازیو سەرەفرازیا گەلێ کوردە دەما دبێژ ی:

کوپادشەك زەمانێ سابق
رابوو دحکومەتا خوە فائق

x x x

اجناس ملل مطیع و منقاد
فەخرێ میدیا امیرێ اکراد

x x x

تەختێ وی جزیرو بەختێ وی مسعود
طالع قویو مقامێ محمود

x x x

رۆم و عەرەب عەجەم دفەرمان
مشهود ب ناڤێ میرێ بوهتان «٤»

x x x

دکتـور نورالـدین زازا دداستانا مەمێ ئالان دە، کوتێ حسێب کرنـێ ژمـــەم وزنیـــا خانێ مەزن کەڤنـــار تر ئو درکنـــا پرسێن جڤاکیدە ل سەر کاروبارێ بازارێ جزیرێ دنڤیسە ودبێژە: ـ «ژئالییێ جڤاکی مەمێ ئالان مە فێری پر تشتان دکەو ل پێش هن پرسان ژ ی مە شاش دهێلە بەری هەر تشتی ژمەرە بازارێ جزیـــرێ یێ کەڤن ددە ناسکـــردن، ئەم دبین کوبازێـــرەکی گەلـــەك مەزن و بازرگـــانی بوو «٢٥» تاخ قەسـرو بازرگـانێن گەلـەك دەولـەمـەنـد تێدە هەبوون میر یان شێخی تاجرێن وان مال ل هەر دەرێن دنێ‌و مەملەکـەتـان دگـەراندن. تشتێ هێژا بازرگانێن جزیرێ ب خوەدییێ سنجیەکی بلند بوون».

ئو دبێـــژ ی بازارێ جزیـــرێ پایتـەختـا میـرنیشنیـا بۆتـان بنگـەهـەك بازرگـانیو بازرەکی بۆش بوووێ میر حوکمەت و یاستیێن خوە هەبوون «٥».

هەر ووسا د «دائرة المعارف الاسلامیة» دە هاتییە کوحەیا نهـا هن تشتێن بهـا گران ل سەر دیـرۆکـا بۆتـان هەنـە نەهاتنە پشکنین و لێگەرین ب درستی وراستی «٦».

گەرۆکێ ئەلمـانی «کـونراد برویسر» دبێژە: «پێلێن زوبا را دجلە خزینەکا دەولەمەند ژشوپێن «معماری»وگەلەك «تمثالا» دبن ئاڤێ خوەدا ڤەشارتنە ئەڤەژ ی دیارۆکا «شاهد».. پاشمایا پرەکی مەزن کودچـــاخـەکێ پێشکـەتیدا چێ بوویـەوحەیـا ب ئیرۆدە مایە «٧»

داگیـرکارێن خوین خوار «فرس و ئوسمانلی» دسەر هەموو ناکۆکی و نەخـوەش و ل هەڤ نەهـاتنـا وان یاکوورو دووردا، تم و تم دکر کو میرنشینێن کوردا ل هەڤ رابن و ل هەڤ بخن شەڕو جەنگێ، ژ بـۆنـا کورەهـەکا کوردی سەر ب خوەو ئازاد سەر هلنەدی و دروست نە بە. ئەڤ سیاسەت کاری ژ ی دپێك هاتنـا «سلیم ـ ادریس» دا خویـا دبـە «٨» ئەو پێکهاتنا کو پرێ کوردستـانێ خستـە ژێـر دەستێ ئوسمـانلیاو داوی کوردستان دسـالا «١٦٣٩» ئان دا ل پەی ئەهـدا «زەهـاو» دنـێڤ بەرا فرس و ئوسمانلیا دە، هاتە پەرچە کرن ب رەنگەکێ رسمی.

پەرچـە کرنـا کوستـانێ دنێڤ بەرا هەردوو دەولـەتا «فرس و ئوسمـانلی» و ئارێشـەو نەخوەش یێ دینی و ئۆل پەرستی دنێڤ بەرا میـرنشینێن کورداده خەبـاتـا دیرۆکیا کوردا ژ بۆنا سەر خوە بوونێ و رزگـاری یێ ل ژێر دەستێ هەردوو دەولەتا کێم وەش و وەزاو بێ هێز کر.

هەردوو داگیـرکـارا تۆڤـێ کەڤـنـە پەرستی یێ و ل هەڤ ب دوورکـەتن و خوین داری و نەخـوەش یێ دنێڤ بەرا میرێن کورداده چانـدن، ب ڤێ یەکێ ژ ی میرنشینێن کوردا ل هەڤ رابـوون و ل هەڤ دانـە شەڕ بێ گۆمـان ل هەڤ رابوون و دانە شـەڕا میـرێن کوردا ژ ی داخـوازو مەرەمـا دلێ داگیـرکارا بوو، چکو بێ هێز بوونا میرێن کورداو ل هەڤ دانە شەڕا وان، یانی ڤەمـانـا دەستێ زۆرداری یـا ب گەمارو مرێژ یا هەردوو دەولەتا ل سەر

کوردستـانێ دسـەر وێ یەکێ را وبێـژە خەراب ترژ ی دەولـەتـا ئوسمـانلی سیـاسـەتـەکـا دن پێشێ گەلێ کورد کر ئەوژ ی سیـاسەت کاریا ب دەست خستنا خزمەت و پەهلەوانیا کوردا دشـەڕو جەنـگێ دژ ێ مللەتێن دن بوو، ولـۆ گەلێ کورد کر ئامـورەتـەك ژ بـۆ سەرکـوت کرن و ڤەمـراندنا ئاگرێ شۆرشێن ئازای یێ ل تەڤابا ئیمپەراتوری یەتا کۆلەداری ئوسمانلی «٩».

هۆزان و فەیلەسـۆڤێ کوردێ نەمر ئەحمەدێ خانێ دمەم و زینێ دە دگـەلـەك بوارادا رۆلا داگیـرکارێن کۆلەدار ژ بۆ پەرچە کرن و پوچ کرنا یەکەتیا گەلێ کورد خویا کری یە.

بۆتـان خەبـاتـا خوە ژ بۆ پاشە رۆژەکا چاکترو روهنی تر ژ بۆ گەلێ کورد ئاژۆت و ب دۆمـانـد ئەو بو دسـەد سالیـا نۆزدێ و دەسپێکا سەد سالیا بیستان دە ئوب سایا رۆلا میر بەدرخان یێ کو دسـالا ١٨١٢ ئان دە حوکـم داری ب دەسـت خسـت و دددوورا ژ ی کورو نەڤـی یـێ وی یێـن کو هاتـنـە ناسـکـرن ددیـرۆکێ دە ب ناڤێ «بـەدرخـانیـا» بۆتـان کرن پایتـەختـا تەڤگـەرێن وەلات پەروەری یێ و ماکـا خواستـا گەلێـری ولـو شاعرێ کوردێ نەمر حاجی قادرێ کویی خەباتا بەدرخانیا ب بهادکی دەما دبێژ ی:

بەدرخانی و لەسەر لاچێ لەمەو پاش
لەهەر لایێ دەتان هارن وەکو ئاش

میر بەدرخان و کورێن وی ب گەلەك بزاڤ ولەپ هلانینێن گەلێـری را رابـوون، ئویا ژهـەژ ی گۆتنێ یـە کو دەمـا دەولەتا ئوسـمـانـلی هێـرشـا خوە یا دژ وارو داوی برە سەر خەلکێ کوردستانێ دسالێن «١٨٢٧ ـ ١٨٤٧» ئان دە میرنشینیا بۆتان مێـرانی بەرەڤـانی ل خوە کرو کەلا خوە راگـرتنا کوردا یا داوی بوو ل هبەرێ لەشکەرێ ئوسمانلیا «١٠»

خەبـاتـا درێژا میرێن بۆتان خاسمە بەدرخانیا ژ بۆ سەر خوە بوون و ئازادی یێ، تم و تم ئەودخستنە گرتن و کوشتن و تالان کرن و ب دوور کرنـێ ژ وەلاتـێ خوە بۆ دەڤـەرو جهـێ دوور ژ جـزیـرا بۆتـان، یەك ژ وان میـر بەدرخان ب خوە چەند سالا دەست ب سەر و ب دوور خستی بوو ژجزیرێ هەر ووسا کورو نەڤی یێ وی ژ ی دهاتن ب دوور خستن و ترش و تالیا گرتن و حەبس و زیندان و ئەشکەنجەو لێدانێ ددیتن.

ئو ژ بـۆنـا کو دەولـەتا ئوسمانلی هایدار بە ل سەر هەر کارو هاتن و چوونـەکـا بەدرخـانیـا ـ وەك چاوا دیـرۆك نڤیسێ ترکی لطفی گۆتی یـە ـ یێ کو ترس و سەهمـا وان ددلێ سولتـانێ ئەستـەمبـولێ دا مەزن و ب هێـز دبـوو دەستـەکـا پاراستنا «مخابرات» ئوسمانلیا کومەکا نیشان و «شەفرا» ب ترکی دانی

بوو ل سەر ڤێ مالباتا خەباتكار».

هەر چاوا بە بەدرخانی چەكێ خوە یێ گران نەهاڤێتن، خەباتا خوە دهوندرو دەرڤەیێ كوردستانێ ب هەر ئاوایی و رێباز ژ بۆنا كۆمكرن و دۆزا مللەتێ خوە ئاژۆتن و ب دۆماندن، بگرە حەیا ل وان جهێ كو ژ ێ هاتبوون ب دوور خستن و مشەخت بوون ژ ی مینا «كریت، لندن، باریس، دمشق، حلب قاهرە، ڤولكستون، استنبول، جنیف . . ل وان جها ژ ی چاڤ ل هەر تشتێ كوردی دكرن و دپاراستن ئیدی وانا دەستەكێ درێژ هەبوو دهایدار كرن ووەراركرنا هەست و سۆزا كوردا ژ بۆ وەلات پەروەرییێ و رۆلەكا مەزن لیزتن دبەلاڤە كرن و پێگەهاندنا چاندا گەلێری.

لەورا ناڤێ بەدرخان وەكە نیگارەكێ دمینە دناڤا مللەتیدا هەر ووسا چاوا باسیل نیكیتین دبێژە پشتی بەدرخان كورو نەڤییێ وی كارێ وەلات پەروەرییا مالباتا خوە ئاژۆتن و بەردەوام كرن.

وەكوكا گۆتناغ هان ئەوە كو چەند كەس ژڤێ مالباتێ و بۆ جارا یەكان دویرۆكا نویا مللەتێ كوردا، رۆژناما «كوردستان» دبیست دووێ «٢٢ نیسانا» سالا ١٨٩٨ ئان دە ول قاهیرێ دانە وەشاندن و بەلاڤە كرن، ژ بۆنا بەلاڤەكرنا تێگەهشتن وسۆزا گەلێرییا كورداو ناسكرنا دۆزا گەلێ كورد یا گەلێری و هایدار كرنا رایا تەڤایا یهانێ ب ڤێ دۆزا راست و درست هەر ووسا بەدرخانی دسالا ١٩٠٨ ئان دە ول ئەستەمبولێ یەكەم رێكخراوا گەلێری دیرۆكا كورداوە،

ب ناڤێ «كردستان تعالي وترقي جمعيتي» ب سەركاریا ئەمین عالی بەدرخان دەیناندن، دیسا خەباتكارێ شەهید عبدالرزاق بەدرخان و پشتی خەباتەكا دژوار و بەردەوام كاری بۆ جارا یەكان خوەندنگەهەكا كوردی ل باژارێ «خوی» ل ئیرانێ دبیست و سێیێ «٢٣» تشرینێ دووێ سالا ١٩١٣ ئان دە دەینی، هەر ووسا ژ ی زانا جەلادەت و دكتور كامران و هێژایان، ثریا ومقداد وعبدالرحمن رۆلەكا مەزن وكفش لیزتن دخزمەت كرنا تۆر وچاندا كوردی، لەورا ناڤ دەنگیا وان دديرۆكێدا بەلاڤ و ئەیانە ئەڤ كەلەپۆرا ئەدەبی ودیرۆكی و خەباتا ب بها دپێڤارۆكا دیرۆكێدا كر كو جزیر جهەكی بلند هەبی لەتەڤایا بزاڤێن گەلێرییا وەلات پەروەرییا كورداوە، هەر ووسا ب رێزو سیانەت بە ددلێ هەمی كوردەكێ ل كوردستانێ لەورا ناڤ ئانینا جزیرێ یانی نوو كرن وزێدە كرا هەست و سۆزو پێژەنا گەلێری ئوب ڤێ یەكێ ژ ی ب روومەتی و سیانەتەكا مەزن ددلێ گوهدێرا خویا دبە. ئیدی نە دوورە كو جزیرو میرێن جزیرێ دكارو كریارو قەسرو كوشك و تەلارێن خوەدا هەر ووسا بوویەرو قەوماندنێ ب سەر وان دا هاتی پارەكا مەزن ژستران و داستان مللیرا بستینە.
حەیانێ كو ناڤێ پرانیا وان میران بێ گرێ دان ب چیرۆكێن مللی و سترانێن دیرۆكی بگرە چكو چیرۆك زان و دەنگبێژ ین مللی و حیكایەت ڤان ل سەر كارۆ كریارو قەهرەمانیا وان میرا، چیرۆك و ئەفسانە ڤەهاندنە حەیانێ كو تەڤلی «تێكەلی» ئەفسانەیێن دیرۆكێ ژ ی بوونە.

قەوماندنێن داستانا مەمێ ئالان و مەم و زینا خالێ نەمر دجزیرێدا چێ بوویە هەر ووسا شاعرێن مەزن مینا جزیری و وخانی و كۆیی و پرێن دن ژ ی گەلەك جزیرو میرێن دئەڤاندن و داباش و پەسنێ وان دشیعرێن خوەدا خویا كرنە.

ئەڤاندنا جزیرو میرێن جزیرێ ژ ی ل جەم شاعرو مللەت و دەنگبێژ و چیرۆك زانا كر كو میرێن جزیرێ مینا سولتانێ ئوسمانلی بێن حسێب كرنێ هەر ووسا ژ ی جزیر هەڤبەری ئەستەمبولێ بە ئو قەسرو كۆشكێن وان مینا یێن سولتانێن ئالی ئوسمان بێن بەر چاڤێ خەلكێ دیسا هنێن وان ژ ی سەرایا میر هەڤدژ ێ سەرایا ئەستەمبولێ ددان حسێب كرنی ئو جزیری و هخانی، هنەك ژ وان میران ب قەنجترین زەلام ژمێران و تێگەهشتن ودل نەرمییێ ددیرۆكێ دە ددن حسێب كرنێ.

ئەڤەو قەسرا بورجا بەلەك بنگەه و شانشینا میرنشینیا

میـرێن بوٚتـان دکـەڤـە سەر گرەکێ ل ئالیێ ڕاژ ورێ باژارێ جزیـرێ ژ ڕەفێ چەپێ ژئاڤا دجلە ئو هاتی‌یە ناڤ کرن ب ڤی ناڤی «بـورجـا بەلـەك» ژ بـەر کو هاتی‌یـە ئاڤا کرن ب کەڤرێن بازلتـا ڕەش و کەڤـرێن گێچیـا سپی ریـز ل دووریـز، خەلکێ دەڤـەر وجهێ وەلێ یێ کو ماتبـریـالا هەمی ڕەنگ یا ئاڤا کرنێ تیـدا بوٚش و زەحفـە، تم و تم ئاڤـانیێن خوە ب کەڤـرو بەرێن وەها ئاڤا دکن.

ئیـدی میـرێن جزیـرێ ژ ی بورجـا بەلـەك ب وان کەڤران ئاڤـاکـرن ئانکـو ب کەڤـرێن ڕەش و سپی ئاڤـاکـرن، کو مینا نەقشەکێ ژ ی لێ بێ.

دنیســـانـا سالا ١٩٠٩ ئان دە گەڕوٚکێ ئەلمـانی «کـونـراد بـرویسـر» میڤـانـداریـا جزیرێ و بورجا بەلەك کری‌یەو دبێژە: کەلا کەڤـنـار ب دیـتـنـا خوە یا ڕنـدو بەدەو

ژئالێ ڕاژ ورێ جزیرێ هاتی‌یە ئاڤاکرن ئو حەیا ب ئیروٚدە ژ ی نەشکـەرگـەێ سوارێن لەشکـەرێ ترکـایـە، ل دوٚر مانـدوٚر جزیـرێ شورهـا کەڤنـار ب کەڤـرێن بازلتا ڕەش و خوە ڕاگرتنا کەڤـرێن گێچیـا سپی یا ب تین و ب هیـز هاتی‌یـە ئاڤـاکـرن، دهەمبەر وێ ژ ی ژئالێ ڕاژ وٚر پاشمایا چالەکا تژ ی ئاڤ حەیا ب ئیـرودە شوپ وشـون وارێ وان خویـا دبـە، ئەلبـەتـە ئەڤ شورهـا بوویە ژ ێدەرەکا سادەو ساناهی و بێ بها ژخەلکێ ڕا کو کەڤـرێن وێ ژئـاڤاهیێن خوەڕا بینن و خانیێن خوە پێ ئاڤابکن دسەر وێ ژ ی ڕا چار دەرگەهـ و چار برجێن نیڤ بازنەکی دروٚژ ئاڤایێ باژێردا مایە، ییێن کو قاسەك نەپر ل هەڤ ب دوورن، ب ڕاستی دەمـا مروٚڤ وێ ڕەوشـا هان دبینە، دلێ مروٚڤ پێ دشەوتەو هزار ئاخ و ئاخینکا ژنیڤا دلێ خوە بەر ددی، ژئالیێ هونـدەر ل سەر دەرگـەهێ جزیـرێ پاشمـایا نیگارا دوو مارێ هەفت سەر یان ژ ی نەهـەنگـا خوە ل هەڤ دوو ئالاندی دبینن کو حەیا بەری مودەکێ بەری کەتنا شورهێ دەرگەهێ جزیرێ ب خەمـل دکـر لێ‌پـا ئەو پشکا باژێری یێ کو شوٚرەها ل دور مایە کاڤل و خوٚپانەو نها تربستانا خەلکێ‌یە.

پارێن دن یێن قەمای ژڤێ شورهێ یا کو ل دوٚر دەرگەهێ‌یە یە یان ژ ی دجهێ گرنـگ ژڤێ کەلێ‌دا خویـایە کو هاتی‌یە ئاڤا کرن ب کەڤـرێن ڕەش و کەڤـرێن گێچیـا سپی یێن کو قاسەك نەپـر ژهـەڤ ب دوورن ئەڤ ڕەنگێ هان زووب زوونێـرینـا مروٚڤ ژخوەڕا دکشینە.



میناك ژ هوندر کەلهێ‌دە د سالا ١٩٠٩ ـ ئان دە.

ژئــالی‌یێ هونــدر شورهێ ل رەخ ئاڤـاهیێن کەڤن یێن کو **دیاره دەرگەهێ** وان مینا نیڤ بازنەکی‌یە هنەك ئاڤاهیێن نووژی **هاتی‌یە** ئاڤا کرن نها جیهـ و وارێ بەیایێ لەشکەرێ ترکایه «**۱۳**» .

بورجــا بەلــەك ل سەر باغێ میـرا «رەنگێ میـرا» دنێـره، **هوزانێ مەزن** و نەمـر ئەحمـەدێ خانێ ناڤێ ڤی باغی **دمەم و زینـا خوەدا ئانی‌یــەو دبێـژه کو هەمی نفشێ فێقی‌و داروباراو گول و کولیلکا وریحانا دناڤ ڤی باغی‌دا هەبوویە دەما دبیژی :**

**باغەك وه هەبوو ئەمیر زیدین**

**باغێ ئیرەمێ دچووب مزگین**

**هەر دوحه ژوی وەهەر طیورەك**

**یەك قەسر ژجنتێ وه حورەك**

**بۆشوشتنێ دەست وپێ وچەهڤان**

کوثر کر بوون سبیل رضوان «۱٤»

هەر ووســا شاعــرێ قەدر گران و خودێ ژێ رازی **مەلا** حسێنێ باتــەیی «۱٥» ناڤێ ڤی باغی ئانی‌یــه **دشیعرەکا خوەدا** کو دبوارا چۆیینا خوه بۆ باژارێ مکسێ **دپاهیزەکا دەرەنگ دا** دبێژه :

**دچریا پاشێ پێدا     مەلایێ باتەیی کانێ**

سەفەر کێشا د«مکسێ»دا     ل سەر وەقتێ زڤستانێ

**هەتا دبێژی :**

**بنێر داغا مه ئێخسیرا**

خەزال زەر بوون رەزێ میر

ریحان باری دئاڤێ‌دا

ریحان باری دئەیوانێ «۱٦»

بابــەتا گۆتنێ‌یه، کو دیوارێ کەلهێ‌و بورجا بەلەك پارچەکه ژشورها باژێر، دنێڤ دیوارێ وێ پارچه شورها کوژنك بورجا بەلــەك درێــژ دبی تا سەر ئاڤێ، کونــەك مەزن هەیه، نەدوور ئەڤ کونـه کوژنێڤ کەلهێ دگهێتـه سەر ئاڤـا دجله رێکـا ئاڤ



بورجا بەلەك شانشیا ...
«ژ الدولة الدوستكية جـ ۲ ل ٤۹۱»

ئتيێ بی دچـاخێ پێـدڤی ییٚدا چاخـەی دژمن دەوروبەرێ ـژێـر بگـرێ، هەروەهـا رێکـەکا نەپەنی بی بوٚناڤ کەلهێ، جکـو هنـەك کەلهێن کوردستانێ رێکێن نەپەنی «سری» هەنە مینا کەلها بدلیسێ وکەلها بانێ وکەلها حەسەن کەیفی «١٧»

هەر ووهـا برادەرێ سەیدایێ هێژا عبدالرقیب یوسف «ملا خەلـەفێ بافـەیی» دنـامـەکـا خوەدا کو دروٚژا ١٥ / ٢ / ١٩٧٨ ژسـەیدا عبدالرقیب را شاندییە دبێژە: ئاسارێ پرەکێ کەڤن هەیـە دنێـڤ بەینـا کەلهێ و (بـانێ خانێ) دە یانێ رەخی بەرامبەری وێ وناڤێ وی «پرا زوٚرەکایە» «١٨»

ئاڤاکرن و وەف دانانا ڤێ کەلهێ و قەسرێ ب وێ ئەفسانێ کودبێـژە ژ «٣٦٥» ژوٚرا پێکهـاتییـە، یانی قاسێ روٚژێن سالێ ڤە هاتییە گرێدان ئەڤەوڤان ژوورا گەلەك ئاسارو تشتێ نەدیتی تێ هەنە ژبل کو پرن ژهەمی نفشێ «توصف»

ئاسارو شوپێ کودکەلهێ دا مایە خویا دکە کو هنەك پارچێن وێ ژسێ قاتـا پێکهـاتییـە وحـەیـا نها ژی دیارە. ژ بوٚکو کار بەدەستێن ئوسمـانلیـاو پشتی وان ژی کار ب دەستێن ترکا ێن نهـا. هەر هەبـوونـەکـا دیـروٚکی و باژارڤـانیـەکـا گەلێ کورد نەهێلن، رابـوون ئەوشون وارو ئاڤـاهی و هەر تشتێ کومیرێن کوردا دانی بوون هەرفاندن و نەهێلان. پشتی وێ را ژی کرن

وارێ رونشتنـا لەشکـەرێ خوە، شون وارو ئاڤـاهیێن جزیرێ ژی ژڤێ کارێ پیس وبێ وژدان ب دوور نەکەت.

بێ گـوٚمـان گەلەك ژ بورجا بەلەك هاتە هەرفاندن دگەل وێ هێـرشـا ددوایيا سەد سالیا بیستان دە هاتە کرن بوٚسەرخان و قەسرێ بەدرخانیا.

ئەگـەر ئەم وان راستیێن دیـروٚکی دچیروٚکا بورجا بەلەك دە ڤاڤێـرن، نەمـازە مەسـەلا ب دەست خستنـا قەهرەمانیا کوردا دڤـەمـرانـدن و سەرکـوت کرنا شورشێن گەلێ دن. ئوچاندنا ئارێشەو دژمناهی یێ دنێڤ بەرا مالباتا بەدرخانیادە وباوەر کرن ب مەزناهیا میرێن بوٚتان و ئەڤین و حەز ژی کرنا وان یا کوورو دوور ژ بـوٚگەل و وەلاتێ خوە، باوەرە ولـوٚچیروٚکا بورجا بەلەك تێـتـە حسـێب کرنێ یەك ژ وان چیـروٚکێن دیـروٚکی یێ کو روهنی یێ دخێ سەر هن پرس و قەومـانـدنێن کو مە تشتـەك ل سەر خویاکر.

ب باوەرو زانینـا مە یەکـەم کەس کو چیروٚکا دیروکیا بورجا بەلـەك بەلاڤ کرییـە، وەك تشتـەك زانستی هێـژا «ئـەسعەد عەدوٚیـە، بێ کو تێتـە ژمـارتن فوٚلکورنیستەك زیرەك ودەست هەل دکوٚم کرن و ئامادە کرن و بەلاڤە کرنا کەلەپورا مللی دە «٢٠»



پاشمایا پرا بافت ل سەر روبارێ دجلەدە.

لێ ئەگەر ئەم ل نڤیسارێن وی بنەڕن دبینن کو جارنا گەلەك گۆتن و ڕستەك و تشتێ تشتێ نووهـ دکی تێدا، یێن کو چ هەڤبەندی دگەل بابەتێ دە نەبی، دیسا ڕایا خوە یا کەس و تالیقاتێن خوە یێ نە موستەحەق داڤێرە ناڤ دا، بەوەرە کو ئەو وان گۆتن و ئاخافتنا ب پێدڤی دزانی ژمژادێ‌را.

خویایە کو ڕێبازا کۆمکرن و ئامادە کرنا بابەتێن مللی ل جەم ئەسعەد عەدۆ وەها تێ وەشاندن، ئانکو بێژم پشتی گوهداری بابەتێ دکی.. دنڤیسە ئیجار جار دن سەر ژنوو ئانکو بێژم ب ئاوایەك دن یان ژی نوو ئوب ڕێبازا خوە ل شونا تۆمار کرنا دەنکی بابەتێ دادرێژە ژ بۆ وەشاندنێ.

ڕاستە هەر تشتێ کۆم کری ژ چیرۆك و سترانێن دیرۆکی ژ بۆ بەلاڤەکرن و وەشاندنێ دەست نادی ئانکو نەمومکنە بێ بەلاڤە کرن و وەشاندن، جار نا ژی ب کەم و کاس تێ بەلاڤەکرن، ئانکو نە ب درستی، لێ ئەڤ یەك نابە ئەگەرا وێ چەندێ کو ئەم ڕابن هنەکا ژێ باڤێژن یان ژی ب گوهێرن یان باڤێژن سەر هەر وەها چێ نابە ئەم گوهارتنا ڕێبازا گۆتنێ و گوهارتنا پەیڤ و زەمانی و ڤەگوهێزتنا ئەلفازان ژڤر بو جهەك دن ل دار

بخن ب هنجەتا ڤیانا کەس و تەمام کرن و شرۆڤە کرن و وەدار

کرنێ ولۆمژاد گەلەك ژ ڕەنگ و ساخلەتێن خوەو تام و ڕەسەنی و جوانیا خوە ووندا دکە. «٢١»

بەری نڤیساندنا چەند ئاوری مە لەسەر چیرۆکا بوزجا بەلەك یاکو ئەسعەد عەدۆ دکتێبا خوەدا «لیرەیەك لەگەنجینەی نەتەوەی کورد» دایە بەلاڤەکرن دڤێم کو چیرۆکی ب کورتی دەینم بە جاڤ وەك جاوا وی ب خوە دایە نڤیساندن وبەلاڤەکرن دەگێرنەوە لەدێر زەمانەوە پیاوێکی نێو «ئەحمەد» ریش سپی و خاوەن خوو ڕەوشتێکی مرۆڤانەی کورد هەبوو، لە ڕاستگۆیی و داد پەروەری شوهرەتی لە کوردستان بڵاوببۆوە، ئەو زاتە لە باوك و باپیرانی پاشایەتی «بۆتان»ی بۆ بەجێ مابوو، هەر چەندە ژنی هێنا بوو بەلام وجاخ کوێر بوو هیچ منداڵێکی نەبوو لە بنەماڵەکەش جگە لە عەبدوڵڵای برازای کەس تری نەبوو.

عەبدوڵڵا کەوتە پیلان دانان لەدژی ئەحمەد پاشای مامەی بو ئەومەبەستە چەند کەسێکی کردە دار و دەستەی خۆی و سەماوەرێکی «میر سوار»ی دامەزراند و قاوەچی و نێرگیلەچی.. هتد. بو دیوەخانەکەی تەرخان کرد.

خەلکی ناوچەکە بەتایبەتی پیاو ماقولەکانی بۆتان زۆریان بێز لە عەبدوڵڵای دەکردەوە، هەر یەکە بەتوانای خۆی



میناکا کەلهێ ژ دەرڤە، ژ دوورڤەژی بورجا بەلەك خویادبە.
«کۆنراد برویسر»

ئامـۆژگـاری منـداڵـەکانیان دەکردو مەترسی ئەو کارەی ئەوانیان ڕوون دەکردەوە کەپێی هەڵدەسن.

ئەو کەسـانـە بڕیـاریان دا کە ئەحمەد پاشا بەم کارە ئاگادار بکەنەوە. بۆیە لە سەوێکی بەهاری بۆتانی زێدە ئازیزێ کۆمەڵێك ئەپیـاو ئازاو ڕۆشنبیـرو زانـاکـانی ناوچـەکە بەرەو دیوەخانی برا گەورەی بۆتان ڕویشتن.

پاش چاك و چۆنی. پاشا ڕوزی کردە «مام چەتۆ»ی هاوتەمەنی

- ها مام چ خێرە؟
- ساغ و سرمەتی پاشامان
- دەبیلیٚ، بلیٚ
- پاشام خۆشبێ عەبدڵلای برازات چاوی لەپاشایەتی تۆیە!!

ئینجا پاشا بانگی سەرکارەکی‌ی خۆی کرد.

- هۆ فەرعۆ
- بەلیٚ پاشا
- برۆ بە عەبدڵلای برازا بلیٚ هەتا دیوەخانیٚ بێت.

فەرعۆ ڕویشت هاتەوە، گەورەم عەبدڵلا دەلیٚ ئیشم هەیە!

- برۆ بلیٚ عەبدڵلای بگاتە ئێدە.

فەرعۆ گەڕاوە، گەورەم دەلیٚ مێوانم هەیە!!

- پاشا دەلیٚ برۆ عەبدڵلا بینە..

عەبدڵلا دەهێنن

پاشا دەلیٚ.. ڕۆلە عەبدڵلا چاوت لە پاشایەتی منە؟

لە ئەنجـام دا لە نێـوان هەوالەکانی عەبدڵلاو ئەحمەد پاشا بوو بەشڕ نزیکەی چل سواریان لیٚ کوژ ران.

ئینجـا عەبـدڵـلا بە خۆی‌و دووسـەد کەس بەرەو ناوچـەی «کیکـان و ملان» کەوتنـە ڕیٚ.. تا گەیشتـە پاوانی عەبـدڵـلا ئاغای کیکان و ملان.

عەبدڵلا ئاغا ب سەرکارەکەی «تەمر» دەلیٚ..

- برۆ بزانە ئەو مالانە کێن

کە تەمـر دەچـی‌و دەبینیٚ دەزانی کە ئەوانــە مشــەخت و لیٚ قەوماون، بۆیە لەسەر زمانی ئاغای پی‌یان دەلیٚ:

- بفەرموونە دیوەخان، ئێوە مێوانی عەبدڵلا ئاغەن.

لەویٚ مانەوە تا ساڵ سواروە ئینجا عەبدڵلا بە عەبدڵلای بۆتانی ووت: «بـارکـەن بە چ ڕێگـایـەك هاتن بەو ڕێگـا برۆنـەوە»

عەبـدڵـلا ئاغـای سیٚ سەد سواری یەك تەمـەن و یەك بەرگ و یەك چەك و یەك جۆرەو ولاخ ئامادە کردو لەگەڵیان کەوتە ڕیٚ.

کە گەیشتنـە پەرەی بۆتـان، عەبـدڵـلا ئاغا بەرەو دیوەخانی ئەحمـەد پاشا ڕۆیشت پاشاش لەماڵەوە بەرەو دیوەخان هات، بەم جۆرە تاسیٚ شەو سیٚ ڕۆژ تەواو بوو ئینجا عەبدڵلا ئاغا بە ئەحمەد پاشای ووت:

- پاشا ئەوە سیٚ ڕۆژە تەواو بوو لەمنت نەپرسی؟

پاشا بەزەردە خەنەیەوە گوتی:

- حەلالی خۆم بو خۆم ئەوی تر هەمووی بۆ تو!!

بێژە چیت گەرەکە؟

ووتیٚ:- باڵندە یەکی خوشکوك هاتە وولاتی منبەراستی ‌لاو چاك و مەند بوو ئەو باڵندەم گرت و لەناو قەفەسم ناو دان و ئاوم دایی‌و پرسیار بە پرسیار بۆم ڕوون بۆوە، کە ئەو باڵندە باڵندەی پاشایا ولە وولاتی من هەلنیشتبوو، منیش ئەو ئەمانیە تەم بۆت هێناوەتەوە..

- خۆزگە ئەوە نەبوایە بەلام چارەم نەما ئەوا لێم بووری
- پاشا ووتی چی ترت دەویٚ ئەمرکە.
- دیـوەخـانی خۆت و مەسـرەفی ساڵێکی دیـوەخـان، چونکە عەبدڵلای برازات مەهاجرە هیچی نیە!

عەبـدڵـلا بەگیـان هێناو عەبدڵلا ئاغا پی‌ی ووت: مامەت لێت خۆشبو، پاشایەتی بۆتانی دەقەبەر کردی، بەلام بە مەرجێك.

- مەرجت لە سەر سەرم
- هەمـوو ڕۆژ یـك، سیٚ جار دەستی مامیٚ خوت ماچ نەکـەی هەردوو چاوت دەردێنم.
- ملم کەچە.

- دەبفەرمە دانیشە

ئینجـا عەبـدڵـلا ئاغاش لە باخەلی خۆی پێنج سەد زێری دەرهێناو دایە عەبدڵلا بەگی بۆتان.

پاش ماوەیـەك، ئەحمەد پاشا فەرمانی خودای بەجێ هیناو لە گۆرستـانی بۆتـانیان سپارد. پاش چەند سالێکیش عەبدڵلا بەگیش مردو لاشەی ئەویش بە گورستان بۆتان سپێردرا.

ئەحمـەد کوری عەبـدڵـلا پاشا کە باوکی بە ناوی ئەحمەد پاشـــای مامـــەی کرد بوو لە شوێنی دانیشت و سەرپـــەرستی بوتانی کرد.

لەکـاتی فەرمـان رەوای ئەو «ئـەحمـەد پاشا» عوسمانیەکان هێرشیان کردە سەر بۆتان وشەر لە نێوانیان بەر پابوو، ئەو شەرە نزیکـەی شەش سالێ خەیـانـد پاشان ئەحمەد پاشا بریاریدا خۆی بداتــە دەســت سولـتــان بۆ ئەوەی میللەتــەکـــەی لەو چەرمــەســەری‌یە دەرباز بکات، بریاریدا بیێتە قوچی قوربان میللەتـەکـەی، بۆیـە لە تاریکـە شەوێکی زستـان بەهێمنی لە بۆتـان دەرچـوو بەرەو «ئـەستەمبول» کەوتە رێی. . تا گەیشتە دیوەخانی سولتان عبدالحمید «۲۲»

ئینجـا سولتـان «بانگی حیجابەکەی کردو لەسەرە خۆیی‌ی ووت ئەوە بەرە ژووری بەنــدیخــانــە بەلام دەمــــوێ وەکـو «گیســك»ی هەیاس لێ بکەن! نەشیش بسوتێ نەکەباب» بەو جۆرە ئەحمــەد پاشا چەند سالێکی لەژ وورەکانی بەندیخانەی ئەستــەمبـول بەســەر برد لەو ماوەیـەدغ کچی سولتـان هەمـوو رۆژێك لە پەنجەرەیەکی کۆشکی سولتان کە دەیروانیە حەوش بەنـدیخـانە لە دوورەوە سۆزی دلی بە تەماشا کردنی ئەو شۆرە سوارە سارێژ دەکردو بەتەواوی ئاگری عیشق لێیدا!

رۆژێکیـان کچی سولتـان بانگی جەنـدرمـەکەی پاسەوان دەکاو دەلێ :-

- ئەو بەندە ناوی چی‌یە؟

- گەورەم ئەوە ئەحمەد پاشای بۆتانە

بەندەی بێنە لام!

کە ئەحمـەد پاشا ئەبەنە لای کچی سولتان، کچی سولتان پیی ئەلێ: ئەوە ماوەی چەنــد ســالــە، عیشقت بۆتـە تیـری پێگـاوم، بفـەرمـە خۆت لە گەرماوە پاك بکەرەوە ئەوەش دەستە جلێك، زووکە تا برۆین!

لەدوای پشودان و خواردن کچەکە هانی‌دا کەهەلیگرێ و برۆن.

بەلام ئەحمەد پاشا ئەم کارە ناکە.

پاشـان سولتـان کچی خۆی «رەمـزیـە خان» دەدا بە ئەحمـەد پاشاو ئاهەنگ ساز دەکا.

لەپـاش چەنـد مانگێـك، لەو کاتـەی ئەحمەد پاشا دەچیتە سەر بانی کوشکی سولتـان، غەریبی بۆتان جەرگی کون کون دەکان هۆش خۆی دەچێ!

لەو کاتـەی پاشـا بەردە بیتەوە «سوزان»ی کارەکەر دەیبینێ و رادەکاتە ژووری «رەمزیە» خان و هەوالەکەی پی رادەگەینێ.

رەمزیە خان بە ئەحمەد پاشا ئەلێ:

- پاشا ئەوە چیتە؟

- رەمزیە خان ئاگری بۆتان وا لەناو جەرگمە.

- ئەلحــەمــدڵــلا هەر ئیستـا برۆ دیـوەخـانی سولتـان داوای گەرانەوەی لێ بکە.

سولتان بریاری دەدا کە بە پاشایەتی بۆتان بگەرێتەوە

ئەحمەد پاشاش دەستی کردەوە سەر پەرشت کردنی بۆتان و دروست کردنی قوتـابخانەو وجبەخانەو نەخوشخانە، هەروەها کوشکێکی جوان و بلنـدی بۆ رەمزیە خان لەناو روباری جزیرە لە شێوەی سێ گۆشەیی لە مەترسی شەپۆلی ئاو، دروست کردو بەناوی «بورجی بەلەك» دەنگی دایەوە.

بەلام چەنــد سانێکی بۆتــان ئەحمـــەد پاشـــاین کوشت ویستیـان رەمـزیـە خانیش لە یەکێکیـان مارە بکـەن، لەو کاتە رەمزیە خان لە ئازاری مندال بوونیدا بوو بەلام زرنگی رەمزیە خان و مامـانـەکـەی، وایـانی لێ کردن ئەو کارە ناپـەسندەیان سەرنـەگـرێ خانم لەســەر بورجی بەلـەك خۆی هاویشتـەنـاو

...ەکەو لە پاش ئەو قسانەی کرد «لەپاش بەژن و بالای ...حمەد پاشای بۆتان دونیایێ روونم لێ حەرام بێ».

...ماەکەش توانی کۆرپەکە لە بورجی بەلەك دەربازبکەو ...ە دیوەخانی سولتان لە ئەستەمبول.

...شان مامانەکە رووداوەکەی بۆ سولتان دەگێڕێتەوەو دەلێ «ئەم کۆرپەیە کوری رمزیە خانی کچی تۆیە»

...وی کۆرپەکە دەنێن «ئەحمەد پاشای دووەم» هەندێك ...یش بانگی دەکەن «بێ ناو».

ئەحمەد پاشای دووەم گەورە دەبێ و رۆژێکیان مامانەکە ...ووداوەکەی بۆ دەگێڕیتەوە.

ئەحمەد پاشای دووەم بریار دەدا بگەرێتەوە جزیرێ لەگەڵ هێزێکی سپاو مامانەکە بەرەو بۆتان دەکەونە رێ خەلکی ...وچەکە بەرەو پیریان هاتن و پاشاش دەنگی دان و گوتی:

...ەلکی بۆتان بریاری سولتانی ئەستەمبول ئەوەیە هەر کەسێك ئەحمەد پاشای کوری عەبدللا پاشای برازای ئەحمەد ...شای گەورە بداتە دەست دەبیتە فەرماندەو پلەی میرایەتی پێ ...ەدرێ».

یەکێم دێتە پێشەوەو دلێ «جەنابی قوماندار، ئەو ئەحمەدەی تۆ بوێ هاتووی، نزیکە بیست سالە تۆپاندم».

- ناوت چی یە؟

- خزمەتکارت زێرۆ

- هەر بەتەنیا کوشتت؟

- نەخێر قوربان، ئێمە دوازدە کەسین!

- زۆر باشە

ئەحمەد پاشای دووەم هەر دوازدە کەسان دەهێنێ و رووداوەکە، بو خەلکەکە دەگێرێتەوە دەلێ ئەمن کوری ئەحمەد پاشاو رەمزیە خانم.

ئینجا هەر دوازدە کەسان دەگوژێ و بەخۆی دەبێتە میری بۆتان.. «٢٣».

زێدە لەسەر وان ئاوروتێ دیتنا مەخویا کر ل سەر بەلاڤە کرنا چیرۆك و بابەت و سترانێن دیرۆکی هنەك ئاورێ مە هەنە ل سەر چیرۆکا «بورجا بەلەك» یێ کو هێژا ئەسعەد عەدۆ بەلاڤە کری، ئەو ژی ئەڤن:-

یەکەم:- دتێکستێ دە خویا دبە کو بوویە رێ ڤێ چیرۆکێ ڤەدگەرە چاخێ سولتانێ ئوسمانلی «عبدالمجید» ئەگەر ئەم ئاڤریەکێ ل دیرۆکا ئوسمانلیا ڤەدن، دبینن: کو دوو سولتان ب ڤی ناڤی هەبوونە، سولتانێ یەکان ب ناڤێ «عبدالمجید کورێ محمود»ە، دسالا ١٨٣٩ - ١٨٦١ ئان دە حوکم داری کرییە، چاخ و دەمێ وی دە دەولەتا ئوسمانلی کاری ب سەر میرنشینیا کوردا یا داوی زال ببەو نەهێلە.

سولتانێ دووەم ب ناڤێ «عبدالمجید کورێ عبدالعزیز»ە دسالا ١٩٢٢ ئان دە، حوکم داری ب دەست خست و تێتە ژمارتن کو سولتانێ داوییا دەولەتا ئوسمانلی، پشتی وی «کمال اتاتورك» کومارا ترکیا «٢٩/١٠/١٩٢٣» دە دەینادیێ کو ددیرۆك و خوەندنا چیرۆکا ئەسعەد عەدۆ بەلاڤە کری هەر ووسا ژی چیرۆکا مە بەرهەڤ کری دیار دبە کو نە مومکنە بوویەرێ چیرۆکێ ڤەگەرە چاخێ هەردوو سولتانا.

ئو خوەندەڤان دکاری بگهێژە ڤێ یەکێ ب ساناهی دمما هەر دوو تێکستا ب خوەندی، ژ بەر کو دهەر دوو تێکستادە ناڤێ بەدرخانیەکێ تێدا دیار نابە، یان ژی ئیشارەت ژێرا نایێ کرن، هەر ووسا چکو میرنشینیا بۆتان دچاخێ سولتان «عبدالمجید»ێ یەکان بە شورەش گەر بووز ب سەرکاریا ئەمیر «بدرخان بك» داوی سالا ١٨٤٨ ب درستی هاتە هەرفاندن ونەمان، ئوب هەرفاندن و نەماناڤێ میرنشینیێ مالێن بەدرخانیا هاتن مشەخت کرن، بزاڤێن میر یەزدین شێر دسالێن «١٨٥٣ - ١٨٥٦» ئان دە، هەر ووسا ژی میران عثمان و مدحت و امین وهنێن دن ژی نکار بوون میرنشینیێ ڤەگەرینن، ئەگەر چیرۆك دچاخێ یەك ژ وان هەردوو سولتانا با، دڤیا ناڤێ بەدرخانیەکێ تێدا خویا ببیا.

یێ کو ئەز دبینم پشتی لێگەرین و پشافتنا دیرۆکی، کو

بووبەرێ چیرۆکا «بورجا بەلەك» ڤەدگەڕە ڕۆژێن بلندو ڕوهنی دژ یـانـا میرنشینییا بۆتان دە، چێ دبە کو ڤەگەڕە چاخ و دەمێ هەر دوو شاعرێ مەزن جزیری وخانی ئو دیرۆکڤانێ قەدر گران شەرەف خانێ بدلیسی، ژ بـەر کو دچـاخ و دەمێ وان دە میـرنشینیـا بۆتان ب پێشکەتن و مەزناهیا خوەڤە شەوق ڤەددا. ئەڤـە ژی ئانکـو ئەڤ پێشکـەتن و مەزنـاهیـە ب سانـاهی دنڤیسـارێن گەلێـریـا جزیـری و خانی و شەرەف خان دە خویا دبە، تێدا سەربلندی وشەهنازییێ ب گەلێ خوە خویا دکن و دڤێن کو میـرنشینێن کوردا ببن یەك وئارێشـەو نەخـوەشییێ دنـێڤ بەرا خوەدو نەهێلن. زێـدە ژڤێ یەکێ هەر دوو شاعـر جزیـری و خانی پەسنـا میرێن بۆتان ددن و ب ئەشکەرا هێرش دکن سەر دەولەتا ئوسمانلی وفرسا دژمنێ گەلێ کوردو کوردستانێ:

چاخێ میـرنشینێن کوردا، دکـەتن وەزا بوون و سەرنشیڤیا دەولـەتـا ئوسمـانلی ب هێـزو ب پێش دکـەت، چاوا دنیڤێ دووێ ژسـەد سالیـا شازدێ و نیڤا یەکێ ژسەد سالیا هەڤدێ دە لۆکـا لەشکـەریـا وان دەولـەتا وەزاو کێم وەش بوو دکتور أحمد السعیـد سلیمـان زانیـارێ دیـرۆکـا ترکی دبێـژە: دەولـەتـا ئوسمـانلی دڕۆژێن قانـونی دە، حسن ب ئارێشـەو نەخوەشیا کر، ئەو بوو لەپ هلانین و خوە نیشان دانا ئەنکشاریاو زۆران بازیـا کار ب دەستـان ژ بـۆ ب دەست خستنـا حوکم دارییێ دەست پێ کر، چەنـد خوازتێن سەرخوەبـوونێ ژی پەیـدا بوون و بەرگـریـا هێزێ مەسیحیا دبولقان دە ل سەر وان هەمی ب ترس تر بوو.[٢٤] هەر ووسـا سولتـانێن ئالی ئوسمـان ئیـدی سەرکێشیـا وان هێـرشێن لەشکـەری نە دکـرن وەکـە بەرێ، ئویا ژهـەمـوو پتر کو دەولەتا ئوسمانلی بەرب بێ بوون و سەرنشیڤییێ دبـر ئەو شەڕێ سی سالی بوو دسـالێن (١٦١٨ ـ ١٦٤٨) ئان دە، دگەل دەولەتێن ئوروپی بێ پشتی سالا (١٦٥٦) دەولەتا ئوسمانلی خوە ب هێـز کر و کاری سەرکێشیا کارو کریارێ دەولەتێ بخی ژێر دەستێ وەزیـران ژکـوڕێن مالبـاتا کوپرلویا ئەلبانی. هەر ووسا ژی

ناڤێن محمـد، عەبـدال، ئەحمـەد، ئولـداش، عبـدالله. یێ کو دچیرۆکێ دا هاتنە ژێدەرەك دنە ژئاوڕێ مەڕا.

دیـرۆك دبێـژە: حیرەکی بۆتان ب ناڤێ (ئولداش، ئولان) بەگ حوکم داریـیا جزیـرێ کرییـە، بشتی ئەو غەدرا سەفەوی ب میر (عـەلی) کری، داوی ئولان بەگ ژی ب نەچـاری ژجـزیـرێ ڕەڤییە، پشتی زانی کو میر عەلی دزیندانا سەفەوییادە ڕەڤییە.

دیسـا دیـرۆك دبێـژە کو میـرەکێ بۆتـان دچاخێ سولتان سلیمان قانونی دە (١٥٢٠ ـ ١٥٦٦) سەرکێشیا کۆمەکا لەشکەر کر حەیا گها ڤیـنا. ئو دبێژە میرەکێ دن ب ناڤێ میر محمد هات کوشتن، ددوڕا کوڕێ وی یێ بچووك هەر ب ناڤێ وی هات بوو ب ناڤ کرن یان ژی میـر محمدێ بچووك، حوکم داری ب دەست خست و دسالا (١٨٥٣) چوویـە بەر ڕەحمـا خودێ. هەر ووسـا دیـرۆك دبێـژە کو پشتی مرنـا ناصـر) بەگ) کوڕێ وی (خان ئەبدال) ڤیا ل شونا باڤێ خوە ڕوونـە، لێ دئەستەمبولێ دە هات کوشتن. پشتی سالا ١٥٨٣ (عثمـان پاشا) یێ کو دبێژنێ (الوزیر الأعظم) میرنشینیا جزیرێ دا دەست (میـر محمـد) کوڕێ (خـان ئەبدال)، لێ دچاخێ (صدر الأعظم) ـ (سنان پاشا)دە، هات ڕها کرن و ب دوور خستن بۆ ڕۆملی،[٢٥] ل ورما حەیـا داوییـا ژیانا خوە. ئەوژی ژ بەر خوازتا هەڤبـەرێ وی بوو دحـوکم دارییێ (میـر عەزیـز) یێ کو ب هەموو هێزا خوە ڤیا (خان ئەبدال) بێ دوندە بمینە.

سـەبـا نەخـوەشی و ئارێشـا کو دجـزیـرێ دێ دەست پێ کر، کار ب دەست و سولتـانێ ئوسمـانلی ل دوو (میـر محمد) شاند کو زوو ڤەگـەڕە (ئـەستـانێ)، وێ چاخێ میـر محمـد د(بـۆسنێ) یەك ژئـەستـانێن نێزیك ژگزرتا بلقان دا بوو، پشتی زڤرینا میر محمد بۆ ئەستـانێ و ل سەر خوازتـا ئیبـراهیم پاشـایێ وەزیر یێ کو فەرمان دا میـرێ دیـار بکـر و هەمی میرێن کوردستانی کو ئالیکاریا میر محمد بکن ڤەگەڕە جزیرێ. میر محمد زڤری جزیرێ، لێ ژ بەر ئارێشـەو نەخـوەشیێن کو برایێن میـر محمـد پێ ڕابـوون، ناچـار میـر محمد میـراتی هێـلاو ژجزیرێ دەرکەت. هنکێ دەولەتا ئوسمـانلی میراتی خستە دەستێ برایێ میر محمد، شەرەف خان ئەبدال.

دشــەرەف نامێ دە هاتی یــە، کوپشتی میر محمـد ژجـزیـرێ

سەرکەت هەمپاری دگەل لەشکەرێ ئوسمانلیا کر، دگەل وێ هێرشا

هاتە کرن بوسەر کەلها (ئاکری( یەك ژکەلهێن وەلاتێ مەجەرێ بێ

ئەڤـ ـ وێ چاخێ میر محمد دگەل ئانکو ل تەك سولتان دمەشیا بۆ

سەر کەلها (ئاکری). بێ گومان هێرش سەرکەت. پشتی وێ دیوانا

سولتان (محمـد خانێ سێهـەم) کورێ سولتـان (مرادێ سێهەم)،

بریـارد کومیـر محمد بێ خەلات کرن، ئەوخەلات کرن ژی ئەو

بو کو ڤەگـەڕەوببـە میـر ل سەر جزیـرا بۆتان. لێ وی ئەڤ خەلات

... نەکـر و جزیـر ژی ما دژێر دەست ێ برایێ وی میر شەرەف

حـ ـ نەمـــدان بێ کو هەڤ دەم و هەڤ چاخـــێ وی شەرەف خانــێ

ـــبـی داباشا وی ددەو دبێژە کوزەلامەکی زیرەك وژیر و چەلەنگ

... میرانی وگەڕناسی ناڤ دار بوو، وی گەلەك کاری کریارو

حرمەتێن باش ژی کرنە. [٢٦]

ئەڤ بوویـەرێن بووری کو مە خویـا کرن، گەلـەك ژ بـوویەرێ

چیرۆکێ بورجا بەلەك نێزیکە.

ئەنـــگ و باسێ میـــرنشینیـــا بۆتـان ژسـالا ـ ١٩٥٦ ـ ئان دە،

ـ ئەوێ دە نایێ زانیـن حەیـــانێ سالا ـ ١٨١٢ ـ وســـەر ژنـــوو

ب دژواری تێ زانین، ئانکـــو پشتی بەدرخـــان بەگ حوکم داری

ـ دەســت خست. ل ڤر دڤێ بێــژم کو نە پێــدڤی یـــە هەمی ناڤ

ـ رست و درستی بێن دچیـرۆکێ دە، ژ بـەر کو نەبـوونا هنەك ناڤا

دچیرۆکێ دە نە ئەوە کو ئەم بێژ ن ئەفراندنا چیرۆکێ دچاخێ وان دا

نەبوویـە یان ژی هەر نینـە دکوکا خوەدە، شاعرێ مەزن (جزیری)

دکەن میـر (عمـاد الـدین) ب شعـر دپـەیڤـە ئانکـو بێـژم بەرێکانا

هەز نشـانی یێ دنێڤ بەرا مەلایێ جزیری ... ادالین هەیە. هەر

وەسا شاعـر و فەیلەسـوفێ مەزن و نەمر (ئەحمەدێ خانێ) پەسنێ

(میـر زەیـدین) دشعـرێن خوەدە ددە، ئو دداستـانا مەمێ ئالان دە.

ـمێ (میــر ئەزین) کورێ (میــر تاجــدین) هاتی یـــە. ئەگـەر ئەم

ـ دیـرۆکـا میرنشینیا بۆتان و میرێن بۆتان بنەرن، دبینن کو ئەو ناڤێن

مە گۆتی تێـــدا نینـــە. چێ دبـــە ژی کو ئەو ناڤێن هان، ناسنـــاڤ

(بـــەرنـــاڤ) بن ژنـاڤێ ڕاستی ڕا هاتبی دەینـانـدن ژ بـۆ مەزنـاهی

وڕێزگرتن ل وان بێ کرن مینا خەلیفێن عەباسیا.

**دووەم:**ـ دچیـرۆکێ دە هاتی یـە کو میـرێ بۆتـان بورجـا بەلـەك ل سەر ئاڤا دجلە ژژنا خوە کەچا سولتانێ ئوسمانلی ڕا ئاڤا کری یە، لێ ئەڤ قەسـر گەلـەك ژچـاخێ سولتـانێ ئوسمانلی عبدالمجیدێ یەکـــان ودووەم کەڤن ترە مامـوستـا (عبـدالله یاشن) دکتێبـا خوەدا ب ناڤێ (CiZRE) یانی (جزرە) یا کو سالا (١٩٨٣) چاپ کری یە ئو دروویــەلا (٣٤) ئان دە ل سەر کەلا جزیــرێ و بورجــا بەلــەك نڤیسی یـەو دبێـژی «کەلا جزیری دزەمانێ (گوتو ـ گوتی)دە هاتی یە ئاڤــا کرن و ژ وەمــانێ ئاشـوریـان دەوحەیـا نهـا ژی مایـە». [٢٧]

ڕێڤـەبـەریـا ئاسارێ ترکی ژی وەها باوەر دکن و دبێژ ن کو ئاڤا کرنا کەلهێ ڤەدگەڕە چاخێ (عمادالدین الزنکي)یان یەك ژکورو نەڤیێن وی یێ کو حوکم داری ل جزیـرێ کری یـە، دسەد سالیا دوزدەهێ زایینی دە، ئەوژی ژ بـــەر کو هنـەك نڤێسنـا عەرەبی ب خەتێ کوڤی ل سەر دیوارێ شورهێ و کەلهێ دە هەیە. [٢٨]

لێ سەیـدایێ هێـژا وبهـا گران (عبـدالرقیب یوسف) وەها باوەر دکـە کو دیـرۆکـا ئاڤـا کرنـا کەلهێ و دیرۆکا ئاڤا کرنا بورجا بەلەك نە یەکن، ئانکو هەر دوودچاخ و دەمەکێ دە نەهاتنە ئاڤا کرن. ژ بەر کو ئاڤـــا کرن ب بەرێن (کـەڤـرێن) ڕەش وسپی بەلاڤ بوو ل بازارێ (دیـار بەکـرێ) دسـەد سالیـا سازدێ (١٦)زایینی دە، مینـا مزگـەفتا بەهـرام پاشـا، مزگـەفتـا فاتـح پاشـا، مزگەفتا علی پاشا، مزگەفتا ئەسکـەنـدەر پاشاو منارا مزگەفتا شێخ مەتەر ئەوا ل سەر چار ستونایە منارەیەکێ یەکەمە دتەخلیتا خوەدە دسالا (١٥٣٠)ز ـ دە هاتی یە ئاڤـــاکـــرن. [٢٩] هەر چاوا بە، ناڤێ بورجا بەلـەك پتـر ژجـارەکێ دداستـانـا مەمێ ئالانادە هاتی یە، کو دێژە یەك ژگرنگترین قەسرێ میرێن بۆتانە دەما دبێژ ی:ـ

**ئەمێ ئیشەڤ هەرن بازارێ جزیرا بۆتانە،**

**زینێ چیکن تابوتا شاهێ پەریانە،**

**بدنە سەر پیێن چەند حەبان ژوانە**

**ددەرخن ژبرجا بەلەك، قەسرا میرانە**

**ل خوە خسنن پەڕو بازکانە**

**ئیشەڤ، وەختێ عەشایێ،**

**گوتنا مە گوتنا ژنانە** [٣٠]

هەر ووسا دتێکستەکا دن دە ژداستانا مەمێ ئالان کو دەنگبێژەك کورد دسێورینە ناڤێ بورجا بەلەك هاتی‌یە دبێژە:-

**خودێ بینێ مالا هەرسێ ڤیزکێ پیریانە،**
**ل خوە کرن پوستێ کووان**
**فریان دکشین ڤاتێ عەسمێنێ حەفتانە،**
**شەڤا ل مەقامێ نیڤێ شەڤێ،**
**خوە بەردان سەر بازارێ جزیرا بوتانە**
**کەتن دەڤێ قەسرا رەنگین**
**بورجا بەلەك وارێ حوتانە،**
**چوونە قامێ دلبەرا رەبەن، زینا زێدانە،** (٣١)

هەر ووسا دسترانەکا دن دە یادیرۆکی ب ناڤێ «بورجا بەلەك»دە هاتی‌یە کو ئەڤ قەسر یێ کوگەلەك چیرۆك و داستان ل دذور هاتنە ئەفراندن، دگەل دەسپێکا دەیناندنا میرنشینیا بوتان دە هاتی‌یە ئاڤا کرن، کو دبێژە:-

**وەختێ ئەساسێ بورجا بەلەك هەر ددانی**
**هوستا کاران بەر دبری شاگردا بەر دبرن بانی**
**میر شەمدین ب سێ دەنگا بانگ دکر هوستاکاران**
**مالاوە ب خانێ خودێ بی**
**هنگ سەرێ ورو ئەساسێ بورجا بەلەك**
**قازان و قازان باشیا دانینە راسەرێ وێ شەتیانێ**
**ئەڤجا مالاوە بەخانێ خودێ بی سەرێ بورجا بەلەك**
**قازان و قازان باشیا دانن سەقلانێ**
**مەما هەی سەرێ وێ شەتیانێ.** (٣٢)

یا ژهەژی گوتنێ‌یە، کو شاعرێ مەزن و نەمر (ئەحمەدێ خانی) وەسفا قەسرێ میرێ بوتان ددەو دبێژە «قەسرا کو ژدوورڤە دهات دیتن وەکە برجەکا بلندو مەزن، تو دبێژی قەی ئایەتەکە ژئایاتێن هونەری و فلیتی‌یێ. ئوگەلەك (توحفێ) کەس نەدیتی و ئەنتیکەو ئەجێب، دگەل گەوهەرێ گران بها تێدە هەبوو». (٣٣)

سێهەم: دڤێ بێژم کو دچیرۆکێ‌دە گەلەك گوتن و تێگەهشتن و تشتێ نوویێ نەناس و نەزان دوێ چاخ و دەمێ‌دە، کرنە تێدا، بێ شك ژی ئەو پەیڤ و گوتن ئەگەر چیرۆك زان ژی وەها گوتبە، لێ ئەو ب خوە نوو هاتنە ساز کرن و کرنە دچیرۆکێ‌دە، ژوان پەیڤان مینا... «سیگار دابەش»، «سیگارێك تێ دەکا»، «چینی نوێ»، «کونە پەرستیان»، «نەرما فرەوایەکی دیموکراتیا»، «بژی بوتان»، «بژی مللەت»، «بژی ئاشتی»، «بژی پاشا»، «بژی دایکی گەورە»، «بژی دایکی بچووك»، «بژکی.. بژی.. بژی»، «مردن بو دوژمنانی خاك و میللەت»، «سەر بەخویی بو هەموو زور لێ کراوان»، «چەپ لە لێدان»، «ئەمن کوری باوکی خوم نیم»..... هتد.

هەر ووسا ئەسعەد عەدو داوی ب چیرۆکێ ئانی‌یە ب چەند ملکێن شعری کوچ هەڤبەندی دگەل چیرۆکێ‌دە نینە، بگرە حەیا دگەل مژادو ناڤەرۆکا چیرۆکێ ژی نامەشە. لێ ب ئاورا وی، ئەڤ یەك نڤیساندی‌یە چکو دبێنی پێدڤی و بەمغا ژچیرۆکێ‌را.

دژڤا بوو کاك ئەسعەد عەدو ڤێ یەکێ نەکی، ئانکو دڤا بوو ڤان زێدە کرن و تالیفاتا وەکە پێشکوتنەکا رند وسپەهی ژچیرۆکێ‌را نڤیساندبا، چیرۆکا دیرۆکی دڤێ وەك چاوا چیرۆك بێژ دبێژە بێ نڤیساندن، راستی نەدوورە، ئەگەر ئەم بێژن ئەسعەد عەدو، جار دن سەر ژنوو چیرۆك ب رێباز و ئاوایا خوە نڤیساندنە، پشتی گوهداری لێ کری‌یە ژدەڤێ چیرۆك بێژی، تێدا ژی گەلەك گوتن و تشتێ نوو کری‌یە تێدا، ئەووەها باوەر دکە کوب ڤێ یەکێ خزمەت کەلەپورا مللی وخوەندەڤانا دکە. ل ڤردەڤا چیرۆکا کو ئەم بەلاڤە دکن گەلەك ژدەڤا چیرۆکا ئەسعەد عەدو نەدوورە، من ب خوە ژی ئەڤ دەق ژزار دەڤێ خودێ ژی رازی (کەلەشن هندی) ل سالا - ١٩٨٤ - نڤیساندنە، کو ئەو ب خوە ژکوچەرێ حیرانەو ژیانا خوە دجزیرا بوتان ل ترکیاو سوریاو عیراقێ‌دە دەرباز کری‌یە، خودێ ژێ رازی ل دەڤەرا بەردەرەش (عشائر السبعة) سەر ب قەزا ئاکرێ سالا ١٩٨٦ چوویە بەر رەحما خودێ پشتی پتر ژ (٨٠) سالان ژیای. مخابن دگەل مرنا وی گەلەك چیرۆك وسترانێن دیرۆکی هاتن بن ئاخ کرن.

لێ بەری ئەز چیرۆکێ بدم بەر چاڤ، دبینم کو پێدڤی‌یە هنەك ئاورا ل سەر گوتنا خوە زێدەکم.

چیرۆك بێژی مە دبێژە کو میرەکێ بوتان ب ناڤێ (ئولداش بەگ) پشتی چەند سالا کو دگەل ژنا خوە نەمێر بوو، سەبا ڤێ شەرم و

...ی نکار بوول جزیریٔ بمینه، رابوو جزیر هێلاو دەرکەت.

... نەدیتنم کو ئەڤە نە ئەگەرە میر میراتی و وەلاتێ خوە (جزیرا ...) بهێلە، یێ دچیرۆکێ‌دە خویا دبە کو ئەوی جزیر هێلایە ... جزیری ژ بۆ ب جی ئانینا خوازتا سولتانێ ئوسمانلی، هەروەسا ... ئاریشەو نەخوەشیێن کو والیێن ترك یێن نێزیك جزیرا بۆتان ... دگەل مالباتا بۆتانیادە.

... چیرۆك بێژ دبێژە ل سەر دەڤێ میریێ کو خەریبیا وەلاتێ ... دکەو تەحلی و نەخوەشی یا ب دوور کەتنێ ژ وەلاتێ خوە دیار ... خودێ دخوازی کو ڤەگەرە سەر ڕەوش و پەرگالا بەرێ گۆتنا مە ... هێر دکە.

... چیرۆك بێژ ڤێ سترانێ ل سەر سترانێ ل سەر دەڤێ میر دبێژە: ـ هۆ میرۆ . . . هۆمیرۆ. . . . . هۆمیرۆ

... ب دیارێ ئەستەمبولا خونکارێ ئیسلامێ کەتم، هەمی ... من قەسرێ سپی نە،

... بەرێ خوە ددمێ ئیسکەلێ بەحرێ، کەلەك و قایق و گەمینە، ... سەقلاەتێ مەما شەتیانێ بۆتا، ب کەلەك و ب مەرکەب و ... گەمینە،

ئەز بەختێ وە وخودێ مە، کەس دلێ مە نەهێلن، ئەم خەلایبن، ئەم ژی ژ وەلاتێ خوە ب هێڤینە، وەرە مەدەد . . . مەدەد. . . مەدەد. . . ئاخ مەدەد هەی لۆلۆ.

* * * * * *

هۆمیرۆ. . . . هۆمیرۆ. . . . هۆمیرۆ

ئەزێ ب دیارێ ئەستەمبولا خونکارێ ئیسلامێ کەتم، هەمی ... من قەسرێ زەرن،

ئەز بەرێ خوە ددمێ ئیسکەلێ بەحرێ، کەلەك و قایق و گەمی وێ ... سەرن،

گەلی خوە جهیا، هون قەدرێ مە بگرن، دلێ مە نەشکینن، ئەم ژی ژ وەلاتێ خوە ڤەدەرن،

وەرە مەدەد. . . مەدەد. . . مەدەد. . . ئاخ مەدەد هەی لۆلۆ. (٣٤)

* * * * *

ژڤێ سترانێ‌دە خویا دبە کو میرێ بۆتان هاتی‌یە ب دوور کرن دگەل چەند زەلاما بۆیەك ژوان جهێ ژێر دەستێ ئوسمانلیا یێ ئورووپی (روملی)، ئو دەولەتا ئوسمانلی ژی گەلەك جارا هەست و بیرا وی یا دینی و ئول پەرستی هەژاندی‌یە ژ بۆ سەرکوت کرن و ڤەمراندنا سەر هلدان و خوە نیشاندانا ل جهێ کو ژێ هاتبوو ب دوور کرن. دەولەتا ئوسمانلی گەلەك جارا هەست و بیرا دینی و ئول پەرستیا کوردا دهەژاندو دلڤاڤاند ژ بۆنا لێدانا مللەتێن دن یێ نە موسلمان و جارنا ژی موسلمان ژی.

یان ژی میر ژ بۆ کو باوەریا سولتان پێ هەبە، دڤا بوو خزمەتەکێ ژدەولەتا ئوسیمانلی‌را پێشکێش کە، لەورا دگەل چەکدارێن خوە هەمپاریا شەرێن دەولەتا ئوسمانلی دکر ل ئورووپایێ. ژێدەرێن دیرۆکی دبێژە کو میرەکێ بۆتان هەمپاریا شەرێ ئوسمانلیا دگەل (نەمسا)دە کری‌یەو سەرکێشیا کۆمەکا لەشکەرێ زیرەك و پەهلەوان کری‌یە حەیا گهایە (ڤیینا) دچاخێ سولتان سلیمانێ قانونی (١٥٢٠ ـ ١٥٦٦). (٣٥)

هەروەسا (محمد بەگ) سالا ـ ١٥٩٦ ـ پشکداری دڤەکرنا کەلها (ئاکری) کری‌یە کو یەکە ژکەلهێن وەلاتێ (بیچ سی)یێ کو پاشایێن ئورووپایێ نکار بوون ڤەگەرینن ژێر دەستێ خوە، لەورا ژی سولتان خەلات و دیاریێ گران بها ل سەر میر و زەلامێن وی پارڤەکرن، دیارە کو میر و زەلامێن وی قەهرەمانیەك مەزن دوێ شەرێ‌دە ل دارخستنە، لەورا سولتان محمد بەگ خەلات کر کو ڤەگەرەو ببە میر ل سەر جزیرا بۆتان، زڤرینا محمد بەگێ بۆ جزیرێ یانی شەڕ و ل هەڤ ڕابوون و نەخوەشی دگەل میرێ ل جزیرێ، لەوژرا محمد بەگ میرێ جزیرێ کوشت و ب خوە بوو میر ل جزیرێ، ـ ئەڤ محمد بەگ چێ دبە کو ئولداش بەگ بە ـ

ئەڤ ڕاستی‌یێ هان دگۆتنەکا مللی‌دە ب هێز دبە کو دبێژە: (میر محمد) کو یەکە ژمیرانێن بۆتان، پسمامێ وی (محمد بەگ) ژێ سل بوویەو دشەڤەکێ‌دە میر محمد دایە بەرخەنجەرا ول سەر بورجا بەلەك دا هاڤێتی‌یە ناڤ ئاڤێ دا ئاڤ دبەر خوەدا بی و ژێ خلاس بی، نەك ڕۆژەك میریتی‌یێ ژێ بستینێ، ئەو جهێ کو میر محمد تێدا هاڤێتی‌یە ئاڤێ حەیا نها دبێژنێ گێرا (گەڕا) میر محمد. بەلێ ئاڤێ ئەو نەبری‌یەو ب سەر ئاڤ کەتی‌یە ب برینداری و بێ هشی،

سوبىّ يان هەر ب شەڤ كەلــەك ڤانــەك يان ژ ى زەلامــەكىّ دن كەلاخىّ وى دنىّ يەو ناس كرىيە، ب نەپەنى برىيە جەم مەتا وى ل كەلها (فنـك)ىّ، كودكـەڤى راژ ورىّ جزيـرىّ ب ڤوناخا سىّ سەعەتان، مەتا وى ژ ى ژنەكا گەلەك زيرەك وزانا بووە، ميرا كەلها (فنك)ىّ بووە، ل فنك و دەورو پشتىّ وى فەرمان دارى دكر. (٣٦)

ئيـدى مللەت ژ ى ژڤىّ يەكىّ سەرگـران وپىّ نەخوەش بوون، سترانێن دل شەوات و دل تەزين ل سەر كوشتنا وى ئەفراندن، ئەڤە ژ ى ل سەر گوّتنا چيروّك بێژ كو ڤىّ سترانىّ دبێژ ى:-

**جزيرا سەد جحارا ل من جزيرە،**
**دسەردا بورجا بەلەكە،**
**دبن دا رەزكوّكىّ ميرە،**
**حەيفا من ل وىّ حەيفىّ تىّ،**
**ئولداش بەگىّ دەستىّ مير محمد گرىّدا،**
**هاڤێتى شەتيانىّ پيرا.**

* * * * * *

ديـروّك نڤيسىّ موسلى (يـاسين خيـرالله العمري) ناڤىّ محمد بەگـەكىّ تينى كودسـالا ١٧٩٣٠ - ز مرىيـەودبێـژ ى: كوگەلەك زوّرداروستـەم كار بوو، خەلكىّ جزيـرىّ ل هەمبـەرىّ وى رابوون شەر كرن، لىّ محمــد بەگ شيـا وان ودڤىّ شەرىدە سەركـەت، گەلــەك ژوان كوشـت، حەيـا مفتـىيىّ جزيـرىّ وژنـا وى ژ كوشت. (٣٧)

سەيـدا (عبـدالرغيب يوسف) ژ ى وەها باوەر دكە كو ئەڤ محمد بەگـە ئەوە يىّ كوپسمـامىّ خوە ميـر محمد دا بەر خەنجەراول سەر بورجـا بەلـەك هاڤێتە ناڤ ئاڤىّ (٣٨) ئەڤ بوون ئاورىّ مە ل سەر وىّ چيــروّكـا كومە ئامـادە كرى ژ بـەلاڤـە كرنىّ را، ئيـدى كەرەمكن چيروّكى ب خوەندن.

**سەرىّ كتێيا ئەليف و بێنە**
**شەكرو نەبات هەردوو ژهندێنە**
**ئەى ميرىّ من من دى دوو نێچيرڤان دتێنە**
**ئيسال حەفت سالە، دوو ماسى ژبنىّ بەحرا**
**مرن ژتێهنا.**

**سەرىّ كتێيا ئەليف و باو ددالن.**
**شەكرو نەبات هەردوو هەڤالن**
**ئەى ميرىّ من، من دى دوو نێچيرڤان ل بالن**
**ئيسال حەفت سالە دوو ماس ژبنىّ بەحرا**
**ژتێهنا دنالن**

* * *

ب گوّتنا دەنگبێژ «دوو ماسى ژ بنىّ بەحرا مرن ژتێهنا ئانكودوو ماسى ژ بنىّ بەحرا ژتێهنا دنالن» يانى نەمێرن، ئانكو ئيسـال حەفت سالـەئـولـداش بەگ نەمێـرە، ئەڤ گوّتنـا هانىّ ژ ى ئولداش بەگىّ ژ بـاڤىّ خوە (ميـر عەبـدلـلا) بەگىّ را گوّت. دبێژ ى وىّ چاخىّ مير عەبـدلـلا بەگ باڤىّ ئولـداش بەگى گوّتن، ئانكوخەبەر وشتەغالى ڤێـهـم كر، يانى ڤێهم كر كوئولــداش بەگ ئيســال حەفت سالــە نەمێـرە، لىّ ژ بـوّزێـدە ڤێهم كرنـا خوە ب جى بكـە، رابـووگازى كورىّ خوە ئولداش بەگىّ كروگوّت:-

- كا گوّ ژمن را بێژە، ئەز باڤىّ تەمە، حال و ئەوحوالىّ وە چنە؟
- گوّ: يابوّ: ما ئەز چ ل تە ڤەشێرم، خودىّ ئيسال حەفت سالە ئەز نەمێرم.
- ڤەت نا...؟!.
- گوّ: بەلىّ.
- ڤێجە عيلاج!.

چ كر، ئولــداش بەگ رابــووژڤـەهـرادە، خورجكـا خوە زێـر داگــرت وخولامــىّ خوە ژ ى (رەمــوّ) تەڤ خوە هلداوژ بــاژارىّ جزيرىّ دەركەت و بەرىّ خوە دا باژارىّ ئەستەمبولىّ... وێدەرىّ ئانكـو ل ئەستـەمبـولىّ هەكـە سالـەكىّ هەكـە دووا... زەمانەكىّ وێدەرىّ مان، قەسرەك ژخوەرا كرىّ گرتن و كەتن تێدا.

قەسـرا ئولـداش بەگ تێـدا، ئەوورەمـوّ ئو قەسـرا كەچا پاشايىّ ئيسلامىّ هەردوومقابلى هەڤ بوون. هندى حالا ميرێن جزيرێنە، بەگن، خوّرتـانى وجمێلينيـا وان ژكـەسىرا نەگـەهشتىيە، هندى دەلالن، هنـدى جاحێلن، يانىّ جامێرا ئازيزينە، بەگن، پادشاهن جامێـرا، نە هەوەنتـەنـە، جا خوّرت و جمێلىّ وەكى ئولداش بەگىّ كێم هەبوون.

كەچكىّ (ئـانكـو كەچا پاشايىّ ئيسلامىّ) ددلىّ خوەدا حەز ژ ىّ

ـ. ئەوی ئاگـاه ژێ تونەیە، کەچکێ کر. . . نەکر. . . نکار بوو
حەیزێ ئولداش بەگێ، ڕابوو خوە گهاندە خولامێ وی (ڕەمۆ)، گۆ
حـ و ئەحوال ئەڤەنە.

ئەو گۆ وەعدە بی هەکە چێ بی ئەزێ بێژم میر، بەرە تە ژ باڤێ
تە خـــواز بکی، ئولـداش بەگ پێ نزانێ. دبێـژ ن ڕۆژەکێ
ئەو نیڤا باژارێ ئەستەمبولێ، ئەو ورەمۆ پرسا جمێلا کرن.

ـ هون چ کەسن؟ . . هون ترکن یان کوردن؟.

ـ هەکەر گۆت ئەز کوردم.

ـ چ شۆلێ تە هەیــە یابــۆ؟ وەرە شۆل نەکـە، وەرە ئەزێ بۆ تە
بکەم، چەند مەسرەفا تە هەمی ل سەر من. ئەڤ کارێ هان،
ئەمکرنا جمێلاو لگدانا وان هەمی ڕەمۆ کرن، میر پێ نزانێ،
ب وێ سورەتێ سالەك ئەگەر دوو ئەگەر سێ، شەش سەد
سوار ژخـــوەرا پەیــداکـرن، هەمی جمێـل وخۆرت، هەمی
کورد، هەسپ وجلکێ هەمی ڕەش.

دبێـژ ن ڕۆژەکێ بی شەڕێ حکـومەتا ئەستەمبولێ دگەل هەکە
ونغارا هەکە یەونانا.

ئەستـەمبـول گەلـەك ترسیا. . . گۆچێ دبە قەوەتێ بینن و
ئەستەمبولێ بستینن.

ڕەمـۆ چو جەم ئولـداش بەگێ، گۆ میـرێ من هلۆ ڕابە سەر
خوە، ئیـرۆ ڕۆژا تە هات، گۆ ڕۆژا چ ڕەمـۆ؟ نێ ئەزو تە تنێ نە
هەی حال خەراب.

گۆ: ڕایە، ئەزو تە نە تنێ نە، شۆلا تە ژێ تونە ڕەمۆ ڕابوو،
هەر شەش سەد سوار کۆم کرن، دەنگ ل سوارا کرو کەتن دوو
ئولـداش بەگێ. . گهـانە وێرێ، ئولداش بەگێ گۆ دەرابە ڕمۆ
هەر یەك ژڤـان سوارا فەنەرەکێ بکە ددەستێ دە، فەنەر ئانین و
هەر یەك فەنـەرەك دا دەستی، ئیجـار هەمیـا ب هەڤـرا فەنـەر
داگـرتن و مینـا گلۆپـا گەش کرن و هێـرش بەردانە دژمنا. . .
دێ. . . دێ. . . دێ. هەتــا ب سەر دژمن دا کەتن ودژمن
شکێناندن، زڤرین، لەشکەر زڤری، پرسن کرن، گۆیابۆ کی
ئەڤ مێـــرانــی کری یــە؟. کی کری یــە، کی نە کری یــە،
ل ئەستـەمبـولێ بی شتەغالی، خەبەر گها پاشایێ ئیسلامێ،
گۆ یابۆ لاوەکی کورد ژمالا میرێن جزیرێ هندی زەلام و ژیرو
چەلەنگە، وی ئەڤ کارە کری یە.

پاشـــا گازی وەزیـــرێ خوە کرن وشێـورا خوە کرن. گۆچ
لایقێ وی یـە ئەم پێشکێشی وی بکن؟ پێشکێشی ڤی جمێلێ
چەلەنگ بکین:

گۆتن، لایقێ وی، جامێـر زەنگینـە، دەولـەتی یە، خودان
ملکە، تێرە، هەکە تو ژ یا مە بکی یا پاشا کەچا خوە پێشکێشی
وی بکـــە، کەچـــا خوە بدێ، گۆ هەرن بێـژنێ بەرە بێ، ئەز
کەچـا خوە بدمێ. هات دەستی وی و کەچـا وی ژێ قەبـوول
کر. ڕابـوو کەچـا خوە دایێ، ژێ مەهـر کرو ڤەگـوهازتن، ما
ل وێـدەرێ ڤێجـە میـر محمدو عەبدللا بەگ یان ژ ی عەبدال
بەگ هەردوو برایێ هەڤ بوون عەبــدلـلا بەگ باڤێ ئولـداش
بەگـێ بوو، میـــر محـمــــد مامێ ئولــداش بەگێ بوو، سەر
مەزنـاتی یێ، میـر محمـد برایێ خوە عەبدللا بەگ کوشت بوو
ئیدی ئەو بوو مەزنێ جزیرێ، یانی میر محمد مەزنێ جزیرێ
بوو.

قسمەتا خودێ ئولداش بەگ هەکە سالەکێ هەکە دووا ما،
ڕۆژەکێ ئولــداش بەگ ل سەرێ قەســرێ دە روونشتی یە هو
نێـــری. . . هۆ نێـــری. . حسێب کر، کەسی هایــا وی ژێ
تونەیە. گو:ـ

هۆ میرۆ. . . هۆ میرۆ. . . هۆ میرۆ.
ئەزێ ب دیارێ ئەستەمبولا خونکارێ ئیسلامێ کەتم
هەمی ل من قەسرێ سپی نە
ئەز بەرێ خوە ددمێ ئیسکەلێ بەحرێ، کەلەك و
قایق و گەمینە.
دیســـانێ سەڤــلانێ مەمـــا شەتیـانێ بۆتـا، ب کەلـەك و ب
مەرکەب و ب گەمینە،
ئەز بەخـــتــێ وە وخـــودێ مە کەس دلـــێ مە نە هێـــلن، ئەم
خەریبن، ئەم ژ ی ژ وەلاتێ خوە ب هێڤینـە، وەرە مەدەد. . .
مەدەد. . . مەدەد. . . ئاخ مەدەد هەی لۆلۆ

* * *

هۆ میرۆ. . . هۆ میرۆ. . . هۆ میرۆ
ئەزێ ب دیارێ ئەستەمبولا خونکارێ ئیسلامێ کەتم، هەمی

ل من قەسرێ زەرن،
ئەز بەرێ خوە ددمێ ئیسکەلێ بەحرێ کەلەك و قایق و گەمی وێ ل سەرن،
گەلی خوە جهیا، هون قەدرێ مە بگرن، دلێ مە نەشکینن ئەم ژ ی ژ وەلاتێ خوە ڤەدەرن.
وەرە مەدەد . . . مەدەد . . . مەدەد . . ئاخ مەدەد هەی لۆلۆ.

* * * *

پیرا ژ ی حێستر دباراندن.
هایا ژنا وی لێ هەبوو، بەرێ خوە دایێ حێسترا دبارینە، چو جەم و ژ پیرا گۆ:
ـ ها میرۆ تە چی یە؟.
ـ گۆ خەریبیا من رابوویە، ئەم ژ ی پاشانە، ئەم ژ ی مەزنێ جهێ خوەنە، یێ ئەشیرێ خوەنە، ئەڤە چەند سالە ئەم دەرکەتنە، حال و ئەحوال ئەڤەنە، دلێ من ژ ی بۆ وەلاتێ من و ئەشیرا من دشەوتە.
ـ گۆ: ما تە دڤێ تو ڤەگەری جهێ خوە؟.
ـ گۆ: ئەرێ وەلەهـ.
ـ گۆ: باااشە ئەزێ بێژم باڤێ خوە، کا چ دبێژە، چ ئەمرێ وی هەیە.
کەچك رابوو چو گۆتە باڤێ خوە، گۆ یابۆ، گۆ ها!.
گۆ: حال و ئەوحوالێ زاڤایێ تە ئەڤەیە، دڤێ هەرِی جهێ خوە.
ئێ گۆ: بلا، بلا هەرِی، بەس بلا موهلەتێ بدی من، پاشێ تو نە هەوەنتەی، تو کەچا پاشایێ ئیسلامێ ی، هەتا من کار بەستنا تە کری، من ئەووتە رێکر. قۆلەك عەسکەر بۆ ئامادە کر، ل دوو ئولداش بەگێ کەتن، قۆناخ . . . قۆناخ . . . کاروانی بی، رِۆژەکێ هەکە دووا هەکە سێیا، حەیا گهانە ئالێ جزیرێ، هنەك پێش وی ڤە هات وگۆتن، حال و ئەحوال ئ ڤەیە، تشتێ خەلکی گۆتی، پشتی تو چوی مامێ تە باڤێ تە کوشت و ئەو بی مەزنێ جزیرێ، هەی ناگۆ بەلێ، مامێ خوە گرت، گۆ خودێ ئەز تە ناکوژم، بەس ئەزێ دەست و پی یێ تە گرێ بدم و تە باڤێژم ئاڤێ، رابوو هەردوو دەست و پی یێ وی گرێ داو هاڤێتە ئاڤێ. جا ب ستران دبێژ ی

**جزیرا سەد جارا ل من جزیرە**
**دسەردا بورجا بەلەکە**
**دبن دا رەزکۆکی میرە**
**حەیفا من ل وێ حەیفێ تێ**
**ئولداش بەگێ دەستێ میر محمد گرێدا**
**هاڤێتی شەتیانێ پیرا**

ئەڤ بوو چیرۆك و گۆتنا مەژ ی ژ زار دەڤێ «کەلەش هندی» ل سالا ١٩٨٤ نڤیساند بوو، چاوا وی دگۆت ئولداش بەگێ بورجا بەلەك ژ ژنا خوە کەچا پاشایێ ئیسلامێ را ئاڤا کری یە، لێ دیرۆکا ئاڤاکرنا شورها جزیرێ و کەلهێ هێ ژدیرۆکا ئاڤا کرنا بورجا بەلەك کەڤنار ترە وەك چاودا دلێگەرینا مە ژ ی دا خویا بوو.

## ژێدەر و دەهمەن

(١) ـ ناڤێ بۆتان تێ گوتن ل سەر وێ دەڤەرێ یا کومیناسێ چۆڤەکێ نە قاسی هەڤن، رِوبەرا وێ دەڤەرێ دگهێژە (٢٣٠٠) میلا چار چۆڤەیی، بنا وێ ئاڤا بۆتانەو هەردوو چۆڤێ دن ژ ی ئاڤا دجلەو خابورە، ل راژۆر شێروایەو ل راژێسر زاخۆیە، رِۆئاڤا تۆر عابدین و رِۆخلات هەکاریایە.

جزیرا بۆتان ئەقلیمەکا جوگرافی یە، نە کویەتەك یان ژ ی قەزایەك بناڤێ بۆتان هەیە، باژارێ گرنگ یێن بۆتان دکەڤن سەروان رِوبارێن تێدا دمەشن مینا باژارێ جزرە، شرنەخ، سعێرت. باژارێ سعێرتێ ژ باژارێن دن مەزترە، ئەگەر چ ئەڤ باژار دکەڤە دەرڤەی ئەقلیما بۆتان ب درستی، هەروسا خەلکێ جزیرا بۆتانی ژ ی ژدەها ئەشیر و ئێلان پێك هاتی یە گەلەك گەرِۆك و زانا مێڤانداریا جزیرێ کرنە، لێ ئەوزانیارێن دسەد سالیا نۆزدێدە گۆتنە گەلەك کێمن، چکو حەیا ب نهادە گەلەك تشتێن ب بها ل سەر دیرۆکا بۆتان هەیە نەهاتی یە لێگەرین و پشافتن و ل دوو چوون ب درستی بنەر «دائرة المعارف الاسلامیة ج ٤» مژادێ

«بهتن» هەر ووسا بنەر. عبدالفتاح علي يحيى : بۆتان والبوتانيون والاغنية الكردية التاريخية» كۆڤارا كاروان، هژمارێن ٢٨ ـ ٢٩ سالا ١٩٨٥، پشكا عەرەبی .

٢ ـ ف . ف . مينورسكي :ـ الاكراد ملاحظات وانطباعات، ترجمة د. معروف خزندار، بغداد ١٩٦٨ ص١٧

٣ ـ الملا احمد الجزيري :ـ ديوانا مەلايێ جزيری، تويژاندنا، صادق بهاءالدين ئامێدی، بغداد ١٩٧٧ ص٤١٦ ـ ٤٢٠

هەر ووسا بنەر وەرگەراندنا هەردوو مالكا شيعری ب زمانێ عەرەبی، عبدالرحمن مزوري :ـ الجزيری مادحاً أمير بوتان، كۆڤارا كاروان هژمار «٢٥» پشكا عەرەبی

٤ ـ ئەحمەد خانی :ـ مەم وزين، بەرهەڤ كرنا گيو موكريانی، هەولێر ١٩٦٨، ل٤٣ ـ ٤٤

٥ ـ نورالدين زازا :ـ مەمێ ئالان، صالح علي گولی و انور قادر محمد لەرێنوسی لاتينەوە هێناويانەتە سەر رێنوسی كۆری زانياری كورد، بغداد ١٩٧٧ ل ٣٣ ـ ٣٤ .

٦ ـ دائرة المعارف الاسلامية، جـ ٤ مادة بهتان

٧ ـ كونراد برويسر :ـ المباني الاثرية في شمال بلاد الرافدين في العصور المسيحية والاسلامية، ترجمة د. علي يحيى منصور، بيروت ١٩٨١ .

٨ ـ ژ بۆ زێدە زانين ل سەر ڤێ پێكهاتنێ و كارتێكرنێ ل سەر ديرۆكا كوردی، بنێر. عبدالفتاح علي يحيى :ـ ادريس البدليسي دوره واثره في التاريخ الكردي، كۆڤارا كاروان هژمار ٢٤ سالا ١٩٨٤ پشكا عەرەبی .

٩ ـ ژ بو زێدە زانين ل سەر ێ يەكێ بنێر :ـ

ـ ن . أ . خالفين :ـ الصراع على كردستان، ترجمة د. احمد عثمان ابو بكر، بغداد ١٩٦٩ ص٢٤ ـ ٤٢

ـ سي . جي . ادمونـدز :ـ كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١ ص٥٦ .

ـ علاءالدين موسى كاظم نورس :ـ حكم المماليك في العراق، بغداد ١٩٧٥، ص١٦٥ .

ـ فيصل محمد الارحيم :ـ تطور العراق تحت حكم الاتحاديين الموصل ١٩٧٥ ص٨٩

١٠ ـ بەدرخان بەگ :ـ رۆژناما كوردستان، هژمارين ١٣، ١٤ سالا يەكان، مارت ١٨٩٨ .

هەر ووسا بنێر :ـ عبدالفتاح علي يحيى : بوتان والبوتانيون والاغنية الكردية التاريخية، گۆڤارا كاروان هژمارێن ديسا ژ بۆ زێدە زانين بنێر :ـ

جەليلێ جەليل :ـ كوردەكانی ئيمپراتوريەتی عوسمانی، وەرگەراندنی د. كاوس قفتان، بغداد، ١٩٨٧ ص٢٠٩ ـ ٢٥١

١١ ـ ميجور نوئيل :ـ يادداشتەكانی ميجور نوئيل لەكوردستان وەرگێرانی، حسين احمد جاف وحسين عثمان، بغداد ١٩٨٤ ص١٤٦ ـ ١٥٣ هەر ووسا بنێر :ـ

حسين احمد جاف :ـ صفحات مشرقة من تاريخ الاسرة البدرخانية مجلة كاروان، العدد ٣، ١٩٨٣ «باللغة العربية»

١٢ ـ كونراد برويسر :ـ ژێدەرێ بەرێ ل ص٤١ ـ ٤٧

١٣ ـ هەر ئەو ژێدەرێ بەدێ ص٤١ ـ ٤٧

١٤ ـ ئەحمەدێ خانی :ـ مەم وزين، چاپكرنا كرنا، گيو موكريانی، هەولێر، ١٩٦٨، ل١١٠ .

١٥ ـ دبارا ژين و ژينە نيگار مەلا حسێنێ باتەيی بنێر:

ـ عبدالرقيب يوسف :ـ ديوانا كرمانجی، النجف الاشرف ١٩٧١ ص١٣٧ ـ ١٤٢

ـ صادق بعاءالدين ئامێدی :ـ هۆزانڤانێت كورد، بغداد ١٩٨٠ ل٢٧٥ ـ ٢٧٧ .

١٦ ـ عبدالرقيب يوسف :ـ ژێدەرێ بەرێ ص٤٨ ديسا، عبدالرقيب يوسف :ـ «گەشتەكێ شوينواری دكوردستانا باكوری دە» ئەڤ كتێب هێ چاپ نەبوويە هێڤدارن كودەمەكی نێزك دە روهنيێ ببينێ، سەيدا عبدالرقيب . . ، هنەك رووپەرێن ڤێ كتێبێ «ژدەست خەتا وی ياكتێبێ» دگەل نامەيا خوە كو دۆژا ١٩٨٧/٥/٣ ژ «نورالدين انور بوتانی» راشانديە بدەست مەگهانديە گەلەك زانياری ل سەر جزير و شون وارێ كەڤن بورجا بەلەك دجزيرێدە تێدا هەيە، ئەم ژدل سپاس دارێ خەمخۆرێ كەلەپۆرا بلاڤا كوردی سەيدا «عبدالرقيب يوسف»ن . ژ بۆ زانينا شونوارێن جزيرێ و راژۆری كوردستانێ بنێر: عبدالرقيب يوسف :ـ حضارة الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى . جـ٢، بغداد، مطبعة الحوادث ١٩٧٥ «ص ٤٩١، ٤٢٩»

١٧ ـ عبدالرقيب يوسف :ـ گەشتەكێ شوينواری دكوردستانا باكوری دە، دگەل نامەيا ژ «ن.أ.ب» راشاندی دروژا

٣/٥/١٩٨٧ده.

١٨ ـ عبدالرقيب يوسف :ـ هەر ئەو ژ يدەر

١٩ ـ نامەيا عبدالرقيب يوسف ژ» نورالدين انور بوتانى «را . .

٢٠ ـ ئەسعەد عەدۆ :ـ ليريەك لەگەنجينەى نەتەوەى كورد، بغداد، ١٩٨٤، ص٩٥ـ١٠٨ . پرانيا جيرۆك زان ودەنگبێژا نەخوەندىنە لەورا ژ ى، كەلەپۆرا

٢١ ـ مللى چيرۆك وسترانين ديرۆكى ب زار دەڤ ژ باڤان بۆ نەڤياو ژ زەمانەك بۆزەمانەك دن هاتى يە ڤەگوهازتن ئيدى نە دووره كو ب بورينا سال ودەم و چاخان، ناڤەك ل شونا ناڤەكى بێ دەيناندن بوويە روقاومانـدن ل جەم چيرۆك زان ودەنگبێژا بێ ئالزين سەبا ژ بيركرن و نەزانينا ديرۆكى، يان ژى ژ بەر خوازتا كەسى جارنا ژى چيرۆك زان چيرۆكى دگوهێرە سەر كاو دانێن ژ بنوارو چاخ ودەمێ خوە ودلێ گوهداريێ خوە ئيدى هنەكێ ژ چيرۆكێ داڤێژە يێ كو پێدڤى پێ نەبى و هنەكا ژى داڤێژە سەر يێ كو پێدڤى پێ هەبە، ئانكو پێدڤى وەراركرنێ بە، گەلەك كەس وبوويەروهەڤبەنديا ژى دگوهێرە لەورا ژى كەم وكاس وزێدەكرن تێدا بەر چاڤ دبە

ب ئاوروتێ ديتنا مە پێدڤى يە دەما بەر هەڤكرنا چيرۆك يان ژى سترانەكا ديرۆكى ژ بۆوەشاندنێ پێدڤى يە كو بەر هەڤ كار ناڤ و جهێ ژدايك بوون و مەزن بوون وزينا چيرۆك بێژ يان دەنگبێژ خويا بكى چكو ئەڤ كارێ هان ئاليكاريا تێگەهشتنا ديرۆكى چيرۆكێ مللى و گوهارتنـێ دكە، جارنا ئەم نكارن بێژن كو هەردەم چيرۆكا مللى وەسفا كەتوارى يا ديرۆكى يە، لێ ديرۆك ب خوە تژى چيرۆكە يێن كوهنەك بوويەرێن ديرۆكى تێ هەنە ئوژ بونا ب جى كرنا ڤێ يەكێ دڤێ ب رهەڤ كار بەرى وەشاندنێ ڤەگەرە سەر تێكسن وژ يدەرو دەهمەنێن ديرۆكى، دا زان بە كا رەهەك يان ژى سەدايەكا ڤى مژادى دديرۆكێ دا هەيە يان نە؟

ئەگەر رەهەك يان بنياتەك وەزا ژى هەبە دڤێ پشتى پيڤان و تەرازوكرنێ، شروڤەكى ودان وستاندنێ ل سەر بەرهەڤ بكى و پێشكۆتنەكا روهنى وئاشكار ژ بۆ را ئامادە بكى تێدا ب ديرۆكێ ڤە گرێ دى چ ژنيزيك چ ژدوور ئەڤ كارێ هان ژ بەلاڤە كرنا چيرۆك وسترانا ديرۆكى چێترە، شروڤە كرن ولێكڤرتنا چيرۆك وسترانێن ديرۆكى ژ بۆ بێژ ينك «مخل» كرنا راستيێن ديرۆكى گەلەك گرنگە ژ بۆ مللەتێ كورد يێ كو فەرسەندەك درست نەديتى يە ژ بۆ نڤيساندنا ديرۆكێ بگرە حەيا ئەوێن كول سەر ژ ى نڤيساندنە ب وژدان و ب درستى وراستى نە نڤيساندنە .

ديرۆكڤان «جيبونز» دبێژە : «ئەگەر ژ يدەرێن ديرۆكى، مە پێدڤى ب خوەندنا چاخەكێ بكى، دڤێ ئەم ڤەگەرن سەر ئەفسانەو چيرۆكێن مللى يێن كو كەتواريا ديرۆكى وهزرا ئاشوپيا مللى چێ كرى خويا دكە . »

هەر ووسا «ج . بيريز» دبێژە :ـ فليتيا سترانكى ئەوە يێ كو دوورو پاراستى ژهەموو كار تێكرنە كا دەرەكەيى ڤەماى.

دكتور عزالدين مصطفى رسول ژ ى، راستيا رۆلا ئەشيرا جەلاليا دداستانا كەلا دمدم دە خويا دكەو بەرسڤا «اسكندرمنشي» ددە يێ كو رۆلا ڤێ ئەشيرێ دگوهێرەو ب خرابى ونەباشى ددە نڤيساندن و دبێژە: «ئەڤ يەك تنێ كارل مە دكى كو ئەم ژئيرۆ ب شون دە، بابەت وچيرۆكێن خوە يا ڤولكلورى بكن يەك ژ ژ يدەرێن گرنگ ژ بۆ نڤيساندنا ديرۆكا خوە ياكو نەهاتى يە نڤيساندن» ل ڤرگرنگيا چيرۆك وسترانێن ديرۆكى خويا دبە ژ بۆ مللەتێ كورد، خاسمە پشتى سالا ١٥٩٦ ئان دە، يان ژ ى پشتى خلاس بونا مير شەرەف خانێ بدليسى ژنڤيساندنا شەرەفناما خوە.

بێ گومان ژ ى چيرۆك وگۆتنا ديرۆكى ڤەدگەرە بۆزەمان و هەڤ دەمێ بوويەرێ، بێژە هنەك ژوان بوويەرا «شاهد» ژ ى هەنە، لێ پشتى سەر ڤەچوونا سال وچاخ ودەمان ب سەردا دگەل ئەفسانا تێكەل بوونە، لەورا كەتواريا ديرۆكى ب درستى ژمەرا خويا نابە، وەك چاوا نڤشت و نڤيسارێن ديرۆكى خويا دكە .

لێ مينا كەكا تێكەل ب كەتواريا ئاشوپى تێتە بەر چاڤ تێدا دڤێ كو شوپەكێ ددلێ گوهدێردا بهێلە نڤيسكارل ڤرپشت ب چاندا ئەڤايى و ژ يدەرێن ديرۆكى راستى يێ ددى كفشێ و هەر تشتەك يان پەسنەك نەكە توارى بە تێدا داڤێژە، ئانكو ددى ئالەكێ .

بنێر: محمد فؤاد كوپريلي : قيام الدولة العثمانية، ترجمة وتقديم د. احمد السعيد سليمان، القاهرة ١٩٦٧ ص١٢ـ١٣ جاسم جليل :ـ بطولة الكرد في ملحمة قلعة ومدم، ترجمة شكور مصطفى، تقديم الدكتور عزالدين مصطفى رسول، بغداد ١٩٨٣ ص٧ـ٨ هەر ووسا بنێر/ عبدالفتاح علي يحيى، ژ يدەرێ بەرێ

٢٢ ـ ئەڤ ئاخاڤتنە : خوە ب دەست دانا ميرێ سوران، مير محەممەدى «ميرێ كۆرە» بۆعوسمانلى يا ل سالا ١٨٣٦، دهێنيتە

...ـن پشتی کو هندەك ژ خوفروشا ب ڕێکا فەنێ شیان وی ب ...ـە دەست و هەتاکو کارێ خیانەتێ یێ ملا محەممەدێ خەتێ و ...ـمێ دن ژی ژ ئاغێت کرێگتری و خوفروش ئەو کارێ میر ...حەممەدی ناچار کر خوە ب دەتە دەست سەربگرت، هندەك ب ...ـر گەهاندن کو میر خوە دە دەست هەتا ببت قوربان بۆ مللەتێ ...ـرێ و وەلات ژ هەرفتن و مللەتی ژ نەمانێ بپارێزت. وە دیارە کو ...ـەر ئەڤ مەسەلە ئانی یە ل بورجا بەلەك وەکی بێژی ل ئەنجاما ...ـغەری و بەس، هاتی یە.

٢٣ ـ ئەسعەد عدو: ژێدەرێ بەرێ ص٩٥ ـ ١٠٨

٢٤ ـ محمد فؤاد کوپریلي :ـ ژێدەرێ بەرێ ژ پیشکوتنا ...ـرگێر.

٢٥ ـ روملی ژدوو پەیڤا پێك هاتی یە، یانی وەلاتێ رۆما ئەوژی مەکرونیە، بەرێ ژێرا دگوتن، «بلقان» وژهەر شەش ولایەتێن ...ـسمانلیا یێ ئوروپی پێك هاتی یە ئەوژی ئەڤن أدرنە، سلانیك، ...ـستر، قوصوە «أسکوب»، یانیا، اشقودرة

٢٦ ـ شرف خان البدلیسي :ـ الشرفنامة في تاریخ الدول و الامارات الکردیة، ترجمة جمیل بندی الروژ بیاني بغداد ١٩٥٧ ص١٥٨ ـ ١٦٧

کذالك، ترجمة محمد علي عوني، القاهرة، ص١٣٠ ـ ١٣٧.

٢٧ ـ نامەیا عبدالرقیب یوسف...

٢٨ ـ هەر ئەو ژێدەرێ بەرێ

٢٩ ـ عبدالرقیب یوسف :ـ گەشتەکێ شوینواری دکوردستانا ...کوری دە، دگەل نامەیا ژ نورالدین.. را شاندنی.

٣٠ ـ نوالدین زازا :ـ ژێدەری بەرێ ص٤٦.

٣١ ـ داستان دکاسێتەکێ دە ل سەر دەڤێ دەنگبێژەکی کورد ب ناڤێ «جلال بگ» دەهاتی یەو، کاسێت ل جەم مە هەیە.

٣٢ ـ عبدالفتاح علي یحیی :ـ ژێدەری بەرێ، کاروان «٢٩»

٣٣ ـ أحمەدێ خانی : مەم وزین ترجمة وزین، ترجمة د. محمد سعید رمضان البوطی، دمشق، ص١٤، هەروسا بنێر مەم وزین بەرهەڤ کرنا، گیو موکریانی، هەولێر ١٩٦٨ ص٤٣ ـ ٤٤

٣٤ ـ بنێر دەقێ وگوتارا مە، بوتان والبوتانیون... کوڤارا کاروان، هژمارا «٢٩» پشکا عەرەبی.

٣٥ ـ میجور نوئیل : ژێدەرێ بوری، ص١٤٦، لێ میجور نوئێل شاش دبە، دەما دبێژی، میرەکێ بەدرخانی یە چکو بەدرخانی هاتن ناڤ کرن ب ڤی ناڤی ژ بەر بەدرخان بەگ وپشتی وی یانی پشتی سالا ١٨١٢.

٣٦ ـ عبدالرقیب یوسف :ـ گەشتەکێ شوینواری..

٣٧ ـ هەر ئەو ژێدەر

٣٨ ـ هەر ئەو ژێدەر

ئاورەك :ـ

ــــــــــ لێگەرین و گوتارا مە دکوڤا خوەدە، ب زمانێ عەرەبی هاتی یە نڤیساندن لێ چکو وەرگەراندنا بابەتێن زارگوت مینا ستـرانێ دیروکی و چیروکا مللی گەلەك ژ رەنگ و ساخلەت و رامانێن خوە ونـدا دکە دەما تێ وەرگەراندن، هەرووسا ژ بەر کو ئەز ب خوە دزارێ کرمانجی‌یە نە پر شەهرەزامە، خاسمە وەرگەراندن، لەورا مە پشت ب ئالیکاریا هوزانێ قەدرگران و شەهرەزا دزارێ کرمانجی‌دە «نوالدین انور بوتانی» بەست،

میناکا کەلهێ ژ دەرڤە، ژ دوورڤەژی بورجا بەلەك خویادبە

«کونراد برویسر»

بازێرێ جزیرێ د سالا ١٩٠٩ ـ ئان دە

«کونراد برویسر»

پاشمایا پرا بافت ل سەر روبارێ دجلەدە.

میناك ژ هوندر کەلهێ‌دە د سالا ١٩٠٩ ـ ئان دە.

«کونراد برویسر»

بورجا بەلەك شانشینا میرێن بوتان..

«ژ الدولة الدوستکیة جـ٢ ل٤٩١»

نەخشا بازێری جزیری ل سەر نەخشا کومەلا خەلەفێ باقی ـ ژ خەلکی جزیرێ ـ چێ کری و ژ هەڤالێ خوە عبدالرقیب یوسف راشاندی د سالا ١٩٧٨ دا هاتی یە وەرگرتن، لێ نە پر درستە، لەوراژی من پشت ب وەسف دانانا «کونراد برویسر» ڤەگرێدا ژ بو زێدەکرنا هنەك شونوارا.

# ملخص البحث
# بورجا بەلەك في جزيرة بوتان

بقلم: عبد الفتاح علي يحيى البو

لجزيرة بوتان التي تقع جنوب بحيرة وان مكانة مرموقة عند الاكراد بسبب تاريخها العريق ونضالها القومي الطويل في سبيل الحرية والاستقلال وقد شهدت مدينة الجزيرة «جزيرة بن عمر» عاصمة امارة بوتان الكردية . . ثورات عديدة ضد العثمانيين، فقد رفض امراؤها منذ بداية تأسيس امارتهم في القرن الثاني العشر الميلادي، الرضوخ المطلق للمحتلين الاجانب فأستحقوا وبجدارة مدح وثناء كبار الشعراء الكرد العظام امثال، الملا احمد الجزيري «١٥٦٠ - ١٦٤٠» واحمد الخاني «١٦٥٠ - ١٧٠٥» وحاجي قادر الكويي «١٨١٥ - ١٨٩٧» وغيرهم .

ورغم تقسيم كردستان رسمياً بموجب معاهدة زهاو عام ١٦٣٩ بين الصفويين والعثمانين، وسياسة الدولة العثمانية القمعية تجاه الامارات الكردية، فقد ظلت امارة بوتان تناضل و باصرار من اجل حياة افضل للاكراد، واشتهر الامير بدر خان، الذي تسلم مقاليد حكم الامارة في ١٨١٢، واولاده من بعده بالنضال السياسي والثقافي، حيث اصبحت مدينة الجزيرة «جزره» بفضلهم العاصمة الروحية للوطنية الكردية في القرنين التاسع عشر والعشرين، وصمدت الامارة حتى النفس الاخير . . فكانت آخر قلعة للصمود الكردي امام الجيوش العثمانية عام ١٨٤٨ .

لقد استمر افراد تلك الاسرة المناضلة بنشاطهم السياسي والثقافي من اجل قضية شعبهم، فكان لهم دور كبير في نشر الوعي القومي وتطوير الاتجاهات السياسية نحو الوطنية الكردية . . .

فاصدروا أول جريدة كردية «كوردستان» واسسوا أول منظمة قومية سياسية في تاريخ الشعب الكردي . . .

إن التراث الادبي والتاريخي والنضالي الكبير لجزيرة بوتان عبر التاريخ جعلتها تتبوأ مكانة بارزة في مجمل الحركة القومية الكردية الوطنية، ومحترمة في قلوب الاكراد في كافة ارجاء كردستان، فنالت اعمال وانجازات امراء جزيرة بوتان حتى الانشائية منها نصيباً وافراً من الاغاني والملاحم والاساطير الشعبية الى درجة ان معظم امرائها ارتبطت اسمائهم بالحكايات الشعبية والاغاني التاريخية، حيث نسج المغنون والرواة حول اعمالهم القصص والاساطير التي امتزجت بالتاريخ، مثل ملحمتي ممىٰ ئالان ومم وزين الخالدتين . .

وقصة بورجا بلك «البرج او القصر الابلق» الذي مازال آثاره باقية، قصر امراء بوتان يقع في شمال مدينة الجزيرة وعلى الضفة اليسرى لنهر دجلة «انظر الخارطة» سمي بهذا الاسم لانه مشيد باحجار البازلت السوداء واحجار الكلس البيضاء على سبيل الزخرفة والبرج مشيد داخل حصن كبير يقال انه يحتوي ٣٦٥ غرفه فيها انواع من التحف النادرة .

ان قصة بناء القصر تلقي ضوءاً على كثير من الاحداث التاريخية التي شهدتها مدينة الجزيرة وامارة بوتان خاصة على الخلافات التي كان يزرعها سلاطين ال عثمان وولاتهم المجاورين للامارة بين افراد الاسرة الحاكمة لجزيرة بوتان .

تروي تلك القصص والحكايات: ان اميراً بوتانياً ترك الجزيرة بسبب الضغط العثماني . واستقر منفياً في استنبول وهناك زوجه السلطان ابنته، مكافأة له على عمل بطولي قام به دفاعاً عن الدولة العثمانية، واعاده ايضاً الى جزيرة بوتان، ليقتل هناك الامير الحاكم ويبني قصر بورجا بەلەك» اكراماً لزوجته ابنه السلطان . واول من نشر نصاً لقصة بناء «بورجا بەلەك» على قدر علمي، كان الاستاذ اسعد عدو، لكنه للأسف لم يقم بعملية نقد وتحليل النص، او يناقش مضمونه ويقارنه بوقائع التاريخ بالاعتماد على المصادر التاريخية والنصوص الاخرى، لنزع كل صفة غير واقعية عنها، كما اضاف اليها الكثير من المفردات والافكار الحديثة، وربما صاغها من جديد باسلوبه بعد ان سمعها من الراوي، معتقداً ان عمله هذا يخدم الفلكلور والتراث ويمتع القارئ ويشوقه لقراءة القصة .

وقد حاولت من خلال البحث إكمال مابدأ به الاستاذ اسعد عدو وذلك بنقد وتحليل القصة تاريخياً بالاستفادة من نص اخر كنت قد سجلته عام ١٩٨٤ ومن المصادر المراجع التاريخية والادبية والتراثية، فتوصلت الى نتيجة مفادها: انه من الممكن بالنسبة لنا نحن الكتاب الاكراد خاصة، لاسباب - ذكرتها في البحث - ان نستفيد من الاغاني والقصص التاريخية التي فيها الكثير من الحقائق الممزوجة بالتاريخ في كتابة تاريخنا ولكن بعد النقد والتحليل والتحقيق التاريخي، لما تعكسه تلك القصص والاغاني من واقع تاريخي قد حرفه الخيال الشعبي، اي انها لاتعرض لنا الوقائع التاريخية كما تعرضه كتب التاريخ والسير وانما تبسط امامنا صورة مموهة يمتزج فيها الخيال بالواقع .

# تابلۆ هونەرییەکانی

## شەرەفنامە

عبدالرقیب یوسف

### بەشی دووەم

## تابلۆی هەشتەم شاری حەسەنکێف

ئەم تابلۆیەیش وەکو تابلۆی حەوتەم لە میرنشینی حەسەنکێف دەدوێت. لە تابلۆکەدا، وێنەی مزگەوت و منارەی حەسەنکێف کێشراون، یەکێك لە حەوشە، یا هەیوانی مزگەوتەکەدا لەسەر مافورێك دانیشتووەو جلوبەرگی لە هی میران دەچێ دەستی ناوەتە سەر سینگی. دوو کەس، کە پێ‌دەچێ کەنیزەك بن، خواردنی بۆ دەبەن، یەکێکیان قاپێکی گەورەی بە سەر دەستەوەیە، دەمەکەی پەلەو خڕ نییەو. ئەمسەرو ئەوسەری دەمی قاپەکە لە نێوەڕاستی بەرزترن و نەخشیش بە دەمەکەوەیەتیو، ئەمیش دەستێکی بە دەمەکەیەوە گرتووەو دەستەکەی دیکەیشی دەم و کەوچکەکەی هەردوو گرتوون. ئەوەکەی‌دییان سینی‌یێکی بەسەر دەستەوەیەو پیاوێکیش هێندێك لە لەشی دیارە وا لە پشت ئەوەوە.

من وای بۆ دەچم ئەو پیاوە گەورەیەی خواردنی بۆ دەبرێ سوڵتان حسێنی کوڕی میر محەممەدی کوڕی میرخەلیل بێ کە کاتی تەواوبوونی شەرەفنامە گەورەی بنەماڵەی میرانی ئەییوبیی حەسەنکێف بوو. ناوبراو ماوەیێك فەرمانڕەوایی‌کرد، بەڵام چونکە حەزی لە ئیش و کاری گەورەی دنیایی نەبوو، دەستی لێ‌هەڵ گرت. شەرەفخان لە لاپەڕەی (٦٠)دا دەڵێت: ئێستاکە سوڵتان حسێن لە کوردستان دەژیو بەشێك لە پاشماوەی ئەوقافی باووباپیرانی وەردەگرێ. واتە بێ‌کارەو باری ژیانە جۆرو تەواو نییە. هەر لەم تابلۆیەدا، وێنەی دوو پیاو لە بەرمزگەوت و لەسەر کەناری دیجلە ڕاوەستاون، دیارن و قوڵیان کردووە بە قوڵی یەکدی‌دا. هەروەها وێنەی دوو پیاوی دیکەیش کە بەسەر شاخی بەرانبەر مزگەوتەکەوەن، دەبیندرێت. وێنەی دوو (سوراحی)یش لەم تابلۆیەدا کراون. شایانی ... ە. شێوەی ئەم منارەیە لە تابلۆکەدا لەگەڵ شێوەی ئێستای ئە‍ منارە کۆنەی حەسەنکێف دا لێك ناچن.

### تابلۆی نۆیەم
### قەڵای ئاگیل لە دیاربەکر

تابلۆی نۆیەم (پەڕەی ٦٦) باسی میرانی (ئاگیل) دەکات و بریتی‌یە لە دیمەنێکی قەڵا سەختەکەی (ئاگیل) کە دەکەوێتە سەر بەردەڵانێکی بەرزی باکوری شاری دیاربەکرو (٧٥کم)ێك لێ‌یەوە دوورەو بەرانبەر بە ڕووباری دیجلەیشە ئەمە قەڵایێکی کۆنی کوردستانەو، نووسینی مێخیو هەڵ کۆڵدراوی سەردەمی ئاشووری‌یانی پێوەن. چەند گۆڕێکی بەردینی گەورەو کۆن و گرنگی تێدان، گڵکۆی ئەم پێغەمبەرانەی لێ‌یە: هارون ذوالنون، الیاس و ذوالکفل. جگە لە هەبوونی مزگەوت و قوتابخانەی کۆنی زەمانی موسڵمانەتی[٣٤]. ئەمانە هەموو نیشانەی ڕابردووی بایەخدارو شارستانەتیی دێرینی شاری ئاگیلن.

لە تابلۆکەدا، قەڵای ئاگیل وا بە سەر گاشەبەردێکی بەرانبەر ڕووباری دیجلەو، ئەم تەرزە بیناسازی‌یانەی تێدا بەرچاو



تابلۆی نۆیەم: قەڵای ئاگیل لە دیاربەکر



تابلۆی دەیەم: میرەکانی مرداس لە ئاگیل.

دەکەن: (قوتکە)کانی سەربانی بە جۆرێکی سێ سوچ و جوان دروست کراون و لە شاخ دەچن و، شێوەی ڕەشماڵی کۆچەریی سێ ئەستوندەگیو کەوانی بەندەروومیش بە ڕەنگ ڕشتنی لێواری (قـوتکـە)کـان بە ڕەنگێکی سپی دەردەکـەون. هونـەرمـەنـد سیفـەتێکی نەخشکـارانەی بە ئیشـەکەی بەخشیوە. پەنجەرەکانی قەڵاَیش بە شێـوەیێکی درێـژ لە بەردەکـان دا هەڵ کۆڵـدراون و، قوتکـە (شـرفـة)کـان و ڕیـزە دیـواری خوارەوەیـان بە چەشنێکی نیوچەکەوانەیی دروست کراون.

چەند کەسێك لە سەر قەڵاو دەوروبەری دیارن. چوارکەس لە سەر قەڵا ڕاوەستاون؛ دوانی نێوەڕاست پیاوو ژنێکن، ئەوەی دەستـەچـەپ بە سەروسـەکـوت و قژیدا دەردەکـەوێ کە ژنـەو سەروکـڵاوەکـەی وەك هیی پیـاوان گەورەیـە، تاکـە جیاوازییان ئەوەیە کە لە پێشەوە زەقتر پێچراوەو نێوچاوانی ژنەکە باشتر دیارە. ئەم سەروکـڵاوە گەورانـە تا ئەم سەدەی بیستـەمـەیش لە ئاگیـل هەن، بەپێی وێنـەی ژمـارە (١٨٨/٢)ی نێـو کتێبی (دیـاربکـر تاریخی)ی (بـەسـری کونیـار) ئەم جۆرە سەروکـڵاوە لە ناوچەی سۆرانیش وەك خۆشنـاوەتی ـ هەیـە. ئەم ژنـە کەمێـك دەستی بەرزکردووەتەوەو، لەگەڵ پیاوەکەی بەرانبەریدا کە دووەم کەسە لە دەستـەڕاستـەوە قسـەدەکـات. دوور نییە ئەوە جەعفەر بەگی کوڕی قاسم بەگ بێ کە کاتی تەواوبـوونی شەرەفنـامـە میـری ئاگیـل بووەو، ڕەنگـە ئەو ئافرەتـەیش ژنی بێ. تەمـەنی میـر جەعفـەر ئەوسـا دەوری چل ساڵ بووە. لە بەری دەستـەچـەپی قەڵاکەدا، لاوێکی بەرگ سپیو کچێکی کەزیدار ڕاوەستاون و لە دڵـدارو دڵخـوازی یەکـدی دەچن. پەڕێکی گەورەی باڵنـدە خراوەتە بەر کڵاوی لاوەکە کە دەستێکی بەرزکردووەتەوەو لەگەڵ کچـەدا دەدوێـت. لاوو کچـەکـە لە تەنیـشت یەکتـر نین و دووریێـك لە نێـوانیـان دایـە. جێیێکی بڵیـند، وا لە نێـوان هەردووکیان داو لەوە دەچێ خۆیان دابێتە پشت جێیێکی بەرز بۆ ئەوەی کەس نەیان بینێ. ئەم جێیە بەرزەی نێوانیان لە کۆسپی ڕێگەی پێك گەیشتنیان دەچێ. لەوانەیە ئەم دیمەنە چیرۆکی دوو دڵداری خەڵکی ئاگیل بێ.

کوڕو کچێك بە نیوقەدی شاخە بەردەڵانەکەی خوار قەڵاوەن و پێکـەوە قسـە دەکـەن. وێنـەی ڕاوکـەرێك وا بە نێزیکی داوێنی تابلۆکـەوە کە تفـەنگێکی درێـژی ئاراستـەی باڵـندەیێکی سەر دارێك کردووە کە پێدەچێ بولبول بێ، ڕاوکەرەکە کیسـەیێکی پچـووکی وەك جزدان (خـەلیتـك)ی لە پشت بەستـووە، لەگەڵ شتێکی وەك قوریی چادا؛ کیسەکە جێی گوللەی تفەنگەکەیو شتـە خرەکـەیش جێی باروتـەکـەیـەتی. کورد، کاتی خۆی، بارووتی تفەنگی کۆن (تفەنگی کرمانجی)ی دەخستە نێو کولەکە (مقەور)ێکی خری پچووکەوە. بۆ ئەوەی بە باران نەر تەبێو شێ هەڵ نەهێنێو نەپـەستـرێتـەوە. دەمەکەیشی بە پەڕۆ دەگیراو توند دەکـراو ملە باریکـەکـەیشی بە پەت دەبـەستـراو، تفـەنگچی بە پشتێنی خۆیـەوەی قاییم دەکـردو بەلاکـەلـەکەیەوە شۆڕدەبووەوە. وێنەی کولەکەی بارووت و تفەنگ و پێداویستەکانی ڕاوشکار لە سەر کێلێکی گۆڕستانی جزیرا بۆتان هەڵ کۆڵدراون، کە ڕەنگە گۆڕی محـەمـەد بەگی میـری بۆتـان بێ وێنەی ئەو کێلەمان لە کتێبی (بـانگـەوازێـك بۆ ڕوونـاکبیـرانی کورد ل ١٠٨)دا بڵاوکردەوە، هەروەها وێنەی ئەم جێیە خرەی کولەکەی بارووت لەگـەڵ وێنـەی دەمـانچـەو شمشێـرو خەنجەرو چەند ئامرازێکی دیکـەی شەڕدا لە سەر زۆر کێلەبـەردی گۆڕستـانی گەورەی هەولـێـریش دا هەڵ کۆڵـدراون. وێنـەی بڕێـك لەو کێلە کەلەپووریەیانم گرتووە. لە هێندێك ناوچەی وەك سلێمانیدا گوللەی تفـەنگیش دەخـرایـە نێـو کولـەکـەیێکی دیـیەوە. واتـە تفەنگچی دوو کولەکەی بچووکی بەم لاو ئەو لای کەلەکەیەوە دەبەست.

لە لای ڕاستـی خوارووی تابـلۆکـەدا، پیـاوێـك دیـارە (کڵاوقووچ)ی لە سەرناوەو مێزەری لە سەر بەستووە. ئەم پیاوە (دافنجان) واتە (دەفـسنجان)[٣٥] ی بە دەستی ڕاستی گرتووەو بە دەستی چەپیش لێیدەدات. دەف لێدەری تابلۆی سێیـەمیش هەر بەم جۆرە دەف لێدەدات بۆیـە دەبێ بڵێیـن چەپـە نین و لەوانـەیـە گرتن و لێـدانی دەف لە کوردستـان دا هەر بەو شێـوەیە بوویێ لە وێنەی تابلۆیێکی (قوتابخانەی تەورێز)دا دەف لێدەر بە دەستـی چەپ لێدەدات.

میسری‌یەکانیش لە سەدەی دووەمی پێش زایینیدا، لە سەردەمی بە تلیمۆسەکان دا بە دەستی چەپ دەفیان لێداوە، وەك وێنەی لە سەر بەرد هەڵ کۆڵدراو ئەوە پێشان دەدات[٣٦] یەکێك لە پێنج مۆسیقـاژەنـانی سەر سەعـاتـەکـەی (ابن الـرزاز)ی جزیـریی هونـەرمـەنـد بە دەستی ڕاست دەف لێدەدات[٣٧]. وەك پێشتـر

ــــ . کرد، جزیری له شاری دیاربەکر کتێبەکەی داناوەو، ـــەنـــی به دەست کردوون، وەکـــوو چۆن وێنـــەکـانی نێـو ــ حـمه نه کوردستان دا کراون.

ــبــقـژەنێکی‌دی بەرانبەر به دەف لێ‌دەرەکـه له ئامێـرێکی ـــنـعی ژێدار دەدات و جیاوازە له جۆری تەنبووری تابلۆی ــ حـه ـموێدا که وەك ئەو درێژ نی‌یەو سنووقەکەیشی دوو بازنەی هـ. که بیوانیـان کەمـەرێکی تەسکـەو تێلەکانی دیارنین. دوور ـ‌ـه ئەمه لەو جوره تەنبووره بێ که دوکتۆر حسین علی محفوظ ـ حـسور الشروانیین) ناوی دەبـات و، دەڵێت: سنـووقـەکەی هـ بحی‌یه (واته جۆره هەرەمی‌یەکه که ملی هەبێ)و دوو ژێی هـ و نه (تــەوریــز) به زۆری ئەم چەشــنـــه تەنــبـووره به ـربیـــــن.[٣٨] تابــلۆی شازدەیـــەم (١٦)یش ئەم ئامـێــره میسقـی‌یەی تێدایه.

ـی ئەوەیش له بیـربکـەین که هونـەرمـەند به باشی دەوری ـعـرەتی لەم تابلۆیـەدا لەچاو تابلۆکـانی دیکـەی‌دا دیـاری‌کردووه ـمویش رەنگه لەبەر ئەوه بێ که زۆربەی خەڵکی ئاگیل کوردی ـ ـ ا)ی‌ن و ئافرەت له لایان ئازادتره یا هۆی‌دیی هەن.

### تابلۆی دەیەم
### دیسان ئاگیل

ئەم تابـلۆیـــەیش هەر سەر به بابـــەتی میـــرانی شارو قەڵای ئاگیله. بەشێك له شاری ئاگیلی بەرانبەر دیجله لەم تابلۆیەدا دیـاره. مزگـەوتی ئاگیـل به گومـەزە کوزکوزەکەیەوە دەبیندرێت. مەلایێك که به سەرو مێزەری‌یەوە دەناسرێتەوە، له دەستەچەپی مزگـــەوت دا دانـیشتـــووه. پیـــاوێکی ئاینیش وا له لای راستی دەرگای خانوویێکی سپی تەنیشت مزگەوتەکەوە، که لەوانەیه به سەروکڵاوه سادەکەیەوه یا بانگدەر یا مجێوری مزگەوتەکه بێ. یەکێکی‌دی بەرانبەری‌و له لاکەی‌دیی دەرگاکەوە دەستی بۆ لای ئەو بڵند کردووەتـەوەو قسـەی لەگـەڵ دا دەکـات و لەوە دەچێ شتێـك له نێـو پەنجەکـانی‌دا بێ‌و پێشـانی‌بدات یا بی‌داتێ. به قژی‌دا دیاره که ژنه، گەرچی شێوەی بەستنی سەروکڵاوەکەی له هی پیاوان دەچێ. رەنگه خانووه سپی‌یەکه بەشێك بێ له مزگەوتەکه.

له بەردەم مزگەوتەکەدا، بینایێکی نەخشدار هەیه که من وای بۆ دەچم قوتابخانه بێ. دوو پیاوی ئایینی یاری‌یێك دەکەن که له (٧٢) خانه (مربعات) پێك هاتووه، به ئەستوونی هەشت خانەو به ئاسۆیی‌یش نۆ خانەیه. یاری‌یەکه (دۆمینه) نی‌یه چونکه له (٦٤) خانه پێك دێت و، (شەترەنج)ی رەسەنیش نی‌یه که پێش ئیسلام له هیندستانەوە بۆ ئێران و زۆر وڵاتی وەك کوردستان له جیهـان دا گوێـزراوەتـەوە هەر (٦٤) خانـەیه. بەڵام له لایەن چەنــد میللەتێکــەوە گۆڕانی تێــدا کراوه. (ابن أبي حجلة) له لاپـەرە (١٤٧ ـ ١٤٨)ی کتێبـەکـەی‌دا (أنمـوذج القتال في نقل العـوال) که له بارەی شەتـرەنجـەوەیـه دەڵێت: شەتـرەنـج چەند تەرزێکی‌دیکـەی هەیـه وەك (الشطـرنـج التـامـة)و شەتـرەنجی خەڵکی (صعید)ی میسرو شەترەنجی درێژو شەترەنجی رۆمی واتـه بێـزەنتی[٣٩] بەڵام هێنـدێکیانی روون نەکردووەتەوە. رەنگه ئەم یاری‌یەی ئاگیل جۆره (شەترەنج)ێك بێ بەڵام نازاندرێت کام جۆرەیەو، ئاخۆ لەو کاتەدا هەر له کوردستان دا هەبووه، یان لای میللەتانی‌دیکەیش.

یەکێك لەو دوو به ساڵداچووەی له تابلۆکەدا یاری دەکەن، مێزەرو جلوبەرگەکانی‌دیی رەشن و دوور نی‌یه قازیی ئاگیل بێ، یا مەلایێکی کوردە (زازا)یه شیعەکان بێ. ئەوی‌تر که مێزەرێکی (ســەروکــڵاو) سپیی له سەره پێ‌دەچێ: مەلایـێکی کورده سوننی‌یـەکـان بێ. ئەوسا پیاوانی ئاینیش شەترەنجیان دەکرد، چونکه له ئاینزا (مذهب)ی (افعی)دا ئەگەر لەسەر هیچ نەبێ حەڵاڵــەو هەر دەیــشــبــێ به قومــار. هەرچی یاریـی تاوڵــه (نەردین)یشه، با لەسەر هیچیش نەبێ، له هەموو مەزهەبێکی فیقهی‌دا حەرامه. بەڵام نازانین مەزهەبی (جەعفەری) رای لەو بارەو چۆنه.

له لای راست و نێــزیکی هەردوو یاریکـەرانـەوە، کوڕێکی لاو دانیشتووه. یەکێکی‌دیی به تەمەن، قاپێکی به سەر دەستــەوەیـــه؛ لەوه دەچێ خواردنی تێــدابێ‌و بۆی ببــات. له سەرووی مزگەوت و قوتابخانەکەوە، پیاوێکی ئاینی به تەمەن خۆ له لاوێکی تازەپێ‌گەیشتوو (هەرزەکارێك) تووڕە دەکات که دوور نی‌یه مامۆستاو فەقێ بن. هەرزەکارێکی دیکەیش له لای راستی سەرووی تابـلۆکـەوە هەیـە. به لای منـەوە ئەم کوره تازەپێ‌گـەیشتـوانـه فەقێی قوتـابخـانـەی ئاگیلن. لەو بەری شارەکـەیش، لەسـەر رۆخی رووبـاری دیجله دوو کەس هەن، یەکیان شتێکی درێژی له دەستدایه.

## تابلۆی یازدەیەم
## شاری هیزان

تابلۆی یازدەیەم (پەڕەی ٧٧) باسی میرانی هیزان دەکات. ئەم تابلۆیەو تابلۆی دوازدەیەمیش برێتین لە دیمەنی شارۆچکەی هیزان کە ئێستا دێیەکی بیست ماڵی سەر بە قەزای (قەرەسوو)ی ویلایەتی بدلیسە لە ناوچە شاخاوی‌یەکانی پاشووری خۆرئاوای دەریاچەی... (وان)داو، دەشتێك لە بەردەمی‌دایە هەر چواردەوری بە چیا تەندراون و جێگەیێکی یەکجار خۆشە. ئەم دوو تابلۆیە مانایێکی ئابووری دەبەخشن؛ بەوەدا کە لە تابلۆی یازدەیەم دا دوکان و بازاڕی شار دیارن و لە دوازدەیەمیش دا، دیمەنی زەوی‌وزارو جۆگەی ئاوو کێڵانی باخ لە لایەن باخەوانێکەوە وێنەکراون. هیزان، وەك شەرەفخان نووسیویە جێ‌یێکی پڕ باخ و بێستانەو، میوەی جۆراو جۆری تێدان کە هێندێکیان لە ناوچەکانی‌دی‌دا نین، وەك فندەق (بندق) کشمیش. هەروەها گلیاسیس و (شاهـ بە لوط)یش بە پێی قسەی مێژوو نووسانی‌دی.

لە دوایێی ئەم تابلۆیەدا، دوکان و بازاڕی هیزان دیارن، وان بە پاڵ گردێکەوە دوکانەکان بە خشتی سووررەوە کراوو پێشەوەیان بە چەشنێکی کەوانەیی‌و ڕێکوپێك بنیاد کراون و، هێندێکیان دەورانـدەوری ڕووکاریان نەخش کراون. دوکاندارەکان میوە دەفرۆشن. لە دوکانی دەستەڕاستی‌دا، کە تاقێکی کەوانەیی هەیە، کۆمەڵە شووتی‌یێکی درێژکۆڵەی بێ خەت دیارن و، شووتی‌یەکیش قاش کراوەو بەرچاوخراوە بۆ ئەوەی سەرنجی کڕیار ڕابکێشێ. لاوێك هاتووە شووتی لێ‌بکڕێت. وا بزانم تاقەکە کراوە بە چەند ڕەفەیێك و دوور نی‌یە میوەیان لە سەر داندارا بێ‌و، سەبەتەیێکیش وا بە سەر ڕەفەی سەرووەوە. دوکانی نێوەڕاست، شووتیی خڕی بەڵەك و تەرازووی تێدا دەبیندرێن. ئەوسا زۆربەی شووتیی کوردستانی تورکیا بەو چەشنە خڕە بووە. من پێش بینینی ئەم وێنەیە، وام دەزانی شووتیی درێژکۆڵەی سادە لەم نێزیکانەدا بۆ کوردستان هێندراوە. بەڵام ئەم وێنەیە بەڵگەیێکی مێژوویی پتەوە بۆ هەبوونی ئەم جۆرە شووتی‌یە لە کوردستان دا پێش چوارسەد ساڵ، خۆ ئەگەر لە هەموو جێگەیێکیش دا نەبووبێ ئەوا لە هیزان هەبووە. شووتیی وا تا ئەم ساڵانەی ڕابردوویش لە ناوچە شاخاوی‌یەکانی دەوروبەری هیزانیش دا نەبووە، وەك ناوچەی میکیس (مکس)و بگرە هەکاری‌و بۆتانیش هەر هیی خڕو درێژکۆڵەی خەتداریان هەبووە. هەر نێزیکەی سی ساڵێك لەم جۆرە هێندراوە بۆ سلێمانی‌و، یەکەم جار پێیان گوتووە (شوویتی قەڵاچۆلان) چونکە لەوێ چێندراوەو بەرهەم هێندراوە. واتە پێشتر هەر شوویتی خڕ هەبووە. وا پێ دەچێ ئەو دەمە هەردوو جۆرە شووتی‌یەکە، یا جۆرە درێژکۆڵە سەوزەکە لە کوردستان دا کەم و نایاب بووبێ‌و، یا هەر لە هیزان هەبووبێ، یان لەوێ بتر بووبێ، بۆیە ئاوا وێنەی کێشراوە لەلایەن ئەم هونەرمەندەی کوردستانەوە.

شووتی‌یە خڕە خاڵدارەکان لەم دوکانەدا بە سەر پێ‌پلیکانەوە دەردەکەون و ئەم پێ‌پلیکانەیش دەچنە سەر ئەو هۆدەیەی بنی دوکانەکە کە پیاوێك لە پەنجەرەکەی‌دایە دوکاندارەکە کە لاوە. لە سەر ئەژنۆ دانیشتووەو، پیاوێکی ڕدێنداریش کە ڕەنگە شتێکی لێ کڕیبێ، بەرەودوا دەگەڕێتەوە. تەرازووی دوکاندارەکە بە بن میچی دوکانەکەوە هەڵ واسراوە. ئێستایش ئەم جۆرە تەرازووە لە دوکانی قەساب و لۆکەو خوری ـ فرۆشەکانی شارەکانمان هەن. دوکانداری دوکانی سێیەم میوەیێکی خڕی بە دەستەوەیەو پێشانی کڕیاری دەدات، لەوانەیە فندق، یا هەنجیر بێ. دەستەکەی‌دیی بۆ شتێکی دیکە بردووەو کڕیارێکیش دەستی بۆ هەمان شت بردووە کە لە گوڵ و گوڵدانێکی شووشە دەچێ.

کوڕێك لە سەربانی دوکانی دەستە ڕاست وەستاوەو، یەکێکی دیکەیش لە سەر بانی دوکانی دەستەچەپ وەستاوەو وێنەکەی کەمێك شێواوەو لەوەدەچێ ژن بێ.

### کێشەیێکی بیناسازانە

کێشەیێکی بیناسازی (معماری) لە هەردوو تابلۆی لەمەڕ هیزان دا دەردەکەوێ. شەرەفخان لەم باسەدا نووسیویە: خانووەکانی نێو قەڵای هیزان (خیزان) لە سەر تەرزی بیناسازیی ڕوانگە (مرصد ـ رصد) واتە ڕوانگەی ستێرناسی بینادنراون ئاواکراونەوە.[٤٠] هەروەها گوتوویە: قەڵای هیزان لە قەڵاکانی وڵاتی کوردان ناچێ، بەڵکوو لە هیی عەجەمستان دەچێ کە بە خشت و قسڵ بنیادنراون. و جگە لەوە، هیزان شارێکی ئیسلامی‌یەو میوەهاتی وڵاتی عەجەمی تێدا هەن[٤١]. هەر لە درێژەی ئەم قسانەدا دەڵێت: لە نێو خەڵکی هیزان دا ئەوە بڵاوە

ئەم شارە خاوەنی شاری (مەراغە)و تەوریز ئاوای کردووەتەوە. بە خۆم زانیاریی وام لە هیچ نووسینێك،دا بەرچاو نەکەوتووە. هەرچەند ئەوەیش هەیە کە هۆلاکۆ شاری مەراغەی کردبووە کردی بە پایتەختی دەستەڵاتدارتیی خۆیو، زانای گەورەی ستێرناس (نصیر الدینی طوسی)یش ڕاوێژکاری بوو. بە ڕێدەچێ نصیرالدین لەگەڵ وەزیرێکی گەورەی ئیسلام دا ... ی هیزانیان بنیادنابێو، هەرخۆیشی مێوەهاتی عەجەمستانی ... بێ. لەبەرئەوە دەکرێت نصیرالدین بە بنیادنەری ئەم ... دینە قەڵەم. هەرچەند ئەوە دووریش نییە.

بە ڕاستیدا بنیادنانی خانوەکانی نێو قەڵای هیزان یا هی ... ی هیزان لە سەر تەرزی بیناسازیی ڕوانگەی ستێرناسی، مەسەلەیێکی گرنگی بیناسازییەو، بە داخەوە شەرەفخانیش ڕوونی نەکردووەتەوە، تا بزانین چۆن بووە. وێڕای ئەوە، نەزانین تەرزی بیناسازیی ڕوانگە ستێرناسییەکانی سەردەمی موسڵمانەتی چۆن بووە؛ وەك ڕوانگەی مەراغە کە گەورەترین ڕوانگەی کاتی ئیسلام بووەو، ڕوانگەی ئولووغ بەگ لە سەمەرقەند کە دووەمین ڕوانگەی گەورەی هەمان سەروەختەو، ڕوانگەی قاهیرەی سەردەمی دەوڵەتی فاتمیو، یا ڕوانگەی دیمەشق) کاتی مأمون و ڕوانگەی بەیرونیو هەروەها ڕوانگەی ... ی مەزنی کورد (ابو حنیفة) (ئەحمەدی کوڕی داودی کوڕی وەنەندی دینەوەری) لە ئەسفەهان و دینەوەر. چەند سەرچاوەییکی ستێرناسی (فلکي)و مێژوییم بۆ ساخ کردنەوەی ئەم مەسەلە بایەخدارە پشکنی. هیچ زانیارییێکم لەو بارەیەوە نەدی. ئەوە نەبێ کە نصیرالدینی طوسی ڕوانگەی مەراغەی کە لە سەدەی شازدەیەم دا دامەزراندووەو، گومەز لە بیناکەیدا هەبووە بۆ ئەوەی تیشکی خۆر بێتە نێو ڕوانگەکەوە، تا چەند حیسابێکی ستێرناسی بەو تیشکانە بکات. واتە بینای ڕوانگەی مەراغە لە ئازربایجانی ئێران گومەزی بووەو، زۆریش ڕێی تێدەچێ شەرەفخان بینای ئەم ڕوانگە گەورەیەی سەردەمی موسڵمانەتی دیبێ کە ئێستایش شوێنەواری ماوە، یا وێنەو وەسفی هێندێك ڕوانگەی لە کتێبە دەستنووسەکان دا بەرچاو کەوتبێو خوێندبێتەوە.

بۆ دەست خستنی زانیاری لە بابەت تەرزی بیناسازیی ڕوانگەی ستێرناسیی دەورانی ئیسلامەتییەوە، نامەم بۆ چەند نامەخانەو لایەنێکی زانستی نارد، وەك (مرکز بحوث الفضاء والفلك) لە بەغدادو (دار الکتب والوثائق القومیة) لە قاهیرەو دێرینخانەی (مۆزەخانەی) بەریتانی لە لەندەن و (الاتحاد الفلكي العالمي)و نامەخانەی بودلیان لە ئۆکسفۆردو نامەخانەی مورگان لە نیویۆرك و مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس. هەروەها چەند دانەیێکم لە تابلۆی یازدەمی شەرەفنامە بۆ هێندێکیان نارد بۆ لێکۆڵینەوەی. کەچی تەنیا وەڵامی مۆزەخانەی بەریتانیو نامەخانەی مورگانم پێگەیشتن کە دەڵێن زانیاریی وامان لەلا نییەو هەروەها وەڵامی (دار الکتب)ی قاهیرەیشم وەرگرت کە دەتوانم بڵێم ئەم نامەخانە گەورەیە لە هەموو نامەخانەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر هەست بە مەسئولییەتی عیلمی دەکات و کەم کەسی بێ وەڵام دەهێڵێتەوە و ئەم کردەوانەی کارگێرانی شایانی سوپاس و ڕێزن. بەپێی وەڵامی نامەخانەی دارالکتب ڕوانگەی سەمەرقەند کە لە ساڵی (١٤٠٥)ی زایین دا لەسەر شاخێکی بەردین هاتووەتە ئاواکردن لەلایەن ئولوغ بەگەوە (کوڕیشاه ڕوخی کوڕی تەیمورلەنگ کە لە ساڵی ١٤٤٧ - ١٤٤٩ زایینیدا حوکمی کردووە) ئاڤاهی (بینایەی) ڕوانگەکە خڕو دامەزراوێکی شەش گوشەییو سێ نهۆم بووە لە ناوەڕاستەکەیدا خەندەك (خندق)ێکی قووڵی بە پلیکان هەبووە کە سەر بە ژێرێکی گرورە (منحني عملاق) گرتبووە خۆی کە ئامێری پێوانە، وە بۆ تۆمارکردنی هات وچوکردنی خۆرو مانگ و پەروانەو ئەستێرەکانی لەسەر دانرابوو لە دەوری ئەم ئامێرە ، ڕارەو و ژووری گەورەو حوجرە هەبووە بۆ زانایانی ئەستێرەناسیو پاراستنی ئامێرەکانی. دیوارەکانیشیان داپۆشراون بە وێنەکانی ئاسمان و ئەستێرەکان و ئامێرەکانی ڕوانین.

دار الکتب وێنەی لاپەرەیێکی لە کتێبێکی ئینگلیزیش ناردوە کە ئەم زانیارییەی لێ وەرگرتووە کە وێنەیێکی هێڵکاری ڕوانگەکەشی تێداهاتووە.

لەم تابلۆیەی یازدەمینی شەرەفنامەدا وێنەی خانوییێك دروست کراوە کە پێدەچێ نمونەی خانوەکانی هیزان بێ کە شەرەفخان ووتویەتی لەسەر شێوەی معماری ڕوانگەکانن. بەگوێری وێنەی ئەم خانوە لەسەر گردێکی خوڵین ئاواکراوەو پەرژینێکی بازنەیی بەدەورەوەیەو بە خشتی سورەکراو ئاواکراوە

هەروەها چوارگۆشەیەو لە شێوەی بورجی هەڵکەوتووە هودەیێکی بچـوکی وەك هەورەبـــان لە قاتی سەرەوەیـدایـەو پەنجـەرێکی سێگۆشەیی تیژیشی تێدایە کە دوور نی یە ئەم شێوە پەنجەرەیە بۆ تەماشاکردنی ئەستێرەکان باشتر بگونجێ.

بێ گـومـان شیـوەی هەنـدەسـەی ئەم خانـووە دووره لەگـەڵ هەنـدەسـەی ڕوانگـەی سەمـەرقەند، بەڵام دوور نی یە هەندێك ڕوانگـەی دیکـە هەبـووبن و تەرزی معمـاری ئەم خانووە لەوانە نیزیك بێ بەوەی کە بنایەکەی بە شێوەیێکی بورجی هەڵکەوتووەو هودەیێـك لە قاتی دووەمیـەتیو پەنجـەرەیێکی سێگوشەیی تیژی تێـدایـەو شیـوەی خانـووەکـە لەگـەڵ تەمـاشەکردن و تۆمارکردنی هاتـوچـونی ئەستێـرەکـان نیـزیکە لەگەڵ ئەمەش دا گومان نی یە شەرەفخـان، یان هونـەرمـەنـدێکی دیکـە ئەم وێنەیەی بەگوێرەی هەموو (تفاصیل)ی هەندەسەی ڕاستەقینەی خانووەکانی هیزان دروست نەکردوە. بۆ بەڵگە هیچ پەنجەرەیێك لە قاتی یەکەم دا نی یـە بەڵکـو هەنـدێـك لەو هەنـدەسەیان کە نیزیك بووە لەگەڵ هەنـدەسـەی هەنـدێـك ڕوانگـەکـان لە وێنەکەیدا جێ بەجێ ـ کردووە. دوور نی یـە ئاشـاهێن (بینـایـەکانی) هەندێك ڕوانگەی ئەستیرەناسی بە شێوەیێکی بورجی بووبن و هۆدەی تەماشاکردنی ئەستیرەکان لە قاتی سەرەوەیبوبێو برێك پەنجەرەی سێگوشـەیی تیـژی لە چوار دەوری بووبێ وەك (قـەڵای شێـروانـە) کە تەنیـا پەنجـەرەکـانی ئەو هودە حەوت گوشـەیی یـەی کە لەسەر سەقفی قاتی دووەمی ئاواکراوە سێگوشەیی نین، یانی مەخسەدم ئەوەیە بڵێم ئەگـەر وەهـــابێ قەڵای شێـــروانـەش لە کەلار لەســەر ئەم تەرزەی ڕوانگەی ئەستێرەکانە.

لە کۆتـایـی دا دەڵـێـم: ڕۆژی ١٠ی ئابـی ١٩٧٧ چووم بۆ بینین و وێنــەگـرتنی شوێنـەوارەکـانی هیـزان و گۆڕی (سینـەم)و قوتابخانەی غەوسی هیزان لەسەر گردی (غەیدا)ی خۆرهەڵاتی هیزان. خانوەکانی شارە کۆنەکە ڕووخاون و هێندێك لە شووراو بورج و قەڵاکـەی ماونـەوەو، خەڵکیش بەردەکـانی (قـوتابخانەی میـرداوود)ی سەر بەری باکـووری شیـوەکـەو بەرانبـەر قەڵاکەیان بردووە کە شەرەفخـــان باسی کردووە. ئێستـــا شتێکی ئەوتـــۆ لە تەرزی بینـاسـازیی ئەوسـای هیـزان بە ساخی نەمـاوەتـەوە، جا مەگـەر ڕۆژێـك لە ڕۆژان زانـایـانی شوێنـەوارناس بە پشکنین و لێگەڕان شتێکیان لەم بارەوە چنگ بکەوێ. . .

## تابلۆی دوازدەیەم

### هیزان

هەروەکـــو لەپێش دا گوتمـــان ئەم تابلۆیـــەیش هەر لەبـارەی هیزانەوەیە. باخەوانێك لەم تابلۆیەدا، باخەکەی بە پێمەرە (بێڵ) هەڵ دەکـۆڵێت داوێنی کراسـەکـەی خستووەتە بەر پشتێنەکەیو، سەروکڵاوێکی پچووکی لەسەر ناوەو، هەردوو قاچی لەیەك دوور خستـونـەوەو لە ئەرزی قایم کردوون. ئەم دیمـەنـە نیشـانـەی کارامـەییو گورج وگـوڵی باخـەوانـەکەیە. جوگەیێکی ئاو بە پەنا باخـەکـــەدا دەڕوات. لە داوێنی تابلۆکـــەدا، ئەسپ سوارێـك دیـــارە، سەروپێچی گەورەیـــەو گوڵنکـەیێکی زل لە کڵاوەکـەی بەرزبروەتەوەو، کەواییکی بێ قۆڵ و کراسێکی کورتی لەبەردان و شەرواڵـێـکـی فش وفـــۆڵـیشـی لەپێ کردووە. لەوانــەیـــە ئەم ئەسپ سوارە میر حەسەنی کوری مەلیك خەلیل، بێ، کە لە کاتی تەواوبـــوونی دانـــانی شەرەفنـــامـەدا میـری هیـزان بووە. ئێستـــرســـوارێـــك وا لە پشت ئەوەوە، ئێستـــرەکـەی سپی یـەو، سەروکڵاوێکی سپی زلی بەسەرەوەیەو پەری باڵندەی خستووەتە بەرو، قژی لەژێـــرەوە دەرکـــەوتـــووەو، جلوبـەرگی لە هیی ئەو پیـاوەی پێشـوو دەچێ. هونـەرمـەنـدی ئەم تابلۆیـانـە وەك چۆن دەموچاوی زۆربەی ژنەکانی بە خرپنیو گۆشتنی وێنە کردوون، هیی ئەم سوارەیش پان و گۆشتنە کە بە دەموچاوو قژی یەوە لە ژن دەچێ. ڕەنگە ژنی میری هیزان بێ، بەتایبەت کە سواریی ئێستر لەبـەر هێمنیو لەسـەرەخـۆیی بۆ ژن چاکتـرە لە ماین و ئەسپ. شتێکی درێژ لە تەنیشتی یەوە دەبیندرێت کە پێ دەچێ کاشۆ (دارقاشوان) بێ و یارم و سەرەکەی لە زین، یا سەرجلی ئێســتــرەکــە تونـدکــردبێ. دوو پیـــاوی پیـــادە، وان لەپێش ئەسپ سوارەکـــەوە، یەکێکیـان ڕدێن و سمێڵێکی ڕەشی بابـری نارێکی پێـوەیـە، ئەوی‌دیکـەیـان لاوێکی قەڵـەوی بێ سمێڵە کە ڕێی تێ‌دەچێ خوڵامی میـر بێ. پیـاوە ڕدێنـدارەکـە قاشـۆیێکی بەدەستـــەوەیـــەو، ژنێکیش ڕووەو ئەوان دێت. قاشـــۆیێکی‌دی لەپشت ژنەکەوە دیارە کە ڕەنگە بە دەستی یەکێکی ـ دیکەوە بێ کە لەشی لە وێنەکەدا دەرنەکەوتووە. لەوە دەچێ ئەم دەستەیە لە کۆشکەکەوە هاتبنە دەرێو بۆ یاریی (قاشوان) بچن.

ئەم یاری یـــە، وەك لە تابـلۆی چوارەمیش دا پێشـــان دراوە، بریتی یە لە دارێکی درێژ کە قاشۆ (کاشۆ ـ چوکان)ی پێ دەڵێن و

(گـۆ ـ گوك)یـێـکـیش کە تۆپـێـکـی خرەو، یا لە دار دروست دەکرێت و بزمارە سەرخرەکانی لێ‌دەدرێت، یان لە لباد دەکرێت و لبادەکە بە سووژن دەدوورێت بۆ ئەوەی پتەو بێ. لە بیـرم دێت کە منـداڵ بووبن ئەم گۆیـەمـان لە بەردیش دروست دەکـرد). قاشـۆ، یا یەك پارچـەیـەو سەرەکەی چەماوەتەوە، یا لە دوو پارچـە دروست دەکـرێت: یەکێکیـان درێـژ و ئەوی‌دیکەیان کورتـەو کونـی تێ‌دەکـرێـت و لە سەری دارە درێـژەکـە دەدرێت وچـەسپ دەکـرێت. ئەو قاشـۆیـانـەی لە شەرەفنـامەدا وێنەیان کێشراوە لە جۆری دووەمن. ئەم یاری‌یە زۆر کۆنەو، بە عەرەبی ( الكرة والصولجان)ی پێ‌دەگوترێت.

مێـژ وونـووسی گەورەی مێژ ووی شارستانەتیی ئیسـلام (جورجی زێـدان) دەڵێت: عەبـاسی‌یـەکان لە زەمانی (هارون الرشيد)دا ئەم یاری‌یەیان لە فارسەکانەوە وەرگرت[٤٢]. شـەرەفخان کە لە پەڕەی (١٤٨)دا باسـی شاییی باوکی خۆی دەکـات، دەڵێت: ئەو دەمانە لاوانی کوردستان بەردەوام یاریی قاشوانیان دەکرد. ئەوەی شایـانی باسـە، (گـوك مەیـدان) کە جێ‌یێکی تەختـانی شاری بدلیـسەو، قوتابخانەی (اخلاصية)ی شەرەفخان و گومەزی چەند میرێکی بدلیـسی لێن، هەر بە ناوی ئەم یاری‌یەوە ناوی لێ‌نراوە، چونکە ئەم یاری‌یە لەو مەیدانەدا کراوە.

«بنێ‌بـرجـا»یش کە هەر لەوەبـەرتـر جێ‌یێکی تەختانی پشت شوورەی جزیـرابـۆتـان و گۆڕی (مـەم و زین)ە، لە سەردەمی میـرانی بۆتـان دا مەیـدانی یاریی گوك و ڕمبازی بووە. شاعیری مەزنی کورد (ئـەحمـەدی خانی)، لە دێـرە شیعـرێکی داستانی مەم وزین دا، ئەم شوێنـەی بە (مـەیـدان) ناوبـردووە، جگە لە ناوهێنـانی چەنـد جێگـەیێکی‌دی جزیـرو دەوروبـەری ـ لەوانـە چەمی وەسطانی‌و نێرگزو سەقلانی مەما[٤٣]. ئەولیاچەلەبی کە خۆی یەکـەم جار چواردە ڕۆژ لە بدلیس ماوەتـەوە، بەدرێـژی باسـی یاریـی قاشـوانـی لەوێ کردووە. لەم ڕووەوە دەڵـێـت: ڕیزێك بەرد لەمـەرو ئەوسەری مەیدان دا داندراون و بە سەدان سوار لە هەردوولا یاری‌دەکـەن. گۆکـە خڕەو لە دارەو هێنـدی سەلکی زەلامێکـەو قاشـۆکـەیشیان سەرخڕەو لە زەردگیراوە[٤٤]. واتە: وەك قاشۆی تابلۆکان نین. (ئەحمەدی خانی)یش ئاماژەی بۆ ئەم یاری‌یە کردووە. ئەوەتا میرتاژدین پەیکەکەی دەنێرێتە کن میر زەینەدین و دەڵێت:

هەرچار سەری دمە وەکی گۆ
چەوگانی ئیرادە تاوی کاشۆ.[٤٥]

جاران یاریی قاشوان لە کوردستان دا باو بووەو، سوار لەگەڵ سوارو پەیـایش لەگـەڵ پەیـادا یاری‌یـان دەکـرد. دوو تاقم لە یاری‌یەکەدا بەرانبەر بە یەکدی دەوەستان و هەر تاقمێکیش هەوڵی دەدا گۆکـە بۆ خۆی ببـات. بە وێـنـە، لە ساڵانـی سی‌دا، هەجـارەی سی‌چـل سوارێـك و لە شاری کۆیـە پێکـەوە بۆ ڕاو دەچوون. لە چوون دا، یا لە گەڕانەوەدا یاریی قاشوانیان دەکرد.

هەروەهـا (جلیتێن)یشیـان دەکـردو، دەهـۆڵ و زورنـایشیـان لەگـەڵ خۆیـان دا دەبـردو (عـەزەی زەینـەڵ چاوەش) کە بە زورناڵێدان بەناوبانگ بوو ـ زورنای لێ‌دەداو (حەمە عەبۆ)یش دەهۆڵی لێ‌دەدا. سەرباری ئەوە، ئەسپیشیان وەها فێرکردبوو لە کاتی (جلیتێن و ڕمبازی)دا بەپێی هەوای زورناکە دەهات و دەچوو.[٤٦] ئێستایش یاریی قاشوان لەنێو منداڵانی لادێ‌دا دەکرێت.

نابێ ئەوەیش لەبیـربکـەم کە یاریی قاشـوانـە لە دەورانی دەوڵـەتی مەغـۆلی‌یـەکـان دا (ئیلخـانی) هەبووە، وێنەیشی لەنێو وێنـەکـانی کتێبی دەستنـووسی (منـافـع الحيـوان)ی (ابن بختيشـوع)دا هاتـووە کە دانـەی بنـەڕەتی لە نامەخانەی مۆرگانە (نمـرە ٥٠٠)و دانـەیێکی وێنە لەبەرداگیراویمان لەلایە. قاشۆی مەغـۆلی‌یـەکـان سەرەکـەی، یا سەری پارچـە پچـووکـەکـەی چەماوەیە، لە کاتێك دا لە شەرەفنامەدا هی کوردان ڕاست و ڕێکە.

لەم تابلۆەدا ژنێك کە سەرپۆشی سپی‌و تەنکی لە سەرناوە، لەبـەر پەنجـەرەی خانـووێـك دا تەمـاشـای ئەو خەڵکـە دەکات خانـووەکـە سێ قاتـە قاتی خوارەوەی لەبـەردی نەقـاری‌یـە و ئەوانی‌دیکـە لە خشتی سورەکـراوە، دوو پەنجـەرەی تێ‌هەڵکێش (مشبـك) کە بە عەرەبی پێی‌دەڵێن (نـافـذە شمسيـة) لە قاتی سێیـەم دان و ئەم شێـوە پەنجـەرەیە لە کوردستـان کەمـە بۆ مەستـووری ژن و خێـزان دروست دەکـرێن بۆ ئەوەی ئەوانـەی لەپشت پەنجـەرە کەوون دەرەوەببینن و خەڵـك ئەوان نەبینن، لە بغـداد ئەم جۆرە پەنجـەرەیـە زۆرە لە خانوە کونەکانی کەرکوك و کریـسـنجـق دا زۆربـەی ئەم پەنـجـەرەبچـوکـانـە لە کەچ

دروست کراون نەك لە دارو ، لە سلیمانی لە (گەنجینە)کاندا هەیە. هەندێك لە خانوێکی‌دیکە لەژێر ئەم خانووە دیارە کە بە خشتی سورکراوەیە.

لە تەنشتی خانوە سێ‌قاتەکە، خانوێك، یان دیکورێك دیارە ئەگەر خانو بێ تێ‌هەڵکیش (حل وشد)ی نی‌یەو خانووش دەبێ بە تێ‌هەڵکیش ئاوا بکرێ لەبەرئەمە مرۆڤ دەڵێ دیکورەو لە بەینی هەر دوو چوارگۆشە (مربع) ێك دا خاڵیکی ڕەش دیارە، نازانم ئایا کونی بچوکن، یان نا؟

ئیحتماڵە ئەمە کانی ژنان بێ، چونکە لەسەر جۆگەی ئاوەو دەرگـایش پێ‌دەچێ لە لقـەبـاریکـەکـانی درەخت بێ کە بە تێ‌هەڵکیش دروست دەکرێ. من ئەم وێنەیە پیشانی برێك لە مهندسەکانی ئیدارەی محلیم - دا لە سلیمانی کەسیان سەری لێ‌دەر نەکرد، منیش وەها بیری لێ‌دەکەمەوە.

### تابلۆی سیازدەیەم

نەخـۆشیی دەمـارگـری (أعصـاب)و چارەسـەرکردنی بە دوعا تابـلۆی سیـازدەیـەم (پـەڕەی ٨٩) لە بارەی میـرنـشـینـی (تـرجیـل)ەوەیـەو، برێتی‌یە لە نەخۆشیی دەمارگریی کچی میری ئورتووقی‌و چارەسەرکردنی لەلایەن (شێخ حەسەنی زەرقی)یەوە. شەرەفخان لە پەڕەی (٨٩ - ٩٠)دا نووسیویە: ئورتروقی کوری ئەکســەبـو أکسب)[٤٧] کە میـرێکی سەلجـوقی بوو و ناوچـەی ماردین و دیـاربـەکـری لەژێـر دەست دا بوون، کچێکی جوانی هەبوو، تووشی نەخۆشیی دەمارگری بووبوو. چەند دوکتۆریان هێنـایـە سەر، نەیـان توانی چاری بکـەن تا داوایـان لە شێـخ حەسەنی کوری شێخ عەبدولرەحمان کرد کە بە شێخ حەسەنی زەرقی بەنـاوبـانـگ بوو و مرۆڤێکی پیـاوچـاوك و موریـدی زۆر بوون، بە دوعا کچەکە چاك بکاتەوە. ئەویش هات و بە دوعا کچەی چاك کردەوە. باوکیشی کچەکەی - دا بە سەیید حسێنی کوری شێـخ حەسـەن.[٤٨] هەروا حوکـومـەتی (تـرجیـل)یشی پێ‌بەخشی کە برێتی‌یە لە (حەزو) کە قەزاییکی دیاربەکرە لەگەڵ عتاق (هتاخ - ئیتاخ) کە (٨٥کم)ێك لە خۆرهەڵاتی دیاربەکرەوە دوورە لە هاوینی ١٩٧٧ بۆم هەڵکـەوت وێنـەی قەڵای ئیتـاخ بگـرم. پاش ئەو کورو نەوەکـانی حوکمیـان کرد. جگـە لەوانە، چەند قەڵاو جێگەیێکی‌دیکەیشی لە ناوچەی دیاربەکر دابێ.

لەم تابلۆیەدا وێنەی خانوویێکی وەك مزگەوت لای سەرەوەیە کە گومـەزی پیـوازی‌و رووکـارەکـەی نەخشـدارە، واتـە ئەو گیاو درەختـەی دیـارن، نەخشـن و پەنـجـەرەیش بە نیـوقـەدی دیـوارەکـەوەیـە. پێ‌دەچێ ئەمـە مزگـەوت نەبێ‌و خانـووی میـر ئورتـووق بێ‌و شێـوەکـەی گومـەزی بێ. کچـە نەخـۆشـەکـە لەحەوشەی خانوەکەدا لەنێو جێ‌دا کەوتووە. ڕاخەرەکەی لبادێکی ڕاخراوە بەسەر مافورێکی جوان داو شتێك تا نیزیك ملی بەسەر کچـەدا دراوە. ژنێـك، بەپێی وێنـەکـە، لە نیـزیك قاچی‌و لای دەستـەراستــەوە دانیشتـووە، دەسـرۆکێکی سپیی بەسـەرەوەیـەو دەسرۆکێکی (هەنی‌یەپێچ - تولێبەند)ی لە دەور بەستووە. ژنە باوەشێنی بەدەستەوەیەو باوەشێنی کچە نەخۆشەکە دەکات، لەوە دەچێ کارەکـەرەکـەی بێ. کەنیــزەکێکی ڕەشیش لە تەنیشتی دەستـەچـەپی، کچـەکـەدا دانیشتووەو فنجانێکی لە دەستدایەو، دەسـرۆکـەکەی ڕەشەو هەنی‌یەپێچەکەی سپی‌یە. شێخ حەسەنی زەرقی‌یش بەسـەرومێـزەرو ڕدێنێکی سپی‌و جلوبـەرگێکی ڕەشەوە لەپشت سەری کچەکەوە دانیشتووەو، وا دیارە دوعا بۆ کچەکە دەکات. پیاوێك لەپشت شێخ حەسەنەوە ڕاوەستاوە، وێنەکەی تا ڕادەیـێـك تێـك چووە، بەڵام لە مرۆڤێکی ئاینی دەچێ‌و لەوانەیە موریدێکی شێخ حەسەن بێ. پیـاوێـکیش لەسـەر کورسی‌یێـك دانیشتـووەو هەردوو دەستی خستـووەتـە سەر ڕانی‌و بە پەژارەو ئومێـدەوە تەمـاشـای کچـە دەکـات. ئەم پیـاوە کەوای بێ‌قـۆڵ و کراسی درێـژ ی پۆشیـوەو کڵاوەکـەی لە هیـی تورکـمـانـانـی یەکـێتیی سۆڤێت دەچێ، نێوەڕاستەکەی وەك تاسکڵاوی جەنگەو گوڵنکەیێکی بەسەرەوەیەو دەورەکـەی بە پانی بۆ سەرەوە هەڵ گەڕاوەتـەوە، هەمـان کڵاو لە وێنەی مەغۆلی‌دا هاتووە، وەك هیی سوڵتان مەحموود غازانیی نەوەی هۆلاکۆ (١٢٩٥ - ١٣٠٤ی زایین) کە لە تابلۆی یەکەمی کتێبی دەستنووسی (منافع الحیوان)ی ئیبن بەختیشوع (عبیداللە کوری جبـرائیـل)دا دەردەکـەوێ. ناوبـراو ئەم کتێبـەی بۆ میری کورد (نصـر الـدولـة ئەحمـەدی کوری مەڕوانی کوری کەك) داناوەو لەسەر داوای سوڵتان مەحموود غازانی کراوە بە فارسی‌و چەنـد وێنـەکێشێکیش وێنـەیـان تێداکردووە. ژنەکەی مەحموود غازانـی‌یش لەم کڵاوەی لەسـەردایـە. وا دیـارە وێـنـەکێشی شەرەفـنـامـە زانیـویـە ئەم کڵاوە بە ڕەگـەز تورانی‌یـە وەك سەلجـوقی‌یـەکـان. ئیدی ئەویش بۆ میر ئورتووقی سەلجووقیی

کێشاوە. بە لای منەوە ئەو پیاوەی لە تابلۆکەدایە ئورتووق کوڕی (ئەکسەبو) خۆیەتی و دەموچاوی لە وێنەکەدا کەمێك شێواوە، سێ (گولدان ـ گولاورێژ) لەسەر سینییەکی بەلەمی بەردەمی دان. هەمان گولدان و سینی لە کۆڕی مەحموود غازانییش دا هەن، لەو تابلۆیەی (منافع الحیوان)دا. هەروا شتێکی درێژ بە لا تەنیشتی ئورتووقەوەیە، ڕەنگە ڕمێك بێ کە سەرەکەی دیار نییە.

## تابلۆی چواردەیەم

### ئابلۆقەدانی قەڵای بدلیس لەلایەن ئاق قۆینلووەکانەوە

ئەم تابلۆیە لە میرنشینی بدلیس دەدوێت و، بریتییە لە ئابلۆقەدانی قەڵای بدلیس لەلایەن لەشکری دەوڵەتی ئاق قۆینلووەوە بە سەرکردایەتیی (سلێمان بیژەن). شەرەفخان باسی ئەوەی کردووە کە (حسن الطویل)ی دامەزرێنی دەوڵەتی تورکمانیی ئاق قۆینلوو (٨٧١ ـ ٨٨٢ی کۆچی = ١٤٥٣ ـ ١٤٧٨ی زایین) لە سەردەمی میر ئیبراهیمی کوڕی میر حاجی محەممەدی بدلیسیدا لەشکرێکی بە سەرکردەیی سلێمانی کوڕی بیژەن نارد بۆ داگیرکردنی قەڵای بدلیس. سلێمان زستانان دەچوە بشێری و ماردین و کە زستانیش بەسەر دەچوو دەهاتەوە بدلیس. بەم پێیە گەمارۆدانەکە سێ ساڵی خایاند، تا خەڵکی نێو قەڵا لەبرسان داو بە نەخۆشیی ڕشانەوە (تاعوون)و لەبەر توندیی گەمارۆو شەڕ هەموو گیانیان لەدەست دا. تەنیا حەوت کەس لەگەڵ میر ئیبراهیم دا، زیندوو مانەوە. ئەوجا بە ڕێك کەوتن خۆی دا بەدەستەوە. سلێمان بیژەن میرئیبراهیمی نارده لای (حسن الطویل) لە تەورێزو ئەویش ڕێزی لێگرت و ئیشێکی لە (قوم) پێسپارد. کە (حسن الطویل) کۆچی دوایی کرد، یەعقووبی کوڕی (میر ئیبراهیم)ی لەبەر سەرکێشیی خێڵی (ڕۆژکی) لە بدلیس کوشت.

لە قسەکانی شەرەفخانەوە وا دەردەکەوێ کە ئابلۆقەدانی بدلیس ساڵی (١٤٥٣ی زایین)، یا کەمێك دوای ئەوە بووبێ. دیارە میر ئیبراهیم پیاوێکی بەهێز ورە بەرز بووەو، یەکێك بووە لەو میرە بدلیسییانەی کە پارەیان لێداوە ئێستایش پارەکانی لەمۆزەخانەی ئەستەموول دا ماون و پارێزراون، وەك لە نامەیێکی مۆزەخانەی بەریتانیدا هاتووە کە بۆم نێرراوە..

لەم تابلۆیەدا، سلێمان بیژەن لەسەر کورسییێك دانیشتووەو، ڕمێکی کورتی لە چەشنی (ڕمی مەوجدار) لەدەستدایەو، تیرەکەی لەنێو تیردان و شمشێری لە کالاندایەو، (بازیبەند)ی شەڕیشی لە دەست کردووەو، قەڵغانەکەیشی چەند گۆشەییەو وەك چەتر دێتە بەرچاو. ئەم شێوە قەڵغانە بەدەستی چەند جەنگاوەرێکی دیی لەشکرەکەوەیەتی و لەتابلۆکانی دیکەدا زۆر کەمە. وا پێدەچێ بەنرخ بێ، چونکە زۆربەی قەڵغانەکانی دی دەوراندەوریان خڕو لە نێوەڕاستەوە دەرپۆقیون، واتە کووڕو قۆقزن کە بە عەرەبی (محدّب)ی پێدەڵێن هەروەها خەتداریشن و خەتەکان لە قەراغەوە دەست پێدەکەن و لە نیوەڕاستیدا کۆدەبنەوە.
ئەم قەڵغانە لەنێو کوردو فارس و عثمانیدا بینراوە، نازانم ئاخۆ جۆرە قەڵغانێکی کوردییە، یا هیی دەوڵەتێکی دییە؟ لە تابلۆی شەڕی ئەدرنەدا قەڵغانی بێزەنتییەکان بازنەیی و تەختە، یانی لەشێوەی ئەم قەڵغانە نییە.

جێی گوتنە، دوو جۆرە قەڵغان لە سنعەتی کوردستان لەنێو چەکەکانی عەبدال خانی بدلیسیدا هەبوون، کە ئەولیاچەلەبی لە لاپەڕە (٢٤٩)ی سیاحەتنامەکەیدا (دەقی تورکی) بە قەڵغانی عەینتابی و دیاربەکری ناوی بردوون. لە لاپەڕە(٤٩)ی وەرگێرانە کوردییەکەیدا دەڵێت: شمشێرو خەنجەرو ڕم و دەمانچەو سەرەتیری دیاربەکر بەناوبانگن. لە لاپەڕە (١٤٢)یش دا دەڵێت: شمشێری شێخانی و مەقراوی لە بدلیس دروست دەکرێن و وێنەیان لە هیچ شارێکی دیکەدا نییە. تیرو کەوانی بدلیسیش بەناوبانگە. هەروەها دەڵێت: دەست وپێوەندانی عەبدال خان کە دە هەزار کەسی خەڵکی بدلیسن و مووچەی مانگانەیان لێ وەردەگرت، شەوو ڕۆژ قەڵغانی حەلەبییان بەشانەوەو شمشێری شێخانی و مەقراوییان بە پشتەوەو گۆپاڵ بەدەستەوە بوو. بەڵام ئێمە نازانین شێوەی قەڵغانی حەلەبی چۆنە. داخۆ ئەو جۆرە زۆرەیان کە لە وێنەکان دا دەبیندرێت ئەوە، یان نا؟.. جگە لەوە نایشزانین (قەڵغانی کوردی) چۆن بووە، کە ئەولیاچەلەبی لە لاپەڕە (٢٠٩) لە بارەیەوە دەڵێت: کوردانی هەکاری هەریەکەو قەڵغانێکی کوردیی بە کۆڵەوەیە. تۆ بڵێی مەبەستی پێ قەڵغانی دیاربەکری، یا قەڵغانی عەینتاب بێ؟ ئەگەر وایش نەبێ، لە هەکاری، یا لە چ جێگەیێکی دیکەی کوردستان دا قەڵغانی کوردی دروست دەکرا؟



تابلوی سیازدەیەم : نەخوشیی دەمارگری .

تابلوی چواردەیەم : ئابلوقەدانی قەلاّی بدلیس

لەشکـــری سلێـمــان بیـــژەن لە خوار قەڵای بدلیس و سەر قەراغی رووبــار دامـــەزراون و پرچـەکن بە شمشێرو رم و تیـرو تفـەنـگ و شەر دەکـەن. لولـەی دوو تۆپیـان لە زرێ (درع)ی تۆپـەکـەوە راست بووەتـەوەو دەرکـەوتـووە، تۆپبـارانی قەڵایـان پێدەکەن. لە شەرەفنامەدا ناوی تۆپ نەهێندراوە، بەڵام گوتراوە کە مەنجەنیقیان پێبووە. لە کاتێك دا ئەوسا تۆپ هەبووە. لەنێو لەشکـری ئاق قۆینلوودا هێنـدێـك هەن کلاوی ئەوروپـایی یـان لەسەرناوە کە هەر لایێکی دوو سەری درێژی هەیە. وا پێدەچێ ئەمـانـە خەڵکی بەشی خۆرهـەڵاتی ناوچـەی ئەنازۆڵی ئەو دەمە بووبـن کە لەژێـر دەسـتـی ئاق قۆینـلووەکـان دا بووە، واتـە دەوروبەری سیواس، یا ئەم لاتر.

میـر ئیبـراهیم بەسـەر قەڵاوە دیارە، سەروکلاوی زل و ردێنی ماش و برنجی و پرو گەورەو قەڵغـانی شەری بەدەستـەوەیـە. دوو پیــاو وان لەپشت ئەووەوە. ئالاێیــك وا بەســەر بەرزتـرین جێی قەڵاکەوە. لە خوار میر ئیبراهیم و بە رووکاری دیواری قەڵاکەوە، لوولـەتـۆپێـك لە دەرگـایێکی ئاسنی تێهـەڵکێش (مشبك)ەوە هاتـووەتـەدەر دوور نییـە میـر ئیبـراهیم تۆپیشی هەبووبێ، وەك چۆن عەبـدال خان تۆپی لەســەر قەڵا هەبـووەو لەشـەری دژی مەلیك ئەحمەد پاشادا بەکار هێناوە.(٤٩)

دوو ژن لە پەنـجـەرەی شانـشـینی قاتی سێیـەمی قەڵاوە سەریــان هێنــاوەتــەدەرێو جلوبــەرگی رەشیـان پۆشیـوە. ئەو جلوبەرگە رەشە نیشانەی ماتەم و خەمبارییە بۆ سەدان شەهیدی قەڵای، بدلـیس چونـکـە زۆریـان لە شەرەکـەدا کوژران و ئەوانی دی لەبـرسـان دا، یا بە نەخـۆشـی رشـانـەوە (تـاعـوون) مردن و، تەنیـا حەوت کەس لەگـەڵ میر ئیبراهیم دا بە زیندوویی ماونەوە، وەك شەرەفخان نووسیویە، کە ئەم دوو ژنـە یەکێکیـان ژنی میـر ئیبـراهیمـەو لەو حەوت کەسـەیە. دوو پیاویش لە قاتی دووەمی قەڵادا دیارن و، یەکێکی دیکەیش چووەتە لای یەکێك لەوانەی کلاوی ئەوروپاییان لەسەر کردووەو سەر بە لەشکری سلێمان بیژەنەو قسەی لەگەڵ دا دەکات. وا دیارە بۆ گفتـوگـۆکـردن لەگەڵ دوژمن دا هاتووە، بۆ ئەوەی بەرانبەر بە دەست تیـوۆنـەدانیـان میـر ئیبـراهیم خۆ بدات بەدەستـەوە. ئەم تابلۆیە دوایین قۆناخی بەرگریکردنی میرئیبراهیم پیشان دەدات لە کاتێك دا هەر حەوت کەس لە دەستەکەی لە تابلۆکەدا دیارن.

**ئەندازەی قەڵا**

بە سایەی قەڵەمی ئەولیا چەلەبی دۆستی کوردەوە کە توانیی (٦١٠) کوردی دیلی شەری عەبدال خان لە شمشێری مەلیك ئەحمـەد پاشـا رزگـار بکـات کە زۆربـەیـان ئێـزدی بوون و جەللادەکان وەك (١٩٠)٠کەسەکەیدی سەریان دەبرین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم تابلۆیە هەمان ئەندازەو پێوانەی راستەقینەی قەڵای هەن، ئەوە نەبێ کە ئێستا ئەو لایەی قەڵاکە رووخاوە، کە سەرای عەبـدال خانی لێبـووو دەکـەوتـە دیوی پشتەوە، یان بەری خۆرئـاوایـەوە. لە تابلۆکـەدا، شانشین (شنـاشیـل - بالقون)ێك لەسەر چوار کەوانی بازنەیی قاتی سێیەم دیارە کە دوو ژن سەریـان لە پەنـجـەرەکـەیـەوە هێنـاوەتـە دەرێ. ئەولیاچەلەبی‌یش باسی لەوە کردووە شانشین لە قەڵای بدلیس دا هەبوون، لە لاپەرە (١٠٦)ی وەرگێرانە کوردییەکەدا لەم رووەوە دەڵێت:

هەمـوو پەنجـەرەو شانشینـەکان لەسەر بورج و دیوارەکانن. ئەمە ئەوە دەردەخات کە کۆمەڵە شانشینێك بە بەرزیی قەڵاوەو لە قاتی سێیـەمی دا هەبـوون کە دیمـەنێکی جوانیـان بەم قەڵا گەورەیـە بەخشیوە کە (٣٠٠) ژووری هەبوون و (٣٠٠) خێزانیان لەنێودا بووە، ئەمە جگە لە عەماری ئازووخەو جبەخانەو تەویلەی وڵاخ.

هەروەها لە لاپەرە (٢٦٦)دا دەڵێت: قەڵا نهۆم نهۆم لەسەر یەکـەو هەر خانێـك هاتبێتـە سەر کار، ئیشێکی ئاوەدانیی لە قەڵاکەدا کردووە. بەڵام عبدال خانی زاناو ئەندازیارو ستێرناس - فلکي - و پزیشك و بلیمەت سەرایێکی لەسەر شێوەی سەرای (فیـداقـا) لە قەڵاکـەدا دروست کردو، دەورانـدەوری قەڵاکـە (٤٠٠٠) شەقـاو بووە. لەنێـو باخی خانیش دا (٣٦٠) ژوور هەبـوون و ئاوی ئاوپـرژێن (نـافورە)ەکانی لە دەمی شێرو لووتی دێـوو دەمی ئەژدیهـای دەستکـردەوە فیچقـەیان دەهات (بروانە: لاپەر: ١٢٦و ٢٦٦و ١٠٦).

لە دەستـەچـەپی تابلۆکـەدا، دەرگـایێکی ئاسنی تێهەڵکێش دیـارە کە لوولـە تۆپێکی لێهـاتـووەتـەدەر. ، ئەمـەیش لەگـەڵ ئەنـدازەی قەڵاکـەدا تەواو یەك دەگـرێتـەوە کە ئەولیـا چەلەبی لە لاپـەرە (١٠٦)دا لە بارەیـەوە گوتـوویـە: «لـە خوارەوەرا رێگـای

جوونــه شار هه‌یــه، سێ قات ده‌روازه‌ی ئاســنــی بۆ کراوه که له‌نێــوان ئه‌و ده‌روازانــه‌دا زۆر جۆره چه‌ك ئامـاده‌کـراوه.». واتـه چه‌کی وه‌ك تۆپی لێ‌داندراوه، وه‌ك چۆن له‌ وێنه‌که‌یش دا پێشان دراوه‌و، له سه‌رده‌می شه‌ره‌فخـان، یا بڵێن میـرئیبـراهیم دا تۆپی لێ‌بـووه. ئه‌م تابلۆیـه به‌ڵگـه‌یێکی ئاشکـرای ئه‌وه‌یه که هه‌ر ئه‌م ته‌رزی معماری قه‌ڵا له‌ ده‌ورانی شه‌ره‌فخان، یا پێش ئه‌ویش دا هه‌بــووه‌و، له‌ زه‌مـانی عه‌بـدال خان دا نه‌کـراوه جا ئه‌و وه‌سفـه‌ی ســه‌روه‌ی سه‌رلێبــ چه‌لــه‌بی ئه‌وه ده‌ســه‌لمێنێ که وێنـه‌کـانی نێـو شه‌ره‌فنامه له‌سه‌ر بناخه‌یێکی ڕاست و دروست کێشراون.

## تابلۆی پازده‌یه‌م

## کۆڕی شه‌ره‌فخانی بدلیسی

تابلۆی پازده‌یــه‌م (پــه‌ڕه‌ی ١٤٥) له بـاره‌ی فه‌رمـــانــڕه‌وایی شـه‌ره‌فخـــانی کوڕی میـــر (شمس الـدین)ه‌وه‌یـه، واتـه باپیـری شه‌ره‌فخـــانی مێـــژ وونـــووس که نه‌ك هه‌ر مرۆڤێکی خوێنـده‌وار به‌ڵکـــو له‌ میــره هه‌ره به‌ده‌ستــه‌ڵاتــه‌کـانی بدلیس بووه. وه‌ك شـه‌ره‌فخـان نووسیـویـه: له‌ زانستی (تنجیم) و (رمـل)دا به‌تـوانا بووه. ساڵی ٩٤٠ی کۆچی (١٥٣٣ - ١٥٣٤ی زایین) له‌گه‌ڵ له‌شکری عوسمانی‌دا به‌شه‌ڕهات و له‌گه‌ڵ (٧٠٠) له‌ هێزه‌که‌ی کوژ را.

ئه‌م تابلۆیــه کۆڕی شه‌ره‌فخـــانــه. ناوبــراو له نێــوه‌ڕاستی باخێك دا له‌ســه‌ر کورسی‌یێـك دانیشتـووه‌و پیاوه‌کانی له‌ ده‌وری ڕاوه‌ستاون. شه‌ره‌فخان له وێنه‌که‌دا چوارشانه‌و که‌ڵه‌گه‌ت دیاره‌و. دوور نی‌یـه شه‌ره‌فخـانی مێـژ وونووس ئه‌م وه‌سفه‌ی له‌ش ولاری باپیری له باوکی‌یه‌وه بیستبێ. شه‌ره‌فخان جلوبه‌رگی میرایه‌تی له‌بــه‌ردایــه‌و، سه‌روکـڵاوێکی سپی گه‌وره‌ی له‌ســه‌ر ناوه که گوڵنگه‌یێکی زۆر به‌رزو زلی له‌سه‌ر قیت بووه‌ته‌وه‌و شێوه گوڵنگه‌ی وا گه‌وره بۆ هیچ میرێکی‌دی نه‌کراوه. جا نازانم ئه‌م گوڵنکه‌یه له‌کـۆمــه‌ڵـه په‌ڕه‌کـانی باڵنـده، یا شتی‌دیکـه دروست کراوه؟. ده‌مــوچــاوی شه‌ره‌فـخـــان ئاراده‌یێـــك شێـــواوه. له ته‌نیشتی ڕاستی‌یه‌وه، سوراحی‌یێکی مل درێژ.

هه‌یــه که بۆ شه‌راب و گوڵاو به‌کـــاردێت. ژنێـك و کوڕێکی ده‌دوازده ساڵی له لایه‌که‌ی‌دی به‌پێوه وه‌ستاون؛ کوڕه‌که که‌مێك چووه‌تـه پاڵ ژنـه‌کـه‌و، جلی ژنـه‌یش ڕه‌نگـاوڕه‌نگ و که‌وای بێ قۆڵ و کراسی درێـژی ژنـانـه‌یـه‌و سه‌روکـڵاوه‌کـه‌یشی وه‌ك هی پیاوان گه‌وره‌یه‌و له‌ هه‌مان قوماشی خه‌تداره که بۆ سه‌روکڵاوی زۆربه‌ی پیاوانی نێو تابلۆکه به‌کارهاتوون و دوور نی‌یه قوماشی مشکی ئاوریشم بێ. وا پێ‌ده‌چێ ئه‌م ژنه قه‌ڵغانی شه‌ڕیشی به‌شانه‌وه بێ که وه‌ك ئه‌ڵقه‌یێکی گه‌وره‌ی له‌ گوڵنگه کراو له‌نێوان ئه‌و و شه‌ره‌فخان دایه؛ واته به‌ هه‌ردووکیانه‌وه به‌ستراوه. له‌وانه‌یه مه‌به‌ستی وێنـه‌کێشـه‌کـه ئه‌و پێوه‌ندیی ژ ن و مێردایه‌تی‌یه بێ که له‌نێــوان هه‌ردووکیـــان دا هه‌یــه، چونکــه ئه‌وه (شـــاهـ به‌گی خاتوون)ی کچی (عه‌لی به‌گی ساسوون)ه که ژنی شه‌ره‌فخانه‌و نه‌نکی شه‌ره‌فخانی مێژ وونووسه. ئه‌م ژنه له حه‌وشه‌ی مزگه‌وتی (شـــه‌رفخـــان) گومــه‌زێکی جوانی تیـژ و به‌رزی له‌ســه‌ر کۆڕی مێرده‌که‌ی ئاواکردووه‌و، گۆڕه‌که‌ی خۆیشی له‌نێو ئه‌م گومه‌زه‌دایه. که چووم بۆ بدلـیس، ویــستم وێنــه‌ی نووسینی سه‌ر گۆڕیـــان بگـرم و بخـوێنمـه‌وه، به‌ڵام مجێـوره‌کـه له‌وێ نه‌بـوو که کلیلی ده‌رگای گومه‌زه‌که‌ی پێ‌بوو.

گومان له‌وه‌دا نی‌یه که جلوبه‌رگی ئه‌م ژنه‌میره به شێوه‌یێکی ولقیعی کراون و هی ده‌ورانی ته‌واوبوونی دانانی شه‌ره‌فنامه‌ن. ئه‌ولیاچه‌له‌بی ژنانی بدلیـسی نه‌دیون، چونکه ڕووپۆش بوون و، ده‌ڵێت: وه‌کـوو براده‌رانم پێیـان گوتـووم: جلیـان سپی‌یه‌و پێچه (په‌چه) به‌کاردێنن و تاسکڵاوی زێرین، یا زیوین له‌سه‌ر ده‌نێن و به‌رگیــان سیـه‌رلـه‌بـه‌ر ئاوریشمـه. [(٥٠)] شایستــه‌ی باســه ژنـانی ئێزیدیش جلوبه‌رگیان به کراس و سه‌روکڵاوه‌وه سپی‌یه، مه‌گه‌ر ئێستاکه گۆڕابن. جاران ژنانی به‌شێك له بۆتان کراسی سپی‌یان ده‌پــۆشی‌و، کراســه‌کـــانیـــان یا وه‌ك هی ژنـــانی ئێـــزیـــدی له‌(مه‌ڤرووم)ی سپی بلادی بوون، یا له جاوی سپی ئه‌ستوور بوو که له لۆکه بوو و له دێهاتی بۆتان دروست ده‌کران. بگره له‌ناوچی (طورێ)و وه‌ك شاری میدیات و که‌رجه‌وس و ئه‌سکیف (حــه‌ســـه‌نکێف)یش دروست ده‌کــران و باشتـــرو قایمتـریش بوون و له بۆتان ده‌فروشران. تا سی - ساڵێك له‌مه‌وبه‌ر، نه‌ك هه‌ر له طورێ واته ناوچه‌ی خۆرهه‌ڵات و باکووری خۆرهه‌ڵاتی ویـلایـه‌تی ماردین. به‌ڵکـوو له هه‌نـدێـك زۆربـه‌ی ناوچـه‌کانی کوردستـــانی تورکیـــادا به زۆری ژنـــان هه‌ر کراسی سپی‌یـــان له‌به‌رده‌کرد، به‌ڵام قوته‌ك و ده‌ربێ‌یان سپی نه‌بوون. جگه له‌وه، که‌تانۆکی سه‌ریشیان سپی بوو. وه‌ك چۆن کراسی پیاوانیش تا ئه‌ژنۆ یا خوارئه‌ژنۆ ده‌هات، به‌ڵام هه‌ردوو لچکی (تیله) درێژتر

بوون. ئەم کراسە لە لۆکەی سپی، یا چندراوێکی سپیی نایاب دروست دەکراو. زۆر لە کراس و دەرپێی پیاوی هیندی دەچوون، بەڵام کراسەکەیان رێکوپێکتر بوو. زۆر کەس بێ شەرواڵ بۆ دەرەوە لەبەریان دەکرد، چونکە باری ئابووریی خەڵك ناجۆرو کز بوو.

## پێڵاوی بەمووروو

شێوەی پێڵاو لە تابلۆکانی نێو شەرەفنامەدا هێندە روون و دیار نین، تا لێی بدوێین و، بزانین ئەوسا پێڵاو لە کوردستان دا چۆن بووەو چەند جۆری هەبوون. بەڵام لەم وێنەیەدا تاکێك لە پێڵاوی (شاهـ بەگی خان) دیارەو ئاشکرایە. رەنگی پێڵاوەکە، سپی یا رەنگێکی کاڵی وەك بەمەیی کاڵەو سەرەکەی پانەو وەك هی ژنانی ئێستا باریك نی یە. هەروەها سەرەکەی هەڵیش نە گەراوەتەوە بۆ سەرەوە، وەك جاران کە ئەم جۆرە هەبووەو لە سلێمانی (پانی بەرز)یان پێ گوتووە. چەند موورووییك بەم پێڵاوەوەن، هێندێکیان گەورەن و یەکێکیان هیلالی یە. مووروەکان رەش، یا شینی تۆخن. جێی باسە کە ئەولیاچەلەبی لە لاپەرە (١٢٨)دا ناوی نەعلی سەدەفکاری بدلیسی هێناوەو گوتوویە: خوڵامەکانی عەبدال خان کە لە (حەمامی باغ) ئیشیان دەکرد، نەعلی سەدەفکاریان لەپێ بوو و، نەعلی سەدەفکاریشیان بۆ ئەوانە دەهێنا کە خۆیانیان دەشۆشت. بەمەدا دەبێ لە بدلیس دا پێڵاو و نەعلی بەمووروو و سەدەفکاریان دروست کردبێ.

ئەو کورەی لەبەر سینگی شاهـ بەگی خاتوون دا راوەستاوە، ئەوە (شمس الدین)ی باوکی شەرەفخانی مێژوونووسە کە کورە تاقانەکەیەتی و لەوێدا کراسێکی سپیی بێ دوگمەی لەبەردایە، چونکە کراوە نی یەو، دەستەسرێکی (کەفی) بەسەر شانی دا داوەو هەردوو سەریی بۆ پێشەوە بەرداوەتەوە. وە تا ئەم زووانە وەیان تا ئێستاش ئەم دەستورە یانی کەفی بەسەرشانی کوربەکادیت لە کوردستانی ژووروا ئەم کورە بە دەستێکی قەڵغان و بە دەستەکەی دیی شتێکی درێژی نووك تیژی گرتووە کە پێ دەچێ ئامێرێکی جەنگ بێ و لە تابلۆی ژمارە (١٣)یش دا هەمان شت دەبیندرێت.

بەپشت شەرەفخانەوە، برێك لە پیاوەکانی راوەستاون؛ سێیان پاسەوانن و رم بەدەستن. ئەمانە جلوبەرگیان تێکەڵە، بەڵام قوماشی سەروکڵاویان یەکەو لە مشکی دەچێ کە قوماشێکی ئاوریشمی ئێرانی یەو ئێستا کورد بەکاری دێنێ. ئەولیا چەلەبی لە بارەی جلوبەرگی پیاوانی بدلیسەوە، گوتوویە: سەروکڵاوین زەردو شین و رەش و سوورو زەرنیخی یەو. زۆر لە پیاوانی عەبدال خان و مرۆڤی مەقوون کوڵکی (کورکی) سمۆرە لەبەردەکەن. لە گەلێك شوێنی دیکەیش دا باسی کوڵکی لە کەوڵی سمۆرە کراو دەکات وەك لە باسی مەلاتیەو دیاربەکردا. چینی دەوڵەمەند ئەم کوڵکەی بەکارهێناوە. ئەمەیش ئەوە دەردەخات کە ئەو دەمە لە کوردستان دا هەمە زۆرو هەمە بەنرخ بووە. هەروەها گوتوویە: ئەوانەی باری ئابووری یان ناوەندی یە (شیاق) لەبەردەکەن کە لە (مەعدەن) لە ناوچەی شیروان دروست دەکرێت[41]. واتە شیروانی باکووری سێرت (سعرت). مەعدەن ئێستایش هەر ئەم ناوەی هەیە. مەبەستی لە (شیاق) کە وشەیێکی تورکی یە، قوماشێکی یا کیرازێکی زۆر ئەستووری وەك بەڕیە کە لە دەزووی خوریی رەنگاو رەنگ دەکرێت و، بۆ سەر (زین)و پاش زینی وڵاخیش دەبێ شیاق درێژەو تا ئەژنۆ، یا خوار ئەژنۆ دێت و، خەتەکانی پان و زستانان بەسەر جلوبەرگ دا لەبەر دەکرێت. **بیرمە دەوری سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر کە لەبەر هێندێك کوردی غەریب دا دەماندی، پێکەنینمان دەهات ئەو جلە درێژەی لەبەر ئەو سوارەی لە دجلە تێپەر دەبێ لە حەسەنکێفی (تابلو/٧) شیاقە ئەولیاچەلەبی هەر لەم بارەیەوە دەڵێت: خەڵکی دەست کورتی بدلیس (بوغاس) لەبەردەکەن. بوغاسیش وشەیێکی تورکی یەو مانای کەتانی تەنك دەدات**[42].

**لە تابلۆکەدا، پشتێنی پاسەوانی نێوەراستیان باش دیارەو سەرنجم رادەکێشی. پشتێنەکە خەتدارەو، هەر لە وێنەکەدا دەردەکەوێ کە لە قوماشێکی نەرمی بایەخدارە. ئەوە هەر ئەو پشتێنە ئاوریشمەیە کە ئەولیاچەلەبی چەند جارێك باسی کردووەو، گوتوویە پشتێنی ئاوریشم لە پشتی خەڵك دا بووە لە کوردستان دا. کە لە بدلیس چووەتە گەرماو (حەمام)ی باغ و بە درێژی باسی ئەوەی کردووە کە چۆن بە نەخشی شووشەیی و ئاوێنەو بەردی مەرمەرو کاشی و بەردی سیلان رازێندراوەتەوە بە رادەیێك کە سوڵتان موراد خۆیی تێدا شوشتووە گوتوویە: «ئەری چ دەبوو ئەستەموولی منیش گەرماوێکی ئاوای تێدابایە»،**

دەڵێت: خوڵامەکانی عەبدال خان کە لە چەرکەس و گورجی بوون و لە گەرمەوەکەدا خزمەتیان دەکرد، چەقۆو خەنجەری جەوهەردارییان کردبوو بە بەر پشتێنە ئاوریشمینەکانیان دا ئەم پشتێنە. لە رووی شێوەی بەستنەوە، پاش ئەوەی لە راستی نافەکەی دا گرێی لێدراوەو سەرەکەی راستەوراست بۆ خوارەوە بەرداوەتەوە. وابزانم ئێستا ئەم شێوە بەستنە باوی نەماوە، بەڵام ژنانی چەند ناوچەیێك سەری پشتێنەكانیان لە لاتەنیشتەوە بەردەدەنەوە.

تیپی مۆسیقاژەندن وا لەپێش شەرەفخانەوە لە تابلۆکەدا. لە بەری دەستەچەپی تابلۆدا، ئامێرێکی مۆسیقایی ژێدار (وَتَري) وا بە دەست پیاوێکەوە، دەسکەکەی درێژەو پشتی سنووقەکەی کوور (محـدب)ەو لە ئامێری (چەلۆ)ی خۆرئاوایی دەچێ. پیاوێکی دیکەیشی وا لە تەنیشتەوە کە دوور نی یە ئەویش مۆسیقاژەن بێ. بازەوانێك وا لەلای دەستەراستی تابلۆکەوە، دەستکێشی لەدەستدایەو باڵندەی راوی بەسەر دەستەوەیەو دوو پیاوی دیکەی لە لاوەن. باڵندەیێکی دیی راوی لەسەر دەستی پیاوێکە لە سەراوردی دەستەراستی تابلۆکەوە. باڵندەی راو لە چەند تابلۆیێکی دیکەیش دا هەن. بێگومان جاران لە کوردستان دا راوکردن بە باڵندە باو بووە، بەتایبەت لەنێو گەورەپیاوان دا.

لە لاپەرە (١٢٢)دا، ئەولیاچەلەبی ناوی پازدە جۆرە باڵندەی راوی عەبدال خانی میری بدلیسی هێناون، وەك بازو شاهێن و قوش و هەروەها باڵەبانیش کە لە پۆلی (مالك الحزين - شاهۆ)ە. تا ئەم نیزیکانەیش بە باڵندە راوکردن لە کوردەواری‌دا هەبوو. شێخ مەحموودی نەمر پێش دیل کرانی باڵندەی بازی هەبوو و راوی پێ دەکردو خوالێخۆش بوو (عەبەنەوتە) بازەوانی بوو و (کەریمی ئاردەبارە)یش بازەوانیی بۆ شێخ کردووەو، (حەمە فەرەجی برای عەبەنەوتەیش بازەوانیی بۆ کردووە لە سلێمانی [٤٤] بەرێز حامید بەگی مەجید بەگی جاف کە تەمەنی (٩٥)ساڵێك، یا پترە، دەڵێت: تا پەنجاکانیش باڵندەی راوم هەبوو. راو لای ئێمە بەم باڵندانە دەکرا: هەڵۆ، باز، شاهێن، ترونتە، واشە (باشیق). بە بازو شاهێن و هەڵۆ راوەئاسك و کەروێشك و قازو بۆرو چێرگ (حبارا)و باڵندەی‌دیکەمان دەکرد. مناڵان بە واشەو ترونتە (ترومتە) کە لە کۆتر گەورەترو لە واشە پچووکترو ئازاترە، راوە چۆلەکەیان دەکرد، ئەوسا بازو هەڵۆ لە کوردستان دەگیران و دەفرۆشران و بۆ میرانی عەرەبی ناوچەی کەنداو (خليج) دەکردران. تا پارو پێراریش لە ناوچەی قەرەداخ قوش کە باڵندەی راوە، بە (٥٠٠) دینار فرۆشراوە.

## تابلۆی شازدەیەم

### شاتەماسب لە شاری خەلات

تابلۆی شازدەیەم (پەرەی ١٤٥) باسی گەیشتنی شاتەهماسبی کوری شائیسماعیلی سەفەوی دەکات بە شاری خەلات (خلاط). شەرەفخان نووسیویە: ساڵی ٩٣٨ی کۆچی (= ٣١ ١٥ - ١٥٣٢ی زایین) دەوڵەتی عوسمانی بە سەرکردەیی فیل یەعقووب و ئولەمە (اولمه) هێزێکی ناردە سەر شەرەفخانی باپیرەی کە میری بدلیس بوو، بۆ داگیرکردنی میرنشینی بدلیس و میرنشینی (روشکی - روژکی). شەرەفخان قەڵای بدلیس و قەڵاکانی‌دیی بە هێزو کەرەستەی جەنگ قایم کردن و. (شمس الدين)ی کوری‌و خێزانەکەی ناردە قەڵای ئاختەمار (کە ئێستا بە - دێرا ئاختەماری - بەناوبانگەو دەکەوێتە نێو دوورگەیێکی زەریاچەی وانەوە لە نیزیك شاری - وەستان - و ئەمەی دوایی‌یشیان قەڵایێکی دەورانی دەوڵەتی ئورارتوو بووە). شەرفخان چووە لای شاتەهماسب لە شاری تەورێز (تبريز)و داوای یارمەتی لێ‌کرد. شا خۆی بەرەو بدلیس هات. کاتێك فیل یەعقووب و ئولەمە بەوەیان زانی هەڵاتن و هێندێك لە تۆپەکانیشیان بەجێ هێشت. شەرەفخان داوەتێکی زۆر گەورەی بۆ شا کرد لە شاری خەلات کە دەکەوێتە سەر لێواری باکووری زەریاچەی وانەوەو ئێستا قەزایێکی ویلایەتی بدلیسە. جگە لەوە، پێنج یەکی ماڵ و مەرانەی میرنشینی بدلیسی پێشکێش بە شا کرد، لەگەڵ زۆر دیاریی نایابی‌دی. شەرەفخانی مێژوونووس بە درێژی باسی ئەم داوەت و دیارییانەی کردوون و، رۆژی (٢٠ی صفری ساڵی ٩٣٩ی کۆچی = ٢١ی ئەیلوولی ١٥٣٢ی زایین)شا لە شاری خەلات بووە، چونکە لەو رۆژەدا فەرمانێکی نووسیوەو شەرەفخانی کردووە بە میری میرانی کوردستان و بەپێی فەرمانەکەیش میرنشینی بدلیس خراوەتەسەر دەوڵەتی سەفەوی. (پەرەی ١٤٣ - ١٤٨ی دەستنووسی شەرەفنامە).



تابلۆی حەڤدەیەم : سوڵتان عوسمان

له تابلۆکەدا. شاتەهماسب لەسەر تەختێك لەژێر چادرێکی بە نەخشی ئەندازەیی و گیایی رازێندراوە، دانیشتووە. چادرێکی دی وا لە پشت چادرەکەیەوەو نەخشی گیایی لەسەر نییە. شەرەفخان نووسیویە کە باپیری چادری گەورەی سەد ئەستوونی، یا سەد گوریسی و چادری سوور شین و چادری گوریس لە ئاوریشمی بۆ شاو لەشکرەکەی هەڵ داوە، تەختی زێرین و زیرینی جەوهەرداری بۆ ئامادەکردن: شا لە وێنەکەدا گەنجەو ردێن و سمێڵی نییەو بە دەموچاو گۆشتنە. شا چوار ـ مشقی دانیشتووەو خەفتانێکی گوڵداری لەسەر کراسێکی درێژ پۆشیوە. خەفتان پێشەکەی کراوەو قۆڵی دەڵب و گورتەو تا نێزیکی ئانیشك دێت. ئەم جلە لە کۆن دا دڵگرتە بووەو خەلیفەکانی عەبباسی خەفتانیان لەبەر دەکرد. ئەدیبانی ولاتی شامیش زوور بەکاریان دەهێنا. خەفتان بە زۆری لە ئاوریشم، یا (تەبلەسان) دروست دەکرا[٦٥]. کەوای ژن لە کرمانجیی ژ وودوودا خەفتانی پێ دەگوترێ. سەروکلاوی شا زل و خرە، لە سەرەوە باریك بووەتەوەو دارێك لە نێوەڕاستی بەرزبووەتەوە، کلاوی دەست و پێوەندەکەیشی وەك هیی خوێن. لەپێش دا باسی ئەم سەروکلاوەی سەفەوییەکارنمان کرد کە دارێکی سووری تێدا دەچەقێن. ئەم چەشنە سەروکلاوە لە وێنەکانی زەمانی شاتەهماس دا دەرکەوتووە. ئیدی نازانم ناوی (قزل باش ـ واتە سەرسوور) کە بۆ سەفەرییەکان بەکاردەهێندراو ئەو دەمە پەیدابوو و تا ئێستایش دەدرێتە پاڵ شیعییەکان ـ لەبەر ئەم دارەسوورە بووە، یا سەروکلاوەکەیان هەر هەمووی سوور بووە، وەك هێندێك مێژوونووس گوتوویانە؟ ماموستای مێژوونوس مەلا جمیل رۆژ بەیانی بۆ منی نووسیوە کە پەرۆیێکی لەسەر دەبەست بۆ لاسایی شەڕی (صفین)یانی جەماعەتی ئیمام عەلی. لەم تابلوەدا دوو کەنیزەك یا دوو خوڵام خواردن، یا میوە بۆ شا دەبەن. دوو کەس لە تەنیشتی ئەولای وەستاون، یەکیان کە رم و قلیچی پێیە لە ژن دەچێ. دوو کەسی دی لەپشت چادری دووەم وەستاون. سەروکلاوی یەکێکیان لە هیی دەستەکەی شا ناچێ، بەڵکوو وەك هیی کوردانە. یەکێکی دیکەیش لەپشت چادری شاوە وەستاوە. دیارە ئەمانەی دوایی پاسەوانن. چەند گومگومەیێك، یان بڵێن سوراحییێك لە خوار تەختی شا داندراون کە بۆ شەراب و گوڵاو بەکاردەهێندرێن. تیپی مۆسیقاو گۆرانی، لە داوێنی تابلۆکەدا، لەبەردەم شادا دانیشتوون، یەکێکیان ئامێری تار، یا تەنبوورو یەکیان دەف لێ‌دەدات و، دوو، یا سێ‌یشیان گۆرانی دەڵێن. بشتێنی کەمەری گۆرانیبێژە قەڵەوەکەیان باش دیارەو، خەنجەرێکی کردووە بە بەرداو، بەرگێکی نیوقۆڵی دوگمەداری پۆشیوە کە جلی وا لە وێنەکانیدیی شەرەفنامەدا نابیندرێت. یەکێکی دی لەپشت گۆرانیبێژانەوە دانیشتووە، دوور نییە کەنیزەکێك بێ و بەشداریی گۆرانی گوتن بکات.

شایانی باسە ئەم تابلۆیە بەرانبەر بە تابلۆی کۆڕی شەرەفخان داندراوە، بەڵام وێنەکێش هەردوو تاقمی کوردو فارسی ئەگەر لە هەموو شتێکیش دا نەبێ. لە شێوەی جلوبەرگ و سەروکلاودا لێك جوێ کردوونەوە. هەروەها پشتێنی کوردان وەك هیی ئێستا لە قوماشە، بەڵام هیی ئێرانییەکان کەمەر (کەمەربەست)ە، وەك لە چەند وێنەیێکی ئەم تابلۆیەدا کەمەرە بە باشی دەناسرێتەوە.

## تابلۆی حەڤدەیەم

### بەشی یەکەم

### سوڵتان عوسمان

ئەم تابلۆیە تا تابلۆی بیست لە بەشی دووەمی شەرەفنامەدا هاتوون و لەسەر سوڵتانە عوسمانیی و پاشا ئێرانیی و تورانییە هاوزەمانەکانیانن. ئەم تابلۆیە لەگەڵ باسی سەرەتای مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا هاتووە. بەم پێیە، دەبێ برێتی بێ لە کۆڕێکی سوڵتان عوسمانی کوری ئەرتوغرول (ارطغرول)ی دامەزرێنی دەوڵەتی عوسمانی کە زۆربەی مێژوونووسان بۆ ساڵی ٦٩٩ی کۆچی (١٢٩٩ ـ ١٣٠٠ی زایین)ی دەگەڕێننەوە، یا لە ساڵی ٦٨٩ی کۆچی (١٢٩٠ی زایین) یان ساڵێك پێشتردا بووە وەك شەرەفخان گوتوویە.[٦٦] ئەم تابلۆیە دوو قۆڵی (ثنائی)یە هەر بەشێك لەسەر لاپەرەیێك و بە چوارچێوەیێکی تایبەتی کراوە، بەڵام دەزانرێ دووەمەکە تەوواوکەری یەکەمەیە لە تابلۆکەدا بەشی یەکەم خانوویێکی بەخشت کراو دەبیندرێت کە دەوری چواریەکێکی پێشەکەی بە کاشی، یا مەرمەری شەش گۆشە (سداسي) رووپۆش کراوەو، شێوەیێکی سێگۆشەییش یانی قوتکە (شرفة) لەسەر خانووەکەوە بەرزبووەتەوە. عوسمانییەکان ئەم تەرزی رووکاری خانوو

(واجهة البناية)ەیان لە بیزەنتی یەکانەوە وەرگرت کە پیرەویکی بیناسازیی رۆمانی یەکانەو پیش هاتنی ئیسلام لە سوریادا بلاوبووەوەو، لە پەرستگای شاری (حضر)یش دا پیرەوی کراوە. سولتان عوسمان لەبەردەم ئەو خانووەدا بە ردین و سمیلیکی رەشەوە لەسەر تەختیکی نەخشدار دانیشتووە، سەروکلاویکی سپیی زلی لەسەر ناوە کە توندو جوان و بە پارچەییکی لە رەنگیکی دی بەستراوە. کورکیکی بیقولی لەسەر کراسیکی دریژ لەبەرکردووە؛ کە بە نوچە ئەستوورەکانی دەناسریتەوە کە کورکە. دەستی راستی بو لای سینگی بردووەو ئامازە بو خوی دەکات و دەستەکەی دیکەیشی بو زەوی دریژکردووە، وەك مەبەستی ئەوەبی کە بلیت: من خاوەنی ئەم خاکەم، یا ئەم خاکە هی خومە.

لەلای دەستەراستەوە، بەپیی وینەکە، سی خزمەتکار وەستاون کە کەنیزەکن، یەکیکیان سینی یێکی لەسەر دەستە کە خواردەمەنیی پیدەبات بو سولتان و لەم راستەدا تابلوکە کەمیك دراوە. پیاویك لەولاترەوە وەستاوە، کە بە سەرو ـ کلاوەکەی دا دیارە وەزیریەتی، چونکە سەروکلاوی وەزیرە عوسمانی یەکان زل و شیوە چادری یە، یان بلین نیزیکە لە شیوەی (کارك). مافووریك لەبەردەم سولتان دا راخراوە، وینەی ژن و پیاویك، یان ژن و پیاویکی بستەبالا (قزم)ی لەسەر نەخش کراوە. چەند پیاویکی عوسمانی لەو نیوەدان، هیندیکیان مەدەنین و ئەو دوانەیش کە فیس و سدارەیان وا بەسەرەوە سەربازن و، یەکیکیان ریبەریکی عەسکەری یە، چونکە ئەو سدارە، یا کلاوەی کە لە فەرووەیەو لەسەری ناوە تا پاش یەکەمین جەنگی جیهانیش ریبەرە تورکەکان لەسەریان دەکرد. دوو کەسی عوسمانی رم بەدەستن سەری رمەکانیان لەسەر ئەرزەو دیار نین. دوو پیاوی دییان (مەسیحی)ی خەلکی ئەنادول، یا بلین بیزەنتی لە تابلوکەدا دیارن، شەپقەی ئەورووپایی یان لەسەردایە کە هەر لاییکی شەپقەکەیان دوو لقی دریژی وەك دوو شاخی هەن، خزمەتکاریکیش لەپشت پاسەوانی دەستەچەپەوە وەستاوە، دوور نی یە کەنیزەك بی، چونکە نەخشی قوماشی سەروکلاوەکەی لە هی سی کەنیزەکەکە دەچی و ئەم نەخشەیش بریتی یە لە چەند پەلکیکی گیایی وەك گیا سوینە کە دریژ و لیك دوورن. هەمان نەخش لە تابلوی لەمەر سولتان (محمد الفاتح)و ئەستەموولیش دا لەسەر سەروکلاوی خزمەتکارەکان، یا بلیین کەنیزەکەکان هەن. رەنگە ئەمە نیشانەییکی تایبەتی کەنیزەکەکان یا خزمەتکارە عوسمانی یەکان بی. ئەگەرچی لەو تابلویەیانەدا هەمان نەخش، یا نیشانە وا بەسەر سەروکلاوی ئەو پیاوە ردیندارەی کە لەپشت وەزیری (محمد الفاتح)ەوەیە. تو بلیی ئەو پیاوە بەرپرسی خزمەتکارەکان بی؟..

ئەمە بەشی یەکەمین بوو لە تابلوی حەڤدەیەم کە لەسەر لاپەرەییکی تایبەتی دروست کراوە بەرامبەر بەشی دووەمینی و هەر دوو یەك مەوزوعن و بە یەك تابلو دەژمیردرین.

### تابلوی حەڤدەیەم بەشی دووەم

لەبەشی دووەمی تابلوی حەڤدەیەمی دووقولن کە بەرامبەر بەش یەکەمە لە پەرەی ١٥٨ دا بریك خەلك لە حەوشەی خانوویێکی پەنجەرە گەورەدا وەستاون کە بە جلوبەرگیان دا دیارە، لە فارس و تورکی عوسمانیو سەلجووقیو رەگەزی ئەورووپایی تیکەلن. لە سەراوردی دەستەراستی تابلوکەدا دوو مروڤ هەن بەستنی سەروکلاویان لە هی تورکە عوسمانی یەکانی تابلوی ژمارە (١٧ و ٢٠) ناچیو، داریکیان لە سەروکلاویان چەقاندووە کە ڤا نیشانەییکی تایبەتی ئیرانی یەکانە لە زەمانی دەولەتی سەفەوی داو لەسەردەمی دەستەلاتی شاتەهماسب دا، وەك لە تابلوی ژمارە (١٦)دا باسمان کرد. هەروەها پشتینیان لە هی تورکەکان ناچیو وەك هی ئیرانی یەکانی تابلوی شازدەیەمەو کەمەرەیە. (سەرنافکە)یانی ئەلقە ئاسنەی بەستنی کەمەرەیان سەرەکەی پانە، هەرچی پشتینی تورکەکانیشە لە قوماشەو سووکەو زور گەورە نی یە. کراسی یەکیکیان باش دیارەو هەتا ئەژنوی دیت. هی ئەوی دیکەیان بە یەخەکەی دا دەزاندریت کە لە هەمان چەشنە. یەکیکی دی وا لەپیش ئەم دوو کەسەوە جلوبەرگی لە هی عوسمانی یەکانەو کراسە دریژەکەی تا سەر ئاستی ناووکی دوگمەییکی زوری پیوەن وەك هی وینەکانی تابلوی ژمارە (١٧). دوو کەس هەن لە خوار ئەمانەوە، یەکیان وینەکەی کەمیك تیك چووەو، یەکیکی دیی لە تەنیشتەوەیە کە بالندەی راوی بەسەر دەستەوەیەو بە کلاوەکەی دا دەناسریتەوە کە سەلجووقی یەو لە هەمان جورە کلاوی میر ئەرتووقی سەلجووقیی تابلوی ژمارە (١٣)یە. دوو کەسی دیکە وان لە نیزیك ئەم

دوانەوە، شێوەی سەروکڵاویان باش دەرنەکەوتووە، یەکێکیان شتێکی وەك سینیی بەسەر دەستەوەیەو شمشێریشی پێیە.

دوو کەس لە بەشی دەستەچەپی تابلۆکەدا، (کە لەسەر لاپەرەییکی تایبەتی‌یە)، وەستاون، کڵاویان خەتدارەو هێلکەیی هەڵکەوتوون و قەراغەکەیان بە ئەندازەی سێ‌چوار پەنجەیێك بۆ سەرەوە هەڵگەڕاونەوە، ئەم جۆرە کڵاوە لە چۆغەیەو، لەوانەیە هی تورکمانە کۆنەکان بێ، چونکە لە هی تورکمانانی یەکێتیی سۆڤێت دەچێ بگرە سیماو سەروسەکوتیشیان لە تورکمان دەچێ. پێ‌دەچێ لادێیی عوسمانی بن. دوو کەس وان لەنێوان دوو کەسی پێشوو و ئەسپەکانیان داو سەروکڵاو واتە مێزەریان وەکوو هی عوسمانی‌یەکان؛ یەکیان ـ کە لەنێوان هەردوو باڵندەی ڕاوەکەدایە ـ شتێك لەسەر بەری دەستی‌یەتی‌و لە وینەکەدا باش دەرناکەوێ‌و، بەو نیشانانەی پێشتر باسمان کردن لە خزمەتکاری سوڵتان دەچێ. باڵندەییکی ڕاو وا بەسەر دەستی یەکێك لەم دوو کەسەوە. بەولای ئەم دوانەوە، دوو کەسی‌دی هەن، شەپقەی ئەوروپایی‌یان لەسەر ناوە. دیارە ئەمانە بێزەنتین و پاش داگیرکرانی خاکەکەیان هێندێکیان بوون بە دەست وپیوەندی عوسمانی‌یەکان. یەکێك لەم دوانەیش، نامەییکی کراوەی بەدەستەوە گرتووەو قسە لەگەڵ ئەوی‌دی‌دا دەکات.

دوو ئەسپ لە تابلۆکەدا دیارە. کەسیان بەسەرەوە نی‌یەو خزمەتکاریکی سولتانیان لەلا وەستاوە. ڕەنگە ئەم دوو ئەسپە هی ئەو دوو میوانە ئێرانی‌یە بن و، تەنانەت شێوەی جلی ئەسپەکانیش لەگەڵ جلی ئەسپی کوردەکان جیاوازە..

من وای بۆ دەچم کە ئامانجی سەرەکیی ئەم تێکەڵی‌یە لە خەڵك دا، وەك لە تابلۆکەدا بەرجەستە بووە، پێشوازی لێ‌کردنی نوێنەرێکی ئێرانی. یا بڵێین ئێلخانی یا چەند نوێنەرێك (وەفد) بێ کە هاتوون بچی بۆ لای سوڵتان عوسمان بۆ پیرۆزبایی لێ‌کردنی بەبۆنەی چوونەسەر تەختی دەستەڵاتدارەتیی ئەووەوە، یا ڕاگەیاندنی بوونی بە یەکەمین سوڵتانی عوسمانی. لە تابلۆکەدا دیارە کە دەرگەوانێکی سوڵتان پێش دوو ئێرانی‌یەکە کەوتووەو، بۆ لای سوڵتانیان دەبات و سوڵتانیش لە دوورەوە چاوەڕێیان دەکات و لێیان وردەبێتەوە. دووەم کەسی ئەو نوێنەرە شتێکی پانی وەك، پارە، یا سەعاتی لەسەر لەپی دەستی خۆی داناوە کە دیاری‌یەو پێشکێشی سوڵتانی دەکات. یەکەمیشیان دەستێکی خۆی نووقاندووە، کە لەوە دەچێ دیاری‌یێکی لەنێودا بێ.

جێی گوتنە، ئەوسا دەوڵەتی (ئێلخانی)ی مەغۆلی لە ئێران دا لەسەر کار بوو. ئەگەر عوسمان ساڵی ٦٨٩ی کۆچی بووبێ بە سوڵتان، ئەوا ئەو دەمە ئەرغونی کوڕی ئاباقای کوڕی هۆلاکۆ (٦٨٣ ـ ٦٩٠ی کۆچی) حوکمی ئێرانی کردووەو ئەگەر ساڵی ٦٩٩ی کۆچیش بووبێ، ئەوا سوڵتان مەحموودی غازانیی کوڕی ئەرغون (٦٩٤ ـ ٧٠٣ی کۆچی) لەسەر حوکم بووە. واتە دەبێ ئەو نوێنەرانە لەلایەن یەکێك لەم دوانەوە نێردرابن. بەڵام وێنەکێش، لەبەر ئەوەی ئەو نوێنەرانە لە ئێرانەوە هاتوون کە مەڵبەندی دەوڵەتی ئێلخانی بووە، هەر بە بەرگی فارسیی سەردەمەی خوی وێنەی کردوون، نەك سەردەم و بە بەرگی مەغۆلی‌یەوە، دوور نی‌یە ئەو دوو بێزەنتی‌یەی کە یەکێکیان نامەیێکی کراوەی بەدەستەوەیەو قسە لەگەڵ ئەوی‌دیکەدا دەکات برێتی بن لە نوێنەرێکی بێزەنتی‌یەکان و پێش نوێنەری ئێرانی هاتبن و ئەو نامەیەیش گفت (تعهد)ێك بێ لە سوڵتانیان وەرگرتبێ چونکە وەك گوتمان دوو بێزەنتیی‌دیکەیش وان لە کۆڕی سوڵتان داو ڕەنگە هەرچواریان نوێنەری بێزەنتی بن. هەروەها ڕێی تێ‌دەچێ ئەو دوو کەسەی کە گوتمان کڵاویان لە هی تورکمانەکان دەچێ ئەوانیش نوێنەرێکی تایبەت بن.

## جلوبەرگی عوسمانی‌یەکان

بەگوێرەی وێنەکانی ..رەفنامەو واقعی مێژوویی لە تابلوکان داجگە لە فێس و کڵاوی ڕێبەرەکان، مێزەری عوسمانی‌یەکان سپی‌و زلەو، زۆربەیان بە شێوەییکی درێژ و خرو لووس بۆ سەرەوە دەچن و نیوچەلوولەکێك پێك دەهێنن. بەڵام هی وەزیر لە هەموویان گەورەترە، بەشی خوارەوەی شێوە چادر، یان بڵێین لە شێوە (کارك ـ کوم فەقیرك)ە لە هی سوڵتان ئەستوورترە، بەڵام کورترەو لە لووکەك ناچێ‌و، کڵاوەکەیشیان باریك و تیژەو کەمێك لە مێزەرەکەوە دەردەکەوێ. مێژوونووسی تورك ئەحمەد ڕاسم لە کتێبی (عثمانلی تاریخی)دا (بەرگی یەکەم، پەراوێزی ژمارە ٥٥٦ ـ ٥٦٥) باسی جلوبەرگی عوسمانی‌یەکانی کردووەو، گوتوویە: لە دەورانی سوڵتان (عوسمان ی کوڕی ئەرتوغوول)دا. کڵاوکانیان هی دەروێشە (مەولەوی)یەکان بوو و، سورمەدار بوو و، مێزەری لە دەور

دەبەستراو، ناوی (سکە) بوو. جاروبار بە سەروکڵاوی پیاوانی سوڵتانیان دەگوت (دستار یوسفی) ئێستا ئەم کڵاوە سەرتیژە لە سەری هەندێك دەرویشە کوردەکانی سلیمانی هەیە. (فەرەیدوون ئولوو عارف ئەفەندی)ی نەوەی مەولانا (جلال الدین)ی ڕۆمی قاتێك جلوبەرگی دەرویشە مەولەوی‌یەکانی پێشکێش بە سلێمان پاشای ڕزگارکەری (روم ایلی) کرد کە[٥٨]

بریتی بوو لە سکەو فراجەو تەنوورەو کەمەرە. سوڵتانە عوسمانی‌یەکان تا زەمانی سوڵتان (محمد الفاتح) ئەم جلوبەرگەی مەولەوی‌یەکانیان لەبەردەکرد. پاشان مێزەر بە سورمە نەخش دەکراو پێیان دەگوت (تەکیە = طاقیە)و، ناوی تەنوورەیش کرا بە (خەفتان)و، فراجەیش بە (بنش)و (قونتوش)و کەمەرەیش بە (قانون قوشاغی) واتە بشتێنی (قانون). مێزەری وەزیری گەورە (الصدر الأعظم) لە شێوەی چادردا بوو و بۆ پێشەوە لاربووبووەوە. مێزەری (شیخ الاسلام) پچووك بوو دەبێ ئەوەیش بزانین کە فراجە (فرجیة) وەك کەوایەو تەنیا لەپێشەوە کراوەیەو لەپێشەوە داخراوەو، لە زەمانی دەوڵەتی عوسمانی‌دا بەرگی زاناکان بوو و، خەلیفەکانیش خەڵاتیان دەکرد بە میران و پێیان دەپۆشین[٥٧]. ئێستا فراجە لە نێو پیاوانی ئاینیی دیان دا هەیە. کەمەرەیش جۆرە پشتێنێکە سێ چوارە پەنجە پانەو بە زۆری لە دەزووی ئاوریشمی ڕەنگاو ڕەنگ و سیمداریش دروست دەکرێت. پێ‌دەچێ سوڵتان لە تابلۆی (محمد الفاتح)و ئەستەموڵ دا کەمەرەی لەپشت بەستبێ کەمەرە بە گشتی لەسەر کەوا، یا بە واتایێکی‌دی جلوبەرگی شۆر دەبەسترێت. کەمەرە، هەر تەنیا ئێرانی‌و عوسمانی نەیان بووە، بەڵکو کوردیش بەکاریهێناوە. ئەوەتە لە وێنەیێکی تابلۆی یەکەمی شەرەفنامەدا کەمەرە هەیە. پێ‌دەچێ ئەو ئاسووری‌یەی کە لە تابلۆی دووەم دا لەبەر دەرگای (قەڵای دزێ)دا لە هەکاری وەستاوە، ئەویش کەمەری لەپشت کردبێ. لە تابلۆی یازدەیەمیش دا، ڕەنگە دوکانداری نێوەڕاست کەمەرەی بەستبێ. ئەسپ سواری تابلۆی دوازدەیەمیش، لەوە دەچێ، کەمەرەی هەبێ. هەتا ئەم ساڵانەی پێشوویش کوردستان کەمەرە (هەمیانە)ی تێدا بەکارهاتووە، بەتایبەت دەوڵەمەندی شارەکان لەسەر جلوبەرگی شۆر دەیان بەست، چونکە لە پشتێنی قوماش نایابترو گرانتر بووە. ئێستا کەمەرەی حەوێز حبیب ئاغای کۆیسنجەقم لەلایە کە دەوری (٣٧) ساڵێکە کۆچی دوایی کردووە. کەمەرەکە (٨سم) پان و (١٥٠سم)یش درێژە، لە دوو پارچە پێك هاتووە: پارچەی یەکەم لە کاتی بەستن دا دەکەوێتە سەرەوەو لە دەزووی ڕەنگاوڕەنگی ئاوریشم کراوەو گوڵنکەیێکی ڕیشوودارەی بەسەرەوەیەو، بە سێ قایش و ئاوزوونە توند دەکرێت.

**پەراوێزەکان:**

(٣٤) بڕوانە: بەسری کونیار: دیاربکر تاریخی بەرگی سێ‌یەم لاپەرە ٢٦٦ ـ ٢٧٩. هەروەها ـ شەوکەت بیسان ئۆغلوو: بتون جبهەلریلە دیاربکر لاپەرە ٧٣ ئەم دوو کتێبە بە تورکین. لە سەدەی یازدەیەمی زایینی‌دا لە سەردەمی دەوڵەتی کوردیی دۆستکی‌دا، گوندی (بەنی نوح) لەسەر پاسەوانانی قەڵاکانی ئاگیل و جاترەو یەمانی وەقف کرا، چونکە ئەم سێ قەڵایەی دەوڵەتی دۆستکی نێزیکی سنووری دەوڵەتی بێزەنتی بوون و بە چاوێکی گرنگەوە تەماشا دەکران. (ابن بهات)، کە بازرگانێکی گەورەی شاری فارقین بوو، ئەم دێیەی بە پێنج سەد دیناری بێزەنتی کڕی، کە قازانجی یەك ڕۆژ خام فرۆشتی بوو و، کردی‌یە وەقفی ئەم سێ قەڵایە. بڕوانە: احمد بن یوسف بن علي بن الأزرق الفارقي: تأريخ الفارقي، بيروت، ١٩٧٤، لاپەرە لاپەرە ١٦٧. هەروەها ـ حضارة الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، بەرگی دووەم، لاپەرە ٣٢٤.

(٣٥) وشەی صەنج (صنج)، وەك (صولجان)و (صهريج)، عەرەبی نی‌یە، بەڵکوو بە عەرەبی‌کراو (معرّبة)ە، چونکە لە زمانی عەرەبی‌دا پیتی «ص»و «ج» لە وشەیێك دا کۆنابنەوە. ئەم لە «سنج»ەوە هاتووە کە وشەیێکی فارسی‌یە. پێ‌دەچێ لە هەمان کات دا کوردی‌یش بێ‌و، هەر لە کۆنەوە «سەنج» لە کوردی‌دا هەبووبێ.

(٣٦) بڕوانە: الدكتور صبحي أنور رشيد: الآلات الموسيقية في العصور الاسلامية، شێوەی ١٥٤ لە لاپەرە ٢٦٠و وێنەی ٨٠ لە لە لاپەرە ٣٧٩و لاپەرە ٢٥٩یش.

(٣٧) بڕوانە: وێنەی ٨٨ لە لاپەرە ٣٨٥ی هەمان سەرچاوەدا.

(٣٨) دوکتور حسين علي محفوظ: قاموس الموسيقى العربية ١٩٧٥ لاپەرە ١٠١.

(٣٩) بڕوانە: ابن ابي حجلة، أنموذج القتال في نقل العوال

لاپەرە ٣٢ ـ ٤٣.

(٤٠) گوزارەییکی پەرەی ٧٦ی دەستنووسی شەرەفنامە لەگەڵ **هیلی** شەرەفنامەی چاپی قاهیرەو شەرەفنامەی کوردیی هەژاری موکریانی کە وەرگێرانی چاپەکەی قاهیرەیە، جیاوازە. ئەم گوزارەیە «قلعۀ خیزان نیز أصلا مشابهت بقلاع بلاد اکراد ندارد و بطرز عمارات بلاد عجم» لە دەستنووسەکەدا هەیەو لەوانی دیدا نی‌یە.

لە دەستنووسەکەدا ئەم گوزارەیە هەیە: «وبیوتات درون قلعەرا نیز بطرز رصد طرح کردەداند»، لە لاپەرە ٢٧٤ی چاپی قاهیرەدا وەهایە: «وعمارات اندرون قلعە بطرز رصد طرح کردە». واتە لە باتی «بیوتات» «عمارات» هاتووەو، بەرێز هەژار لە لاپەرە ٤٠٢دا ئاوا وەری‌گێراوە: «ژووری قەڵا وەك ڕوانگە ئەستێرەناسان هەڵ خراوە». یانی «عمارات»ی بە «ژوورە»کانی قەڵا داناوە، لە کاتێك دا شەرەفخان ئەمەی مەبەست نەبووە، بەڵکوو خانووەکانی نێو قەڵای هیزان کە هەموو خانوویکی نێو شوورای قەڵای هیزان دەگرێتەوەو برێتی‌یە لە شاری هیزان، نەك بینای قەڵا بە تەنیا تەنێ. ئەم مەبەستەی لە گوزارەی دانە دەستنووسەکەدا بە باشی ئاشکرا دەبێ. زۆرجار مێژوونووسان شار بە ناوی (قەڵا)وە ناو دەبەن. بۆ نموونە، ئەولیا چەلەبی لەبری شاری ماردین و شاری سنجارو شاری وان، نووسیویە: قلعة ماردین و قلعة سنجارو قلعەوان. مەخسەدی شارو قەڵا هەمویەتی

(٤١) ئەوی ڕاستی بێ هیزان، کە لە سەرچاوەکان دا بە شێوەی (حیزان و خیزان)یش ناونراوە، وەك شارۆچکەیێك و مەڵبەندی ناوچەیێك لەپێش ئیسلام دا هەبووە. واقدی لە (فتوح الشام، بەرگی دووەم، لاپەرە ١٦٨ ـ ١٦٩)دا دەڵێت: خیزان و (معدن)و (اسعرد)و چەند مەڵبەندیکی دیکەیش، ساڵی ١٨ی کۆچی (٦٣٩ی زایین) (عیاض بن غنم) ڕزگاری کردن. باسیل نیکیتین لە کتێبەکەیدا (الاکراد، لاپەرە ١٢٩) دەڵێت: هیزان لە سەردەمی ڕۆمانی‌یەکان دا مەڵبەندی هەرێمی (موکسای) واتە (میکسێ) بووەو، ئێستایش قەڵاییکی ڕۆمانی لە دۆڵی هیزان دا دەبیندرێت. هیزان، پێش دەورانی هولاکوو (نصیرالدین الطوسي)و لە لە زەمانی ئیسلامەتی‌دا ناوی (حیزان) هاتووە لە کتێبی: (آثار البلاد وأخبار العباد، لاپەرە ٣٦)ی (زکریا القزویني)و (معجم البلدان)ی (یاقوت الحموي) لە باسی «حیزان»داو (اللباب في تحریر الأنساب)ی (ابن الأثیر) لە بابەتی• «حیزان»دا.

میوەهاتی هیزان ڕێ لەوە دەبەستێتەوە کە بگوترێت لە زەمانی هولاکودا بنیاد ـ نراوە، چونکە ئەو میوەهاتە پێش ئەویش لە هیزان دا هەبوون، وەك فندەق (بندق) و(شاه بلوط) کە قزوینی و یاقوت الحموي باسیان کردوون. هەروەها فندەق لە دێهاتی بێدارو ئوزیە و خنوکی ناوچەی بەرواری لە قەزای (خەسخێ)ی باشووری ناوچەی هیزانیش هەن. دوور نی‌یە لە هیزان وەریان گرتبێ ڕێ‌تێ‌دەچێ لە زەمانی ئیسلامەتی‌دا بە فراوانی دەست بە شاری هیزان دا هێندرابێ و ئاواکرابێتەوە. ڕەنگە هەر ئەمەیش لە بیری خەڵك دا مابێتەوە. من وای بۆ دەچم پاشماوەی ئێستای شوورای هیزان زۆر کۆن نی‌یەو هی زەمانی ئیسلامەتی‌یە، لەگەڵ ئەوەیش دا پتەو نی‌یەو بەردەکانیشی نە داتاشراوو نە گەورەن. شایانی باسە، کە چووم بۆ هیزان لەگەڵ محەممەد واثقی زڤنگی، خەڵکەکەی پێیان گوتم: ئەم بەشی خۆرئاوایەی قەڵای هیزان کە ئێستا گرنگترین بەشی‌یەتی و بە بەردی نەقاریی سپی بنیاد نراوە، ئەوە بورجی (جیهان شاه)ەو ماڵی جیهان شاه بووە. کە چووینە سەر گۆری ئەو (سینەم)ەیش کە گۆرانی و حقایەتی زۆری لەسەر هەیەو بە ڕادەیێك بڵاوبوونەوە کە گەیشتوونە ناوچەی موکریان و هەولێرو کۆیەیش، گوتیان: ئەوە خانووی جیهان شاهی باوکی (سینەم)ە کە گۆرەکەی وا لە بەشی پاشەوەی گۆرستانەکەو بەری خۆرئاوای قەڵاکەدا.

جا ئیدی نازانم ئەم جیهان شاهە میرێکی هیزانی پاش زەمانی شەرەفخان بووە، یا یەکێکی دی‌یەو، قەڵای هیزان، یا شووراکەیشی ئاواکردوونەوە؟ من لە مێژوودا سێ کەسم بەبیردا دێت بە ناوی جیهان شاهەوە کە بتوانم بڵێم: ڕەنگە دەستی بە هیزان دا هێنابێ یانی تەعمیری کردبێ و ئەو بورجەیش هەر بە ناوی ئەوەوەیە. یەکەمیان جیهان شاهی کوڕی مغیث الدینی طوغروول شاهی کوڕی قلیچ ئەرسەلانە کە لە سەلجوقی‌یەکانی ڕۆمەو پایتەختی حوکمەتەکەی شاری (ئەرزەڕۆم)ی کوردستان بوو و، لەنێوان ساڵانی ٦٢٢ ـ ٦٢٧ی کۆچی‌دا (= ١٢٢٥ ١٢٢٩ / ١٢٣٠ی زایین) حوکمی کردووە. دووەمیان

حبـ ـ شـهی کوڕی قەرەیوسفی قەرەقۆینلووە کە ماوەیێکی زۆر
ـ ـیـر ـ ۆ عیـراق و کوردستـان دا فەرمانڕەوایی کردووەو، ساڵی
... ی کۆچـی (١٤٦٧ ـ ١٤٦٨ی زایــیــن) لە ناوچـەی
ـــرۆش)ی ـکـــووری بدلـــیس کوژراوە. سێ یـــەمیـــشیـــان
حبـ ـ شـهی کوڕی قەرە عوثمـان و مامی (حسن الطـویـل)ی
ـق قریمەوە. لە کاتێك دا میرانی ئاق قۆینلوو سەرۆکاریی
ـ ـجـەی هیـزانیشیـان کردووە. ژیـانی ئەم جیهـان شاهە روون
ـی ـەوە، ئەم وەکوو شایێك حوکمرانیی نەکردووە. من بە دووری
ـ ـ ـە جیهان شاهی قەرەیوسف، کە خاوەنی مەراغەو تەوریزیش
ـووە، قەڵاو شاری هیــزانی ئاوەدان یان تەعمیــری کردبنـــەوە.
ـەڵام ئەم بیســتـــووە هیــزانی کردبێ بە جێی دانیشتنی خۆی.
ـەوێش ناچێ شوورای هیزان هی سەدەی پازدەیەم بەرەوخوارتر
ـی.

هەرچی جیهـانی شـاهی قەرەقۆینلووە مزگەوتی گەورەی شارە
لە میـژینـەکـەی وان و منـارەکـەی بنیـاد ناوە کە وا لەلای قەڵای
وانـەوە، وەك ئەولیـاچـەلەبی لە لاپەڕە ٢١٢ی سیاحەتنامەکەی‌دا
(چاپی کوردی) بە نەخش و نیگـارەکـەیشی‌یەوە باسی کردووە.
بەڵام لەبریی ئەوەی بڵێت جیهان شاهی قەرەقۆینلو، بە هەڵە
گوتوویە: جیهان شاهی ئاق قۆینلوو.

(٤٢) جرجي زيدان: تأريخ التمدن الاسلامي بەرگی پێنجەم
لاپەڕە ١٨٠.

**(٤٣) ئەحمەدی‌خانی، مەم وزین: هەولێر ١٩٦٨ لاپەڕە ١٠١**
**دێرە شیعرەکەی مەم و زین ئەمەیە:**
**وەسطانی‌و نێرگزی‌و سەقلان**

**دەروازەو ئومەری‌و مەیدان**

**(٤٤) ئەولیا چەلەبی: سیاحەتنامە بەرگی چوارەم: ١٤٤ دەقی کوردی.**

**(٤٥) مەم وزین ل١٣٩**

**(٤٦) عەزە چاوەش باری ئابووریی باش و ئەسپێکی چاکیشی هەبوو و، لەگەڵ سوارەکان دا بەسواری دەچوو. فەرەج چاوەش زوڕناژەن بوو لە کۆیەوە، پاشتر هاتە ڕانیەو، دەوری دوو ساڵێك لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد. ئەوسا ڕاوکردن بە تاژی بوو، نەك باڵندەی ڕاو. ئەم زانیاری‌یانەم لە کۆیە لە بارەی یاریی قاشوانەوە لە کاك تۆفیقی مەلا صدیق وەرگرتووە. وابزانم «قاشوان ـ قاشو»**
لە وشــەی «کـاشــو»ی وەرگیـراوە وە بەڵکو لە زۆر جێگـەکـانی
کوردستان پێی دەڵێن کاشو وەك بەهدینان و فارسیس پێ‌دەڵێن
کاشو

**(٤٧) بە ناوی ئورتــووقــی کوڕی ئەکـــســەب ـ ئەکـــســەبــو ـ (اکســك)یش لە هێنــدێـك سەرچاوەدا هاتــوە ـ ساڵی ٤٧٧ی کۆچی (١٠٨٤ ـ ١٠٨٥ی زایـیـن) سوڵتــان مەلــك شاهــی سەلجووقی هێزێکی بە سەرکردەیی میر ئورتووق بۆ یاریدەدانی ئەو هێزی‌دیی نارد کە بۆ داگیرکردنی دەوڵەتی کوردیی دۆستکی بەکێش کردبوو. ئەوە بوو ساڵی دواتر داگیریان کرد. ئورتووق ساڵی ٤٨٤ی کۆچی (١٠٩١ ـ ١٠٩٢ی زایین) کۆچی دوایی کردووەو، سەکمـانی کوڕی ساڵی ٤٩٥ی کۆچی بووەتـە میـری حەســەنکێف و پاشـان کوڕو نەوەکـانی دەستیـان بەســەر هەمـوو ناوچەی ماردین و دیاربەکردا گرت.**

جا لەبــەر ئەوەی ئورتـــووق فەرمـــانـڕەوایی لەم ناوچـانـەدا نەکردووە، دەبێ ئەو میرە ئورتووقی‌یەی باوکی کچەکە یەکێك لە کوڕ، یا نەوەکانی ئورتووق بێ، نەك ئورتووق خۆی. (بڕوانە: دکتور احمد السعيد، تأريخ الدول الاسلامية ومعجم الأسرات الحـــاكمـــة، بەرگی دووەم، لاپـــەڕە ٣٥٠ ـ ٣٥٣. هەروەهـــا کتێبەکەمان ـ الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٩١.)

(٤٨) لە پەڕەی ٩٠دا لە دەستنووسی شەرەفنامەدا ناوی «سید حسین» هاتــوە، واتــە سەیـیـد حوسێنی کوڕی شێخ حەسەن. بەڵام لە شەرەفنامەی چاپی قاهیرەدا، لە لاپەڕە ٣٢٤دا، «سید حسن» لەبریی «سید حسین» هاتووە. دیارە دانەی دەستنووس ڕاسترە. شەرەفخان لەپێش دا نووسیویە: شێخ حەسەنی زەرقی کچی میـر ئورتـووقی لە خۆی مارەکـرد. (بـڕوانە: پەڕەی ٨٦ی دەستنـووسـەکـەو لاپـەڕەی ٣٠٩ی چاپی قاهیـرە. سەبـارەت بە ئەمەنی شێخیش، پێ‌دەچێ هەر ئەوە ڕاست بێ کە ئەو کیژەی لە کوڕی خۆی مارە کردبێ.

(٤٩) سیاحەتنامە، لاپەڕە ٢٤٤

(٥٠) سیاحەتنامە، لاپەڕە ١١٤.

(٥١) هەمامان سەرچاوە ل١١٤

(٥٢) المعجم التركي العربي، بەرگی چوارەم، لاپەڕە ٢١٨.
بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٥٠.

(٥٣) له لاپەڕە (١٠١)ی سیاحەتنامەی تورکیدا ناوی «بلبان» هاتووە. مامۆستا سەعید ناکام لەگەڵ ناوەکانی دیی باڵندە هەر بە ناوی خۆیانیانی نووسیوەتەوەو بە کوردییەکەی نین. «بالابان» له (المعجم التركي العربي)دا بە عەرەبی (واق)ە کە لە پۆلی (مالك الحزين)یە. بەڕێز حامی بەگی جاف دەڵێت: «باڵەبان» بە کوردی ناوی ئەو هەڵۆیە (صقر)یە کە بە گەورەیی بگیردرێت و ماڵی بکرێت. چونکە بە گەورەیی بەداو دەگیرا. ئەگەر هەڵۆیش بە پچووکی لە هێلانەدا بگیرێت و بەخێوبکرێت و گەورە ببێ، ئەوا هەر هەڵۆ (صقر)ی پێدەگوترێ.

(٥٤) شێخ صاڵحی کوڕی شێخ محەممەدی موفتیی کوڕی شێخ بابە ڕەسووڵی بەرزنجەیی و ئەحمەد پاشای عەبدولڕەحمان ئاغاو حەمەئاغای ئەورەحمان ئاغا لە سلێمانی بازیان هەبووە، عەبە نەوتەو حەمە فەرەجی برای بازەوانییان بۆ کردوون. ئەوسا خەرجیی بازەوان و خێزانەکەی لەسەر خاوەن باز بوو، چونکە نەیدەتوانی لەو ئیشە بەو لاوە کارێکیدی بکات. دەبوو بازەکە ماڵی بکات و فێری ڕاوی بکات و دەستکێش لەدەست بکات و بەسەر دەستەوە بە بازاڕدا بیگەڕێنیو هەتا بۆ چاخانەیشی ببات و لەسەر ئاسنێك دایبنێ کە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، چونکە شێ کار لە باز دەکات و لەبەر ناسکیی زوو دەمرێت. بازی گەوری ڕۆژی مریشك و نیوێك دەخوات و خواردنی هەر گۆشتی مریشك بوو. شێخ مەحموودی نەمر لە داریکەلییش بازو هەڵۆو باڵندەی دیی ڕاو دەکردن و بۆ شێخە عەرەبەکانی کەنداو (خەلیج)ی بە دیاری دەناردن. بەڵام خۆی ڕاوی پێنەدەکردن، بەڵکوو بە تاژی ئەوسا ڕاوی دەکرد. کەریمی ئاردەبارەی بازەوان دەورووبەری ساڵی ١٩٢٠ مردووە، عەبەنەوتەیش دەوری ١٩٤٨و حەمەفەرەجی برایشی دەوری ساڵی ١٩٥٢ کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانیارییانەم لە بەڕێز شێخ ڕەئووفی شێخ نووریی نەقیب و خوالێ خۆش بوو عەلی دەدە (عەلیی صاڵحە سوورە) وەرگرتوون. کاك علی ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٣٠ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد، بیرەوەرییەکی زۆری هەبووە، من و کاك ئەکرەمی صاڵحی ڕەشە سوودی زۆرمان لێوەرگرت. جگە لەوە کە لەپووری کوردیی خۆش دەویست. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێ.

(٥٥) الدكتور صلاح حسين العبيدي، الملابس العربية الاسلامية في العصر العباسي، لاپەڕە ٢٥٣. هەروەها بڕوانە: زینهارت دوزی، تكملة المعاجم العربية، بەرگی چوارەم، لاپەڕە ١٤٧ ـ ١٤٩.

(٥٦) شەرەفنامە (دەستنووس)، پەڕەی ١٥٧و ١٥٩. هەروەها ـ الدكتور أحمد السعيد، تأريخ الدول الاسلامية ومعجم الأسر الحاكمة، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٤٤١ ـ ٤٤٢. شەرەفخان دەڵێت: سوڵتان عوثمان ساڵی ٦٨٨ی کۆچی سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت. بەڵام لە هەمان کات دا گوتوویە: ساڵی ٦٨٩ی کۆچی سەرەتای هاتنەسەر تەختی سەڵتەنتی بوو.

(٥٧) د. صلاح حسين العبيدي، الملابس العربية، لاپەڕە ٢٧٨.

**سەرچاوەکان**


١ ـ ڕێنست کونل/ الفن الاسلامي د. احمد موسى کردوویە بە عەرەبی بیروت ١٩٧٥

٢ ـ ابن ابي حجلة (احمدی کوری یحیی) انموذج القتال في نقل ال العوال لێکۆڵینەوەی زهير احمد القيسي بغداد ١٩٨٠

٣ ـ ابن الأثير/ اللباب في تحرير الأنساب

٤ ـ ابن بختيشوع (عبدالله کوری جبرائيل): منافع الحيوان دانەی دەسنوسی نامەخانەی مورغان

٥ ـ ابن بطوطة (محمدی کوری ابراهيم/ رحلة ابن بطوطة چاپی بیروت ١٩٦٠

- ـ شداد (حجى كورى على كورى ابراهيمى‌ى حه‌له‌بى)
ـعلاق الخطير في ذكر امراء الشام والجزيرة القسم الخاص
ـحريرة دانه‌ى نامه‌خانه‌ى بودليانى ده‌سنووس نمره ٣٣٣.

٠ - حمد راسم/ عثمانلى مؤلفلري چاپى استنبول ١٣٣٠ - ١٣٣٠

٠ - حمد السعيد سليمان/ تاريخ الدول الاسلامية ومعجم
لأسرات الحاكمة به‌رگى دووه‌م چاپى قاهرة ١٩٧٢

٩ - احمدى خانى - مه‌م وزين - چاپى هه‌ولێر ١٩٦٨

١٠ - ادوار غالب/ الموسوعة في علوم الطبيعة المطبعة الكاثوليكية بيروت

١١ - اوليا چلبى/ سياحتنامه به‌رگى چواره‌م به توركى چاپى استنبول ١٣١٤

١٢ - ئه‌وليا چه‌له‌بى/ سياحه‌تنامه سعيد ناكام كردوويه به كوردى ١٩٧٩

١٣ - ئوسكارمان/ تحفهٔ مظفريه چاپى كۆرى زانيارى كوردى ١٩٧٥

١٤ - باسيل نيكيتين/ الاكراد بيروت ١٩٦٧

١٥ - بسرى كونيار/ دياربكر تاريخى سێ به‌رگه به زمانى توركى له ١٩٢٦ دا چاپ كراوه

١٦ - جعفر الخياط/ صور من تاريخ العراق في العصور المظلمة چاپى ١٩٧١

١٧ - حسن الباشا/ التصوير الاسلامي في العصور الاسلامية چاپى دووه‌م ١٩٧٨

١٨ - حسين على محفوظ/ قاموس الموسيقى العربية بغداد ١٩٧٥

١٩ - حنا دولپونو/ ماردين تاريخى به زمانى توركى چاپى ١٩٧٢

٢٠ - دائرة المعارف الاسلامية.

٢١ - ريج (كلوديوس جيمس ريج) رحلة ريج - بهاءالدين نوري كردوويه به عه‌ره‌بى چاپى ١٩٥١

٢٢ - زكريا القزوينى/ آثار البلاد واخبار العباد بيروت ١٩٦٠

٢٣ - زكي محمد حسن/ مدرسة بغداد في التصوير الاسلامي بغداد ١٩٧٢

٢٤ - زينهارت دوزى/ تكملة المعاجم العربية وه‌رگێرى دوكتور محمد سليم النعيمي به‌رگى چوارم چاپى بغداد ١٩٨١

٢٥ - ميجرسون/ رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان ١٩٧٠

٢٦ - شوكت بيسان اوغلوبتون - جبهة لريله دياربكر

٢٧ - صبحي انور رشيد/ الآلات الموسيقية في العصور الاسلامية بغداد ١٩٧٥

٢٨ - عبد الرقيب يوسف - حضارة الدولة الدوسكية في كردستان الوسطى - بغداد ١٩٧٥

٢٩ - صلاح حسين العبيدي/ الملابس العربية في العصر العباسي من المصادر التاريخية والأثرية بغداد ١٩٨٠

٢٠ - الفارقي احمدى كورى يوسفى فارقينى/ تاريخ الفارقي چاپى قاهرة ١٩٥٩

٣١ - فه‌قێ ته‌يران (محمه‌دى مكسى) به‌رصيصى عابد، به خه‌تى محمد على كه‌فشنى نووسراوه له ١٩٦٩دا.

٣٢ - لسترنج/ بلدان الخلافة الشرقية چاپى بغداد ١٩٥٤ وه‌رگێرى بشير فرنسيس و كوركيس عواد

٣٣ - ليسكو/ مه‌مى آلان ده‌سكارى كردنى د. نورالدين زازا دوكتور عزالدين مصطفى رسول له كوردى‌يه‌وه وه‌رى‌گێراندوه بۆ عه‌ره‌بى ١٩٨٤

٣٤ - ماجد عبدالله شمس/ مقدمة لعلم الميكانيك في الحضارة العربية بغداد ١٩٧٧

٣٥ - محمد ميحه زكى/ تاريخ الكرد وكردستان محمد على عونى له كوردى‌يه‌وه كردويه به عه‌ره‌بى چاپى قاهرة ١٩٦١.

٣٦ - محفوظ عمر/ امارة بهدينان العباسية ١٩٦٩.

٣٧ - المعجم التركي العربي دانه‌رى عبداللطيف بندر اوغلو و محمد خورشيد داقوقى و دوكتور ابراهيم داقوقى.

٣٨ ـ مەلای جزیری/ دیوانا مەلای جزیری ئویژاندنا صادق بهاءالدین چاپی بغداد ١٩٧٧

٣٩ ـ مەم وزین بە رایەتیکی فولکلوری کرمانجی خواروو بە دەنگی حاجی پیرۆتی رانیەم تۆمارکردوە.

٤٠ ـ ناهدة عبدالفتاح النعيمي/ مقامات الحريري المصورة بغداد ١٩٧٩

٤١ ـ نظمي زاده/ كلشن خلفاء موسى كاظم نورس لە تورکی‌یەوە کردوویە بە عەرەبی چاپی ١٩٧١.

٤٢ ـ نعمت اسماعيل/ فنون الشرق الاوسط في العصور الاسلامية چاپی دووەم القاهرة ١٩٧٧

٤٣ ـ هيني هارولد هانس/ زیانی ئافرەتی کورد عزیز گەردی لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە بە کوردیی و لە ١٩٨٣دا چاپی کردوە.

٤٤ ـ الواقدي (محمدی کوری عمر) فتوح الشام چاپی بیروت

٤٥ ـ ویگرام/ مهد البشرية الحياة في شرق كردستان بغداد ١٩٧١ وەرگیری جرجيس فتح الله.

٤٦ ـ ياقوت الحموي/ معجم البلدان

# تعريف البحث

عبدالرقيب يوسف

البحث دراسة لتصاوير شرفنامه أي التصاوير الموجودة في نسخة الكتاب التاريخي (شرفنامه) التي بخط المؤلف الأمير شرفخان البدليسي والموجودة في مكتبة (بودليان) بجامعة اكسفورد تحت رقم (٣١٢). الدراسة شاملة للتصاوير العشرين من الناحية الفنية والتاريخية والاجتماعية وهي وثائق ثمينة للعديد من الجوانب الاجتماعية والتاريخية للحياة في كردستان في القرن السادس عشر أي في عصر المؤلف بل وقبله أيضا وقد نشر القسم الأول من البحث في العدد السابق من هذه المجلة العلمية نفسها وقد تضمن دراسة سبع تصاوير خاصة بامارة هكاري وامارة بهدينان. أمارة بوتان وامارة حصن كيفا من الامارات الكردية مع الدراسة الفنية للتصاوير والتطرق إلى فن التصوير في كردستان في القرن الثاني عشر الميلادي في عهد المصور مهران بن منصور بن مهران ابن الرزاز الجزري المصور والمهندس الميكانيكي وكذا المصور عثمان بن محمد الحصكفي الذي ستمرا عهد المصور الواسطي (يحيى بن محمود بن يحيى بن الحسن بن كوار يها) مع الاشارة أيضا الى المصور والموسيقار مظفر بن حسين الحصكفي من فناني (مدرسة ديار بكر للتصوير) التي أخذت منها (مدرسة بغداد للتصوير) أسسا وخصائص فنية ورغم أن مدرسة ديار بكر للتصوير خلقت قبل مدرسة بغداد الا أن مؤرخي الفن إعتبروها جزء من مدرسة بغداد كمثل من يقول: (الابن ولد قبل أبيه) ولاشك أن السبق الزمني لمدرسة ديار بكر للتصوير (نزهاب إلي) على خطاهم. لقد تطرقنا أيضا الى تصاوير كتاب (معرفتنامه) لأبراهيم حقي الأرضرومي التي عملها فنان من كردستان الشمالية أو عملها في مدينة (بايزيد) بالذات.

وفي القسم الثاني من البحث تمثل الصورة الثالثة جامع كيفا ومنارتها وشخصا ذا مكانة اجتماعية مع حاشية تحمل جدا آلة الأمير حسين بن الأمير محمد ابن السلف خليل من الأمراء الأيوبيين في حصن كيفا المدينة الجزرية الواقعة على دجلة

و تابعة لولاية ماردين . أما الصورة (٩) فتقع في موضوع (امارة آكيل) من مواضيع شرفنامه تشاهد في الصورة قلعة آكيل الواقعة في شمال ديار بكر يشاهد فيها عدد من الرجال والنساء نعتقد أن الأمير جعفر ابن الأمير قاسم وزوجته من بين الواقفين على القلعة وكان هذا الأمير معاصراً لمؤلف شرفنامه . كما يشاهد في الصورة أيضاً موسيقيون وصياد بيده بندقية طويلة . والصورة (١٠) تخص أيضاً امارة آكيل حيث تشاهد فيها بنايات وأشخاص ونوع من أنواع لعبة الشطرنج . أما الصورة (١١) فتمثل مدينة هيزان التي هي الآن قرية صغيرة في ولاية بدليس وتشاهد فيها بناية على تل مع سوق (هيزان) وحركة البيع والشراء وقد خصت هذه المدينة ببعض الفواكه غير الموجودة في معظم المناطق الكردية مثل الشاه بلوط والبندق . أما الصورة (١٢) فتمثل جانباً آخر من مدينة هيزان التي قال شرفخان أن أبنيتها شيدت على طراز المراصد الفلكية ومما يشاهد في هذه الصورة فلاح يشتغل في مزرعته وتشاهد امرأتان تنظر احداها من نافذة دار مشيدة بثلاثة طوابق وفي الصورة فارسان يحتمل أن احدهما أمير هيزان . هذا ويشاهد القارىء في الصورة (١٣) الشيخ حسن جد أمراء زرقى وهو يدعو لابنة الأمير (أرتق) السلجوقي جد الأمراء الأرتقيين الذين حكموا ماردين وحصن كيفا وديار بكر مدة من الزمن ويشاهد الأمير ارتق في الصورة أيضاً وقد تمكن الشيخ حسن من شفاء الفتاة المصابة بمرض الأعصاب التي عجز الأطباء عن شفائها . أما الصورة (١٤) فتمثل حصار القوات (الآق قوينلية) لقلعة بدليس وقد رسم الفنان القائد (سليمان بيزن) وجيشه المزود بالسيوف والرماح والبنادق والمدافع كما رسم أيضا الأمير الكردي ابراهيم البدليسي واقفاً على القلعة ولم يبق معه سوى سبعة فقط من بين رجال ونساء حيث أفنت الحرب والطاعون كافة المدافعين عن القلعة وقد أثبت في الدراسة أن صورة القلعة مطابقة لهندستها الموصوفة من قبل اولياچلبي تماماً . أما في الصورة (١٥) فيشاهد الأمير شرف بك جد المؤلف شرفخان وجدّته (شا بگى خاتون) وابنها شمس الدين أي والد المؤلف وقد جلس شرف بك على كرسي يحيط به رجاله وأمامه الموسيقيون وأهل الطرب . بينما تمثل الصورة (١٦) الشاه طهماسب ابن الشاه اسماعيل الصفوي ورجال حاشيته يستمع الى الغناء والطرب وهو في ضيافة الأمير شرف بك في مدينة خلاط الواقعة على شاطىء (بحيرة وان) وقد جاء لنجدة الأمير شرف بك عندما كانت القوات العثمانية تحاصر مدينة بدليس سنة ٩٣٨هـ (١٥٣١ ـ ١٥٣٢م) . أما الصورة (١٧) وهي (لوحة ثنائية) فتمثل حسب اعتقادي السلطان عثمان بن ارطغرل جد السلاطين العثمانيين وفي مجلسه جواريه ورجال حاشيته وحراس ورجال أوربيون او بيزنطيون ويشاهد فيها وفد قدم من احدى الممالك الشرقية وهو يتوجه لمقابلة السلطان وقد رسم الفنان سواء كان شرفخان نفسه أو فناناً غيره ـ معركة (أدرنة) التي نشبت بين العثمانيين في عهد السلطان مراد الأول (١٣٥٩ ـ ١٣٨٩م) وبين البيزنطيين

هذا ويجد القارىء في ثنايا هذه الدراسة لرسوم شرفنامه معلومات غفيرة عن الأزياء الكردية في القرن السادس عشر مع مقارنتها بالأزياء الكردية حالياً اضافة الى معلومات عن الطراز المعماري في كردستان آنذاك وكذلك الأسلحة والأدوات الموسيقية والأثاث المنزلية في ذلك العصر مع بعض العادات الكردية المنقرضة .

# شارەزوور لە بازنەی دوو چەرخ دا

غفور میرزا کریم

لە بەرەبەیانی مێژووەوە زۆرانبازیو مل ملانێ بۆ زاڵ بوون و سەرکەوتن لە نێوان بەرەی کۆمەڵی کۆچەرو نیشتەجێ‌دا هەبووە بە واتایەکی‌تر لەسەر سوورانەوەی پێچکەی ناکۆکیو دووبەرەکی ئەم دوو کۆمەڵە مرۆڤە، هەمیشە رەورەوەی مێژووی مرۆڤایەتی بەرەو هەورازی پێشکەوتن و سەرکەوتن چووەو لە قۆناغ و پلەیەکی دواکەوتووی نزمەوە هەوارگەی بۆ پلەیەکی نوێی پێشکەوتوی بەرز بردوەو ئاوات و ئامانجیانی پێکاوەو هێناوەتەدی.

زانایانی چەرخی ئەمڕۆ رقەبەرایەتیو بەیەك هەڵ شاخان و دواتر کوشتنی (هـابیـل)ی شوان بە دەستی قابیلی برای وەرزێری لە خانەو چوارچێوەی دووبەرەکیو مل ملانێی نێوان کۆمەڵی مرۆڤی کۆچەرو نیشتەجێ‌دا دادەنێن و لیکی دەدەنەوە کە لەئەنجام دا مرۆڤی نیشتەجێ، واتە قابیل بەسەر مرۆڤی کۆچەردا واتە هابیل زاڵ دەبێ کە بە هۆیەوە کاروانی مرۆڤایەتی دەچێتە قۆناغ و پلەیەکی پێش کەوتووترو بەرزترەوە. سروشتی تایبەتمەندی کوردستان و ویستی رۆژگارو خواستی کۆمەڵایەتی هەر لە مێژەوە کۆمەڵگەی کوردی بە دوو بەش؛ بە کۆمەڵە مرۆڤێکی نیشتەجێ لە شارو دێهات دا و کۆمەڵێکی‌تر بە کۆچەر ـ بە هاتوچۆکەر لە گەرمیان و کوێستان دا، دابەش کردوە کە بێ‌گومان لە هاوبەشی ئابوریی هەردوو بەشەکە بنچینەی سەرخان و بن خانی کۆمەڵگەی کوردی دامەزراوە بە بازووی هەردوولا رەورەوەی مێژوو بۆ بەرەو پێشەوەو سەرکەوتن چووە.

بە راستی زانین و باسێکی ئەوتۆمان دەربارەی مێژووی کۆچەری لە کوردستان دا بە تایبەتی لە رۆژانی دێرین دا ـ لەبەر دەست دا نی‌یە بەڵام ئەوەی دیارە لامان کە کۆمەڵگەی کوردیش بە وێنەی کۆمەڵگەکانی تری مرۆڤایەتی... ماوەیەکی تایبەتی مێژوویی ژیانی لەم قۆناغ و پلەیەدا بردۆتە سەر تا دواتر پێویستی رۆژگارو خواستی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەشی لە کۆمەڵی بەرەو کشتوکاڵ و وەرزێرو نیشتەجێ‌بەتی وشارستانیەت لە شارو دێهاتەکان بردووە.

هەروەکو لەسەردەم شەپۆلی هەڵ چوونی کاروانی نیشتەجێ‌یی و شارستانی‌یەتی‌دا دیاردەی کۆچەری بەرەو کزیو لاوازی بەلکو لەناوچوون چووە. بۆیە بۆمان هەیە کە بڵێین کە ئەمڕۆ مەگەر شوێنەواری ئەم ژیانی کۆچەری‌یە هەر لە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان دا مابێتەوە وە لە دڵ و دەروونی کۆمەڵانی خەلکی‌دا بژێنەوە بێتە بەرچاووگوێ.بەهاتنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر دەزگا ی دەستەڵاتداریو دامەزراندنی شەرو تاودانی هێرش بۆ سەر دەوڵەتی صفوي و زاڵ بوون و سەرکەوتن بەسەریان دا لە شەری چالدیرانی بەناوبانگ دا ساڵی ١٥١٤دا دواتر داگیر کردنی عێراق لە ساڵی ١٥٣٥دا ئەم قەوماوانە باروودۆخێکی گونجاو و هەل و مەرجێکی تایبەتی بۆ سەرهەڵ دان و دامەزراندنی میرنشینەکانی کورد رەخسان و پەیداکرد کە دواتریش لە ژێر سایەی دەستەڵاتی سوڵتان موراد چوارەم دا دەرگاو رێگەو بانێکی پان و بەرینی بۆ بووژاندنەوەو گەشەکردنیو بەهێزبوونی هۆزو خێڵە کوردەکان کردەوەو تەخت کرد بە تایبەتی عەشیرەتی جافی گەیاندە لوتکەی بەرزیو دەستەڵاتداری. عەشیرەتی جاف لە زەمانی حمە پاشاو محمود پاشادا لە تافی دوو بەهاری هێزو دەستەڵات و هەرەتی جۆش و خرۆشیو جەولانی گەرمیان و کوێستانی‌دا ژیانی کۆچەری‌یان دەبردەسەر عەشیرەت لەم بوارە مێژوویی‌یەدا بۆ ماوەی ١٣٠ میل زیاتر باڵی دەستەڵاتداری بەسەر خاك و زەوی‌یەکی زۆری ناوچەی گەرمیان و کوێستان دا درێژکردبوو وە دانیشتوانیشی لە ئاستی زەبرو زەنگیان دا مل کەچ راوەستابوون، کوردواتانی: فەرمانیان رەت کردنەوەی نەبوو!!!

هەر لە قەڵای شیروانەوە بە ناوجەرگەی شارەزووردا تا دەگاتە بانەو سنەو کوێستانی نەکەرۆزو بەرانان و کوێستانی شارەکانی‌تری کوردستانی ئەو دیو، جێگای لەوەڕگاو مەیدانی هاتچۆی شۆرە سوارانیو گابارو هەوارگەی بارو بنەی ئەم عەشیرەتە بوو، بەم چەشنە ساڵی دووکەرەت تۆ بڵێ ساڵ دوانزە مانگ هەژدە هەزار خێزانی رەشماڵ نشین بە هەموو ماڵ و ماڵاتیانەوە کە بریتی‌بوون لە ٣٠ تیرە، کە هەر تیرەیەك لەژێر سەرکردایەتی سەرۆکی تایبەتی خۆی‌دا و هەمووشی بە کۆمەڵ لەژێر فەرماندەی سەرۆکی گشتی‌دا بە وێنەی لەشکرێکی گەورەی تازەکووره، لە جەولان دا بوون. کوردواتەنی (خلە باری ئەکردو بلە کەیری ئەکرد)

ئیتر ئەم دەستەڵاتداری‌یەو پەیوەندی‌یە تۆندو تۆڵەو بەرژەوەندی هاوکۆیی، ئامانج و ئاواتی هاوبەشی ریکوپێکی ناوخۆی هۆزو گوێ شل کردنی کەسانی هۆزو رێزگرتنی بی‌وێنەیانە بۆ سەرکردەکانیان، ئەم خاڵانە بە گشتی هێزو توانایەکی بێ‌سنووری دابوو بە هۆز. کە لە ئەنجام دا کاری کردە سەر هەژاندنی دڵ و دەروونی سەرکردەکانیو بیرو بۆچوونیانی لە بازنەی بەرژەوەندی گشتی هۆزەوە گەیاندە بیرکردنەوە لە مافی چارەنوسی دوا رۆژی کورد. بۆیە بێرەمێرد بەرامبەر ئەو ئەقەلاو کۆششەی کە محمود پاشا لە پێناوی یەك گرتنی هۆزو خێلەکان و بەشەکانی تری کوردا دەی‌نواند... بە وێنەی

ئەو تەقـەلایـەی دادەنـا کە کاتی خۆی (بیسمـارکی ئەڵمـانی) بۆ یەك گرتنی بەشەکانی ئەڵمانیاو مافی چارەنوسی دوا ڕۆژ ی گەلی ئەڵمانیا دەی‌دا کە دواتر محمود پاشای بە بیسمارکی کورد لە قەڵەم دەداو ناو دەبرد.

هەروەهـا هێـزو دەستـەڵاتی عەشیـرەت لەم بوارە مێژوویی‌یەدا گەیشتبووە رادەیـەك کە لە ئاستی‌دا هەر دوو دەوڵـەتی عوسمـانی‌و ئێـرانی دەلـەرزان، هەریـەکـەیـان خواخـوایـان بوو کە هێـزی عەشیـرەت بە لای بەرژەوەنـدی خۆیـان دا رابـکێشێ، وە ئەگـەر پێشی نەکـرا بۆ دوژمنـایـەتی بەرامبـەر دەوڵـەتـەکـەی‌تـر راپێچی بکـات هیـچ نەبێ بە دۆستی‌و لایـەنگیـری خۆی بی‌هێڵێتەوە، دیارە شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەم بابەتەوە نیشانەی باش پێکاوەو بە دروستی هێزی عەشیرەتی هەڵ سەنگاندوە، بۆیە دەڵێت:

**خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا**

**مێروولە نەچی چاکە بە گژ قوڵلەیی قافا**

شارەزوری دێرین کە لە مێژەوە ناوبانگی بە کانگای خێرو بیرو گەنجینەی سامان و چاوگەی شارستانی دەرچووە ئەمرۆ لەم بازنە مێژوویەدا بەدبەختی رۆژگارو میردەزمەی کاوڵ کەر یەخەو سەرشانی گرتبوو. دانیشتوانی بە شنەی شەماڵی ڕابووردووی شکۆمەندی‌یەوە. دڵ و مێشکی خۆیان فێنك دەکردەوە. وە بەسەر گوزەشتەی ژیانی پرشنگداری باو باپیریان دڵ و دەەوونیان زاخاو دەدایـەوە. چەرخـی چەپ گەردو شملی شەرو هەرای بێ ئـامـان دەرگـای شارستـانیـەت و ئاوەدانی لە گریـژنـە بردبوو. تۆوی وێرانی‌و دواکەوتنی تێ‌دا شەتل کردبوو. . . ئەمرۆ وەکو لەوەرگایەك بۆ عەشیرەتی جاف دێتە پێش چاو لە وەرزی بەهاردا گژوگیای چروپری بە قەد باڵای زەلامێك بەرز دەبووەوە کە سوار، یا کەروبار تێی‌دا نقوم دەبوو لەو دەشتە پان و بەرینەدا نە پەڵە دارێك بۆ جوانی‌و دڵگیری نەسێبەرێك بۆ حەوانەوەی ڕێبوارێك نەباخ و گوڵزاری بۆ چاولـەوەرانێـك و دڵ کەیلیـەکێ نەئـەدی‌ی. ناسازی ئاووهەوا لەرزو تاو مارو مێرو و مێشولە سەرتاپا ژیانی ئەو خەڵکەی تەنگ و تاڵ کردبوو، وە لە داوی ئەندێشەی دەردو بەڵاو نەخۆشی‌و ورگ ئاوسی‌دا دەیان ئاڵاندو دەتلانەوە. لە گوێ (مێـروان) و(زەڵـەم)و لە کەنـار (تـانجـەرۆ) خەڵکی چەنـد پەڵـە چەلتوکێکیان دادەچاند کە ئەویش ڕەوە بەراز بە چەشنێ لوتیان تێ‌دەژنی کە نە بە ڕاوکـردنی، یا بە کوشتنی لەوەزەنیـان ڕزگـاریـان نەدەبـوو، زیـانیـان گەیشتبووە ڕادەیەك تەنانەت لەم دوایی‌یەدا نوێنەرانی ئەنجومەنی نیابەت بۆ قەلاچۆو لەناوبردینان داوایان لە دەزگای میری دەکرد.

لە پاڵ داچاندنی چەلتوك دا وەرزێرەکان لە بەراوەکان دا گالیشیان دەچاند ئەم گاڵەی کە زیاتر بۆ ئالیکی ئاژەڵ بەکاردەهێنرا، بەڵام دانیشتوان (شارزور و شلێرو ئاوخـوان) لە ڕەشـەسـاڵانی گرانی قاتـوقـری‌دا بە نان، یا بە خەپلە لەگـەڵ خواردن دا دەیـان خوارد. لە بەهـاردا کاتێ عەشیـرەت بەرەو شارەزور دەجما، هەر بەش و پەل و لقێك بە وێنەی لەشکرێکی ڕێکخراوی هاوچەرخ ئەرکی تایبەتی‌یان لەناو کاروان دا بەجێ دەهێنا بۆ وێنە ژنە جاف بێجگە لە ڕستن و چنینی، کەلوپەل لە کاتی زستان و هەوار خستن و حەوانەوەدا. . .

گای بار دەکردو لێی دەخوڕی، کۆڵ بە کۆڵەوە، منداڵ بە بەرەوە، بە دوای کەرو بارەوە دەرۆیشـت هەر کە دەگـەیشتـە هەوار دەستـوبـرد پەلامـاری مێکـوتی‌دەدا دەستی بە داکـوتـانـدنی سنگی چیغ و ڕەشماڵ دەکردو لە کاتی کۆچیش دا ئەگەر لەسەر منداڵ بوون بوایە لەبن دەوەنێك دا خۆی دەشاردەوە منالی کۆرپەی گۆش دەکرد، تا دەگەیشتنە هەوار، سەرەرای ئەمەش مانگا دۆشین و ماست و پەنیرو کاری تری هەمووی بە ڕێك وپێکی دەبرد بەڕێوە.

باش ترین بە... ...ی ڕوون کردنەوەی ڕۆژانی دوو بەهاری پایەی بەرزی دەستـەڵاتـداری‌و گەورەیی عەشیـرەتی جاف و بارودۆخی ئەو سەردەمـەی ناوچـەی شارە زوور دواتـر ڕۆژانـی خەزانـی نزم بۆ نەوەی ئەم پایـەی دەستـەڵاتـداری‌و کزو لاوازی دەوریـان هەروەهـا ئاواکـردنـەوەی ناوچـەی شارەزوور بە نیشتە جێ‌بوونی هۆزو ناشتنی نەونەمامی شارستانی تێی‌دا ئەم پەخشـانـەی خوارەوەی پیرەمێـردە کە لە ڕۆژنامەی ژیان ژمارەی ٤٤٤ ساڵی ١٩٣٥ بە ناوی «اجتمـاعیـات» بڵاوی کردوتـەوە کەوا ئێمـەش بە بۆوسینی ئەمرۆ دەی‌خەینە پێش چاوی خوێندەواران.

## ئیجتماعیات

### ژیانی کۆچەری «حەیاتی بەداوەت»

لەناو چەوانم نوسرابوو کە جیهان دیدەبم، هەموو شتێك ببینم لە ساڵی ٣٠٣ی ڕۆمی‌دا لە هەڵەبجە بووم ئەو کارەی پێم سپێرا بوو لەوانە بوو لای هەمـوو بەگـزادە قەدری بگیـرێ چونکـە سەرکـاری سوڵتان عبدالحمید بووم خۆشم بە تایبەت سەروساختم لەگەڵ هەموویان دا هەبوو نەخوازەلا کەمی لە شیـعـرم دەزانـی‌و ئەو سەردەمــە شیـعـرو شاعیـری و صوحبـەتی خۆش و خۆش گوزەرانی لەناو بەگزادەدا پەسەندو باو بوو. هەر لە (شیروانەوە) هەتا گەلگە گوزەرگەی کۆچی ئاوداران و شیرین ڕوخساران بوو. بەهاران خێڵ و ژووری (ئێلی موڕادی) کە ماڵەگەورە لە دوێ (ڕەسم) هەڵی‌دەداو ماڵە بەگزادە بە دەوری‌دا وەك یازدە ئەستێرەی دەورەی مانگ یازدە خەیمەو بارەگای نەوەی کەیخسرەوی دەرازانەوە. وە لە هەموو توترکێکەوە ڕوویان تێ‌دەکرد. بەیانیان گزنگی ڕۆژ دەی‌دا لە سەرو پۆپلەو خشـڵ و میخـەك بەنـدی پەری ڕوویـان لەویوە دەکەوتە سەر لێفەی خاراو قنەوزە شەبەندە بەرۆژ و خامەك ئەتلەسی گوڵ سورمەیی میوانان و لەناو گوڵ و گوڵستان و سەوزەگیاو ئاوی ڕەوانەدا بینەر خۆی لە خەودا دەدی.

کە هەوار دەگـوێـزرایـەوەو کۆچ دەکـرا ئەم تیـپـە سوارە بە ماینی نەجدی‌وە رخت و شەقەبەندەوە دوای ئەوان پۆلی پەریان بەو ئالۆ والای شیرین کارەوە بەسواری (ئاخ ئەو وەختە فوتوگراف باونەبوو) دەکەوتنە ئەو دەشتەی وێنەی بەهەشتە!!!

ئەم وێنەیە لە دەماخی من دا نەخشی بەستبوو تا لە ساڵی ٣٢٠ ڕۆمی‌دا لە ئەستـەمـوڵ لە مەجلیسێك دا پێنج ساڵ لەگـەڵ (زەکی مغامزدا) پێکەوە

**ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ساڵی ١٩٢٢ ژمارە (٦)**

بووین. مغامز دەرسی تورکن و عەرەبی بە (پیەرلوتی piyerlowty ئەدیبی ناودار وە قیمــەتــداری دوایی شاعیــری فەرەنســە دەگـوت بە زۆر منێشی ئالانــدە ئامـوشـوی لای پیـەرلـوتی وە گوایا منیش فارسیم دەزانیو پراتیکی فارسیمان دەکـرد، ڕۆژی ئەم گوزەرانی ئیـلاتی ئێمـەیـەم بۆ گێـرایەوە تێفکریم بۆ ئەم گوزەرانی کۆچەری‌یە لە من بە پەرۆش ترە، وەختێ کە بە (جیهان گەردی) چوەتە اصفهان و لە ڕێ تووشی ئیلات هاتووە سەربەستیو ئازادی‌یەکی کە لە گوزەرانی کۆچــەری‌دا دیــویــە لەلای گەلێ لە مەدەنیــەت ـ شارستــانی ـ خۆشتر بووەو سیاحەت نامەیەکی نوسیوە شاهـ ئەسەرە. ئەوساش دڵم نەهات خەیالی سەبنی خوم و ئینتباعاتی دەماخی پیەرلوتی بە درۆ بخەمەوە بەڵام کە ئێستــا پیـری ژێـری کردووم و ئەو شکـۆەو دەبـدەبەو دەست ڕەسی ئیلاتیە وەرگەڕاوەتەوە سەر نوشـست و دەست بەستەیی ڕێی بەندەریەوە، وە لە باتی ئەو شیرین سوارە بە لەنجەو لارانە ژنە کورد دەبینم بە کلاشەوە وە بێشکە بە کوڵەوە جالوکیکی لە مانگایەك بارکردو وە لەرز دەی‌چوقێنیو حەیوا ئاتیشیان کە جاران چل یەك بوو وە ئێستا پارەی بزنانەکەی دەرنایەنی. زۆر ئارەزوو دەکەم کە وەکو لەمەوپێش نووسیومە «ئەگەر ئیل نیشتمەنی بێ» ئەم برادەرانەم لەو کێشمـەکێشـەو دەردی مەعیشــەتـە ڕزگار بن، وە شارەزوور ئاوابکەنەوە وە درەختی لێ بنێژن و تیایا دانیشن ئینجا خۆیان دەبن بە مرۆڤیکی پێش کەوتوو و وڵاتیش دەبێ بە وڵات)...

لە ئەنجامی سەرهەڵ دان و پەیدابونی بەرەی کۆچەریو نیشتەجێی‌دا لە کۆمـەڵگـەی کوردی‌دا ڕق و قینـە بەرایـەتی دواتر مل ملانێو زۆرانباریەنی بۆ زاڵ بوون و سەرکەوتن لە نێوانیان دا بەرپابوو هاتە کایەی ژیانەوە.

ئیتر تا سنووری دەلاقەو کەلەبەری بەرژەوەندی نێوان ئەم دوو بەرە کۆمەڵ قووڵترو گەورەترو بەرفراوان تر بوایە بێ‌گومان دوو بەرەکیو زۆرانبازی نێوانیان شێـوەی تیـژتـرو ڕەبـرو ڕەنگ ترو حەستر بەخووە دەگرت و دەهاتە پێش چاو. درێـژخـایـەنی مێـژوویی ئەم دوو بەرەکیـەو بە یەك دا هاتنی نێوان کۆچەریو نیشتـەجێ‌یی‌دا لە کۆمـەڵگـەی کوردی بارو دەوخێکی گونجـاوی بۆ گۆڕینی هەردو وشەکە ڕەخسناند کە لە ئەنجام دا ناوی کوردو گۆران لە جێگەیان دا چەسپاو بوو بە باوو کە ئەمڕو لە مێژووی کوردا، ئەم دوو بەشە کۆمەڵە جیاواز لە هەموو مەیدانێکی کۆمەڵایەتیو ئابوری بە ناوی کۆمەڵەی کوردیو گۆڕانەوە ناوی دێ‌ی... وە لە قاڵبـێـکی مێـژوویی و زانیـاری‌دا خۆی دەنـوێنێ. بێ‌گومان وێنەی زۆرانبازیو مل ملانێی ئەم دوو کۆمەڵ لە کەلەپوری کوردی‌دا بە زەقی دەبیرێت، وەکو دەڵێن کوردو گۆران شەڕیانە لەسەر ماڵی موسڵمانان.

هەروەکو لە شیعری کوردی‌یش دا جارجار ناوی کوردو گۆران بە وێنەی دوو بەش لە کۆمەڵ دێ. وەکو ئەم پارچە شیعرەی کە بە بۆنەی هاتنەوەی شیخ مەحموودی نەمر لەهندستانەوە گوتراوە، ئەردەکەوی:

**ڕوو بە قیبلە دەست بە سینە بۆ [کویتین] چاوەری**
**(کوردو گۆران) هەر دەڵێن یارەبی موحموود بێتەوە**

کاتێ کۆمەڵانی خەڵکی لە گۆران. دەیانبیـست کە ئێل بارو بنە ڕێك دەخاو بۆ حەولانی گەرمیــان و کوێستــان خۆ ئامـادە دەکـات ترس و لەرز دای دەگـرتن هەروەکو لەبەردەم شەپۆلی یەك لە دوا یەکی تیپی سوارەیو گاو بار لێشاوی کاروانی‌یا، ئاسۆی ژیانی لێ‌تاریك دەبوو وە بۆ پاراستنی دەغلودان و مەرەزەو نیگرا شـیایی‌کانی دنیای بەرفراوانی لێ‌دەهاتەوە یەك و کەسانی ئیل لە جیاتی ئەوەی بەدەنــگ هاوارو دادو پاڕانــەوەیــان بێ!! ڕەحمی بەزەیی یەکیــان بە ماڵاتیانەوە بێت هەڵ دەشاخانەوە بە ڕوویان دا بە لووت بەرزی‌یەکەوە دەیان قیـژان بەسـەریـان دا دەیـان وت (بـڕۆ گاڵت وەگوێزە!!! زۆر وتنی ناوێ، با گوڵەکەی بۆ خۆتان بێت و ساقەکەی بۆ ئێمە بێ!!) وێنەی ئەم دووبەرەکیو مل ملانێ‌یــەی نێوان کوردو گۆران لە گەنجینـەی شیعـرو پەنـدی پشنیـان و کەلــەپـوری کوردی‌دا بە زەقی دێتـە بەرچـاو لە پەنـدی پێشینـانی پیـرەمێـردا عەشیرەتی جاف کەلە لوتکەی دەستەڵاتداری‌دابوو بە تاوانبار بەرامبەر گۆران دادەنرێت. بۆیە بە زیان بەخشی لەم بوارە مێژوویی‌یەدا ناوی دەبات وەکو دەڵێت؛

**جاف بۆ زیان و هەمەوەند بۆ شەڕ**
**شێخ و تەفرەقە، زەنگنە بۆ گەر**

[پشدەر جەنگاوەر، بانەیی تەصحایە کوژ]... هەتد

کڵپەی بڵێسەی شۆڕشی فەرەنسی بۆرجوازی ساڵی ١٧٨٩ ئاگری لە دارو پەردوی سیستــەمی دەرەبەگایەتی بوگەنی ڕزیوی مردووی ئاش لە ئاو کەوتەی لە جیهان دا بەردا شەپۆلی پرشنگی بیرو باوەری ڕوبسپیرو دانتیو دیدرومارا دڵ و دەروونی بەرەی خوێنــدەواری لە پایتــەختی دەوڵــەتی عوسمــانی‌دا ئەستەمبوڵی هەژاندو ڕووناك کردەوە. ڕووخاندنی زیندانی باستیل و دانانی جمهـوریـە بانـگە ڕاهێشتی بۆ سەربـەستیو ڕزگـاریو دانان بە مافی ڕەوای مرۆڤ دا شیـرازەو بنچینـەی ڕژێمی زورداریو کۆمـەڵایـەتی لە دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵات دا لەرزان و هەڵ تەکان وە دەرگای تێ‌کۆشانی بۆ میللەتانی ژێر دەست خستە سەرپشت، تا چارەنووسی دوارۆژیان دیاری‌بکەن و شارستانیو پێش کەوتن و ئاوەدانیو زانستی پێك بهێنن. لەژێر بالـەبەستوی بیروباوەری شۆڕشی فەرەنســەداو بۆ دابین کردنی پێـویستــەکانی کۆمەڵ و هێنانەدی داواو داخــوازی پێشکــەوتن و شارستــانیو ئاوەدانی شۆڕشی مەشروتەی ساڵی ١٩٠٨ لەلایەن کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقیەوە دژی دەستەلاتداری سوڵتانەکانی دەوڵــەتی عوسمــانی بەرپابوو. بە هاتنی کۆمـەڵی ئیتحادو تەرەقی بۆ سەر دەزگــای فەرمانــرەوایی دەوڵـەتی عوسمــانی، دەرگــاو ئاسۆیەکی بەرفراوان بۆ پێش کەوتن و شارستــانیو لەنــاوبــردنی دیــاردەی کۆنی ڕزیــوی دواکــەوتوی کۆمـەڵایـەتی کرایـەوە، دەرکـەوت ڕۆشنبیرانی کوردیش بە وێنەی ڕۆشنبیرانی گەلانی تر... کەڵکیـان لەم دەرفـەتـە ڕەخسـاوە هەڵکـەوتـوە وەرگرت و لەناو جەرگــەی شــەپــۆلی ئەم کەف و کوڵی بزووتنــەوەیــەدا جاکی مەیدانــەیــان لێ‌هەڵ کرد، دەستیـان بە دانانی کورو کۆمـەڵ و بانـە کردنەوە کرد ڕۆژنامەو

گوڤاریان دەرکرد بەبیری تیژی والآبیژیان چارەنوسی دواروژی کوردیان دیاری دەکرد داوای پێشکەوتن و شارستانی و ئاوەدانی کاولکەی نیشتمان و لەناوبردنی داماوی دواکەوتن و نەخوێندەواریان دەکرد لە ئەنجامی ئەم کۆششەو ئالوگۆرینی کۆمەڵایەتی یەدا خێڵ و هۆزە کۆچەری یەکانی کوردیش بە تایبەتی ئیلی گەورەی جاف ـ بە کاوەخۆ، دەکەوتنە نیشتەجێ بون وە دەستیان بە کشتوکاڵ کردن کرد بە تایبەتی پاش ئەوەی کە هەندێ لە سەرۆکەکانیان پایەی دەستەلآتداری یان لە دەزگای دەوڵەت دا وەرگرت.

**کورد واتانی «گەورە ئاو ئەرێژێ پچووك پێی لێ ئەنێ.»**

---

پاش جەنگی یەکەمی جیهانی «سەفەربەر»ەوە لە ئەنجامی بەرپابوونی شۆرشی بیستی عیراقی و دواتر بە دروست بوونی حکومەتی عیراقی بارو دۆخیکی گونجاو و هەل و مەرجێکی تایبەتی لە ولآت دا بۆ تێ کۆشانی روشنبیرانی کورد لە بواری بەرەو پێش چوون بۆ پلەی پێشکەوتن و شارستانی و تۆڵەسەندن لە میردە زمەی دواکەوتنی دێرین رەخساو هاتەکایەوە. لەم بوارە مێژوویی یەدا بیرو راو هاواری روشنبیران لە سەرچاوەیەك دا یەکی دەگرتەوە هەموو بیروڕایان ئەوە بوو کە بناغەی پێش کەوتنی ولآت لە سەر سێ کۆڵەکە وەستاوە، بلآوکردنەوەی زانستی، پەرەپێدان بە بازرگانی، برەودان بە کشتوکاڵ کردن. بۆیە کۆششی روشنبیران لە پێناوی ئەم سێ مەبەستەدا لەو سەردەمەدا چ لە لاپەرەی رۆژنامەکان... پێشکەوتن، ژیانەوەو ژیان... هەتد، یا لەو داواو داخوازیانەی کە لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی دا لە هەموو دەرفەتیکی هەڵ کەوتودا دەیان دا بە گوێی کاربەدەستانی میری دا. بە زەقی و روونی دەبینراو دەهاتە بەرچاو. روشنبیران هەر لە ساڵانی بیستەوە کێشەی ئاوەدان کردنەوەی شارەزوور و پێویستی نیشتەجێ بوونی خێل و هۆز، پێش خستنی کشتوکاڵ کردنەوەی شەریکەو دانانی بانق «دراوگە» بۆ یارمەتی وەرزێران. گرنیوە ئەستوو بێ وچان دەیان خستە بەرچاوی کۆمەڵانی خەڵك و دەزگای میری. بۆ وێنە ئەم چەند دێرە شیعرەی خوارەوە کە لە هەڵبەستێکی دوورو درێژدا هاتووە کە رۆژنامەی ژیانەوە ساڵی ۱ ـ ژمارەی ٦ ساڵی ۱۹۲٤ بلآوی کردوتەوە دەتوانین بی کەین بە بەڵگەنامەیەك چ بۆ دەرخستنی باری دواکەوتنی ولآت بێ یا بۆ دەربرینی بیری روشنبیران و تەقەلآیان بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن بێ.

شارێك وەکو ئێرە کە چەند گەورەو زۆرە
یەك مەکتەبی تێدا نی یە بۆ دافعی حاجات
ئەحضا لەبەر ئەولادی وەتەن بانەبن مەحروم
ماڵ و سەرو و روح صەرفی مەعاریف بکەین فەخرە
بۆکردنی یەك باخ و دوو گاسن بە هەزار حاڵ
حاجی محمد و حاجی کریم دێنە موناجات
کوا مەکتەبی طب کوانێ حقوق کوانێ صەنایع
چون سەعی بکەم فێری ببم علمی فەلەکیات

ـ مصطفی ـ

لە ئەنجامی کۆششی روشنبیران و بە پێی پێویستی رۆژگارو خواستی دابین کردنی بازاری عیراق بە هەموو پێویستی یەکی ئابوری و کۆمەڵایەتی جگە لە ناردنی کەرەسەی خاو وەکو لۆکەو خوری و دانەوێڵەو ئاژەل و برنج... بابەتی تر بۆ دەرەوەی عیراق ئەم خالآنە بە گشتی گورو گوژمێکی دیاری کراوی بە بازرگانەکان ـ دا، هەروەکو سەرنجی دەزگای میری بۆ گوێدان و لاکردنەوە بۆ پێشکەوتنی کشتوکاڵ و هان دانی خێل و هۆز بۆ نیشتەجێ بوون و ئاوەدان کردنەوەی شارەزوور راکێشا، کە نمونەی ئەم تەقەلآیەش لە دامەزراندنی کێڵگەی بەکرەجۆ لەلایەن دەزگای میری یەوە ساڵی ۱۹۳۳ رەنگ دەداتەوە و دەردەکەوێ. کێڵگەی بەکرەجۆ... بە دیاردەیەکی پێش کەوتوی هاوچەرخ بۆ مەیدانی کشتوکاڵ کردن و بەخێوە کردنی ئاژەڵ و چاندنی دارو درەختی بەردار دەژمێرێ هەروەکو بە تاقی کردنەوەو نموونەیەکی تازەش دادەنرێ کە بە هۆیەوە وەرزێرەکانی ناوچەی سلێمانی فێری چاندنی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ و دروست کردنی ماست و پەنیر... هتد لەسەر شێوەیەکی تازەی هاوچەرخ دەبن.

نیشتەجێ بونی سەرۆکەکانی جاف و هاوبەشی هەندێکان لە پایەی دەستەلآتدری دەزگای میری دا چ بە وەرگرتنی پایەی بەرێوەبەرێتی ناوچەیی مدیری ناحیە» و قائمقام و نوێنەری لە ئەنجومەنی ئیابی دا چ بە پلەی موچە خۆری تر بێ... بوو بە هاندەرو پاڵ پێوەنەر بۆ کەسانی (ئیل)یش کە بەرەو نیشتەجێ بوون بۆ کشتوکاڵ کردن و دوکانداری و پیشەی تر بچن کە لە ئەنجام دا هۆش و گیانی و بەرژەوەندی هۆزایەتی بەپێی ئەم ئالوگۆرە بەرەوکزی و لاواری و نزمی دەرۆیی و دواتر شیرازەو بناغەی پەیوەندی نێوان هۆزو خێلی پساندو پچراندو پەیتا پەیتا بە «کاوە خۆوە» لەژێر زەبروزەنگی پێوستی رۆژگارو خواستی مێژوودا ئەم پەیوەندی یە شێوەیەکی تری وەرگرت وە چووە قالبێکی ترەوە. کەسانی (ئیل) بوون بە پابەندی زەوی، ملیان بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن نا ـ تا بوونە جوتیارو وەرزێر، سەرۆکە کانیش بوونە خاوەنی زەوی. نیشتەجێ بوونی خێل و هۆز دابین کردنی بازاری عیراق و دەرەوەی بە پێویستی کۆمەڵایەتی و کەرەسەی خاو گەشەکردنی بزوتنەوەی بازرگانی دەست درێژکردنی بازرگانانی سلێمانی بە ئەرخانەی سەرمایەیان. لە کاروباری کشتوکاڵی و شوانکاری دا ئەم خالآنە بەسەرجەمی بارو دەوخی کشتوکاڵی بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن برد کە دواتر دەشت و دەری شارەزوور سەرتاپا ئاوەدان بووەوە. بۆ وێنە هەر لەسەرچاوەی زەڵمەوە هەتا گوندی دوو ئاوان لە هەڵەبجەوە تا موان «۲۷» جۆگە هەبوو. بستی زەوی بە بەیار نەدەمایەوە لە هەر لایەکەوە چاوت دەگێرا. رەنجبەرو جوتیار جۆگەیان لە زەڵم و تانجەرۆو سیروان هەڵ دەکرت نۆوی دەغلودانیان دەوەشاند لۆکە، کەتان، چەلتوك و، گالیان دەچاند.

وە لە گوێ زەڵم و تانجەرۆ و سیروانیش کاڵەك و شووتی و بێستانی ترۆزی و شینایی یان دەکرد. تەنانەت لەم دوایی یەدا بە تایبەتی پاش دانانی دائرەی ئینحصاری توتن لە ۱۹۳۹ بە دیاری کراوی پاش بەرزکردنەوەی نرخی

توتن له سالآنی ٩٤٥ - ٩٤٦ به هۆی باری سیاسی‌یه‌وه ده‌ستیان به توتن چاندنیش کرد. به‌م چه‌شنه گزنگی ئاوه‌دانی و شارستانی ده‌شتی شاره‌زووری گرته‌وه به هۆی کردنه‌وه‌ی خه‌سته‌خانه‌و رشتنی «دی‌دی‌تی» یه‌وه به یارمه‌تی میری‌و گوێ‌دانی دانیشتوان به له‌ش ساغی‌و ته‌ندروستی خۆیان، مارو مێرو مێشوله‌و سونه‌و کولله‌و دوپشکی عه‌ربه‌ت و ورگ ئاوسانی دانیشتوانیش نه‌ماو ناویان به کۆڵه‌که‌ی ئاشا چوو. بارو دۆخی شاره‌زور بۆ کشتوکاڵ و ئاژه‌ڵ به‌خێوکردن ئه‌وه‌نده سازو گونجاو بوو، سه‌رنجی دانیشتوانی شاریشی بۆ نیشته‌جێ‌بوون تێ‌دا راده‌کێشا بۆیه له چله‌کان دا ده‌سته‌یه‌ك له عه‌ره‌بی گامێشه‌وان به ئاره‌زووی خۆیان هاتنه شاره‌زوور وه نیشته‌جێ‌بوون به چه‌شنێ رێزیان لگیراو و تێکه‌ڵی دانیشتوان بوون که تۆزی غه‌ریبیان پێوه نه‌ما. که ئه‌مرۆ مه‌گه‌ر هه‌ر ناوه‌که‌یان که پێیان ده‌ڵێن عه‌ره‌به‌کان له‌گه‌ڵ دانیشتوانی‌تردا جیایان بکاته‌وه.

بازرگانه‌کانی سلێمانی به پاره‌دان به جوتیارو به کرینی ده‌غلودان و لۆکه‌و خوری‌و چه‌ڵتوك... هتد. به کرێ‌گرتنی ئه‌م دێ‌و ئه‌و جۆگه‌و ئه‌و کۆمه‌ڵه دێیه له به‌گزاده‌کانی جاف به سالآنه بزووتنه‌وه‌ی کشتوکاڵی خسته پله‌و پایه‌کی پێش که‌وتووی به‌رزه‌وه. حاجی ئه‌حمه‌دی کریم ئاغا له‌م کاره‌دا ده‌وری بریتی بوو له پاره‌دان به جوتیاران به کرینی لۆکه‌و خوری‌و ناردنی بۆ موصل و به‌غداد.

به‌ڵام له‌سه‌ر هه‌موو بازرگانه‌کانی سلێمانیه‌وه میرزا تۆفیق قه‌زارز وه‌کو بازرگانێکی کورد په‌روه‌ری هاوچه‌رخ ده‌وری تایبه‌تی له وریا کردنه‌وه‌ی دانیشتوانی شاره‌زوورو ئاوه‌دان کردنه‌وه‌و پێش که‌وتنیان دا نواندوه.

به‌م چه‌شنه گۆرانی داماو گره‌وی سه‌رکه‌وتنی له کۆچه‌ری ده‌سته‌ڵات دار برده‌وه‌و گزنگی ئاوه‌دانی‌و شارستانی بێشه‌ڵانی شاره‌زووری دواکه‌وتوی رووناك کرده‌وه.

**سه‌رچاوه‌کان:**

١ - رۆژنامه کۆنه‌کانی کوردی هه‌ر له (ژیانه‌وه) تا (ژیان) له ساڵی ١٩٢٤ تا ١٩٣٩ به تایبه‌بیتی.. ئه‌و به‌شه‌ی که په‌یوه‌ندی به عه‌شیره‌تی جافه‌وه هه‌یه که پیره‌مێردی نه‌مر نوسیویه‌تی، وه‌هه‌ر ئه‌مه‌شه یه‌که سه‌رچاوه‌ی باسه‌که‌م و به پێویستم نه‌زانی هه‌رسات ده‌ست نیشانی ئه‌م سه‌رچاوه‌یه پیره‌مێرده بکه‌م.

# لمحة عن حال منطقة شهرزور في نطاق مرحلتين

غفور ميرزا كريم

مرّت البشرية خلال تأريخها الطويل بالصراعات والتناقضات العنيفة والشديدة بين فئاتها وأصنافها وطبقاتها، وما الصراع القديم المستحكم بين البدو والحضر أو بين فئة الرعاة والصياديين وبين القرويين (أي المزارعين) الّا وجهاً من وجوه هذا الصراع. وكأن الصراع ميراث قابيل وهابيل الذي يحلل بعض العلماء الصراع بينهما على أساس الصراع بين الرعاة والمزارعين الذي انتصر في حلبته الفلاح «الفئة الاكثر تقدماً» على الراعي.

وحسبنا ان نتطرق في هذا البحث الصغير الى الصراع بين فئة الرحالة وفئة ساكني القرى والمزارعين في مرحلة تاريخية محدودة وفي منطقة شهرزور بمحافظة السليمانية. ونعني به الاحتكاك والمماحكة بين العشائر الكردية التي تقوم برحلة الشتاء والصيف وتعيش على موارد قطعاتها من المواشي والاغنام وبين ساكني القرى الذين يعتمدون في عيشهم على الموارد الزراعية.

أن عشيرة جاف التي كانت تقدر نفوسها بـ (١٨) ألف عائلة وثلاثين فخذاً كانت تقوم برحلة دائمية من قلعة شيروانة الكائنة في قضاء كلار الى جبال بنجوين و سنه وكرماشان، حيث تقدر مسافة طريق رحلتها بأكثر من ١٣٠ ميل.

وكانت تمرّ في منطقة شهرزور حيث يصيب سكانها من وطأة رحلة هذه العشيرة الأذى والضرر. وكانت شهرزور تعتبر مرعىً طبيعياً لهذه العشيرة حيث لم يكن يزرع فيها بساتين الفواكه ولاتستثمر أراضيها الخصبة للزراعة الّا في حدود ضيقة، ويرزح ساكنوا قراها تحت وطأة الأمراض المتفشية من جرّاء وجود المياه الراكدة بالأضافة الى خوفهم الدائم من أذى رحيل هذه العشيرة.

ونتيجة تطور الأوضاع العالمية وتفكك النظام الأقطاعي في الدولة العثمانية وتشكيل الحكومة العراقية وربط الاقتصاد العراقي بالأقتصاد العالمي تفكك النظام العشائري، حيث إرتضى بعض رؤساء عشيرة الجاف بالسكنى في الحواضر والأضطلاع بمسؤولية الأدارة الحكومية في المحافظة، وجنحت العشيرة شيئاً فشيئاً الى التوطن فعمروا القرى وأخذوا يزرعون الأراضي فأصبحت شهرزور منطقة عامرة بالزراعة واشتهرت بزراعة القطن والكتان والحبوب والفواكه، وانتصر الحضر (أو ما يسمون بالگوران) على الرحل وتغيرت معالم شهرزور.

وقد لعب المثقفون الكورد والشعراء وفي مقدمتهم (بيرەميرد) دوراً مهماً في بث الوعي الحضاري بين الشعب في هذه المسيرة التاريخية.

# چەند شاعیری کورد "شیرین و خوسرەو"یان داناوە؟

محمد علی قەرەداغی

داستـانی (شیـرین و خوسـرەو) یان (شیـرین و فەرهـاد) داستانێکی کۆنی مێژوویی‌یەو، بۆ پێش لە چواردە صەدە دەگەڕێتەوە. ئەم داستانە لە لایەن (نیظـامی گەنجـەوی)یـەوە بە فارسی‌و بە شیعـر دانراوە. لە کوردستانیشدا لە لایەن چەند کەسێکەوە ئەم داستانە بە شیعر دانراوە.

ئەوەی من بزانم تا ئێستە باسی ئەوە نەکراوە کە چەند کەسی لە کوردان ئەم داستـانـەیـان بە زمـانی کوردی نووسیـوە. ئەوەی بە شێوەیەکی تێروتەسەل لە بەردەستمـانـدا بێت (شیـرین و خوسـرەوە)کـەی خانای قوبادی‌یە کە مامۆستا محمدی مەلا کریم ساغی کردوەتەوەو، فەرهەنگی بۆ ڕێك خستوەو، پێشەکی بۆ نووسیوەو لە ساڵی (١٩٧٥)دا لە بەغدا چاپ کراوە.[1]

هەروەها هەمان داستان ساڵی (١٣٤٨)ی هیجری شەمسی بە کۆششی موراد ئەورەنگە چاپ کراوە.

لە نوسخەکەی کاکە حەمەدا کە لە بەردەستماندایە باسی ئەوەی نەکردوە کە چەند شاعیری کورد شیرین و خوسرەیان داناوە، هەروەها ـ دیارە کە پێی نەزانیـون ـ باسی ئەوەیشی نەکـردوە کە چەنـد کەس پێش ئەو لەگـەڵ ئەم داستانەدا خەریك بوون و چاپیان کردوە.

نوسخەکەی موراد ئەورەنگیش دوورەدەستەو نەمتوانی بیبینم تا بزانم چی تیایەو باسی چی کردوە. لەبەر ئەمە بە هەوڵ و کۆششی خۆم و ئەو مامۆستاو دۆست و برادەرانـەی یارمـەتی‌یـان دام دەستم دایـە وەڵامی ئەم پرسیـارە کە: (چـەنـد شاعیـری کورد شیـرین و خوسـرەویـان دانـاوە؟) کاتێ کە بیـر لەوە بکـەینـەوە کە تەمـەنی ئەم ڕووداوە لە هەزارو چوارصـەد ساڵ زیـارتـرەو، کارەسـاتـەکـانی لە کوردستـانـدا ڕوویـان داوەو، شوێن پەنجـەی فەرهـادو. بیستـوون و تاقـەوسـان لە بەرچـاوی گەلی کوردایـەو، زۆر لە شاعیـرانمـان سەریان لەو دەسکارە ڕەنگینە داوەو، لەوانەیە هۆنینەوەی ئەو داستانە بووبێ بە مەیـدانی پێشبـرکێ و کێ‌بـەرکێ‌و هەر شاعیـرێـك ویستبێتی بنـاسـرێ خۆی کوتابێتە ئەو مەیدانەو ئەسپی بیرو قەڵەمی خۆی تێدا غاردابێ.. ئەوا بیرمان بۆ ئەوە دەچێ کە وەڵامی ئەم پرسیارە هەروا بە سانایی نادرێتەوەو لەوانەیە دوای پشکنین و گەڕان و مانـدوبـوونی زۆریش هێشتـا هەر وەڵامـەکە نیوەچڵ بێت. بەڵام هەرچـۆن بێت من لێـرەدا یەکـەم کەس بەم شێـوە لە دەرگـای باسـەکـە دەدەم و بەوەی بۆم بلوێ‌و بەدەستمـەوە بێت دەچمـە ناو باسـەکـەو سەرنجی خوێنـەرانی بۆ لا ڕادەکێشم بەڵکـو لە داهـاتـوودا باسـەکـە فراوانتـر بکرێت و وەڵامەکە ڕاست و ڕەوانتر بدرێتەوە.

## چۆن کەڵکەڵەی ئەم باسە کەوتە مێشکم؟

لە مێژووی ١٩٨٦/٢/١دا برای بەڕێزو ئەدەب دۆستم مامۆستا فاضیل مەجید سیامەنسووری ـ کە تا ئێستە خۆیـم نەدیوەو بە دیداری شاد نەبووم ـ لە ڕێگەی دۆستی هەردو لامان مامۆستا شێخ حسەین بەرزنجی‌یەوە لەگەڵ نامەیەکدا چەند پەڕە دەسخەتی کۆن و شڕی بۆ ناردم کە ـ وەك باسیان دەکەم ـ شیعری کوردی بوون و باسی شیرین و خوسرەویان تێدا بوو.

دوای ئەوەی نامـەکـەم خوێنـدەوەو چاوێکم بە پەڕەشـڕەکـانـدا گێڕا یەکەم هەنگاو نام ئەوە بوو هاتم ئەو شیعرانەم لەگەڵ دەقەکەی (خانای قوبادی)دا کە مامـۆستـا محمـدی مەلاکـریم ساغی کـردوتـەوەو بڵاوی‌کـردوتـەوە... بەراوردکرد. لەمەوە بۆم دەرکەوت دوو دەقی جیاوازن و هەریەکەیان بەرهەمی دانەرێکە. لە بەر ئەوە کەوتمە بیری ئەوە بە گوێرەی توانا بگەڕێم و بکەومە سەرو سۆراخی نوسخەیەکی ترو دۆزینەوەی خاوەنی ئەم نوسخەی مامۆستا فاضیـل سیـامـەنـسووری‌یە. بەڵام هەرچەند هەوڵم داو چەند گەڕام تا ئێستە نەگـەیشتـومـەتـە ئەنجـامێکی ئەوتـۆ. بەڵام گەڕان و هەوڵـدانەکەم بێ‌سوود نەبـوور، ئەوەنـدەم زانیـاری هەڵکـران کە شیـاوی ئەوە بێ لێـرەدا بیخـەمـە بەردەستی خوێنـەران. بەڵکـو هانـدەری ئەوە بێت ئەوانیش ـ لەمـەولا ـ لە عاستی خۆیانەوە زیاتر وەخۆ کەون و کارێکی وا بکرێ بە کۆششی هەموان شتێك بەشتێك بکرێت.

پێش ئەوەی بەراوردی نێـوان دەقـەکـان بکـەم، یان دەست بە نووسینی دەقەکە بکەم چەند زانیاری‌یەکی سەر بەباسەکە لێرەدا تۆمار دەکەم:

یەکـەم: ئەم دەقـەی مامـۆستـا فاضیـل جیـاوازی زۆری لەگەڵ دەقەکەی

ـ عكردنەوەو فەرهەنگ بۆ ریکخستن و پێشەکی بۆ نووسینی محمدی مەلا ...ریم. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.

(٢) مامۆستا حوزنی لە پتر لە (١٣) ژمارەی دەنگی گێتی تازەدا ئەم ...ستانەی بلاوکردوەتەوە، من لە ئەلقەی سێیەمەوە دیومە، ئەم ئەلقە لە ژمارە: (١)ی بەرگی (٢٦)ی سالی سێیەم. (١٩٤٥)ەوە دەست ...ی ئەکات.

(٣) شیرین و فەرهاد بە کوردی، ١ ـ نشرەی دەنگی گیتی‌ی تازە، ١٩٤٦، چاپخانەی معارف ـ بغدا.

(٤) بروانە: نەشرەی دەنگی گێتی تازە ل: ١٩.

(٥) کە دەڵێ: (هەرسێ ها . . .) رەنگە هەڵەبێت، یان بەیتێ کەوتبێ؛ چونکە هەر باسی بازیبەندو گوارە کراوە.

(٦) بروانە: دەنگی گێتی تازە، ژمارە: ٣، بەرگی: ٥، سالی ١٩٤٥ ل: ٢٦.

(٧) بروانە: نەشرەی دەنگی گێتی تازە، ل: ٢٢.

(٨) بروانە: مشاهیر کرد ل: ٢٢٩.

(٩) بروانە: نەشرەی دەنگی گێتی تازە، ل: ٨.

(١٠) بروانە: شیرین و خوسرەو، ل: ٦.

(١١) بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە لە دەسخەتی کۆندا بۆ (جیم) بە زۆری (ج) دەنووسن و کە (جم) بوو بۆ (جەم) زیاتر دەست دەدات تا جیم.

(١٢) بروانە: شیرین و خوسرەو، ل: ٣٦٩.

(١٣) بروانە: نەشرەی دەنگی گێتی تازە ل: ٨

(١٤) بروانە: دەنگی گێتی تازە، بەرگی ٢٦، مارتی ١٩٤٦. ل: ٤٠٧.

(١٥) بروانە: شیرن و فەرهاد، دانەر خانای قوبادی، چاپی سێیەمین، چاپخانەی کوردستان هەولێر، ٢٥٨٣ی کوردی، (١٩٧٣) ل: ٦، هەروەها نشرەی دەنگی گێتی تازە، ل: ٣.

(١٦) بروانە: إقتران النيرين في مجمع البحرين، دانراوی مامۆستا مەلا رەشیدبەگی بابان، لێکۆڵینەوەی محمد علی قەرەداغی، بەرگی سێیەم، ل: ٥٣، چاپخانەی (آفاق عربية).

(١٧) ئەمە سەرەتای لاپەرەیەکی دەسخەتەکەیەو، ئاشکرایە ئەم سەرەتایە ناتەواوەو نازانرێ لە پێش ئەمەوە چەندی لەناوچوە.

(١٨) عاشق بوونی شیرین بۆ فەرهادو ناردنی بە دوای فەرهادا.

(١٩) لێرەدا وەك ئەوە وایە کەوتن و دوویات بوونەوەی نیوەبەیتێك هەبێت.

(٢٠) ناردنی خوسرەو بە شوێن فەرهاداو مەرج بەستنی لەگەڵیا.

(٢١) سێ بەیت لەم شوێنەدا بوو باش نەدەخوێنرانەوەو بۆ نووسینیش نەدەگونجان؛ بۆیە بواردمن.

(٢٢) هەر وەك سەرەتاکە ناتەواو بوو ئەم دواییەیش ناتەواوە.

## خلاصة البحث

# كم شاعرا كرديا ألفوا قصة (شيرين وحسرو)؟

**محمد علي القرەداغي**

**منذ بزوغ فجر الاسلام ظهرت قصة مثيرة في مضمونها وأحداثها ونتائجها، وتناول هذه القصة عدد من الشعراء. ومن بين من تناولها شعراء أكراد. وقد نشرت إحدى هذه القصص، أو أحد هذه المؤلفات من قبل المجمع العلمي الكردي. وعثرت عن طريق أحد الاخوة على نص غير منشور لأحد الشعراء الأكراد تناول فيه هذه القصة. فبحثت عن مؤلفه، ونسخ أخرى له بيد أني ـ الى الآن ـ لم أظفر بشيء. إلا أني وصلت الى نتيجة أخرى،**

**وهي: أن عدداً غير معروف من الشعراء الكرد جربوا أقلامهم وأدلوا بدلوهم في هذا الميدان، لكن لم أجد من حاول معرفتهم وعددهم. فسألت السؤال الذي بدأت به بحثي هذا، وحاولت الاجابة عنه جهد استطاعتي.**

**فوصلت الى أن ثلاثة ـ على الأقل ـ من الشعراء الأكراد نظموا هذه القصة باللهجة الگورانية وهم:**

**١ ـ خاناى قوبادي، الذي نشرت قصته من قبل المجمع العلمي الكردي سنة (١٩٧٥).**

**٢ ـ ملا ولدخان الذي لم يتيسر لمؤلفه ـ الى الآن ـ أن ينشر.**

**٣ ـ مؤلف النص الذي نشرته خلال بحثي هذا، إلا أن النص ناقص، ومؤلفه مجهول.**

**كما أن شعراء آخرين، حولوا هذه القصة الى اللهجة السورانية منهم:**

**١ ـ علي كمال باپير آغا، وقد طبع مؤلفه مرتين، مرة تحت اسم (شيرين وفرهاد) سنة (١٩٥٦م)، ومرة تحت عنوان (شيرين وخسرو) سنة (١٩٥٧م).**

**٢ ـ حبيب علي ميراني، ورجل آخر لم يشأ المرحوم گيو موكرياني وحبيب علي ميراني أن يعرف.**

# تۆژینەوەیەك دەربارەی

مصطفی نەریمان

# گۆڤاری دەنگی گێتیی تازە




## پێشەکی

لەوساکەوە زمانی کوردی ئەونوەتە سەرکاغەزو ڕێی چاپخانەی گرتوەتەبەر، بەسەریەکەوە نزیکەی سەد ڕۆژنامەو گۆڤارمان دەرچووە. لەو لێکۆڵینەوە فراوانە بەولاوە کە ڕۆشنبیری بەتوانا دکتۆر (کەمال مەزهەر ئەحمەد) لەسەر ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) کردبووی تائێستا کەسی تر لەسەر هیچ کامێك لەو بلاوکراوانە لێکۆڵینەوەیەکی مام ناوەندیشی نەکردووە.

بەڵێ نووسەران (د. کەمال فوئاد) خوالێخۆشبوو علاءالدین سەججادی، د. عزالدین مصطفی ڕەسوڵ، جەبار جەباری، جەمال خەزنەدار، هەریەکەیان لەسەر ڕۆژنامە، یان چمکێك لە ڕۆژنامەنووسی دواون و نووسیویانە بەڵام هیچ یەکێکیان خۆیان نادەن لەشان ئەو خزمەتەی کە (دکتۆر کەمال مەزهەر) کردوویەتی، بەوەی، ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)بۆ خوێنەران ڕوون کردەوەو ...ی دەربڕیوە ئەو ڕۆژنامەیەی کە سوپای بەریتانی داگیرکەر بۆ مەرامی خۆی بە کوردی بلاوی کردبووەوە لە سنووری خۆیدا توانیویتی خزمەتی ئەدەب و مێژوو و وشەی کوردی بکات.

ئێمەش لەم تۆژینەوەیەدا لە گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە) دەدوێین کەلە چلەکان دا تاماوەیەك بالیوزخانەی بەریتانیا بۆ مەرامی پروپاگەندە بلاویان دەکردەوە، توانیمان ئەوە بسەلمێنین کە ئەم گۆڤارە کۆمەڵێك لە نووسەرو ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە ئەو نووسەرو ئەدیبانە توانیویانە خزمەتێکی باش بە ویژەو مێژووی کورد بگەیەنن.

### ئاستی ڕۆشنبیری کوردی پێش چلەکان:

لە بیستەکان دا چاپخانە گەیشتە کوردستانی عێراق و دەست کرا بەچاپ کردنی ڕۆژنامەو بلاوکردنی کتێب، (پێشکەوتن) یەکەم ڕۆژنامەیە کە لە ساڵانی (١٩٢٠ - ١٩٢٢) سەدو چل و چوار ژمارەی لە سلێمانی چاپ کراو لە کوردستان بلاوکرایەوە، (مێجەرسۆن) ئەم ڕۆژنامەیەی لە سلێمانی دامەزراند تاوەکو جێ‌و شوێنی (تێگەیشتنی ڕاستی)بگرێت، لە حوکمرانی شێخ مەحمودی

ئەمردا ڕۆژنامەکانی (بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان و ئومێد ئیستقلال و بانگی حەق) دەرچوو، پاش ئەوەش هەر لە سلێمانی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) دەرچوو لەوەولا ئەم ڕۆژنامەیە بوویە (ژیان).

لە ڕەواندزیش ڕۆژنامە نووس و مێژوونوس و ئەدیبی بەناوبانگی کورد (حوزنیی موکریانی) (١٨٨٦ - ١٩٤٧) لەماوەی سالآنی (١٩٢٦ - ١٩٣٢) بیست و چوار ژمارەی لە گۆڤاری (زاری کرمانجی) چاپ کرد، هەر لە بیستەکان دا لەبەغدا، یەك ژمارە لە گۆڤاری (پەیژە) لەلایەن (مصطفی شەوقی)یەوە دەرچوو شانزدە ژمارەش لەگۆڤاری (دیاری کوردستان ١٩٢٥ - ١٩٢٦) لەلایەن (صالح زەکی صاحبقەرانەوە) دەرچوو، ژمارەی کتێبە کوردی‌یە چاپ کراوەکانیشیان لەم ماوەیەدا (٢٣)کتێب بوون بەقەوارەی (١٠٩٣) لاپەرە.

لە سی‌یەکان دا بزووتنەوەیەکی ڕوشنبیریی کوردی سەری هەڵ دا، یانەی سەرکەوتن دامەزرا، محمد ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠ - ١٩٤٨) دوو بەرگ لە مێژووی کوردو کوردستانی داناو حسێن حوزنی‌ی موکریانیش زنجیرەیەك کتێبی لەچاپ دا (کوردی‌و مەریوانیش) لە بەغدا دوانزدە کتێبیان پێشکەش کرد، بەکورتی بیلێین لە سی‌یەکان دا (٧١) کتێبی کوردییان بە قەوارەی (٥٨٢٣) لاپەرە لەچاپ دراو بلاوکرایەوە. لە گورەپانی ڕۆژنامە نووسینیش دا پیرەمێردی نەمر (١٨٦٧ - ١٩٥٠) جڵەوی ژینی گرتە دەست و بوویە ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی ئەدەبی. لە هەولێریش گۆڤاری (روناکی)لەلایەن پارێزەر (شیت مصطفی)وە لە سالآنی (١٩٣٥ - ١٩٣٦) یانزدە ژمارەی لێ‌دەرچووە لە دوا مانگی دوا سالی سی‌یەکان ئەستێرەی گۆڤاری (گەلاوێژ) لە کەل هاتە دەرو تا سالی ١٩٤٩ واتە دە سالی تەواو خزمەتێکی یەك جار تەواوی وێژەو مێژووی کوردی کرد.

لەدوا سالی سی‌یەکان دا ئاگری شەڕی دووەمی جیهان هەڵ گیرساو پزیشکی ئەو ئاگرە سەرانسەری جیهانی گرتەوەو کاری کردە سەر ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕوشنبیریی هەموو گەلان بە جۆرێك ژمارەی کتێبە کوردی‌یەکانیان لە چلەکان دا نیواو نیو زیاتر هاتە خوارەوەو لەو سالآنەدا (٤٢) کتێبیان بۆ چاپکرا بە قەوارەی (٢٧١٤) لاپەرەو لە ڕۆژنامە نووسینیش دا ئاگری شەڕ کاری نەکردە سەر (ژین و گەلاوێژ)و گۆڤاری (دەنگی گیتی‌ی تازە) شیان هاتە دنیاوە.

## ئەو هەل و مەرجەی کە دەنگی گیتی‌ی تازەی تێدا لە دایك بوو:

شەڕ بوو، شەڕێکی جیهانی توندو تیژو سامناك بوو، ئەورووپا بەرامبەر تەوژمی هیتلەری نازی هەرەسی هێنا، لەماوەی یەك دوو مانگ دا ئەلمانیای هیتلەری لە ئەورووپاوە تەکانی‌داو ژۆروی ئەفەریقاشی گرت لە ئەورووپاشەوە سنووری یەکێتیی سۆڤیەتی شەق کردو گەیشتە قەوقاس، ئەم ڕۆژهەلآتی ئێستای خۆمان کەوتبووە ناوەڕاستی دوو کەڵپەی هیتلەرەوە، لە بەرلینەوە (یونس بەحری) هاوارو هەڕەشەی دەکرد کە بەم نزیکانە سوپای ئەڵمان شام و بەغدا دەگرێ، بەرەی فاشیستەکان بریتی بوون لە دەوڵەتانی (میحوەر - تەوەرە) کە (ئەڵمان وئیتالیاو ژاپۆن) بوون، بەرەی جیهانی دیموکراتیەت ریزی خۆیان قایم کردو دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیان دروست کردو بریتی‌بوون لە (ئینگلتەرە، یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا)، سوپای ئەم سێ دەوڵەتە لەگەڵ میللەتە ئازادیخوازەکانی گیتی ریزی خۆیان سفت و پتەوکرد بۆ ئەوەی مێردەزمەی فاشیەت بڕوخێنن. بەرامبەر ئیستگەی بەرلین، لەندەن و مۆسکۆ هاواریان دەکرد، لەو حەلەدا لە شاری (یافا)ی فەلەستین ئیستگەی (شرق الادنی) دانرا، هاوپەیمانەکان دایان مەزرانـد بەعەرەبی دژی (بەرلین و باری) پروپاگەندە بکات هەر لەو هەل و مەرجەیش دا، سێ نووسەری کوردپەروەر (عبدالله گۆران ڕەفیق چالاك، ڕەمزی قەزاز) گەیشتنە (یافا)و لەوێ ئیستگەی کوردستانیان دانا کە بەشێك بوو لە (شرق الادنی) بەڕاستی ئەو سێ ڕۆشنبیرە دەنگی وشەی کوردی‌یان بەگوێی کوردانی جیهان دا بلاوکردەوەو پڕ بەهەردوو گوێیان لێرەو لەوێ دەمان بیستەوە، هەر لەوکاتەیش دا نیشتەجێی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەبەغداد (بالیوزخانەی بەریتانی) گۆڤاری (دەنگی گیتی‌ی تازە)یان دەرکرد، ئەم گۆڤارە بەو ناوەوە چوار سالێك دەرچوو، دوو سالی ئەووەڵی یەك مانگی بوو، ئنجا بوو بە گۆڤارێکی هەفتەیی.

## چی‌لەسەر (دەنگی گیتی‌ی تازە) نوسراوە:

١ - خوالی‌خوشبو مامۆستا (علاءالدین سەججادی ١٩٠٨ - ١٩٨٤) ڕۆژنامەنوس و ئەدیب کە هەڤالی نوسەرانی دەنگی گیتی‌ی‌بوو ئاگای لە دەرچونی ئەو گۆڤارە بوو لە کتێبی (مێژوی ئەدەبی کوردی)دا دەربارەی ئەم گۆڤارە نوسیویتی دەڵێت (گۆڤارێکی پەیامی‌و ئەدەبی بووە، بالیوزخانەی بەریتانیا لە بەغداد دەری‌کردووە، سەرەتا

بڵاوکەرەوە بووە، لە پاشا بە وێنەی گۆڤار، یەکەم ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ دەرچووە، تۆفیق وەهبیو سەید حسێن حوزنیی موکریانی سەر نوسەری بوون، لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٤٧ بەو لاوە ئیتر دەرنەچوو)[٣].

٢ ـ کاك (جەمال خەزنەدار)یش دەربارەی ئەم گۆڤارە نوسیوێتی دەڵێت (گۆڤارێکی مانگی وێنەدار بووە، لەلایەن باڵیوزخانەی بەریتانی لە بەغداد دەرچووە، ژمارە یەکی لە نیسانی ساڵی ١٩٤٣دا دەرچووە، هەتا ساڵی ١٩٤٧ بەردەوام بووە)[٤].

٣ ـ مامۆستا (جەبار جەباری)یش نوسیوێتی دەڵێت (گۆڤارێکی ئەدەبی وێنەدارە بەشی پەیوەندی لە باڵیوزخانەی بەریتانی لە بەغداد دەری دەکرد، ژمارەیەکی لە تشرینییەکەمی ساڵی ١٩٤٣دا دەرچوو، زانـا تۆفیق وەهبیو حسێن حوزنی موکریانیو شێخ حسێن و کەسانیتر بەشداریان لە نوسینیان دا دەکرد، بەرێك و پێکی ٢٤ ژمارەی لێ دەرچوو، لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ بووبە گۆڤارێکی یەك هەفتەییو سیو پێنج ژمارەی بەم جۆرە لێدەرچوو لەوە بەولاوە قەوارەی رۆژنامەیەکی هەفتانەی وەرگرت و لە تشرینییەکەمی ١٩٤٦ تا ٢٥ ئابی ١٩٤٧ سیو چوار ژمارەی لێ دەرچو، ئنجا بەکیکەوت، ئەم گۆڤارە لە کوردستان دا بەفراوانی بڵاو دەکرایەوەو ژمارەکانی دەگەیشتنە کوردستانی ئێرانیش هەرچەندە ئەم گۆڤارە بۆ ئەوە دانرابوو پروپاگەندە بۆ لایەکی ئیستعماری بکات کەبە ئاگرو ئاسن حوکمی عیراقیان دەکرد، لەلاپەرەکان دا پارچە شیعرو مێژوو چیرۆکی کوردیو بابەتی وەرگێراو هەبوو) تێبینی: ئەم زانیارییانەم لە ئەدیب گیوموکریانی وەرگرت کە برای خواڵێخۆشبوو حوزنیی موکریانییەو زۆر رێزو سوپاسم بۆی هەیە[٥].

٤ ـ دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەدیش لە کتێبی (تێگەیشتنی راستی)دا دەربارەی ئەم گۆڤارە نوسیوێتی دەڵێت (دەنگیگێتی ـ بەغداد ١٩٤٣، سەرەتا لە نیسانی ١٩٤٥ وەك پەخشە دەرچوو لە تەشرینی هەمان ساڵ بوویە گۆڤار تا ساڵی ١٩٤٧ ژیا، لەگەڵ ئەوەش دا کە ئنگلیز بۆ کاری پروپاگەندەی خۆیان لە ساڵەکانی شەری دووەمی جیهانیدا دەریان دەکرد بەڵام پڕە لەوتارو بەرهەمی ئەدەبیو زانستی بایەخدارو لەژێر ناوی گۆڤارەکەدا نوسراوە: ئەدەبی، خوێنەواری زمان، اجتماعی، پەیامی هەفتەیی کوردییە. قەوارەی ٢٣×٢٨ سم

ئەمە چل و پێنج ساڵە بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارەدا تێپەریوە، ئەم ماوەیە ئەوەندە دوورە وەخت نییە کە لە پشکینی سەرچاوەکان دا خۆمان زۆر ماندوو بکەین، هەندێ لەو کەسانەی کە لە لاپەرەکانی ئەم گۆڤارەدا بەرهەمیان بڵاو دەکردەوە هێشتا لەناومان دا ماون و دەژین، من خۆم وەك یەکێك لەو نوسەرانە کە لە پلەی دووەمی ئەم گۆڤارەدا بە شداریم کردووەو نزیکەی دەدوانزدە ماددەم تێدا بڵاوکردوەتەوە، بەئەرکی سەرشانی دەزانم ئەم توژینەوەی لە سەر بڵاوبکەمەوە بەهیوای ئەوەی ئەگەر بۆم لواو تەمەن بەدەمییەوە هەبوو لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل لەسەر (گەلاوێژو دەنگیگێتیی تازە) بڵاوبکەمەوە.

## ئێوەو دەنگیگێتیی تازە:

به بۆچوونی من ئەم گۆڤارە بەدوو پلەدا تێپەریوە.:

پلەی یەکەم:

بەشی پەیوەندی لە باڵیوزخانەی بەریتانیا لە بەغداد بۆ پروپاگەندەی شەر دژی تەوەرەکان لە تەشرینی یەکەمی ١٩٤٣دا ژمارە (١) ی بەرگ (١) ئەم گۆڤارەی دەرهێنا (بڕوانە وێنەی بەرگ ژمارە ـ ١ ـ)و لە ناوەوەی یەکەم ژمارەیدا بەم شێوەیە (باڵیوزخانەی بەریتانیا) ئامانجی دەنگی گێتیی تازە. ئەم گۆڤارەیان روون کردوەتەوە (بەناوی بینای چاوان. ئامانجی دەنگی گێتیی تازە. بڵاوکردنەوەی ئاگای راستە لە بارەی هەموو کردارو قەوماوێکی ئەم جەنگە گێتیگرەوە. ئەم گۆوارە زانیاری بڵاو ئەکاتەوە لە بارەی ئەو کۆششە جەنگیە مەزنە بێ مانەندانەوە کە نەتەوە دیموکراتیەکان بۆی تێئەکۆشن کە وەکو ئازادیو بەختیاریو خوێندەواری مەردومە.

ئەم گۆوارە بەشێ لە لاپەرەکانی تەرخان ئەکا بۆ زانیاری دیریك و یاسا بۆ پەندی پێشینان، شعر، ئەدەبیات، داستان، ستران، چیرۆك و گۆرانی کەڵکی بەرزکردنەوەی خوێندەوارییان هەیە، لەگەڵ ئەوەشا تێئەکۆشێ بۆ بەرزکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیو شارستانێتیو زانیاریش بڵاوئەکاتەوە بۆ چاك کردنی تەندروستیو کشتوکاڵ و ئابوریو بازرگانی، ئیتر خواپشتیوان بێ.»

## لکی بڵاوکردنەوەی دەنگ و باسی کوردی
## لە مودیری پەیوەندی گشتی باڵیوزخانەی بەریتانیدا
## لەبەغدا

لە ئامانجی دەنگی گێتیی تازەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پاڵ پشتی نەتەوە دیموکراتییەکانە لەم جەنگە جیهانییە مەزنە کە دژی

دشیست بەرپابووەو لەپێناوی ئازادیو بەختیاریو خوێندەواریدا تێئەکۆشێت و بەشێك لە لاپەڕەکانی بۆ ویژەو مێژوی کوردی تەرخان کردووە.

دەنگی گێتی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤دا پێی نایە ساڵی دووەمییەوەو ژمارەیەکی ساڵی دووەمی بەم پێشەکییەوە دەستی پێکرد بەم ژمارەیە گۆواری دەنگی گێتیی تازە پێ ئەنێتە ساڵی دووەمیەوە. دەنگی گێتیی تازە بۆ پێك هێنانی ئەو ئامانجەی لە پێشەکی ساڵی یەکەمیدا دایناوە بێ ووچان تێکۆشی، دەنگی گێتی تازە لەبارەی نگای ئەم جەنگە گێتی گرەوە هەرچی ڕاست بو ئەوەی بلاوکردەوە بۆ بەرز بونەوەی گیانی دیموکراتیو روون کردنەوەی مرۆڤ لە گێتیی تازە لە ساڵی یەکەمیا ئاوێنەی پیرۆزی گەورە گەورەی سپای دادی دیموکراسی بو. گۆوارەکەمان پشت بەخوا لەناو ساڵی دووەمیدا دانگی موژدەی پیرۆزی ئەنجامی رائەهێلێ.

دووساڵ ئەم گۆڤارە لە بالیۆزخانەی بەریتانیاوە دەردەچوو، ساڵی یەکەمیان بەقەوارەی گەورە (١٦×٣٢ سم) ساڵی دووەمیان بەقەوارەی مام ناوەندی (١٦×٢٤ سم)، ساڵی یەکەم دوانزدە ژمارەی لێدەرچوو لاپەڕەی هەر ژمارەیەکیان (٤٨)بوو واتە بەسەریەکەوە ساڵی یەکەم (٥٧٦) لاپەڕەی دەرچوو ساڵی دووەمیان دیسانەوە دوانزدە ژمارەی لێدەرچوو، لاپەڕەی هەر ژمارەیەکیان (٩٦)بوو، بەسەریەکەوە ساڵی دووەم (١١٥٢) لاپەڕەی لێدەرچوو. دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت کەهەر شەش ژمارەی ساڵێکیان ژمارە بەرگێکی لە سەر دادەنرا واتە لەم چوارساڵەدا (٢٤) ژمارە لە چواربەرگ و بە قەوارەی گشتی (٥٧٦+١١٥٢= ١٧٢٨ لاپەڕە)بوو.

لەم دوو ساڵەدا ئەم نووسەرانە بەرهەمیان زۆر بلاو بوەتەوە (تۆفیق وەهبی، حسێن حوزنی موکریانی، شێخ حسنی شێخ حمە مارف).

هەر بەم هۆیەوە کە (دەنگی گێتیی تازە) پێی ناوەتە ساڵی دووەمییەوە گۆڤاری (گەلاوێژ) بەم چەشنە هەستی خۆی بەرامبەر ئەم گۆڤارەی دەستەخوشکی دەربڕیوە:

(بە پیرۆزیو سەربەرزی. بە خۆشیو بە گەشی گۆڤاری پڕنگاری دەنگی گێتیی تازە پلەی ساڵی یەکەمی بردەسەر، خەرامان خەرامان بەدڵێکیپڕ بەزم و بەزەمزەمەیەکی پڕ ئاهەنگەوە وا پێی نایە ساڵی دووەم، نالێن پێی نایە ساڵی دووەم!.. بگرە ئەڵێین لە مەعنویات و لە ئاگادارکردنەوەمان بۆ دەنگوباسی دەوڵەتی گەورەی بەریتانیاو هەمو جۆرە شتێ پلەی حەوتەوانەی پەی دەرپەی پەی کرد.. چون وا نیيە؟.. بە زمانی خۆشەویستی خۆمان بە هەمەتی دەوڵەتی بەریتانیاوە هاڵ و هەواڵی هەموو لایەکیان ئەخوێندەوەو بەزم و ڕەزم، شەڕو شوڕو هەڵس و کەوتی هەمو دنیامان بە هۆی نیگارەوە جوانەکانیەوە ئەبینی...)

زوربەی بەرهەمەکانی (تۆفیق وەهبی ١٨٩١ - ١٩٨٤) زمانەوانیو رامیاریو چیرۆك بووە، (دەستوری زمانی کوردی) بەزنجیرە نوسینێك تا دە ژمارەیەك لە سەری ڕۆیشتوە، هەروەها لە سەر وشەو زاراوەکانی (باکوور، نیوەڕۆ، پس پۆر، ئازاد، شارەزا) دواوەو شیکردنەتەوە، جگە لەمانە تۆفیق وەهبی چەند نوکتەو چیرۆکێکی بەتامی بلاوکردوەتەوە، وەك (بەختیارو بەدبەخت، ئەحەی کوڕنو. قەزای دیزە کەوت لە گۆزە)و ڕەخنەی لێگیراوەو وەڵامی ڕەخنەکەشی داوەتەوەو دەربارەی هاتنی مێجەرسون بۆ هەڵەبجە نوسینێکی نوسیوە. (حسێن حوزنی موکریانی) زوربەی نوسینەکانی دەربارەی (مێژوو، رامیاری، ئەدەبیو بابەتی وەرگێراو)بووە، دەربارەی (لورد بایرۆن و شکسپیرو سێر چۆن مالکولم و کەسانیتر) لە گۆڤارە میسرییەکانەوە کەرەستەی کردوەتە کوردی.

(شێخ حسن شێخ حمەمارف)یش نوسینەکانی (رامیاری، ئەدەبیو فولکلۆرو بابەتی وەرگێراو بوە).

جگە لەم سێ نووسەرانە ئەم نووسەرانە، کەم تا زۆر لەم پلەیەدا نووسینیان لەم گۆڤارەدا بلاوکردوەتەوە (عبدالمحسن هوشیار، فائق کاکەمین، عبدالقادر حیشمەت، بەکر دلێر، ناجي عەبباس، طاهر ئەحمەد حەویزی، محمد رشدی دزەیی، فاضل نظام الدین، ڕەفیق چالاك، شێخ سەلام، فەرەج عەلی قەرەداغی) لە مەیدانی شیعریش دا ئەم شاعیرانەمان شیعریان تیادا بلاوکردوەتەوە (ئەحمەد شێخ غەنی، ئەحمەد شوکری، ئەنوەر مائی، قانع، ملاحسن ملاقادر - شاهۆ -، زێوەر، مەدهۆش، وردی).

لەم پلەیەدا گرنگی دراوەتە کەلەپووری کوردیو دەربارەی ئەم شاعیرانە گەلێ نوسین و پارچە شیعرمان بەرچاو دەکەوێ (میرزا شفیع، مەلا مصطفای بێسارانی، پرتەو هەکاری، حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە، مهربان خاتون، فەقێ قادری هەمەوەند) هەروەها (داستانی قەلای (دمدم و لەپ زێرین و مەم و زین بە شێوەی موکری بەدورودرێژی بلاوکراونەتەوەو لەم دواییەدا وەك سەرچاوەیەی کەڵکیان لێوەرگێراوە.

ڕێنووسی کوردی لەم پلەیەدا چ لە گۆڤاری گەلاوێژ و چ لە دەنگی گێتیدا وەك یەك وابوون حەوت لەسەرو ژێری پیتەکان نەبوون و ئەم گۆڤارە لە لایەن زمانەوانییەوە هەوڵێکی زۆری داوە بۆ نووسینی کوری پەتی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرپەرشتیکردنی (زانا

تۆفیق وەهبی)و گەلێک وشەی وەك (باکوور، گێتی، هاوپەیمان، تەوەر، کۆمار، شالیار، سەمەرە، گەمارۆ، شادوت، نیگار پالو، شەوق هاوێژ، ئاسیب) بەرنامە، کارنامە، ئەورەنگ، دروشم هتد..

کەوتە زمانی کوردییەوە کە تا ئێستا هەندێکیان رەگیان داکوتاوەو بەکار دەهێنرێن.

لەم هەزارو حەوت سەدو ئەوەندە لاپەرەی دەنگی گێتیی تازە لە نزیکەی دووسەد لاپەرە زیاتر بەشی هاوپەیمانەکان و پشتگیری کردن لەو جەنگە مەزنە بێ‌مانەندەوە نەبوو،

## پلەی دووەم:

لە ساڵی چل و چوارەوە بەرەی فاشیەت گڵۆڵەیان کەوتە لێژیو سوپای ئەڵەمان لە شەرەکانیان دا بەرامبەر هاوپەیمانەکان خۆیان پێ رانەدەگیرا، لە ساڵی چل و پێنج نازی‌یەت بە جاری هەرەسی هێناو

شەریان دۆرانـدو نەتەوە ژێردەستە چەوساوەکان یەك لە دوای‌یەك کەوتنە خەبات بۆ ئازادی وەرگرتن، هاوپەیمانەکان کە سەرکەوتنیان وەدەس هێنا ئیشیان بە پروپاگەندەکردن نەما (ئێستگەی شرق الادنی) بە عەرەبی‌و کوردی‌یەوە داخراو هەرسێ رۆشنبیرەکانیان گەرانەوە، بالیۆزخانەی بەریتانی (نوێنەری هاوپەیمانەکان لەبەغداد (دەستیان لە (دەنگی گێتیی تازە) کێشایەوە، سێ کوردی دڵسۆزی وشەی کوردی (حـوزنیی موکـریـانی، محمـد بابـان، فائق تۆفیق) داوایـان لە (وەزارەتی ناوخـۆ - داخلیـە) کرد ماوەیـان بدات گۆڤـارێـك بەناو (دەنگی گێتیی تازە)وە دەربکـەن، وەزارەتی ناوخۆیش بەم نوسینە موافەقەتی لەسەر دەرکردنی ئەو گۆڤارە کرد:

(وەزارەتی داخلیە - ژمارەی - ١٤١٦

مودیریەتی دعایەتی گشتی رۆژی ١٩/٢٣/٤/١٩٤٥

مەوزوع - دەستوردان بۆ دەرهێنانی گۆوار

بۆ سید فایق تۆفیقی مەحامی.

ئەوا لەسەر خواستی خۆتان پایەبەرز وەزیری داخلیە بۆ دەرهێنانی گۆوارێك بەزمانی کوردی بەناوی (دەنگی گێتیی تازە»وە موافەقەتی کردووە، کە دەبێ مدیری مسؤول محامی محمد بابان بێ، جا تکا دەکـەین کە بەپێی ئەحکـامی قانـونی مطبـوعات و ئەو مراسمە کە بەندیوارە بە بڵاوکردنەوە بیزوون. مدیری دعایەتی گشتی

روونوسێ بۆ - وەزارەتی داخلیە - مدیری شرطەی گشتی.

متصرفیـەتی لواء بەغـدا. مدیـری لێ‌پرسینەوە بەپێی ئەم ئیجازە نامـەیـە پارێزەر (فائق تۆفیق بووبە خاوەن ئیمتیازو پارێزەر محمد بابـانیش بووبـە بەرێـوەبـەری مەسؤوول و خواڵێ‌خـۆشبـو حوزنی موکـریـانیش بووبـە مودیـری ئیـدارەو نووسـین و ژمارەی یەکەمی ئەم جارە ئەم گۆڤارە - واتە: پلەی دووەم - رۆژی دوشەممەی ١٢ ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥دا دەرچووە - بروانە وێنەی ژمارە - ٢-

هەر لەم ژمارەیەدا خاوەن ئیمتیاز (پارێزەر فایق تۆفیق) بەم شێوەیە ئامـانجی (دەنگی گێتیی تازە)ی لە یەکـەم لاپەرەدا بڵاوکردوەتەوە (بەدڵێکی پاك و خاوێنەوە نیازمان کردو بریارمان - دا کە لە رێگای خدمـەتی زمـانی کوردیو ئەدەبیـاتـەوە خدمـەتێکی چاکی گشتیو نەتـەوەکـەمـان بکـەین، خدمەتێکی بە ویژەی وا کە بۆ خوداو بۆ خۆشـەویـستی نیشتـمـانـەکەمان بێ. چونکە باوەرمان وایە کە هەمو نەتەوەییکی زیندوو بەبێ زمانێکی فراوان و ئادابێکی بەرزی ئەوتۆ کە بۆ فراژین و ژیـان و گۆرین بشێو دەست بدا، چاك نازێو سەر ناکەوی، وە هەر ئەو گۆرینە ئەی باتە سەر بارێك کە بەرادەییکی فراوان خدمـەتی زانستیو هونـەر بکـا بەراستی بەیانی زمان وەکو سیحر وایە (وإن من البیان لسحرا) دیارە نەتەوەی کورد لەو نەتەوە زینـدوانەیە کە لە بەرزبوونەوەی زمانی عەرەبیو فارسیو تورکیدا دەستێکی باڵای وایان هەیە کە یاد بکرێو هەمەتێکی گەورەیان لەو بارەوە نوانـدوە. لەم عونـسرە چاکـە زیـرەکەدا گەلێك زانای گەورە گەورە پێگـەیشتـوون کە بە تالیفـاتـەکـانیـان لە هەمـوو لایێکـدا ناوبانگیان سەندووە، وە ئەوانەی شارەزای زمانی کوردین ئەزانن کە تاچە رادەیێك ئەدەبی کوردی هێزی لێك دانەوەو عاطفیەی ئنسانی هەیە، وە تا چە پایەییك بیری بەرزو هیواو هومێدی دوور دوور پیشـان نەداو، وە بە پێـویستـمان زانی کە لە رێی خدمەت بۆ ئەم گۆوارە، وەبـۆ خدمـەتی ئەم زمـانـە بەشـداری بکـەین و بۆ بەرزبـوونـەوەو پێشکەوتن و خاوێن کردنەوەی تێبکۆشین، ئەمەش دیارە بەهۆی فضل و تێکۆشینی برا خوێندەوارەکان وشارەزاکانی زمانە کەمـانـەوەیـە وە هیـوامـان وایـە لە سایـەی ئەو کەسـانـەوە کە بۆ پێشکـەوتن و بەرز بوونـەوەی تێکـۆشن چاکـتر سەرکـەوین، ئەم گۆوارە. ئامـادەیە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو وتارانەی لەلایەن ئەدیب و فاضلەکانەوە ئەنێررێن، بەڵام تکای گەورەمان ئەمەیە کە وتارەکانیان لەرێی ئامـانجی گۆووارەکـە لانـەداو تۆفیق و پشتیـوانی لە خودا دەخوازین. مەحامی فائق تۆفیق).

لە لاپـەرە دووی ژمـارە یەکیدا دەنگی گێتیی تازە بەم شێوەیە رێبازی خۆی ئاشکراکردوە کە دەڵێت (بڵاوی دەکەینەوە کە گۆواری گێتیی تازە سەربەخۆ دەرئەهێنرێو لەگەڵ هیچ حزب و کۆمەڵێکشدا پەیـوەنـدی نیـە، مدیـری ئیـدارەو رەئیسی تەحـریـری حوزنی موکریانی‌یە. هەموو مخابرەو نوسین و حەواڵەو وتار بەناوی ئەوەوە ئەنێررێو لە دائرەی بەرید بە ژمارە - ١٨٥ - تۆمار کراوە)، گۆڤارەکە لە یەك مانگی‌یەوە لەم پلەیەدا بوویە گۆڤارێکی هەفتەیی وەك لەسەر

بەرگ و یەکەم لاپەرەیدا ئەم دروشمە نوسراوە (گوواریکی ئەدەبی، خویندەواری، زمانی، ئیجتماعی، پەیامی، هەفتەیی، کوردی‌یە).

ژمارە یەکی ئەم گوڤارە لەم پلەیەدا رۆژی دووشەممە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥ دەرچــووە قەوارەشی بوویــە (٢٤×١٦)سم، هەر ژمارەیەکی (٢٤) لاپەرە بو، نرخی ژمارە یەکی (٢٦) فلس و بەدەلی بەشــتراکی سالانــەی (١٫٢٥٠ دینار)و ناونیشانی لە بەغداد گەرەکی جەدید حسن پاشا)بوو.

هەر کە ئەم گوڤــارە سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و پەیوەندی بە بالیوزخانەی بەریتانیاو هیچ کۆمەل و دەزگایەکەوە نەما لە نووسەرو شاعیرانی ئەو سەردەمەوە چەندان نامەی پیرۆزبایی بۆهات، وەك ئەم نوسینــەی شاعــیر (أ.ب. هــەوری) کە لە ژمــارەی (٦) کانــونی یەکەمی ١٩٤٥دا نوسیبوی دەلیت:

(بــە پەیمانەوە، چەند خۆشە کە لە تاریکیی زەریای بیرو لیك دانەوەی دواروژا بەشەپۆلی سەراسیمەیی کەوتبیتە گەرداوی بی‌پەیەوەو گرش داماین دەستی نەزانیت دابیتە بەر دوو ئەژنوی بی‌هیزیو ئەژنو بەر دلی پر ئاوات و سەری کەســاسیەت بەسەردا شۆر کردبیتەوە، کەچی لەپر سەر رشتەی تروسکەی شادیت لەلیوە دەرکەویت. لە کاتیکی تەنیایی‌دا بەو رەنگە گلۆلەو گردنشین دانیشتبوم دا چرای دوا رۆژم بە بی‌پلیتەو نەوت لی وون بوو، لەو بیرەدا بووم مۆمیك بخوازم بەلکو بەهــۆیەوە چرا گووم بووەکە بدۆزمەوە کەچی هاوری‌یەکم پەیــدابــوو وتی، هابگرە وە ژمارە یەکی دەنگی گیتی‌ی تازەی دایە دەستم، بەلام چۆن دەنگی گیتی‌یەك، دەنگی گیتی تازە بەپەیمانەوە، بە پەیــمانیکی بەئیــمانــەوە، هاتوە لە قورگی پر گریانەوەو بەسۆزی سینەی وەك بریانەوە بە ئاهـ و نالەی بی سامانەوە، نیشانەی میشکی بیداری شەوە، بەلگەی دوو چاوی قەد نەچوەخەوە، نموونەی بیری بەرزی لاوانەوە، یەك دلی چەندری هەم دووئاوانەوە... پەیمانی وایە ئیتر لەمەولا بەپشتی هاوین روو بکاتە خودا، زۆربکاو خو بەبیری بەرزو بیتی وردەوە تەقەلای شەوو رۆژ بەبەسیت بەیەکەوەو مەبەستی بەرزی کە خزمەتی زمانی کوردی‌یە بخاتە پیشی هەمو نامانجیکەوە...)

هەروەها لە ژمارە (٨)دا (ت، دلپاك) نوسیویتی دەلیت (بەراستی گــەم وڤارە خزمەتیکی بالای زمانی کوردی کردووە بەوەی کەخیرا دەستی کردوە بە نووسینی کوردی پەتی وە بژارەکردنی زمانەکەمان لە وشەی بیگانە بۆ ئەم کارەی لای ئەوانەی کە نرخی زمانەکەیانیان لاهــەیــە، سوپــاس و ستــایش ئەکــریت. بەلام ئەم کتــوپــری‌یەی کردویــەتی لە تەتەلە کردنی زمانەکەماناو هیرشی‌ووشەی پەتی کەلە زوری خوینــدەواران رانــەهــاتــوون. خوینــدنەوەی بۆ گەلی کەس قورس و نالــەبــار. بووە، چونکــە بەشی زۆرمان بۆ خۆشی ئەخوینینەوە نەك بۆ کەلــك وەرگــرتن و فراوان کردنی زانیارمان لە وشەو وتەی کوردی پەتی. ئنجا لەم بابەتەوە تکام وایە کە لەمەولا بەیەك شیوە - لهجە - بەکوردی پەتی‌یەك کەوا وشەکانی هەمو خویندەواریك لی‌ی راهــاتبی بنوسری، وە ئەگەر هەندی ووشەی بیگانەشی تی‌بکەوی قەیــد ناکا، دوایی بەرە بەرە وشەی کوردی پەتی‌تر بلاو بکەنەوە، تاخویندەوارەکانیش لە سەری رابین، وە لە نوسەرەکانی کوردیشم ئەوی کە لەمەوودوا بەم چەشنە وتار بنوسن و لەم گوڤارەدا بلاوی بکەنەوە).

پیرەمــیردی ئەمریش نوسینیکی بەنرخی بۆ ئەم گوڤارە نوسیوە لە ژمــارە (٩) دا کە ریکــەوتی ٣١ ی کانونی‌یەکەمی ١٩٤٥ دەکات، حســین حوزنی موکریــانیش بەم جۆرە پیرەمیردی پیشکەش کردوە (دۆستیکی هونەروەر ئەم وتارە لە لایەن مامۆستای زانا پیری رەوشــەن زەمیر، شاعیرو ئەدیبی بەناوبانگ جنابی حاجی توفیق بەگ مان بۆ هاتوە کە دەفەرمویت: ئەوەتی دەنگی گیتی تازە بەتایبەتی کەوتوەتە دەست خۆتان هەمو جاری بوم دیت و ســەراپا ئەیخوینمەوە چاوم پی روون ئەبیتەوە. من ئەمەوی لەهەمو شوینیك و لەهەموو مەلبەندیکدا بانگیکی خۆمانی تیا بدری ئنجا ئەیەوی بەشیوەی ئەولایی کە دەلین (خــودی مەزنــە) یاخود ئاینی (الله اکبر) بیت منیش لە خوشی ئەم ئاوازەی هەستی‌یە کە شاد مەرگ بووم بردمیانە سەر گردەکەی یارەی شوین ئاگــری نەورۆزەکــەی خۆم شیــخ محمــدی خال بەکوردی ئامۆژگاری بکاو تەلقینم دابدا وەکو ئەمجاریش لە ژیندا وتومە استاد...)

لە پلەی دووەمی ئەم گوڤارەدا ئەم نوسەرانە دەوریکی دیاری‌یان بینیــوەو بەرهــەمیکی زۆریــان هەیە (حوزنی موگریانی، ج - ب. رۆژبەیانی، جگەر خوین، ئەحمەد دلزار، پیرەمیرد، م - نەریمان، دەرویش عبــدالله جەبــاری - دلــریش - ، أ.ب. هەوری محمد کەریم قادر، بەکــر دلــیر، مەدهــوش، مەحمــود فەهمی هەمەونــد، مصطفی صفوەت، مصطفی شیخ نعمة الله، ئیبراهیم نادری عزالدین کاتب زادە، بەنگینە، ملا عبدالله سعید، دلشاد رەسولی‌و کەسانی‌تر..)

حســین حوزنی موکریانی لەم پلەیەدا گەلیك باسی میژوویی لە ژمارەکانی ئەم گوڤارەدا بلاوکردوەتەوە، وەك (کوردی سیامەنصور، کوردی رۆژبەیانی، کورد لە ولاتی خۆراسان دا، دەولەتی منتشا، دەولــەتی دۆستیــك، سەرزەوی ماد، پادشــای شەدادیــان، میژوی فەرمــانــرەوای ئەردەلان، دەربــارەی ئەمــین فەیــزی شاعــیرو زانــا) هەروەها چەند باسیکی ئەدەبی بلاوکردوەتەوە، وەك (پەروانەو شەم،

هەی باڵنـــدەی پیرۆز، هەی خوشکی نادیـار، بەیتی کەل و شێر. ئەندرزو پەند، نیانی‌و ئاشکرایی، هتد..)

ماموستا جەمیل بەندی ڕوژبەیانی دووەم کەسە بو زوری بەرهەمە لە لاپەرەکانی ئەم گوڤارە لە پلەی دوەمی‌دا نووسینەکانی تام و بوی خوی هەبووو لەسەر چوار تەوەردا بوو (یەکەم) زنجیرە نووسینێك دەربارەی بویژەکانی (زەنگنە، دەلو، داودە، شێخانی، قەرەحەسەن، تاڵەبانی، گل).

(دووەم) لە مێـژودا (شەرەفنامە بەکورتی‌و وەرگێرانی گەشتەکەی فریـاستـارك) - (سێـیـەم.) بابەتە نوسینێکی ئاینی وەك زانسـت و فەرمـایشی مێـژوویی‌و دەربـارەی کەلـەپـوور بەشکـردن و ژینامەو چاکی‌یەکانی پیری قەرەچیوار)، (چوارەم)سێ پارچە شیعر یەك دوو رەخنـــەشی گرتـــوە یەکێکیـــان لەســەر نووسینێکی منـە دەربـارەی (رەنج بەرو رەنج دەر).

(پـیرەمـێرد)ی شاعـیر چەندنوسین و چەند پارچە شیعرێکی لەم پلەیـەدا بلاوکردوەتەوە، لە ژمارە (٩) دا پارچە شـیعرێکی هەیە بە (نـاونیشـانی - هەژارو سـتـەمکار) ئەڵێت - بو ئەوکەسەی کە ئەڵێ کوردی قافیەی نیە، شیعرەکە (٢٧)دێرە، لە پێشەکی‌یەکەیدا ئەڵێت:

**ئامان چەند خوشە تاڤی منداڵی:**
**بەلام تێی‌ناگەی تا کونە ساڵی**
**لە منداڵیا کە باوکم ساغ بو:**
**گەلێ ئارەزوی لە رەزو باغ بو**
**رەزو خانومان لە (گورگە) دەربو**
**(گورگانە شەوێ)م زور چاك لەبەربو**

پیرەمیرد بەم چەند شیعرە دوایی بەچامەکەی دێنێ:

جەوری ستەمکار ئاهی لە دوایە: بەدکار هەمیشە کاری لەدوایە دەلێن خوا دوایی تولە ئەسێنێ: ئەممەوت قینی گلپە ئەسێنێ کەچی‌وا لەپڕ ئەو تولەیەی سەند: بو (خەرگە رەش)بو کاری واپەسەند ئەگینا ئیستایش هەر ئەو ئەوەیە: ئەکوژن ئەبرن نە دەنگ نە وەیە

هەر پیرەمیرد لە ژمارە (٢١)دا کە ڕێکەوتی ٢٥ی مارتی ١٩٤٦ دەکات (ئەوروزنامەی کون)ی (بو دەنگی گیتی تازە) نوێ کردوەتەوە کە دەڵێت:

**موژدەبێ ساڵ گەڕایـەوە: ئاگـری نەوروز کرایـەوە**
**بەفـری زسـتـان تووایـەوە: گیاو گوڵ و دڵ ژبایەوە**
**نوخشەیش بێ لەکوردی هەژار**
**گوڵ لە باخـــا خوی دەنـــوێنێ: بولبـول بەرویـدا**

**دەخـــوێـنـــێ**
**هەورمـرواری دەپـرژێنێ: شەمـاڵ زنـدەگانی دێنێ**
**نێرگس مەستەو چاو بەخومار**

بەم چەشـنە (هەشـت) پێنج خشتەکی داناوەو بلاوی کردوەتەوە.

نوسـەری ئەم چەنـد دێـرەش لە دە ژمـارەی ئەم پلەیەدا چەند نوسین و پارچە شـیعری هەیە. شـیعرەکان بەناونیشانی (رولە چاکە بو نەیـار مەکـە. پیشـەی ئیمەیە. **گفتوگوی چوار هەژار**. ناگوزیری واسیتـە. بەرخی بەسـرمـان و **گورگی سـتـەمکـار**) نوسینـەکـانی تر دەربـارەی (کـونفـوشیـوس. **ولاتی فنلندە. دوو شاعیری شاکەل**. رەنج بەرو رەنج دەر).

ماموستا (دەرویش جەباری - **دلریش) لە قاهرەوە چەند نوسینێکی** زانستی دەربارەی (هێزی هەلا. تەلگراف. دیریکی گوگرد. دیریکی کەشتی. دیریکی **مێخی‌ئاسن. دیریکی چرا.** هتد...) نووسیوە.

ماموستا (یەحیا چروستانی) چەند پارچە پەخشان و شیعری وەك (من و کەویـك، مام صوفی. ژوانیـك بو دواروژ. هاوتای ماتەم) نوسیـــوە. شاعــر (محمــد کەریم قادر) لە نزیکـەی دە ژمـارەدا چوارینەکانی خەییامی کردوەتە کوردی‌و لە لاپەرەی ناوەوەی یەکەم بەرگدا بلاوکراونەتەوە.

ماموستا (خالد سەعید) چەند چیروکێکی بو منداڵ نوسیوە وەك (مام زوراب. پولە کوترێك. منداڵەکانتان فێرە ژیان بکەن) شاعیری خواڵی خوشبـو (جگـەر خوین ١٩٠٣ - ١٩٨٤).

خواڵی‌خوشبو (**مەلا مصطفی** صەفوت ١٩٠٥ - ١٩٦٣ لە لەبنانەوە لاوانـەوەیـەکی شعـری لە ژمـارە (٢١)دا بلاوکـردوەتـەوە). یەکەم نوسینی شاعیری خواڵی‌خوشبـو (کامەران - محمد احمد طە ١٩٣٢ - ١٩٨٦ پەخشـانێکە بەناو (شەونمی بەری بەیان) لەژمارە (١)ی ساڵی ١٩٤٦دا بلاروکراوەتەوە.

دەربـارەی کشتـوکـاڵ و لەش ساغیش هەنـدێ کەرەسـتەی تێدا هەیە. هەروەها کەم تا زور بایەخ دراوەتە فولکلورو قسەی نەستەق و پەندی پێشینان

(شـەوێـك لەسـەر لوتکـەی ئەڤـرست) چیروکێکی سەرکەوتووە بەزنجیرە لە حەوت ژمارەیدا نوسراوەو ناوی کەسی بەسەرەوە نی‌یە ئەگەر بەرچاوی لێکولەرەوانەکان بکەوێ دەکەوێتە ریزی چیروکە هونەری‌یەکانەوە:

لەم بەشەدا گەلێك تێکستە شیعری شاعیرانی کلاسیهان هەیە، وەك (سەی یاقو، مەولانا خالد، حاجی قادری کویی، خانای قوبادی، شێخ رەزا، مەلا مارف کوکویی، سالمی سنەیی، ئەحمەدی کور) بلاوکراوەتەوە.

له چەند ژمارەیەك دا بەزنجیرە (شیرین و فەرهاد)و (شیرین و خەسرەو) بەکوردی نوسراون، بزانە چۆن لەژمارە (٧)دا ئەڵێت (شیرین و خەسرەوی کوردی ئەم کتێبە ساڵی ١١٥٠ی کۆچی لەلایەن شاعیرو زانای بەناوبانگە خانای قوبادی‌یەوە بەدەستوری نظامی

مامۆستا (خالد سەعید) چەند چیرۆکێکی بۆ منداڵ نوسیوە وەك (مام زۆراب، پۆلە کۆترێك، منداڵەکانتان فێرە ژیان بکەن) شاعیری خواڵێ خۆشبو (جگەر خوێن ١٩٠٣ ـ ١٩٨٤ وێنەی ژمارە (٤) لەچوار پێنج ژمارەدا شیعری نایابی بڵاوکردوەتەوە.

خواڵێ‌خۆشبو (مەلا مصطفی صەفوت ١٩٠٥ ـ ١٩٦٣ له لەبنانەوە لاوانەوەیەکی شعری له ژمارە (٢١)دا بڵاوکردوەتەوە). یەکەم نووسینی شاعیری خواڵێ‌خۆشبو (کامەران ـ محمد احمد طه ١٩٣٢ ـ ١٩٨٦ پەخشانێکە بەناو (شەونمی بەری بەیان) لەژمارە (١)ی ساڵی ١٩٤٦دا بلاروکراوەتەوە.

دەربارەی کشتوکاڵ و لەش ساغیش هەندێ کەرەستەی تێ‌دا هەیە. هەروەها کەم تا زۆر بایەخ دراوەتە فۆلکلۆرو قسەی نەستەق و پەندی پێشینان.

(شەوێك لەسەر لوتکەی ئەڤرست) چیرۆکێکی سەرکەوتووە بەزنجیرە لە حەوت ژمارەیدا نوسراوەو ناوی کەسی بەسەرەوە نی‌یە ئەگەر بەرچاوی لێکۆڵەرەوانەکان بکەوێ دەکەوێتە ریزی چیرۆکە هونەری‌یەکانەوە:

لەم بەشەدا گەلێك تێکستە شیعری شاعیرانی کلاسیمان هەیە، وەك (سەی یاقو، مەولانا خالد، حاجی قادری کۆیی، خانای قوبادی، شێخ رەزا، مەلا مارف کوکویی، سالمی سنەیی، ئەحمەدی کۆر) بڵاوکراوەتەوە.

له چەند ژمارەیەك دا بەزنجیرە (شیرین و فەرهاد)و (شیرین و خەسرەو) بەکوردی نوسراون، بزانە چۆن لەژمارە (٧)دا ئەڵێت (شیرین و خەسرەوی کوردی ئەم کتێبە ساڵی ١١٥٠ی کۆچی لەلایەن شاعیرو زانای بەناوبانگە خانای قوبادی‌یەوە بەدەستوری نظامی کردویە بەکوردی بەشێوەیەکی زۆر خۆش و شیرین دایناوە. ئەم کتێبە کە ئێمە لێمان وەرگرتوە هەر لەو ساڵانەی خانای قیادی‌دا محمد صادق نام خۆش نوێسێك بەدەستی خۆی نوسیویەتەوەو بە ٣٩ نیگاری رەنگاو رەنگ رازاندویەتەوە....)

هەر لەم بوارەداو له ژمارە )١٩(ی ساڵی ١٩٤٦دا (پیرەمێرد) کاغەزی بۆ (سید حسین حوزنی)دەنوسی تیی‌دا دەڵێت:

(استادی خۆم سیدحوزنی ـ داستانە چاپکراوەکەی شیرین و فەرهادم پێ گەیشت شیرینە!! تۆیش رەنجی فەرهاد بۆ ئاثاری کوردی ئەدەی جۆی ئافەرینە، یوسف زلیخایەکی دەست خەتی تەواوم لەلایە خۆم پیری پەکی خستوم مەگر بینێرم بۆ تۆ خوا پاداشی رەنج و ئەمەکت بداتەوە.

بەرەمەبدی شاگ دلڤشاک ت،

دەنگی گێتی تازە بایەخی بەباسی زانستیش داوە دەربارەی (ئەدیسون و بێ‌تەل و کارەبا) شتی تێ‌دا هەیە بروانە پێش چل ساڵێك چۆن ئەم گۆڤارە خەیاڵی بەوەوەکردوە رۆژێك دەبێ مرۆڤ دەگاتە مانگ و ئەو مانگە کە هاودەردی (بێ‌کەس)بوە بزانە لە ژمارە (٢٧)ی دەنگی گێتی‌دا چۆن بەباسی (مرۆڤ و مانگ) لەسەری نوسراوە کە دەڵێت (گەلێك ساڵە بەسەرچو مرۆڤ هەروا لە لێکۆڵینەوەدایە، داخوا مانگ چۆنەو چی تێدایە، زاناکانی خاك ناس کەلە مانگ دواون بریاریان داوە مانگ بێجگە لەوەی کەرتێکی زەوی‌یەو لەم خاکە بچڕاوە هیچی دیکە نی‌یە، جا هەرچۆنێك بێ مرۆڤ نارەزویەتی بچێ بۆ مانگ؟....)

لە ژمارە (٢٨) یش دا دەربارەی دۆزینەوەی تەلەفزیۆن دواوە.

لە دامێنی چەند لاپەڕەیەکی دەنگی گێتی‌ی تازەدا نوسراوە (هەی لاوی‌کورد، دەنگی گێتی‌ی تازە هی خۆتە، بۆ خۆتە بیخوێنەرەوە.

کە ژمارەکانی دەنگی گێتی‌ی لەم پلەیەدا بە شێوەیەکی فراوان چاپ کراو فرۆشیارو کریاری پەیدابون ئەمیش وەك (گەلاوێژ) لە شارەکان دا باوەرپێکراوی بۆ خۆی هەڵبژارد، وەك (لە بەغداد. مكتبة الهلال ـ سوق السراى، لە سلێمانی ـ کتێبخانەی سەرکەوتن، لە کۆیسنجق ـ کەمال صادق، لە خانەقی ـ محمد سعید فەوزی، لە عەقرە ـ مەلاعلی عبدالرحمن، لە کەرکوك ـ مەلا خالدی کچانی، لەتاران ـ ابراهیم نادری).

ئەوی روون و لەبەرچاوە لەم پلەیەدا هیچ نوسینێکی رامیاری‌و پێ‌هەڵدانی ج دەوڵەت و بەرەیەکت بەرچاو ناکەوێت.

ئێمە کە دوایی بەم توژینەوەیە دەهێنین ئومیدەوارین پسپۆرانمان چاکی لێ‌هەڵ کەن و بازوی لێ‌هەڵماڵن و دەست بکەنە لێکۆڵینەوەی زانستی‌یانە لەسەر گۆڤارو رۆژنامەکانمان تاوەکو مێژوی رۆژنامەگەریمان بۆ روون بێتەوەو هەقی هەر بڵاوکراوەیەك بەپێ هەل و مەرجی خۆی ئاشکرا بکەین.

## ئەنجام

ساڵی ١٩٣٩ شەڕی دووەمی جیهانی هەڵ گیرسا ئەڵەمانیای نازی‌و ئیتالیای فاشیست و دکتاتۆریەتی ژاپۆن لە بەرەی (تەوەرە ـ میحوەر)دا دژی نەتەوە دیموکراتیەکان یەکیکیان گرت و ئەڵەمان نیوەی زیاتری ئەورروپای قووت دا، بەرەی دیموکراتیەکان (ئینگلتەرەو یەکێتی‌ی سۆڤیەت و ولاتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا) لە بەرەی (هاوپەیمانەکان)دا ریزی خۆیان توندکردو بە سوپاو ئازوقەوە کەوتنە بەرنگاری کردن، شەرێکی جیهانی یەجگار سەخت بوو پەنجا ملیۆن زەلام بوون بە سوتەمەنی ئەو ئاگرە جگە لە ملیارەها زەرەو زیانی ماڵی، شەرەکە شەش ساڵی خایاند.

ـو هەل و مەرجەدا ئینگلتەرە لە عیراق دا بوونی لە هاوپەیمانەکانی

خۆی زیاتربوو، بۆ تێگەیاندنی رای گشتی دژی دیکتاتۆری تەوەرەکان ئیستگەیەکی عەرەبیی و کوردی لە (یافا) داناو گۆڤارێکی کوردی بە ناو (دەنگی گێتیی تازە)وە لە بالیۆزخانەی خۆی - واتە بەریتانیا - دەرکرد. گۆڤارەکە مانگانە بوو دەنگوباسی ئەو جەنگە بێ‌مانەندەو سەرکەوتنی دیموکراتیەکان لە بەرەکانی جەنگ دا بلاوەکردەوە لەگەڵ زانیاری دەربارەی کەلەپووری کوردیی و فۆلکلۆرو ئەدەبیات. ئەوانەی دەوری سەرەکیان لە دەرکردنی ئەم گۆڤارەدا هەبوو ماموستایان (توفیق وەهبیی و حوزنیی موکریانیی و حەسەنی شێخ حمە مارف) بوون کە ئاگری دووەمی شەری جیهان کوژایەوە (حوزنیی موکریانی) هەوڵی‌دا بۆ ئەوەی بلیسەی ئەم گۆڤارە نەکوژێنەوە بە هاوکاری لەگەڵ (محمد بابان و فائق توفیق) لە نیسانی ١٩٤٥ ئیمتیازی گۆڤارەکەیان گرتە ئەستۆو بووبە گۆڤارێکی هەفتەیی.

لەبەر ئەوەی یەکێك بووم لە تازە نووسەرەکانی ساڵانی چل و لەپێش دا لە گەلاوێژ (پەخشان و شیعرم) هەبووە هاتم بۆ ئەم گۆڤارەیش نووسینم ناردو بلاوکرایەوە، لەبەر ئەوەی ویستم تیشکێك بخەمە سەر ئەم گۆڤارەی کە تا ئیستا زانیارییەکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە، بە بۆچوونی من (دەنگی گێتیی) هەر گۆڤارێکەو بە دوو پلە - قۆناغ - دا تێپەریوە، چونکە:

١ - ناوی وەك خۆی ماوەو نەگۆراوە.

٢ - زنجیرەی ساڵەکانی وەك خۆیان ماون، ساڵی یەکەم و دووەم و سێیەم تا چوارەم.

٣ - خواڵێخۆشبو (حوزنیی موکریانی) لە هەر دوو دەوردا رۆڵێکی گرنگی بینیوە وەك هەندێ زاراوەو وشەی وەك (دێرێك، داستان، ستران، یاسا، گۆواو، بینایی چاوان، هتد..) کە لە ژمارەیەکی ساڵ ١٩٤٣وە هەیە تادوایی هەرماون دۆزینەوەی ئەوزاتەن.

ئەم گۆڤارە لە پلەی یەکەم دا ساڵانی (١٩٤٣ - ١٩٤٥) کە لە بالیۆزخانەی بەریتانیا دەردەچوو دەنگوباسی سەرکەوتنی بەرەی دیموکراتی بە گشتی بلاودەکردەوەو قەت نەبووەتە کوتەکی دەستی ئیمپریالیزمی بەریتانی وێنەی هاوپەیمانەکان، چەرچڵ ترومان - ستالین بە تەنیشت یەکەوەبوون، وەك باسی شەری ئەفەریقا دەکرا زیاتر لە بەرگری گەلی سۆڤیەت لە ئینگرادو لە پلەی دووەم دا گۆڤارەکە قەوارەی یەك هەفتەیی وەرگرت و زیاتر ئەدەبیات و کەلەپوورو فۆلکلۆری بلاودەکردەوەو ئەم نووسەرانە دەوریان لە پلەی دووەم زۆر دیاری بوو (حوزنیی /موکریانی مەلا جەمیل رۆژبەیانی/ جگەرخوێن، ئەحمەد دلزار، پیرەمێرد، نەریمان، دەرویش جەباری، هەوری کاروخی، قانع، مەدهۆش، صەفوەت، بەنگینە، شوکری، هتد..)

دەنگی گێتی تازە بە هەر دوو پلەکانیەوە نزیکەی چوار ساڵی بری (١٩٤٣ - ١٩٤٧) لەم چوارساڵەدا برێکی باش لە نووسەرانی چلەکانیان بەشدارییان تێدا کردو نووسینی پوخت و شیعری رەنگاورەنگ و گرنگیەکی فرە درایە کەلەپووری کوردی، هەروەها ئەم گۆڤارە لە یەکەم ژمارەیەوە هەوڵی ئەوەی داوە بە کوردی پەتی بنووسێت و گەلێك وشەی رەسەنی کوردی زیندووکردوەتەوەو خستویەتیە ناو نوسینی کوردییەوە کە تا رۆژگاری ئەمرۆمان بەکاریان دەهێنین.

## پەراوێزەکان:

١ - گۆڤاری گەلاوێژ لە وەختی خۆیدا ستایشی ئەم ئیستگە کوردییەی کردوە.

٢ - لەو سەردەمە (یەکێتیی سۆڤیەت) بالیۆزخانەیان لە بەغدادا نەبوو ئەمەریکاش دەفیان دەنگی نەدەداو نفوزێکی ئەوتۆیان لەم ولاتانەدا نەبووە

٣ - بروانە - مێژوی ئەدەبی کوردی علاءالدين سەججادی، چاپ ١٩٧١ ل ٦١٤.

٤ - بروانە - رابەری رۆژنامەگەری کوردی، جەمال خەزنەدار، بەغداد ١٩٧٣ ل ٤٣

٥ - بروانە - تأريخ الصحافة الكردية، جبار محمد جەباری، ١٩٧٥، ل ٤٢

٦ - بروانە - تێگەیشتنی راستیی و شوێنی لە رۆژنامە نوسی کوردیدا -

٧ - د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بەغداد ١٩٧٨ ل ٢٣٧

٨ - هەندێ کەس (قۆناغ) بەکار ئەهێنن، بەلام لەبەر ئەوە لەسەرچاوەدا - وشەیەکی تورکییە (پلە) بۆ (مرحلة) لەبارتر دەزانم.

٩ - بروانە - گۆڤاری گەلاوێژ، ساڵ ٥، ژ ١١، تشرینی دووەمی ١٩٤٤ لاپەرە (٤٢)

١٠ - محمد بابان کوڕی جەمیل بەگی مجید پاشای بابانە، لە کفری لەدایك بووە، کۆلیجی حقوقی لە چلەکان دا تەواوکردوە. کوردێکی دلسۆزە، ئیستا ماوە نەخۆشی پەکی‌خستووە تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵێك دەبێت.

١١ - ج.ب. رۆژبەیانی، جەمیل بەندی رۆژبەیانی یان ماموستا مەلا جەمیل کە ئیستا (محمد جميل رۆژبەیانی)یەو لە کۆری نووسین دا بەردەوامە.

# عرض لمجلة دەنگی گیتی‌ی تازە (العالم الجديد) الكردية

مصطفى نەريمان

لما نشبت الحرب العالمية الثانية انتشرت اوارها وشملت اكثر بقاع الارض فكانت المانيا النازية وفي ركبها ايطاليا الفاشية واليابان يريدون اكتساح العالم الحر فشكلوا قوة تدعى بـ (دول محور)، أضحت البشرية في خطر من أمرها فرصت الدول الديمقراطية آنذاك ـ انكلترة، الولايات المتحدة الامريكية، الاتحاد السوفيتي ـ رصت صفوفها في مجموعة دول الحلفاء لصد هجمات المانيا الهتلرية والدفاع عن العالم الديمقراطي الحر.

كانت بريطانيا آنذالك هي صاحبة النفوذ في العراق وهي تمثل دول الحلفاء فاصدرت مجلة كردية تدعى (دەنگی گیتی‌ی تازە ـ صوت العالم الجديد) لنشر أنباء انتصارات الحلفاء في جبهات القتال والدعاية ضد النازية ونشر التراث الكردي والأدب والعلوم وغيرها، وبعد ان وضعت الحرب العالمية الثانية أوزارها وبجهود من بعض المثقفين الكرد الذين عملوا مع المجلة في بدء تأسيسها كالمرحوم (حوزني المكرياني) تمكن مع كل من الاستاذين محمد بابان وفائق توفيق الاستمرار في اصدار المجلة ذاتها وبامتياز جديد ـ خارج نطاق الحلفاء والسفارة البريطانية الممثلة لها ـ فتمكنت المجلة من المضي قدماً سنتين أخريين.

لم تكن المجلة لدى صدورها الاولى ـ المرحلة الاولى في السفارة البريطانية أداة طيعة بيد الاستعمار البريطاني بل كانت تنشر انباء انتصارات الحلفاء بصورة عامة وفي جميع جبهات الحرب، وقد اسدت هذه المجلة طيلة صدورها في بحر السنوات الاربع (١٩٤٣ ـ ١٩٤٧) خدمات جليلة للتراث الكردي والادب والثقافة وبرزت على الساحة الثقافية الكردية وعلى صفحاتها أقلام خيرة لعبت دوراً مشرفاً في رفد النتاج الفكري الكردي من امثال (حوزنى موكريانى، محمد جميل الروژبياني، پيرەميرد، قانع، زيوەر، دلزار، جگەرخوين، نەريمان، وردى، هەورى، صفوت، كاردۆخى، درويش الجباري، مدهوش، بنگينه... وغيرهم...) مازال بعضهم أحياء يرزقون...

# گەشتی ژیانم

## - ئاڵقەی نۆیەم

مسعود محمد:

لە ئالقەی پێشووتر بەڵێنم دا، بە کورتیش بێت، باسێکی تەتویجی مەلیك فەیسەڵی دوەم و هی کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان لە بەغداد بکەم.

هەرچەند خەڵق بە تێکڕایی دەیان زانی، بە تاج لەسەرنان، نەباری سیاسەت و هیچ شتێکیدیکە دەگۆرێت نە فەیسەڵیش لەو قەفەسەی کە عەبدولئیلاهـ دەوری پێگرتوە لێی دەردەچێت، دیسانەوە تەتویج خۆی لە خۆیدا ڕووداوێکی سیاسیو هەمەگیرە: هەروەك بە هاتنی جەژنی ڕەمەزان ئەوەی بەڕۆژوویش نەبوە خۆی بۆ ئامادە دەکات و ڕەنگە، جلکی نوێشی بۆ سازبدات، هەروەهاش حکوومەت و میللەت و سیاسییە موعاریزەکان بە ناچاری چاویان بڕیبوە ئەو ڕۆژەی کە دەوری (وصایة)ی عەبدولئیلاهـ بەرواڵەت و [لەلایەن دەستووریشەوە] لەسەر مەلیك هەڵدەستێت: هەموو ئەوانەی بە تەما بوون، یاخود ئاواتەخواز بوون دەرفەتێك پەیدابێت بۆ تێخستنی کەلێنێك لە تامانی سفت و پتەوی سیاسەتی نووری سەعید بەدەوری ناوك و ناوەڕوکی حوکمەوە، بەڵکوو ئاسانتر بگەن بە دەسکەگوڵی وەزیرایەتی، وەیا سەروکایەتی وەزیران، وردە حیسابێکی خۆشکەلەیان بەدڵ دا دەهات لەوەدا کەوا ڕەنگە بەدەم ڕۆژگارەوە مەلیك فەیسەڵیش پێلەسەر دڵخوازێکی خۆی دابگرێت و دەستەوتاقمێکی تایبەت بەخۆی بژاردە بکات، بەمەش دا دوو کوچکە دەسەڵاتی نووری سەعیدو عەبدولئیلاهـ ببێت بە سێ کوچکەو چانسی تێهەڵکشین لە دوو شیانەوە (شیانە= احتمال) ببێت بە سێ، چونکە هەتا شاباش دەر پتر بێ شاباش وەرگر قازانج دەکات.

موعارەزەش لەلای خۆیەوە بەسەر چوونی دەوری ویصایەتی ناحەزانەی عەبدولئیلاهی بە هەلێك دادەنا، هەر نەبێ لە ڕووی ئەوەوە کەوا تەجرەبەی تاڵ و تفتیان لەگەڵ عەبدولئیلاهـ دا وەهای لێکردبوون ڕووی تێنێن مەگەر لەو پەڕی ناچارییەوە بێت: بە عادەت و بەپێی داخوازی باری قانوونیو دەستووریش، کە موعارەزە لەگەڵ حکومەت پووشکەی پساندو سەلام لەنێوان دا نەما ڕوو لە سەروکایەتی دەوڵەت دەکات بۆ دەربڕینی دادو بڕوی خۆی. ئنجا کە هات سەروکی دەوڵەت، وەیا جێگری ئەو سەروکەش [کە ئەوسا عەبدوولئیلاهـ بوو] گرێپچکەی خستە پێوەندی خۆی بە موعارەزەوە هەموو ڕێگەیەك لەپێش موعارەزەدا کوێر دەبێتەوە بۆ چالاکی سیاسی لەو مەیدانەدا کە قانوون و دەستوور بەرەوای داناوە. ئیتر جموجوولەکەی باریئهێنیو پلانگێری وەردەگرێت. مەبەستم لە موعارەزە هی ناو مەجلیسی نیابی نییە، مەبەسم لە جیهانی بەرفرەوانی دەرەوەی مەجلیسە، کە ئەوسا حیزبی وەتەنی دیموقراتیو حیزبی ئیستیقلال دوو دەرووی سەلمێندراوی ئاشکرای موعارەزە بوون، من لە هەردوو لایەنم دەبیست، بە هەناسەیەکی حەسانەوەوەو خۆشامەدی کردن باسی تەتویجیان دەکرد. هەر ئەو موناسەبەیە خۆی هەلێکی باش بوو موعارەزە پێکات بە هۆی

داواکردنی گۆڕینی سیاسەت.

هەرچی میللەت بوو، کە حیسابی جودایە لە سیاسیو ڕۆشنبیرو ئەهلی وشەو مەهارەت لیکدانەوەشی زۆر دوورە لە هی ئەو کۆمەلە خوولیادارە، چ ناحەزایەتی پێوە دیارنەبوو دژی تەتویج و بنەماڵەی مەلیك. من ئاگاداری شاری بەغداد بووم: ڕۆژێ مەلیك بە شەقامی ڕەشیددا بردرا بۆ پەرلەمان تا سوێند بخوات و تاج لەسەر بنێت من چونکە جلکی ڕەسمیم نەبوو پێی بچمە ئەو کۆبوونەوەیەی کە دەم زانی هیچی دیکەی وەك خۆی بەدوادا نایەت، بەینێك لە شەقامی ڕەشید خولامەوە هەتا دەستەو دایەرەی مەلیك تێپەڕی:

شەقام مۆنجەی دەهات، هەزاران هەزار لە بەرەبەیانییەوە شوێنی خۆیانیان گرتبووە نەکا دواتر بکەونە ڕیزەکانی پشتەوە. خواهەڵ ناگرێ ئەو خەڵقە بەدڵ بەزەییو خۆشەویستی خۆیانیان دەردەبڕی. لەگەڵ چەپلەڕێزانی ئاپۆرەی خەڵق بەشی زۆری ئافرەتان بەدەنگ بۆ (بێ باوکیو بێدایکی) مەلیك دەگریان و بە سەدەقەی دەبوون. تو بڵێ ئەگەر ئەو ئافرەتانە لە گۆشەیەکی غەیبەوە تێگەیشتبانایە کە دوای پێنج ساڵ و دوو مانگێك ئا ئەم بێدایك و بابە لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵ دەکەندرێت دەبوو چ بڵێن و چ بکەن؟ ئەوەی ڕاستی بێت خۆم لەو دەمەدا کە مەوکیبی بەرەو پەرلەمان دەکشی هەستی بەزەییم دەکرد. ئەو دەمەش کە لە ڕۆژی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ زانیم کوژرا، نەك هەر پێم ناخۆش بوو بگرە ڕەش بینییەکی خەست دایگرتم. دواتریش کە گوێم لە ڕادیو دەبوو دەیگوت جەماوەر وا خەریکە کەلەش ڕاکێشی دەکات هەرچی هەستی شیرنایيو خۆشی بوو لە ناخم دا کپ بوو: خەڵقێك دڵی بچێتە سەر ڕاکێشانی لاشەی خویناوی بە نوێژی نیوەڕۆی گەرمای ١٤ ی تەمووزی بەغداد، کە ئەو ساڵە لە ڕادەبەدەر گەرم بوو، بە ئاسانی بادەداتەوە سەر کوشتنی برادەری خۆی کە بزانێ دوو قرۆش قازانج، وەیا یەك هەنگاو بەرەوپێش چوونی تێدایە. مرۆ ناشێ ببێتە گورگ..

بۆ داوەتی شەو کە لە (قصر الرحاب) بەرپابو جلکی کوردیم لە جوانەمەرگ ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغای دزەیی خواستەوە.. ئنجا یەکێکی ئەو وێنەیەمی دیتبێت کە لە ئالقەیەکی (الجذور) بە جلکی کوردییەوەم لەو داوەتەدا نیشان دەدات بابزانێ زێدە کوردایەتیم جلکەکەی پێ لەبەر نەکردبووم بەلکوو بێ چارەیی نەبوونی جلکی ڕەسمی لێمی داواکردبوو.

گوتەیەکی میصری هەیە دەڵێ: (یدّی الحلق للّی بلا ودان) واتە: گوارە بە یەکێکی بێگوێ دەدات، ئا ئەمە بۆ من ڕەخسا وەك بۆتی دەگێڕمەوە:

پێداویست وەهای داخوازی کرد چەند ڕۆژێکان هامۆشۆ بە شەقامی ڕەشیددا تەنها بۆ ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بێ کە نیشانەیەکی تایبەتی پێوە بێت. من سەیارەم نەبوو بەڵام نیشانەکەم بۆ هاتبوو. وا ڕێك کەوت لەو ڕۆژانەدا حەمە طیب ئاغای طاهیر ئاغای حەویزی، خاوەنی مەعمەلی جگەرە، کە یەکێك بوو لە دەولەمەندەکانی ئەوسای بەغدا داوەتی فراڤینی کردم و بەو بۆنەوە لە جەماعەتێکی هەرەدەولەمەندی بەغداشی گێرابۆوە وەك: عبدالعزیز البغدادي، عبدالهادي الچلبی، دامیرچی، حافظ القاضي... بەدەم باسی تەتویجەوە، حافظ القاضي کە ئۆفیسی لەسەر شارع الرشید بوو گوتی: لەو چەند ڕۆژەدا لەبەر مەنعی ئۆتۆمۆبیل هەتا دەگەمە ئۆفیسەکەم ماندوو دەبم، نیشانەم نییە بە سەیارەی خۆمییەوە بکەم. گوتم: تۆ سەیارەت هەیە بێنیشانە منیش نیشانەم هەیە بێسەیارە، خۆ ناشێ بڵێم سەیارەکەت بۆ من بێت، با نیشانەکەم بۆ تۆ بێت.. دواتر برادەرێکم کە زانی نیشانەم بە حافظ داوە گلەییکرد کە چۆن ئەوم لە بیرکردوە [لەماڵەوە سەغڵەتیان کردبوو]. دڵیم دایەوە بەوەی کە نیشانەی ئائیبی پژدەر، عومەری خدری حاجی ئاغام بۆ وەرگرت..

لەو داوەتە قاضی عبدالحمید ئەترووشیش بانگ هێشتن کرابوو کە پێشتر شناسایيان هەبوو. دوای ڕۆیشتنی خەڵقەکە جارێ من مابوومەوە (فخری جمیل پاشا)ش هەتا هەڵستام باسی مەلا ئەفەندیو باوکمی بۆگێرامەوە. لەقسەدا بوو هەناسەیەکی هەڵ کێشاو گوتی: من بعد ملا افندی انحرمت من لبن أربیل. کە گەیشتمەوە ئۆتێلەکەی خۆم دیتم لە هەولێرەوە دوو کیسە ماستی شاهانەم بو هاتوە. خێرا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ حەمە طیب ئاغادا کرد کە سایقەکەی بنێرێتەوە بۆ ئەو دوو کیسە ماستە، یەکێك بۆ فخری پاشا ئەویدیکەش بۆ خۆی. چەند ڕۆژێکی دیکە خەفری پاشا داوەتێکی فتاری ڕەمەزانی کردم هەمان گرووپی داوەتی پێشوو بەشدار بوون.. هەر ئەوە بوو هیچیدیکەی بەدوادا نەهات، زۆریشی نەبرد من لە پشووی هاوینە بۆ کۆیێ گەرامەوە.

فەخری پاشا لە پیاوە ناودارەکان و مەزنی بنەماڵەی (جمیل)و لە دۆستانی مەلیك فەیصەلی یەکەم بوو: بووبوو بە وەزیر و سەرەکی مەجلیسی نواب و (عـین) ئاکاری مەردانەی لە قسەو ڕەوشتی دیاربوو. ڕێکەووتێکی خۆشی بوو لەو دیتنانەدا کەوا لەباس کردنی ڕۆژگارانی بەسەرچوودا قسەمان گەیشتە ئەو پێوەندی دۆستایەتییەی

به سالی ١٢٩٣ ك. (١٨٧٦ز) له نێوان باپیرم، حاجی مەلاعەبدوللا. و مەزنی ئەوسای بنەماڵەی (جمیل)دا کە (محمد الجمیل) بووه پەیدا بوه باپیرم گەلێك باسی له مەردایەتی ئەو (محمد الجمیل)ە گێرابۆوه، تەنانەت له هەموو ئیش و کارو موراجەعەی ڕەسمی بۆ لای خاوەن پایە بەرزەکانی ئەو سەردەمە یارمەتیدەرو ڕێزپارێزی بووه. تەمەنی پێوەندییەکە له سەردەمی باپیرم تا ئەو ڕۆژەی من ناسیاویم لەگەل فەخری پاشادا پەیدابوو ٧٧ سالی ڕێك بوو..

من بەر له تەتویج مەلیك فەیسەلم دیتبوو. دواتریش پتر له جارێك چوومە خزمەتی:

مرۆیەکی ساف دلپاك بوو. ئەگەر دەسەلاتی هەبوایە له چاکەی خەرج دەکرد. مەرگ هەلینەدای بزانین دوای قال بوونەوەو چەپ و ڕاستی خوناسین چۆن دەبوو..

بێمە سەر یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتی خوازانی عیراق کە له هاوینی ١٩٥٤ له شاری بەغدادا گیراو تێیدا بەشداربووم. ڕاستییەکەی ئەگەر بریاری حیزب نەبوایە لەوانە نەبووم بۆی بچم، کە بریاری حیزبیشم پێڕەوی لێکرد بۆیە بوو کە دەرچونم بە نائیب بۆ جاری دووەم بە مجێزی حیزب نەبوو. نەدەشیا لە باری وەهادا نافەرمانی بکەم چونکە دەبوە بەهانەی دەوام دان بە ناکۆکیو دل شکان: سەد فەلسەفەم بەکار هێنابایە بۆ ئەوەی کە هەلوەستم له ئاست ئاشتیخوازی هی قەناعەتە بایی فلسێك بوو. له موناسەبەدا دەلێم، جارێکیان لەگەل ئەندامێکی زیندە دەسەلاتداری حیزب کەوتینە باسی ئەوتۆیی. من گوتم نەدەبوو ئاشتیخواز له دەست درێژیی کۆریای باکوور بەرانبەر کۆریای باشوور خامۆش بێت. له وەلام دا زۆر بە هەناسەی سوارەوە گوتی: کۆریای سەروو کە برامە دەلێ کۆریای خواروو له هەوەلەوە دەست درێژی کرد تۆش بە عەکسەوە دەلێیت. ڕاست وەکوو مەلا گوتی: بە زەرەی کەر بروا دەکەیت بە قسەی مەلا بروا ناکەیت. من لەسەرەخۆ گوتم: بلێم چی کەرەکە ڕاست دەکات و مەلا درۆزنە..

وەك لە بیرمە کۆبوونەوەکە لە مالی فاروق پرتەو گیرا: پاش گفت و لفت و گوتار سێ کۆترەی زیرینی بچووك بە سێ کەس درا لەبری خزمەتیان بە ئاشتی، یەکێکیان کورد بوو.

بەلای باوەری منەوە کە ڕەنگ دانەوەی واقیعی بێفیلە، ڕێك خراوی وەك ئاشتیخوازی، نیقابەی هەرپیشەیەك بێت، کۆمەلەی وەرزێران، مافی ئافرەت.. هی قوتابی.. هی دین و دنیا بێت پێویستە لەلایەن خەلقەکە خۆیەوە بەپێی داخوازی بەرژەوەندو باوەریان ڕسکابێت نەك حکومەت سازاندبێتی چونکە ئەوسا کە بوو بە داروەکازی حکومەت لە خوازو خوایشتی ئەنداما نی دەشۆرێت و ڕەنگە بەزۆریش وەها برەقسێت کە دژی ئەو بنەمایە بێت کە لە سەری هەلستاوە. ئەگەر ئاشتیخوازی بەپێی ڕواڵەتی زیندە ئاشکرای واتاکەی لە عیراق، یان لە شوێنێکیدیکە ڕسکابایە دەبوو نەك هەر یەخەی حکومەتی خۆی وەیا ئەمەریکا بگرێت بەڵکوو باداتەوە سەر چین و ڕووسیاش لەو حالەتانەدا کە ڕەفتاری ڕووەو جەنگیان کردبایە، من کە بەدەم دەرەبەگ دا بێمەوە لە ئاست ئەو دەست درێژییەی لە وەرزێری دەکات دەبێ ڕەخنەی نارەزایی لە حیزبەکەی خۆم و غەیری خۆشم بگرم کە بە تەما بێ خەلق بە گوریس ڕاکێشێت، وەیا بە کەیفە بیان خاتە زیندانی ئەشکەنجەوە. کە ڕێك خراوەکەم هی حکومەتی خۆم، یان هی دەرەوە بوو دەبێ چاوەنۆڕ فەتوا لەوەوە، لە حکومەتەوە، دەرچێت بۆ نارازی بوونم کە ئیتر ڕەنگە بەپێی تەبیاتی خاوەنی فەتواکە بە گژ شتێك دا بێمەوە کە زۆری حەز لێدەکەم.

من ئەگەر کوترەی زێرم پێدرابایە دەهاتم لە سالی ١٩٦١ کە کەریم قاسم بە فروکەی میگ کوردستانی بۆمباردمان دەکرد ئەو کۆترەیەم بۆ بەرەی ئاشتی خوازانی جیهانی دەناردەوەو دەم گوت: مالی قەلب سەربەسەر ساحێبی..

ئەو ڕێك خراوانەی کە حکومەتان سازیان دەدەن هەرگیزاوهەرگیز خەریکی کارێك نابن کە لەژێر سایەسانیداو بە ناوی ئەوەوە هەل نراون بەتایبەتی لەو ولاتانەدا کە (دروشم)ی بێناوەرۆك بایەخدارترە بۆ ڕازاندنەوەی ئامانجی سیاسی لەو بەرهەمەی کە دەبوو هەلگرانی دروشمەکە بە میللەتی بدەن. ئەو لایەنەی کە دەیەوێ لە ڕێی نمایشت و تێك هاویشتن و بێئوقرەییەوە بە دەسەلات بگات چ مەبەستی نییە پەتاتە دەروێ یاخود کارگە ئیش دەکات: کوردی گوتەنی، ئەو لایەنە بەزمێکی دەیزانێ سێ پێییەو هیچیتر.. دەوجا نە حەز لە سێپێیی دەکەم نە بەرژەوەندیشی بو کوردو بۆ جەماوەر تێدا دەبینم نە ئەنجامێکی لێشی چاوەڕوان دەکرێ ئەو هەموو جانفیدایی‌و خەلق بە کوشت دانە دەهێنێت: لوکسەمبوورگ هەناسەشی سوار نەبووەو زۆریش تێرو تەسەلە.. بە هەمەحال فایلم لە تەحقیقاتی جینائی تۆمەتی ئاشتیخوازیشی خرایە سەر.. دواتر، وەك بوتی دەگێرمەوە، ئەو تۆمەتەم بە چاوی خۆم خوێندەوە..

پاش بەسەرچوونی هەرای هەلبژاردنە باس کراوەکەی ناوتوێژی ئالقەی هەشتەمی ئەم یاداشتانە خەلقەکەی بەندیکرابوون و دوور خرابوونەوە ڕێیان پێدرا بگەڕێنەوە بۆ مالی خۆیان. من لە ئیستیراحەتخانەی ئیستگەی شەمەندەفەر دابەزی بووم، لە حکومەتی

هەولێرەوە چ سەرو سۆراغێکی گەڕانەوەم بۆ کۆیێ دەرنەکەوت: کاغەزێکم بۆ وەزیری داخلیە سعید قەزاز، نووسی کە ئەگەر چی دیکە بەندم بکەن لە هەولێر، یەخەی حکومەت دەگرم لە دادگا بۆ زەرەرو مەسرەفێکی لە کیسم دەچێت.. هەر کاغەزم گەیشتە بەغداد متصرف پێوەندی پێوەکردم کە دەتوانم بچمەوە کۆیێو وەزیر دەڵێ ئەو بەینەش بە چاکەی خۆی ـ نەکا لە کۆیێ ناڕاحەت بێ ـ لە هەولێر هێڵراوەتەوە.

چەند قسەیەکم هەیە دەیکەم ئەم جار بە ڕێگای گەشتەکەم دا دەڕوم:

هەرچەند پێویستیش بێبیروڕا بە بەڵگە بچەسپێت، لێرەدا مەودای بەڵگەکاریو چەسپاندنی زانستیو هەڵ وەشاندنی پسپۆڕانە بەدەستەوە نییە، ناچارم بەکورتی لە نیشان دانی بیروڕای خۆم بیمەوە:

بە شێوەیەکی گشتیی ئەوانەی لەم جیهانەی سێیەم دا خەریکی سیاسەتن بابای سەر بە تیۆریو وشەسازیو بەلاغەت و دروشم هەڵ کردن و چشتی ئەوتۆیین بە تایبەت لەنێوان بەرەی بەرهەڵستی حکومەت کە بەشێکی زیندە بەرچاویان لە بنەڕەت دا بەرپرسی خێزان

بەخێوکردنیش نین، تەنانەت بربڕەو کۆڵەکەی ئاغلەب بزووتنەوەی توندوتیژ قوتابی پلەی ناوەندیو بەرەژووروترن کە خۆیان بارن بەسەر باوکیانەوە. تاکێك لەو حیزبانەی بەیداغی نیشتمانپەروەرییان هەڵ گرتووە هەڵ گرتبوو ئەگەر ڕێکەوت کردی بە حکومەت نازانێ چ بکات چونکە پرۆژەی بۆ چارەسەرکردنی هیچ کێشەیەك سازنەداوە.

هیچیان سەرەدەری لە بازارو شەمەندەفەرو مەرەزەی برنج و کێڵگەی گەنم و جۆو توتن و تیجارەتی دەرەوەو ناوەوە.. ناکەن. هەرچی بەرهەم هێنی ڕاستەقینەیە خەریکی کەسبی خۆیەتیو نەدەزانێ خوتبە بدات و نەگوتاری ئاگرین بنووسێت و نەهوتاف ڵێبدات و نەدروشم هەڵ بگرێت. نیشتمانپەروەر تەنها لە گەپی (بژی، بمرێ) پسپۆڕەو وەك دەستی لەسەر پەلاپیتکە بێت وەها ئازاو ئامادەیە هەرچی بەرژەوەندی لە دەستدایەو خەڵقی پێدەژێت سەرەوبنی بکات بە تۆمەتی خوێن مژیو چەوساندنەوەو بورجوازیەتیو دەرە بەگایەتیو سەر بە ئیمپریالیزمیو جنۆکەپەرستی. تا ڕۆژی ئەمڕۆکەی ١٩٨٨/٢/١ لە صەدی یەکێکی ئەفەندییە سیاسەکانی بەرەی هوتاف و دروشم و بژیو بمرێ نەهاتۆتە سەرڕ ڕامان لە ڕەوابوون و ڕەوانەبوونی ئەو قازانجەی (صراف)، وەیا بانك لە خەڵقی وەردەگرێت و بە خەڵقی دەدات.. خوادەست بە عومرمانەوە بگرێ، لە پەنجاکان دا هەر بینایەکی حکومەت بیکردایە پڕبەدڵ داوای

ڕمانییان دەکرد چونکە وامان دەزانی کە بۆ سپای ئەمەریکا دروست دەکرێت.. سەددی دوکان تەیارەخانەی دەریایی بوو.. خولاسە نیشتمانپەروەر لە نێوان چوار دیوارەی خەیاڵ و خەون و ورێنەی خۆیدا دەخولایەوە، هەرگیز ئەو چاوەی ڵێنەرسکا سەیری باری ڕاستەقینەی بازارو کووچەو گەرەك و مزگەوت و ڕەزو باغ و پاوان و کەرخ و پاراوی مەرەزەی پێبکات و تێیبگات:

سەقافەتی ئەزەری، ڕۆشنبیری دنیای سێیەمی لە خۆیو لە خەڵق ترازاندبوو. لەبیرمە کوری خزمێکم لە مەکتەب دەرکرا سەبەب بە کەوتنی دوو ساڵ لە سەریەکی. یەخەی باوکی گرت و هێنایە حەمێلکان کە لە عەسکەری بیکرێتەوە دەیگوت، من ئیستیعمار هۆی کەوتنمە دەبێ بم کرییەوە. باوکەکە دەیگوت ڕۆڵە خۆ من ئیستیعمار نیم.. هیچیشی نەبوو بیکاتە بەدەڵی عەسکەری. ئەم خزمەی من نموونەی ملیۆنەها تێکۆشەرانی جیهانی سێیەمە. لە نموونەدا دەڵێم، توتن مایەی ژیانی صەدان هەزار کوردی عیراق بوو: دەسا پێم بڕوا بکەن تاکەیەك کادری پارتی، وەیا شیوعی نەبوو پرۆژەی چارەکردنی کێشەی توتنی گەڵاڵە کردبێت. تێکۆشەران هەر ئەوەندە لە خوابشتەکانی جەماوەریان دەتۆژیەوە کە بیکەن بە هۆی قەپ و قیرو سەغنەت کردنی حکومەت.

ئەم وێنە سەرپێییەی حاڵی بزووتنەوەی نیشتمانی بەر لە شۆڕشی ١٩٥٨ تروسکێکە لەو ڕۆژگارەوە بۆ دواڕۆژ تێبر دەکات و دەشێ لەو ڕۆژەوە چاوی بینا مەجهوولی دوای چەندین ساڵی دانەهاتووی پێببینێت چونکە وەك دەگوترێ: مانگەشەو سەر لە ئێوارێوە دیارە.

من لەبەر زۆر هۆی تایبەت بە خۆم ئەو تیژڕۆیەو پەرگیرە نەبوم کە لێرەدا لێیدەدوێم: چ لەلایەن تەبیات و مجێزەوە بێت و چ لەلایەن جۆری تێفکرین و عەیارەی چاکەو خراپەو سوودو زەرەرەوە بێت هەمیشە بەلای تێك گەیشتن و مەسلەتیو پێکەوە ژیان و هاریکارییەوە بوومەتەوە.

هەرگیزاوهەرگیز لەوانە نەبووم دڵم بۆ قوربانیدانی خۆڕاییو بێئەنجام چووبێت، وەیا لە کوڵانەی دووبەرەکیو سێ بەرەکییەوە بەتەمای سوودی گشتیی میللەت بووبێتم. لە خەون و ورێنەش دا باوەڕم بەوە نەبووە کە ڕووت و ڕەجاڵی کوردەواری بەگرتنی بینەقاقەی یەکدی لەژێر سایەی دروشمی شەڕ بە دنیا فرۆشەوە پاڵ دەداتەوە لەناو بەهەشتی شیرو هەنگوین.

مەجلیسی (یەك کۆ بوونەوەو هەشت ڕۆژ تەمەن) مەرسوومی هەڵ وەشاندوەی دەرچوو. هەر خۆشییەکی سەرکەوتنە

بچکولانەکەی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی بەخشی بووی بەسەر لیوانەوە وشك بوّوە. کەسانیکی نەختیك لە نزیکەوە ئاگاداری پروژە سیاسیەکەی نووری سەعید بوون دەیان زانی هەویری ئەم جارە یەکجار ئاوخوازە.

لیرەدا یەك تێبینی بنجیم هەیە لەبارەی زیدە تیژبوونی حکومەت لە ئاست هەرچی پێیدەڵێن بەرهەڵستی کردن لە سیاسەتی نووری سەعید کە نوینەری دیرین و کلاسیکی رووکارو رارەوی عیراقی پاش عوسمانییەکان بوو: من نامەوێو ناش پەرژێم سیاسەتی نووری سەعید بنرخێنم چونکە خەریکی گەشتی ژیانی خۆم نەك هی ئەو، لەو گەشتەش دا هەر ئەوەندە ریگەیەم دەبێ بەسەر سیاسەتی ئەو مروڤەوە کە لە گەشتی من دا تیشکی دابێتەوە. من دەمەوێ رەفتاری بەرەی بزووتنەوەی نیشتمانی هەڵ سەنگێنم کەوا بێگومان دەخلی هەبوو بەسەر ئەو سیاسەتەی پیرەوی دەکرا لایەن حکومەتی عیراقەوە چونکە لە ئاشکرا ئاشکراترە، بابی زیدە تێنووسانی لایەنێکی ملانێ لایەکەی دیکەش تێدەنووسێ مادەم هێزی پێوە مابێت.

بزووتنەوەی نیشتمانی عیراق لە هەموو عومریدا نە خۆی ناسی (چەند دەخوات و چەند دەبەزێت) نە توانیشی هەڵەتەکانی خۆی لە چارچێوەی (مومکین) بگونجێنێت، نە رۆژەك لە رۆژان خەریك بوو بزانێ میللەتی عیراق چی دەوێت:

## لەلایەن خۆنەناسینەوە:

قسە کورت دەکەمەوەو دەلێم، ئەگەر نیشتمانپەروەران خۆیانیان بناسیایە دەبوو هێندی مندالی شەرەگەرەکێ واقیع بێن بوونایە کە لە ئاست دوژمنی دەسەلاتداردا پێویستە یەك دل و یەك هەنگاو بن کەچی لەناو بەندیخانەش دا یەخەی یەکتریان دەگرت. لەپاش راپەرینەکەی (وثبە) ساڵی ١٩٤٨ یشەوە پەرگیریو لە خوبایی بوونیکی ئەوەندە ساواهانە زوربەی خوێن گەرمەکانی هوتاف لیدان و نمایشت گیران و سینگ دەرپەراندنی وەها گرتبوّوە هەموو سنوورێکی زرە هوش و شکستە گونەن (منطق)ی بەزاندبوو. وەتەنیەکان وەهایان دەدایە بەرداس دەت گوت رۆژی حەشرەو بەهەشتیو جەهەندەمی لەیەکدی جودا دەکرێنەوە ئیتر نەك هەر دەستەو دایەرەی حکوومەت و اقطاع و بورجوازییو رەجعییەکان، بگرە ئەوەی کاکڵ کاکڵ نەبێت لەم جیهانەو لە بەهەشتیش دا جێی نابێتەوە. من خۆم ئەو رۆژانەو ئەو بۆچوونانەو ئەو شالاوە فێگرتوانەم دیتووەو تێیدا ژیاوم، لە بەشکیشی، بە ناچاری، بەشداریم کردووە. دوای وەثبە وەتەنیەکان وەها یەخەی یەکدیان گرت لزوم نەمابوو حکومەت پێیانەوە خەریك بێت. وای لەو خەرمانە بێکۆزرەی دەمان کوتایەوە!!

## لەلایەن خۆنەبەستنەوە بە مومکینەوە:

کە پەرگیری (تطرف) رابەر بوو تەلاق دانی ئامانجی مومکین و کۆشان بۆ نامومکین دەبێتە سێبەرت و لێت نابێتەوە، واتە لەخۆتەوە خەریکی نامومکین دەبیت بێ ئەوەی زەینت بەدوا مەبەستی سەخت و رەق و تەق و شەق و پەق دا بگێرێت. لە نموونەی خۆمالی دەلێم، کە حیزب بەیانامەی هەلبژاردنی بۆم دەرچواند سێ ئامانجی سەرەکی تێیدا: / - تەئمیمی نەوت ٢ - قبوڵ کردنی چین لە نەتەوە یەك (نە) گرتوەکان ٣ - لەغو کدنی مەجلیسی نەعیان. بوو. برایەنە چەند سەیرە جەنابی کاکە مسعود محمد (چینی شەعبی) شریت پێچ بکات و بەدەم گوتاری ناو مەجلیسی نوینەرانی عیراقەوە رایکێشێت

بۆ سەر کورسییە رەواکەی خۆی لە نێوان پێنج کورسییە دائیمیە مەجلیسی ئەمن. سێبەرێکی ئەم پاڵەوان پفییە لە بەشێکی حیکایەتی (فسوس پالەوان) دەبیسرێت. تەئمیم دەفەرموویت؟ دەسا بە تەپەو توزی تەیموومی بێئاو و زەوادی بێپێخۆر سوێند دەخۆم: حکومەتی نووری سەعید خۆشی لە سێدارە دابایە بوی نەدەچووە سەر، نەوت تەئمیم بکات نەك جەنابی من بیکەم!!

لەلایەن هەست نەکردن بە دڵ خوازی تێکرای میللەتەوە:

جەماوەر، میللەت، خەڵقی شارو دێو عەشرەت، خەلقولڵاو هەرچی ناوێکی لێیدەنێیت بەپێی هەر عەیارەیەکی بەرژەوەندی پێناقییەکەیەوە، خۆشی بێت و ترشی بێت، بەدواگوزەران و ماڵ و منداڵ بەخێوکردن دا دەگەرێت: چاری ناچارە دەبێ دەست بۆ شتێك بیات کە جەمی رۆژانەی پێدابین بکات. ئەگەر سەرشێت نەکرێ، وەك کە سوفی تەریقەت سەرشێت دەکرێت. خەتەجووتی گارەش بەجێ ناهێڵێ بۆ نمایشتی خوێن گەرمانە. بەربەیار یەخەی حکومەت ناگرێت لە پێناو ئامانجێکی نانی تێدا نەبێت. گوزەرانی خۆی بەقوربانی شاپەرە ژەنگارەکانی کوتەرەی درۆزن و راست گۆ ناکات. بەکورتی ژیانی کولەمەرگی کومەلگەی وەکوو کوردەواری سییەکان و چلەکان و پەنجاکان ئەوە نەبوو هەناسە ساردێکی ئەو رۆژانە بەرەو ئامانجی دوورە دەست و ئاسوی بەرزی چارەنووسی هەموو مرۆڤەوە بیات کە بووبووە خەیاڵ و خوتخوتەو خوولیای تێکۆشەری کورد تا ئەوەی وەهای لێهاتبوو خەریك بوون بە دەسکەوتی مومکینەوە

تاوانبار بکات گوێا ئامانجی ئەوتۆیی میللەت بەرەو چارەسەری (اصلاحی)یەوە دەبات و لە نیازە بنەڕەتیەکیانی پرولیتاریای دوور دەخاتەوە.

تێکۆشەری کوردو تێکرای عیراق بە شانازی‌یەوە لەپێناو مان گرتنی کرێکـارانی واقلواق ئامـادەی خۆبـەخت کردن بوو، . یەخـەی حکـومەتیشی بۆ دەگرت. بەلام بەلایەوە مردەنی بوو ئەگەر لەپێناو بەرژەوەندی گوزەرانی ڕەش و ڕووتی وڵاتی خۆی بە نەرمی لەگەڵ حکـومـەت بدوێت. هەتا بۆی لوابایە بۆ ڕیسوا کردنی حکومەت حەزی بە هەراو مەزادو تێك هاویشتن و نمایشت و نازانم چی دەکرد هەرچەندە بەوەش دا نانی ڕۆژانەی عەمباڵ و کرێکارو چەوسایەوەو ئەهـلی بازاری شارەکەی خۆی دەبری. پێی وابوو هەرچی بەلای حکومەتەوە چاك بێت دەبێ ڕووڕەش بکرێت با لە حەقیقەتیش دا چاکەی پێوەبێت.

تێکۆشەر پێی وابوو نووری سەعیدو برادەرانی دەرگەی خەزێنەی بێ‌برانەوەیان لێ‌بەستوە. هەر برمێ میللەت لە تێرییان دەدرێت ئیتر مانای چی خۆ بە شتی (اصلاحی) کەم بایەخەوە خەریك بکات. لە هەموو کەس ڕوون بوو بزوتنەوەی نیشتمانی ڕازی‌نی‌یە بە چارەیەك کەمتر بێ لە ڕماندنی ڕێجیمی بەر لە ١٤ ی تەمووز. ئنجا کە ئەمە وەهـابێت ئەو ڕێجیمـە چی دەکـات لەوە کەمـتر بێ کە خۆی بێ‌بپـارێـزێ. وەك دیتـمان کار گەیشتـە ئەوەی کە حیـزبی سەربـەقـەومـایـەتی کورد سێ‌و دووی نەکـرد لە خۆدانەپاڵ ئاشتی خوازی کە لە ئەزەر حکـومـەت دا ناجـایـەز بوو هەرچەند جاڕێ هەبـوونی خۆیشی لەلایـەن قانـوونـەوە دانی‌پێ‌نـەهێنـدرابوو، واتە دەی‌زانی خۆگێری بکات لە خۆ ئاشکرا کردن بەلام چاو نەترووکێنێ لە دەربرینی لایەنگیری خۆی لە بزووتنەوەی ئاشتی‌خوازیی سـەر بە ئینتـەرنـاشنالیزم. کە ئەمە حالی تێکۆشـەری کورد بوو هی غەیری کوردیش هەر وەها بوو. هەرچەند حیزبە ئاشکراکانی وەکوو وەتەنی دیمـوقـراتی‌و ئیستیقـلال [جـەبهـەی شـەعبیش کە پتر کۆمـەلـەی پیـاوماقـوولان بوو لەوەی حیـزب بێـت] لە کۆبـوونەوەی یەکەمی ئاشتی‌خـوازان بە نوێنـەری بەرچـاو بەشـدارییـان نەکـرد بەلام لە جەریدەکانیان بە گەرمی خۆشامەدی‌یان لێ‌کرد. جگە لەوەی کە پێشتر مەعلووم بوو دانـوویـان لەگەڵ حکومەت ناکوڵی‌و ئەگەر مەجلیس بەردەوام بێ هەرای کوشـندە دژی ڕێژیم دەنێنەوە. بەرەی نیشتمانی بەو دە نائیبـەی گەیاندنیە مەجلیـسی نوێنەران هەڕەشەیەکی ڕیشـەهەلکەنی لە ڕێـژیم دەکـرد. نووری سـەعیـد باوەڕی هەرچـۆنێـك بووبێت بەرانبەر چاکو خراپەی سیاسـەتی خۆی‌و غەیری خۆی لێی چاوەڕوان

نەدەکرا سەر دانەوێنێ بۆ ئەو هەڕەشـەیە، بەرەی نیشتمانیش دەسەلاتی خۆ پاراستنی نەبوو لە ئاست هێرشێکی درندانەدا کە دەزانین ـ دواتر لە ١٤ی تەمووز دیتیشمان ـ هێرش بۆ سەر ڕێژیمی شایەتی لەلایەن ناحەزانیەوە چۆن بوو! هەر بێ‌هێزی موعارەزەی سیاسیەکانیش بوو چەپـارەی‌دان لە تونـدوتیژی کەللەتەزێنی گەردەن پەڕێنی ڕێژیم کە لەوەنـدەی تێ‌پـەر نەکـرد چەنـد کەسـانێکی لە وڵات دەرکـردو هێندێکیشی بۆ ماوەیەك خستنە بەندیخانەو لە هەلبژاردنیشی گێڕانەوە دەنا ئەگەر مل ملانێی دوو لایەنی هاوهێز بایە دەبوو سەدان سەری تێـدا بێ‌کـلاو مابـایـەوە، یاخـود کلاوەکـان بێ‌سەر دەمانەوە. من مەبەستم نی‌یە بە شان و باڵی کەس دا هەڵ بلێم: هەر ئەوەندەم دەوێ باوەڕی خۆم لە ئاست کارە ساوایی‌یانەکانی جەماوەری تێکۆشەران دەربـبڕم کە لە هەمـان کاتیش دا تەفـسیری هەڵـوەست و ڕەفتاری حکـومەتی بەر لە تەمووز دەکات. ئەو ساوایی‌یە لە سالانی پاش تەموزدا مەیدانی بۆ چۆل بوو هەتا تێکۆشەران تێراو و مەست بوون لە نۆشینی خوێنی خۆیان.

ئەم ڕستـەیـەی هەرە کۆتـایی قسـەکانم لزومی نەهێشت بیلێم، دۆرانـدنـی شـەڕەدنـدووکـێی سالانی ١٩٥٣ و ١٩٥٤ لەلایـەن تێکۆشـەرانەوە بایی تۆسکالێك بەلای لێکدانەوەی ژیرانەو هەنگاوی واقیع بینی‌یەوە نەبردن:

هەرچـۆنێـك بێت گەشتـەکـەی ژیانی من بەناو ئەو چرگەنانەدا گەیشتە نیوەندی ساڵی ١٩٥٤. لە میراتی ئەو دوو دەورەیەی نیابەت زیادبوونی ئەرك و مەسرەف و بەرپرسیم بوو لەچاو سالانی بەر لەو نیـابـەتـە. زیـادکـردنـی مەسرەف وەهـای کرد پتر خەریـکی نان پەیـداکـردن و گوزەرانـدن بم کە کێشـایـەوە بۆ قوڵ و باسـك هەڵ مالین لە محامات کە دوای ئەختێك بۆی دەچمەوە.

لەو ڕۆژانەدا کە کوردی گوتەنی ئەستێرەمان کزبوو. خێرەومەندە زمان لووسە خۆ ڕەپێش کەرەکان کە زوربەیان پێشتر بە دەورمانەوە بوون کەوتنە فیتنەبازی‌و خەبەرلێ‌دان: چەند کەسانێکیان لە خزم و دۆستەکان نان براو کرد. هێندێکیان بە نەقل کردن دان و خەریکیش بوون تێ‌کـۆشن بۆ بەگـرتن دانی هی‌دیکـەش. ئەگـەر متصرف، اسماعیل حقی رسول، لەدڵ دا دۆسـت نەبوایە سەغلەتی پتر تاوی بۆ دەهێناین: لە نموونەدا دەلێم. لە هەولێر بووم کاك مەجیدی ئامۆزام کە کارگـێڕی قوتـابخـانەی (حاجی قادر) بوو لە کوێی ئیخباریەی لێ‌درابـوو لەلایەن پیاوچاکانەوە نەقل کرابوو بۆ گوێر. بە ڕێکەوت دەچووم بۆ لای متصرف کاك مەجید پێم گەیشت گوتی ماڵ و منداڵ لەنـاو سەیارەن و لۆریش بە بارەوە ڕاوەسـتاوە کە بڕوین بۆ گوێر،

داخـوا رێ نابێ لە هەولـێر بمێنمـەوە؟ کە چوومـە لای متصرف، رەحمەت لە گۆڕی، بەر لە دانیشتنم گوتم فلانەکەس، وا ئاموزام لەو وەزعەدایە. . دەرلەحزە ئەو ئەرزوحاڵەی لێوەرگرتم کە خۆم بە کاك مەجیدم نووسی بوو، لە سەری نووسی بۆ مدیری مەعاریف کە خاوەن عریضە لە قوتابخانەیەکی هەولێر دادەمەزرێ، ئەگەر جێ نەبـوو یەکێکی‌دیکـە نەقل بکەن تا ئەمیان لە هەولێر بێـت. . صەد خۆشی: هەر لەو ڕۆژەدا خانووشیان دەست کەوت و باروبینگەی نامـزەدی گوێـر، لە گەڕەکی خانەقای هەولێردا خـرا. . لزومیش نەبوو کەسی‌دیکە نەقڵ بکرێت چونکە شاغیر هەبوو.

هەر لەو ڕۆژانـەدا ئیشێکی‌دیکـەم بە متصرف، اسـاعیـل حقی رسول، بوو:

مەلای دێیەکی دەوروپشتی کۆیێ بەراوێکی هەبوو تەماعکارێك لەبنەوە لەگەڵ مەئمووری تاپۆ ڕێك کەوتبوو کە بەفێڵ ئەو بەراوەی لەسـەر تاپـۆ بکـات، بەرێ‌نمـوونی مەئمـووری‌تاپۆ سەنەدێکی بە تونکڵیان پێ‌ئیمزا کر،دبوو کە بتوانرێ نەقڵی خاوەنایەتی زەوی‌یەکەی پێوە مومکین بیت بۆ سەر ناوی قوڵ برەکە. چوومە لای متصرف: حیکـایـەتـەکـەم تێ‌گـەیـاند کە ئەگەر فریای نەکەوێ بە مەحکەمە دۆڕاوە. . گوتی، ئەم مەئمووری تاپۆیە دەناسم. لە ئاکرێ، یان لە قەزایەکی‌دیکە بوو، ئەدەب خانەی مزگەوتێکی بە پارە قووت دا. . مەئمـــوورەکـــەی نەقـل کردو چاوێکی وەهـاشی لە تەمـاعکـارەکـە سوورکردەوە وازی هێنا لە مامڵەتەکە بێ‌ئەوەی بوێرێ داوای ئەوەندە پارەیە بکاتەوە کە لە بەیعی (عربون) مامڵەتەکەدا بە مەلای دابوو. مەلا پیاوەکی زۆر قسەخۆش بوو، ئەگەرنا ئەو پێنج دینارەی کە بۆ مەسرەف پێی‌دام و منیش دڵیم نەشکاندو لێم وەرگرت بەشی نیوەی نیوەی سەفەرێکمی نەدەکرد لەو ڕۆژانەدا. .

لە چالاکی محامات دا بێ‌ئەوەی سـەنەدو مەنەد ئیمزا بکەین لەگەڵ مامـۆستا بەکر ئیسـاعیل بەیەکەوە دەکۆشـاین: لەسـەرەتاوە کە جارێ ڕێی ڕانیـە گەلالـە نەکرابوو ئۆتومۆبیل پێیدا بڕوات، جغزی تێدا سوورانەوەمان زۆر فرەوان نەبوو، دواتر کە ڕێگاکە کراوە، ڕانیەو قەلادزەمـان لێ‌بـوو بە بەشێکی کۆیێ: من لە سەیداواو بوسکێنی نزیـك ڕانیـەو لە سنـدۆلانی پژدەر قوناغم ماڵە خاڵەکانم بوو، لە قەلادزەش حاجی ئەحمەدی حەمەدەمین، کوڕەخاڵی کاك بەکر، بە خزمی منیش حیسـاب دەکرا ئیتر هەر دوو قەزا بۆ هەردووکمان وەك کۆیـە وابـوو بگـرە لە زۆر ڕووەوە لێـمان خۆشتر دەهات. . گیانی عەشیرەتگەری‌و میوان نەوازی لەو تەرزە جێگایانە تا بڵێی جودایە لە شاری داخراو.

**لەو ساڵەی ١٩٥٤ کە تێ‌شکاوی ئینتیخابات بووین دەعوایەکی تەسویەی یەکجار گرنگمان بەدەستەوە بوو لە دوو دێی (کانی‌وەتمان و شێخ مەسووریان)ی دۆڵی شاڵەبەگی سەر بە محاڵی خەلەکان. مەلا حەوێـزاغـای تازە نائیبمان ١٥ ساڵێك دەبوو بە براگەورەیی ساڵانە ملکـانـەی لە زۆربـەی خەڵقـەکـە دەستاند. بەر لەوە بە دەعواکە ڕابگەین، هەر لە کەشفی تەسویەی هەوەل جارەوە ئاغلەب فەلاح و ئاودێـرەکـان دانیـان هێنـابـوو بەوەدا کە ملکـانـەیـان داوە، بەڵام گوتبـووشیـان ملکی خۆمـانە. دەعوایەکە لە ڕووی قانوونەوە زۆر بێ‌هێــزبـوو ناچـار بووم، بە موافقـەی کاك بەکـر، بێ‌دەمـە بەر تەئجیــل. . باریکــە ڕێگـەیـەکم لەوەدا دۆزی‌یـەوە کە داوابکـەم سەرلەنوێ کەشفی ئەو دوو دێیە بکرێتەوە. . معاونی تەسـویەی ڕانیە کاك بایز عبداللە سەلماندی‌و ڕۆژی کەشفی دیاری کرد. . لە کۆیەوە بە سواری هاتین بۆ دێی کانی‌وەتمان، تاقمی ئێمەو هی مەلا حەوێزاغا قەلەبالغیەکی بەرچاوی پێك هێنابوو. محامی مەلا حەوێزاغا. صدیق نقـاش، کە دەمێـك بوو وەڕز بووبوو لە تەئجیل و تەئجیل و ئەم جارەیــان کە سێ سەعــات بەســواری ولاغ لەو شاخ و داخــە سەرەژوورو سـەرەژێر بۆوە بەجارێك بێ‌تاقەت بوو. سەرت نەیەشێنم دوای دوو ڕۆژ کەشف و شایەدی‌و نازانم چی گوتی:**

**لە ڕاهی خوا قوتارم بکەن، وەرن با ڕەئیـسی تەسویە بکەین بە حەکەم چ بڕیارێکی‌دا پێی ڕازی بین. . من و کاك بەکر لە خوامان دەویست بەڵام لە ڕواڵەت دا بە خاترانە تەکلیفەکەیان قبوڵ کرد. .**

سێ شەو لە ماڵی کوێخای دێی کانی وەتمان ماینەوە ئەوەندەی خزمەتی ئێمـەو جەمـاعـەتی مەلا حەوێـزاغـاش کرد کە بە موجـامـەلەو بۆ دلـدانـەوەی صدیق نقـاشیش کە ڕەفاقەتی ئێمەی پێ‌خۆش بوو بە زۆری جەمی نیـوەڕۆژەیـان لە ماڵی کوێخـا دەبـوو. هەر لەبیرمە، ڕۆژێکیـان گوێم دابـوە ڕادیۆی قاهیرە کە سەرۆك جمال عبدالناصر خەریکی دوان بوو لە مەیدانی (منشیّة). لە گەرمەی حەماسـەت دا بوو کە تەقـەی لێ‌کـرا: من تەقەکانیشم بیـست. ماڵم حەقە جەمال نەشێـواو دەنگی نەلـەرزی. . گرمـەی هوتـافی ئەو هەزاران هەزار خەلقـەو تێـك هاویشتنیـان و سمـرسمـرەی خەلقـولـلا لە دوورەوە دەهشـەتی بۆ دڵی گوێ‌گر دەهێنا. سەرۆك جەمال کەوتە حاڵەتێکی مەجـذووبـانـە، بە دەنگی بەرزی دلـێر دەی‌گـوت و دەی‌گـوتەوە: یاشباب، یارجال. . .

بۆ سـەبەینێ، وەها بزانم ڕێکەوتی ٢٩ی ئەیلوول بوو، گەڕاینەوە کۆیێ. . هەر لەبیرمە، هەوری پڕ بوو، ڕشێنەش باری بوو: کە

بەسەر هەیبەسولتان کەوتم نواریمە قەندیل، لە کەلینی هەورانەوە دیاربوودەوروبەی لووتکی (قووچ باش) سپی بووبوو. .

ئەم دەعوایە پاش چەند مانگێك بریاری تێدا ددرچوو: رەئیسی تەسویە یەك بستە ئەرزی بە مەلاحەوێزاغا نەدا. کەم موژدەی وەها خۆشم بیستوە چونکە لە کاتێکدا بوو تازە وەختێك بەسەر دەرهاتنم لە حەبسی ١٥ رۆژەی نێوان ٢٦ی شباط و ١٢ی مارتی ١٩٥٥ تێپەڕی بوو. ناوچەی دۆلی شالەبەگ لە دەسەلاتی (ئاغا) دەرچوو. . صدیق نقاش دەعواکەی استئناف کرد لە سەروکایەتی استئنافی تەسویەی سلێمانی کە ئەوسا مامۆستا فایق هۆشیار سەروکی بوو: خەریك بوو بچێتە ناو دەعواکەوە، گوتم ئێمە هەر دوولا رەئیس تەسویەمان بە حەکەم داناوە کە بە بریاری رازی بین. مامۆستا فایق کە (تحکیم)ەکەی دیت یەکسەر کۆتایی بە دەعوا هێناو بریاریدا بە رەددی داخوازییەکانی مەلاحەوێزاغا. . من ئەو بەیانییە گەیشتبوومە سلێمانی، بێوەخران گەڕامەوە بۆ کۆیێ کە لەو چەند مانگەدا ڕێگاکەی بەرەو رانیەی گەیشتبوە جادەی نێوان دوکان و رانیە. . لە نزیك دێی شێخ مەسووریانەوە خەبەرم بۆ خەڵقەکە نارد کە دەعواکەیان یەکجارەکی بە سەرکەوتوویی بنەبڕ بوو. ئەوسا هاتوچوی ئەم سەرو ئەو سەری نێوان کۆیەو سلێمانی بە ترمبێلی خصوصی دە دیناری دەخوارد. .

پێویستە بڵێم لەدوای تێشکانمان لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٥٤ سەفەرێکی رانیەم کرد. کاکە فوزی صائب قائمقام بوو: هەرکە بیستی لە ماڵی خاڵە خدرم دابەزیوم بە خۆیو دەستەودایەرەی حکومەتی رانیە هاتە بەخێر هێنانم. مرۆ نابێ مەردایەتی مەردان بن لێو بخات. لەو سەفەرەدا حکومەتی رانیە وەهای رێز لێنام ئەگەر لێقەوماو نەبام زاتی نەدەکرد وەهام شێرن بکات. کاکە فەوزی وەهایکرد کە لەو دەمەدا بڵێم: بەراستی دۆڕاندنی ئینتیخاباتی ئەوتۆیی خۆشترە لە بردنەوەی. .

## بچمەوە بۆ سەروکاری ئەو پازدە رۆژەی گرتوویم:

هەرچەند کەین و بەینی توندیو تیژی حکومەت لە هەڵبژاردنەکەی دوایین دا چاوی خەڵقی شکاندبوو، ماکی بێئۆقرەییو بزوزی هەم لە شێوەی زانەوەی ئاساییداو هەم بە هۆی هان دانە بێوچانەکەی رادیۆی (صوت العرب) لەلایەن ئەحمەد سەعیدەوە کەوا بەراستی هێندەی (یونس بحری)یەکەی رادیۆی بەرلینی سەردەمی جەنگی دوەم کاریگەر بوو، ئا ئەو ماکە مانگ لەدوا مانگ پتری هەست پێدەکرا تا رادەیەك حەزکردنی ئەو خەڵقەش لە بیستنەوەی دەنگ و ناوی خۆی لە رادیۆی میصر. وەك کە رۆژانە راپۆرتی نمایشت و نارەزامەندیو توورەییکەسان و شوێنان و میللەتانی دەخوێندەوە وەهای کرد کە زوربەی خەباتگێرانی کۆیێ، بەتایبەتی هی سەربەچەپ کە دەیەویست یەك نەوا بێت لەگەڵ دەنگ و رەنگ و سەنگی بەرەی یەکیەتی سۆڤیەت، وەهایکرد بکەونە رێك خستنی موزاهەرە: ئەم نیازە لە رۆژی ١٩٥٥/٢/٢٥ پێك هێنرا، من لە زویکەوە زانیم و زۆریشم پێناخۆش بوو شتی وەها بێسەمەرە قوربانی بۆ بدرێت: گۆیا چ سوودێك بە کوردو ئادەمیزاد دەگات بەوەدا ئەحمەد سەعید بڵێ کۆیەی تێکۆشەر وەهاو وەهای کرد!

پاش نوێژی جومعە دەست کرا بە موزاهەرە لە دەورو بەری بازارەوە بەرەو سەرای حکومەت. خۆو تاڵع هێزی پۆلیس لە دەست سەعیدی حەماغای رانیە بوو کە خۆی کۆیی بوو هەتا توانی پۆلیسەکانی بەرەو پاش کشاندەوە بێئەوەی دەس بوەشێنن. لە ئاکامی ناچاری چەند تەقەیەك کرا، یەکێکی زامدار کرد بەلام دەردەست نەکرا. من لەماڵەوە دەرنەچووم. دەشم زانی حکومەت لێیان وسکت نابێ. . .

سبەینێ بەرچاییم دەخوارد، خەریك بووین فەحسی تووتنمان بۆ بکرێت، لە قایمقامەوە داواکرام بۆ سەرا. . سەرت نەیەشێنم من و کاکە زیادو بەرپرسی پارتی نێردراین بۆ هەولێر بە سەربارەی خۆرایی خراینە قاوشێکی بەندیخانە لەگەڵ حەبسی عادەتی. تێکرامان چل کەسێك دەبووین. گرتوەکان کە هێندێکیان لەسەر هیچەش گیرابوون، ئەوەندە پیاوانە بەخێریان هێناین و وەها رێزیان راگرتین بە قسە ناگوترێ. ئەوەندەی فەقێ لە دەرس خوێندنی لای مامۆستاکەی بە ئەدەب و وێل و تەرتیبە ئەو گرتوانە وەهاو بەولاوەتریش بوون. خەبەری گیرانمان زووبەزوو زاندراو بە هەولێردا بڵاو بۆوە ئیتر لە سبەینێوە رێزی برادەران بۆ سەرلێدانمان شریتەی بەست و نەپسانەوە: هەر رۆژە لە ماڵی برادەرێکەوە نان و پاتی بەگزادانەمان بۆ دەهات. بە هەموو عومرم ئەوەندە سێوو پرتەقاڵم بە دەوری خۆمەوە نەدیتوە وەك لەو رۆژانەدا دەم دیت. د. مەردان عەلی رەئیس صحة هەموو رۆژ بە ناوی تەفتیش دەهاتە لامان و وەهای کرد هەموو شتێکی حەبس خانەکەمان لە هی ماڵەکانمان خاوێنتر بێ. چەند رۆژان لەگەڵ ئەو برادەرەگیراوانەو سەرلێدەرەکانمان بە کامەرانی بردمانە سەر هەتا د. مەردان وەهای کرد بگوێزرێینەوە بۆ ژووری (تضمید). باوەرم پێبکەن غەریبی هاورێکانی قاوشە عومیەکەمان دەکرد: لەبیرمە شەوێکیان چوار گەنجی ١٧ ـ ١٨ ساڵەیی قۆز کە سەر بە

عەشیرەتێکی ئەولای ڕەواندزەوە بوون گەپێکی خۆ ولاتی خۆیانیان کرد بە گۆرانی تایبەت بەو گەپەوە. ئەم چەند دێرەم لەو گۆرانیە بەبیر ماوە.

وەی ئەز هاتم ئەز هاتم
حەپکولانێ حەلهاتم
یارێ پمەمکا نخافتم

تومەز (نخافتن) بە واتای (داپۆشین) بوو لەگەل (نهفتن)ی فارسی کە نهێنی کوردی‌یە یەك دەگرنەوە.

دەبێ بلێم، نوورەددیناغای حاجی ڕەشیداغا هەموو بەیانی‌یەك سینی‌یەکی ڕازاوەی بەرچایی دەناردو لە هەوەڵەوە هەموو نیوەڕۆژێکیش خواردنی شاهانەی دەنارد کە بایی برادەرە حەبسەکانیشی دەکرد، هەتا بە ئیلحاحی ئێمە نیوەڕۆژەکەی ڕاگرت چونکە هەر ڕۆژە برادەرێك بەلکوو پتر لە یەکێك نانی بۆ دەناردین بەو جۆرەی کە باس ناکرێ، دیسانەوە لە سێ ڕۆژان دا ڕۆژێك خواردنی بێ‌حیسابی بۆ دەناردین:

دوای چەند ڕۆژێك لە گیرانمان بەڕالێبوونی خۆمان و دۆستان و ئەو خزمانەی لەکۆیەو ڕانیەوە [خالەکانم] هاتبوون نامەیەکم نووسی بۆ خوالێ‌خۆش بووی ئەحمەد موختار بابان کە چۆن لە خۆڕایی گیراوین. ئەو جوانمەردە لە دەمی کە کاغەزەکەی پێ‌گەیشتبو کەوتبوە تەلاشی بێ‌وچان؛ بەو حورمەتەی کە هەی‌بوو لە هەمان ڕۆژدا وەهای کرد حکومەت بسەلمێنێ بەرەللا بکرێین. عەلی ئاغای حاجی ئەحمەداغا، نائیبی هەولێر، لە بەغداوە بەسەردان گەڕابۆوە هەولێر هاتەلامان گوتی: ئەمری بەردانتان لە ڕێگایە بەپۆستە دەگاتە متصرف. سەیر لەوەدایە، کابرایەکی ڕوتەڵەی بۆرەپیاو خرابوە قاوشەکەمانەوە وامان زانی جاسووسە بەسەرمانەوە، کتێبی دەگرتەوەو خەبەراتی بە خەلکەکە دەدا. سەغلەتیان کرد بەوەدا پێیان گوت قسەکانت درۆن. ئەویش سوورهەلگەڕاو سوێندی خوارد لەسەر هێندی کە سێ ڕۆژی یکە ئێمە هەرسێکمان لە حەبسخانە ڕزگار دەبین. کە ئەمەی‌گوت جارێ عەلیاغا نەهاتبوو: وەها دەرچوو کە دوای سێ ڕۆژ ئەمری بەردانمان گەیشتە هەولێر بەلام دەرچوونمان کەوتە ڕۆژی چوارەم، چونکە ئەو ڕۆژە دەوام بەسەرچوو بوو. دەبوو بلێم من و کاکە زیاد کاغەزمان ئیمزاکرد بۆ ئەحمەد موختار بابان..

حکومەتی بەغداد بە حکومەتی هەولێری ڕاگەیاند بوو کە بە تۆمەتی بەشداری‌کردن لە موزاهەرەی چەکدار بدرێینە مەحکەمە.. دوای بەربوونمان لەگەڵ کاکەزیاد بۆ بەغداد چووین. بە شێوەیەکی بەربلاو خەبەری گیرانمان زاندرابوو لە بەغداد.. چووینە سپاسگوزاری ئەحمەد موختار لە ماڵەکەی‌و بە عادەتی خۆمان سەردانی دۆستانمان کرد: لای صادق البصام بووین بە ڕێکەوت حکمت سلیمانیش هات. بە نوکتە گوتی: چاوەڕوانم دەکرد (حلاوة مسکت ـ مسقط) بخۆن لە بەندیخانە، زوویان بەردان. گوتم: دوو حەلاوەی مەشوور هەیە یەکیان ئەوەی فەرمووت حەلاوەت مەسکەت بەشی ئێمەی تێدا نەبوو، ئەوی دیکەیان (منّ السلیمانیه ـ گەزۆی سلێمانی) فەخامەتتان چانستان هەبوو لێتان خوارد.. بوو بەپێکەنینێکی خۆش. گوتی: یاأخی خلونی بغرفة الاعدام وأنی مالادری شنو هی المسألة..

چەند مانگێك هاموشۆی هەولێرمان کرد بۆ دادگەی جەزایی کە سەیری دەعواکەی ئێمەی دەکرد. عومەری مام عەلی لە سەرینایی پشتگیری کردنم لە زەوی‌وزاری بەرەی مالی کوێخا محەمەدی پیازۆك کە عومەر تەمای لێ‌نابوو، دوو شایەدی درۆی ڕاست‌کردەوە لێم کە بە تصادف هەردووکیان لە سوێندی‌درۆ پێشتر حوکم درابوون. لە هەوەڵ جەلسە عومەر بۆم تێ‌کۆشا گوتی، جەنابی حاکم ئەم کابرایە سەرۆکی شیوعی هەموو دنیایەیە ئەمەش دەلیل. بەیاننامەی ئینتیخابیمی لە باخەڵی دەرهێناو دایەدەست حاکم گوتی، بێ‌خوێنەوە هەموو شتی تێدایە. دوو شایەدەکەشی کە هەر پێ‌بازوکی بوون دەستیان بە قورئان دا دا کە ئەم کابرایە لەپێش موزاهەرەوە دەڕۆیی‌و هانی خەلقی دەدا بۆ ئاژاوە.. شایەد بۆ نوێنەرەکەی حیزبیش پەیداکرا.. لە ئاکام دا من و کاکە زیاد تەبریە بووین. نوێنەری حیزب دە مانگ حوکم درا.. حاکمەکەی کە ئەم حوکمەی‌دا زۆر عەیبدار بوو چونکە لە کەشفی جێگەی (حادثە) مەعلووم بوو کە شایەدەکان مومکین نی‌یە ئەو کابرایەیان لە موزاهەرە دیبێت چونکە لەو شوێنەوە موزاهەرە هەر نەدەدیترا جگە لەوەی مەودای دووربوو.

من مامەوە هەتا قەرارەکەی مەحکەمەم بۆ ئەو نوێنەرە ئیستیئناف کرد.. لە کەرکووك دادگەی ئیستیئناف حوکمەکەی هەڵ وەشاندەوەو برادەرەکە دەرهات. زۆری نەبرد ڕۆژێکیان عومەری مام عەلی بەگەل دەستە برادەرێکم کەوت و هاتە لام: لە دوورەوە عوزرخوازی کردو پەشیمانی خۆی دەربری. من لە باری وەها کوردی‌گوتەنی ملم لە موویەك باریکترە: کێشەی ئێمە لەگەڵ ڕۆژگار گەلێك بەو لای ئەوەیە حیسابی وردو قووڵ بخەمە کارەوە بۆ بابایەکی ئەوتۆیی کە

وەکوو هەزاران بێ‌دەسەلات بایەك دەی‌هێنێت و دەی‌بات. پاش ئەم مەسەلەیە عومەری مام عەلی هەتا مردنی بە دۆست مایەوە. گەردەنی

ئازادبێ. یەکێك لە دوو شایەدەکان لە قوڕولیتەی لافاوێك دا خنکا، ئەوی‌دیکەیان نازانم سەری بەچی گەیشت..

ئەو ملکانەی بەرەبابی ماڵی کوێخا محەمەد کە من تێیدا خەریکی پارێزگاری بووم بەر زەمانی ڕەئیس تەسوییەکی کورد کەوت کە جێی متمانەم نەبوو هەرچەند ناسیاوی کۆنینەمان بوو، بە جۆرێکی ئاشکراش ویستی ترسم نەهێڵێ لە نەتیجەی دەعواکە چونکە زانی من هەرجارە بە بەهانەیەك موحاکەمەی ئەو زەویانە دەوەخرێنم.. من هیچ شتێکم لە ڕووی ئەو ڕەئیس تەسوییەیە نەدا بەڵام دڵیشم ئاوی نەخواردەوە بە بەڵێنەکەی.. هەتا نەقڵ نەبوو کۆتاییم بە موحاکەمەکە نەهێنا. چاك بوو زەوی‌یەکان سەلامەت دەرچوون.

لێرەدا بە باشی دەزانم تەپوتۆزێك برەوێنمەوە کە لەو ساڵانەدا بە دەوری محاماتی منەوە پەیداکرا گۆیا من ملکی ئاغاو ملکداران دەپارێزم. هەڵبەت قسەی ئەوتۆیی لە بوختانێکی ڕەجاڵ بەو لاوە نی‌یە. جارێ دەبێ بڵێم کەسم نەدیت لەو محامیانەی کوردپەروەرو چین پەروەر دیفاعی لە قاتل و لە خاوەن ملك نەکردبێت کەسیشیان ناوی کەسیان نەدەهێنا کەچی لە ئاست من دا جۆرێکی‌دیکە بوون. لە نموونەدا دەڵێم، بەرەبابێکی سەربەتایەفەی مەحموداغای پژدەر من و مامۆستا بەکریان کرد بە محامی بۆ ساغ کردنەوەی ملکەکانیان لە تەسویە.. محامیەکی بەرپرسی گەورەی حیزبێك لەوتوویژدا ڕەخنەی لێ‌گرتم کە وەکاڵەتی (اقطاع) دەکەم. دواتر کاغەزی ئەو محامیەم دیت بۆ ئەو بەرەبابەی نووسی‌بوو دەڵێ حەز دەکەم وەکیلی ئێوە بم ئنجا لە ماوەیەکی چەند ڕۆژدا ئەگەر لەگەڵم ڕێك نەکەون گلەییم لێ‌مەکەن دەبمە وەکیلی موددەعییەکانتان.. [من خۆم لەبرسانیش بمرم ڕێگەی وەها ناکوتمەوە م.م.]

من کە محاماتم دەکرد فەلسەفەم لەلاوە بۆ نەدەخواستەوە: کە خۆم ڕازی بم ملکداربم دەبێ ڕازیش بم بەملکداری خەڵق ئەمەش حەقیقەتێکە لە ناوەرۆکی محاماتەوە هەڵ دەقوڵێ نەك لە فەلسەفەی لاوەکی‌یەوە. بەشێکی دەعواکانم هی فەلاح بوون بەشێکیشی‌هی ملکدار. بەش بە حاڵی خۆم هیچ بە تەماش نەبووم هەڵی تەسویە بکەم بە هۆی نانەوەی شۆڕشی چینایەتی. لە دێیەك هەرا پەیدابوو لەنێوان فەلاح و ملکدارەکە. چەندێکی کوشتان تێیدا محامی بم نەم سەلماند چونکە هەموو پژدەرم دەرابایێ ئەوەی نەدەهێنا خوێن لە لووتی کەس بێت.

لە نموونەی چالاکی ئەو ڕۆژانەم دوو ڕووداوت بۆ دەگێڕمەوە. یەکەمیان ئەوە بوو مینەی عەلیاغای گەناو داوای کردم بۆ مەحکەمەی قەڵادزە لە تۆمەتی قەتلی ڕزگار بکەم. لە بۆسکینەوە، سبەینەی ئەو ڕۆژەی تەحقیق لە دەعواکە دەکرا چووم بۆ قەڵادزە. میناغاو کوڕێکی لەلایەن بۆرەپیاوێکەوە شکاتیان لێ‌کرابوو کە گۆیا کوڕێکی مێردمنداڵەی ئەویان کوشتوە دەعواکە درۆیەکی زڕە درۆی هەڵبەستراو بوو، بە پارە ئەو کابرایەو شەش شایەد، ڕاست کرابوونەوە بۆ لەناوبردنی میناغا کە کابرایەکی فێڵبازی تەماعکار مرخی خۆی لە ملکەکانی میناغا خۆش کردبوو بە هەویای ئەوەی لە دەمی تەسویەدا بتوانێ بۆ خۆیانی ساغ بکاتەوە. ڕۆژ ڕەمەزان بوو منیش بەڕۆژوو: باوکێك و شەش شایەد ڕەپەیان لە قورئان هێنا بە تەمایەکی کەم بۆ خاتری فێڵبازێکی بێ‌ویژدان. دیار بوو مەحامی‌یەك دەرسی دابوون چۆناوچۆنی شایەدی بدەن: دوو شایەد گوتیان دیتمان میناغاو کوڕەکەی ئەو جحێڵەیان لە شاخی هەڵ داشت. دوو شایەد گوتیان بەر لە مردنی گەیشتینە سەری، ئیقراری دا کە میناغاو کوڕەکەی کوشتیانم. دوو شایەد گوتیان ئەو کوڕەمان چەند ڕۆژێك پێشتر بە پەشۆکاوی دیت تێی گەیاندین کە میناغا بەتەمایە لەسەر نامووس بی‌کوژێت. خولاسە دەعواکە پەرچەم کرابوو کە ئاو نەدەڵێنێ خوای لەسەران مرۆ چۆن دەزانێ وەها بەرەواژ بێتەوە بۆ دەروون پیسی‌و بێ‌ویژدانی!! من جارێ وەکالەتیشم بۆ میناغاو کوڕەکەی دەرنەکردبوو بەڵام حاکمم تێ‌گەیاند کە دەبمە وەکیلیان. پاش ئەو شایەدیانە بە حاکمم گوت مەحکەمە لە خەڵق چۆڵ بکە قسەم لەگەڵتدا هەیە، هەتا لە قسەشم دەبمەوە نابێ لە غەیری قایمقام ڕێ بە کەس بدرێ بێتە ژوورەوە. قایمقامیش بۆیە حەقی هاتنی هەیە چونکە قسەکانم پێوەندی بە وەزیفەی ئەویشەوە هەیە.

مەحکەمە چۆڵ کراو دەرگا داخرا ماینەوە من و حاکم: پێم باوەڕ بکە، خوێنەری خۆشەویست، ئامادە بووم لەو ژوورەدا بە تێلا لە حاکم بدەم ئەگەر قسەی لێ نەسەلماندبامایە.. کوردی دەڵێ «لە دین دەرچوو بووم.».

گوتم فلانەکەس: شتێکت پێ‌دەڵێم هی ئەوە نی‌یە ڕەتی‌بکەیتەوە، دەبێ بێ‌دووپات کردنەوە جێ‌بەجێ بکرێ. واتە لێمی بسەلمێنێ، هێشتا زاری نەکردبووە بپرسێ چم مەبەستە لەسەر قسەم ڕۆیشتم و گوتم: میناغاو کوڕەکە تەوقیف ناکرێن...

ئەو حاکمە، ماڵی بە خانەی خوابێ. بێ‌جووڵە گوتی: تەوقیفیان ناکەم.

ئنجا گوتم: باپێت بڵێم بۆچی وەها لە حەد دەرچووم.. هەموو پژدەر بە دیار ئەم مەحکەمەیە گوێ‌قوت بووە: ئەگەر میناغا تەوقیف بکرێ لە ماوەی حەفتەیەك دا صەد دەعوای وەهات بۆ دێت، چەند شایەدێك ڕەپە لە قورئان دێنێت و ملکدارەناحەزەکە بەگرتن دەدات بە

تەمای ملکەکانی. . ئەوساش هەرایەك پەیدا دەبێت نە بە مەحکەمەو نە بە قائمقام و نەبە عومەر عەلی [متصرف ئەوسای سلێمانی] چارەسەر ناکرێت کەسیش سەرەدەری لە ئاکامەکەی ناکات بە چ لایەك دا دەکەوێت. عومەر عەلی لەو رۆژانەدا دژی ئاغاکانی پژدەر بوو.

کە دەرچووم لە ژووری مەحکەمە ئەو ناوە مۆنجەی دەدا لە قەڵەباڵغی. میناغاو کورەکەی وەکوو مەلی بەرباران بە کزی راوەستا بوون: کە زانـدرا میناغا تەوقیف ناکرێ خەڵقەکە وەك تەلی کەهرەبایان گرتبێ وررووژان. . میناغا گوتی: فلان، ناموسی لێ‌دەرچێت هەرچی خوا بەمنی داوە هی تۆیە. پێم گوتەوە، هەموو پژدەرم پێ بدەیت ناموێ. من شەری سەروناموسم بۆ کردوویت خۆ، فلسێکم نەخستۆتە سەر سامانت. . پاش بەرپابوونی هەرا لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم کە هەمووی چوار ساڵێك لەو موحاکەمەیە دواکەوت، ماڵی میناغا بوو بە قوناغی حەسانەوەی صەدان لەو کەسانەی خواخوایان بوو میناغا لەو موحاکەمەیەدا بە پەتەوە بکرێ. .

ئەو رۆژە دەوری عەصر کە گەرامەوە بۆ بۆسکێن، لای شێخ حسێنی حاجی سەیید، لەسەر قەیاغی دەربەندرا دیتم شێخ حسین هاتوە کە بەیەکەوە بۆ بۆسکێن بگەرێینەوە هەرکە دیتمی گوتی رەنگت گۆراوە دەڵێی رۆژوو تینی بۆ هیناوی، منیش باسی چەندوچۆنی ئەو دەعوایەم بۆ گێرایەوە کە چەند بەدەست سوێندی درۆزنانەی شەش شاهیدو باوکی (مقتول) سەغلەت بووم.

کەسێکی وەها بزانێ کە درۆی جاری ئەوها پشت گیری کردنە لە هەژار دژی زۆردار، ئەو کەسە خۆی دەخافڵێنێ‌و لە هەمان کاتیش دا رێ خۆش دەکات بۆ خۆی کە لە هەل دا درۆی ئەوتۆیی بکات بە تەپکەی تەماع. .

بابەکری سەلیم ئاغا کە گەورەی ئەو تایەفەیە بوو میناغای پێ‌دەناسرا کە زانی هەڵوەستم لەو دەعوایەدا چۆن بووە گوتبووەی لێرە بەدواوە با کەس پرس بە من نەکا بچنە لای فلان. بابەکراغا ساردایی هەبوو لەگەڵ خاڵەکانم و لەگەڵ تایەفەی مەحمووداغاش کە خاڵوانی خاڵەکانمن و دۆستی خۆیشم بوون، بەپێی عادەت و بەرژەوەندی قاڵب بەستوو چاوەروانی نەدەکرد من هێندە بە پەرۆش بم بۆ خزمێکی ئەو، بێ تەماعیش. من جگە لە شەخسی میناغا کەوا زۆر زۆر دەیان ویست لە هیچە بە پەتیەوە بکەن، بۆ هەموو پژدەر لە پەرۆش دا بووم کە لەسەرێنایی دەعوای وەها ناحەق و بوختانکەر و چرووك باری بشێوێت و قەسابخانەی تێدا بەرپابێت.

ئەم مەسەلەیە گەلێك لایەنی‌دیکەی بە سفتوسۆی تێدایە، من بەلامەوە لێ‌دوانی پەسەند نی‌یە.

رووداوی‌دیکە ئەوە بوو کە لە دەعوای دێی مەمەنداوا کە تێیدا وەکیلی بابەکراغا بووین کەشفی تەسویە (وضع الید)ی بۆ بابەکراغا دانا. فەلاحەکان خۆیان بە مەغدوور زانی، رەنگە مەغدووریش بوون، چوون پەنایان بردە بەر عومەر عەلی، متصرفی سلێمانی. کاغەزێکی رەسمی لە عومەر عەلی‌یەوە بۆ سەرۆکی تەسویە هات داوای لێ‌دەکات کە خۆی بچێ بۆ دووپات کردنەوەی کەشفەکە. سەرۆك تەسویە، خەلقی سلیمانی بوو. لە وەلام دا بۆی نووسی‌یەوە:

نزولا عند رغبة سعادتكم قررت إعادة الكشف في المقاطعة المذكورة بنفسي. ئەگەر هاتبایە لە خۆوە بریاری دابایە کەشفەکە هەڵ وەشێنێتەوە چ گلەییم نەدەبوو بەلام وەها پاتەپات بە خاترانەی متصرف قانوون ژێر پێ بیەخێت هی سەلماندن نەبوو: تازە چ متهانە دەمێنێ بە دادو حەق و ناحەق. چوومەلای ویستی مجاملە بکات گوتم ئەچایە نەناوێشت دەخۆمەوە من لەم دەمەرا لێت دەچمە شکات: چەندێکی هەوڵ‌دا گوێی خۆم نەدایێ. مامۆستا عبدالرحمان نوورجان، معاون تەسویە بوو، خەریك بوو شەرەکە بکات بە شەری خۆی، پێم گوت تۆ دەخلت بە مەوزووعەوە نی‌یە هەر چونکە کۆنە مامۆستاشمی لێت بەدەنگ نایەم [لە دەعوایەك دژی ئێمە بێ‌قانوونیەکی کردبوو، ئەویش بە ئەمری سەرۆك تەسویە، هی ئەوە بوو ئەگەر لێی‌بکۆڵرێتەوە دووچاری سەغلەتی‌یەکی زۆر بێت. من هەر هەم لەبەر مامۆستایەتیەکەی‌و هەم لەبەر بێ‌دەسەلاتیەکەی هیچم تێدا نەگوت، هەروەهاش کاك بەکر].

یەکسەر چوومە بەغداد: هەوەڵ جار سەردانی (مکی جمیل) کارگێری گشتی تەسویەم کرد کە ناسیاو و کۆنە ئاشنا بوو، زاتی نەکرد هیچ بکات گوتی: أخي عمر علي فد عفريت منو يگدر له. .

ئنجا چوومە لای ئەحمەد موختار بابان، وەزیری مالیە بوو. من وەزیری عدل (عبدالجبار التكرلي)م نەدەناسی، مەسەلەکەم لە ئەحمەد موختار گەیاند: تەلەفۆنی لەگەڵ وەزیری عدل کرد هەموو قورسایی خۆی هاویشتە سەر مەسەلەکە نەك تەنها چونکە خاتری منی دەویست بەڵکوو وەك خۆی گوتی: هذا اخلال خطير بالقضاء والعدالة. .

کە گەیشتمە عەدلیە (مکی جمیل) بە چاوەروانم بوو، خێرابەخێرا لە ژووری (مدیری عدلی عام)ەوە بۆ ژووری وەزیری بردم لێم نەگەرا سەلامیش لە مدیر عام بکەم کە ناسیارم بوو. گوتم با خەبەری وەزیر بدەین. گوتی أخي الوزير ينتظرك على جمر. .

دەرگای نێوان ژووری مدیر عام و وەزیری کردەوە منی پاڵ پێوەناو خۆی گەرایەوە دواوە. ماموستا تەکەرلی پیاوانە وەریگرتم، لەحەد بەدەر موجامەلەی نواند. جارێ لەپێشەوە بانگی (مکی جمیل)ی کرد و گوتی هەر بە تەلەفۆن ، لەپێش چاوی فلانەکەس لە رەئیس تەسویەی رانیە بگەیەنە کە دەست بۆ هیچ ئەوراقەك درێژ نەکات.

مەکی جەمیل چاوەنۆری کردم لای مدیر عام. وەزیر دوای قەو لەتیفە رووی تەکلیفی لێنام و گوتی: دەزانم خۆت حەز ناکەیت لە وەزیفە ئەمما پیاوی راست و پاکی کوردم بو ئیقناع بکە مەسئولیەتی ئەو ناوچانەی پێبدەم بەڵکوو لەو تەرزە رەئیس تەسویانە قوتار دەبین.

[دواتر خەبەرم پێدا کە ئەوانەی من شیاویان دەبینم وەکوو منن حەز لە وەزیفە ناکەن]

لەگەل (مکی جمیل) چووینەوە تەسویەی عامە. بە تەلەفۆن لە سەروك تەسویەی رانیەی راخوری: لاتتحرك من غرفتك. لاتلمس ورقة. لاتطلع في کشف. کلشی ماتسوی الی ان تجیك اوامر.

بۆ سبەینێ ئەمر دەرچوو بە لادانی لە سەروکایەتی تەسویەو دابەزاندنی بۆ معاون تەسویەو نەقلیش کرا بۆ شوێنێکی وەکوو قەرەداغ، دەربەندیخان. ناوی شوێنەکەم لەبیرنەماوە. بەلام کە ئەمەیان کرد پێشتر بۆیان روون بۆوە کە سەروکی تەسویە کاغەزەکەی بۆ متصرفی سلێمانی نووسیوە، ئەویش بە تەلەفۆن مەعلووم کرا چونکە ژمارەو تەئریخی ئەو کاغەزەم لابوو.

وێنەی ئەوتۆیی لە تەجرەبەی پارێزەری بە بەریەوە هەیە نیگای خوێنەری بیست سێ ساڵەیی بەسەر دیمەنێکی قانوونی رۆژگاری بەر لە خۆیدا بکاتەوە کەوا رەنگە بە تەمای نەبووبێت: من موعاریزێك بووم موراقەبەم بەسەرەوە بوو. لە دەمی (عدوانی ثلاثی) بۆ سەر میصر، بۆ هەر کەشفێکی تەسویە وەیا لە دەعوای دیکەدا چووبامایە دەستەی رەسمی لە هەندی کاتب و پۆلیس و فەراشانیان رادەسپارد ئاگایەکیان لە هەڵستان و دانیشتنم هەبێ. کە چووم بۆ کەشفی گەناو مەخفەری شورتەو موعاوینی تەسویەش راسپێردران بۆ ئەم لایەنە. لەگەڵ ئەمەش دا رێزم دەپارێزراو قسەم دەبیسترا وەك تازە گوتم رەئیس تەسویەیان لەسەر موراجەعەی من هەڵ داشت. ئەو خەلقەی پێش شۆرشی تەمووز گورگ و درندە نەبوون. لە دەستیان هاتبایە حەزیان دەکرد خەلقیان لێمەمنوون بێت. مرۆکە رەفتارو ناکاری بە پاکی رسکابێت لە هەموو دەورانێك دا مەردایەتی خۆی دەنوێنێت، کە دەروونیشتی کرمی بوو دیسانەوە لە هەموو دەورانێك دا چلکنی خۆی بەدەر دەداتەوە.

لە یادی رەوی سێ قۆڵی بریتانیاو فەرەنسەو ئیسرائیل بۆ سەر میصر دێتەوە بیرم کە خەبەرەکە لە رادیۆ بیسترا من لە هەولێر بووم. ئیشی محامات بردمی بو قەلادزە: شەوان لە ماڵی حاجی ئەحمەدی خاڵۆزای کاك بەکر دەنووستین. هەموو عالەم بەدڵ بۆ میصر لە پەروش دا بوو، ئیمەی سەربەسیاسەتیش پتر لە عالەم بەو رووداوەوە دڵ گەرم بووبووین چونکە تێشکانی میصر دەیکێشایەوە بۆ کەمتر بوونەوەی ئومید بە لاچوونی توندوتیژی سیاسەتی حکومەتی عیراق.

شەوێکیان بەدرەنگەوە کەوتینە ناو جێگە: کاك بەکر خەوی لێکەوت من جارێ بزەی چاوم دەهات. رادیۆم بەسەر ئیستگەی میصرەوە کردبۆوە لە ناکاو خەبەری ئینزارەکەی سوڤێت کە بەو سێ دەولەتەیدا بوویخوێندەوە کاك بەکرم بە خەبەر هیناو ئەو موژدەیەم دایێ. رەنگە هەتا لای بەیانی لە خۆشیان و بە دیار خەبەری نوێترەوە نەنووستبێین. خۆشی ئەوتۆیی لە ناوێنەی دواروژدا بەیتە مەشوورەکەم بە خەیاڵ دا تێدەپەرێنێ کە دەڵێ:

که من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ
به من چی باغی عالەم جوملە بەر بێ

بەلام مەعلوومە مروی بێدەسەلات چ تاك بێت و چ کومەل، بە هەلس وکەوتی لە خۆی دەسەلاتدارترانەوە دەخەریکێت.

هەر لەو بەینانەدا بوو چەند کەسانێکی ناوداری موعارەزەی بەغداد بەر حوکمی عورفی کەوتن، لەمانە (صدیق شنشل) بۆ قەلادزە دوورخرایەوە. من لە قەلادزە بووم، حکومەت رێی نەدەدا کەس بچێتە لای پیوەندیم بە قایمقامەوە کرد کە ئیمکان نییە سەردانی (صدیق شنشل) نەکەم، رێشم نەدەن من بۆی دەچم: ئیوە دەم گیرنەوە نام گیرنەوە لەدەست خۆتاندایە. ماڵی ناوابێ فیلی لە حکومەت کرد. بە ناوی واجیبەوە خۆی سەردانی ماموستا شەنشەلی کرد، منیش بێئەوەی لە رواڵەت دا تێخوێندرابێتمەوە. وەیا ناوم خرابێتە لیستەی سەرلێدەرانی باباى دوورخرایەوە گەیشتمە ئەو ژوورەی ئیستیراحەتخانەی کە شەنشەلی لێدابەزێندرابوو. پێش ئەوەی بچین بو لای، تەرتیباتی خواردەمەنی بو کرابوو لە ماڵی حاجی ئەحمەدەوە. نازانم چۆن وەصفی ئەو بەیەکتر گەیشتنەمان بکەم. کە دێتەوە یادم چ برسێتییەکی چێشتبوو لەو ماوەیەدا کە بو قەلادزە بەرێکرابوو تا ئەو دەمەی خواردنەکەی گەیشتێ تەزووم پیدا دێتەوە. ئەو لە خەوە هیچ دادو برۆی لە دەست برسێتی، وەیا مامەلەی گەیاندنە قەلادزی نەکرد بەلام دارسانی بۆ سەر خواردن فیلمی ئەو گەشتە خۆشەی نێوان بەغدادو ژوورەکەی

ئیستیراحەتخانەی بە بەر چاوی زەینی بنیادم دا دەگێرا. قایمقام بەینێك لەگەڵمان دانیشت بایی ئەوە بکات کە دواتر ئەگەر پیویست بوو بتوانێ بڵێ لەوتوویژیان خوّم حازربووم. . بە بەهانەیەك ژوورەکەی بەجێهێشت. چی شاردرایەوە نەبوو لەنیوان دا ئەوە نەبی کە قسەی دوو قوّلی نیوان دوو برادەر خوّشترو بێگرفترە لەوەی قوّلیکی سێیەم وەك پینە پیوەی بنووسیت. (فایق سامرائی) بو هەڵەبجە دوور خرابوّوە، کوّمەڵەی وەتەنی دیموّقراتی لە بەغداد حەبس بوون. . ئیتر لەو جوّرە خەبەرانەو هەندێ تەعلیقات و پێش بینیو چاوەنوّری دواروّژو بابەتی ئەوتوّییو باری ناوچەیی کوردەواری بوو کەکوردەواریبوو کە ماوەی دانیشتنە دوو قوّلییەکەمانی پر کردەوە. قایمقام کەرکووکی بوو. بە چەند ساڵیك دوای من لە حقوق دەرچووبوو. دوستی خالەکان و خوّیشم بوو: هەموو هەمواریەکی لە ئیمکان دا بێ بوّ حەسانەوەی (صدیق شنشل)ی جێبەجێکرد. بە زوویی رێدرا خەلق بچیتە لای، لەلایەن خزمەتیشەوە تێکرای قەڵادزە بێقسوور بوو بوّی. دواتر، وەك خوّم چاوەنوّرم دەکرد، صدیق شەنشەل خوّیشی بوّمی گێرایەوە کە تییان گەیاندوە من پاریزگاری دەرەبەگ دەکەم. . پاش شەش حەفت ساڵیك کە لە پەراگەندەیی ساڵی ١٩٦٣ ماڵەکەم لە هیروّ بوو، کوّمەلیکیش پەنابەری سەر بە چەپ بووبوون بە میوانی ماڵی مەحموودی حاجی ئاغا [مەحموداغا لە زستانی ١٩٥٥ کوّچی دوایی کردبوو] لە نیوایان دا برادەریکی عەرەب بوو تووشی نەساغی دڵ بووبوو، تکای بوّ کرابوو لە حاجی ئاغای مەحموداغا کە ئیزنی بوّ وەربگرێ لە دەرەوەی ولات تەداوی بکرێ. . ئا لەو ساڵەدا دەستەیەکی شەش حەفت کەسی بووین لە بیرورای هەمەچەشنە قسەمان لە هەموو مەیدانیك دا دەگێرا هەتا هەل پەیدابوو کە بەو برادەرە عەرەبە بڵێم: ئیوە لەسەر چەند دەعوایەکی تەسویە کە من تیدا وەکیلی ئاغاکان بووم ناوی منتان زڕاند هەر لیرەوە هەتا پەکین و موّسکوّ کەچی ئیستا من پەراگەندەم لە خانووی مەکتەبی منداڵان دا سەربەخوّ دەژیم، حاجی اغا نەك دوّستمە خزمیشمە، خوّیشی بە برا چووکم حیساب دەکات ئنجا ئەگەر لە برسان بمرم و بەدەردی سیل هەڵاهەلابم ئەو چاوەی لێبزناکەمەوە کەوا توّ دوژمنی بابەکوشتەی دەرەبەگی بە ئومیدی تەداوی لە ولاتی ئیستیعمار چاوت لێچرکردوّتەوەو بە نانی ئەویش دەژیت. . قسەکانم بێرەحمانە بوو بەلام جەرگەی راستیو دادی دەپێکا. ئەو برادەرە هەر ئەوەندەی پێکرا کە بە کوڵ بداتە گریان، خوّ منیش لەو دەمەدا بوّی گریام. . لە موناسەبەدا دەڵیم، کاتیك هەر لەبەرەو کوّتایی پەنجاکان دا کە سەرەی تەسویە گەبشتە دێی هیروّ مەحامیە تیکوّشەرەکان دەعوای تەسویەیان خستبوە قالبی خەباتی چینایەتییەوە تا ئەوەی لە تەسویەی دێیەك لە دێیەکانی پژدەر هەرای خویناوی رووی دا ئیتر من دەستم لە دەعوای تەسویە کیشایەوە. حاجی اغا هاتە کوێی شەویکیشم لێ میوان بوو کە وەکالەتییان بۆ ، لە تەسویەی هیروّ، عوزر خوازیم کردو دەعواکەم بە ملەوە نەگرت. ناشزانم چ تیکوّشەریکیش چوە ژیر ئەرکی ئەو دەعوایەوە. لەو ماوەیەدا کە دەعوای نوێم نەگرت تەنها خەریکی دەعواکوّنەکان بووم. .

شەراکەتی بێ سەنەدو ئیمزام لەگەڵ کاك بەکر ئیسماعیل دا ئەوەندە بێگرفت و بێقورت بوو دەت گوت شەریکی خوّمم: روژەك لە روّژان، نەك هەر گەردی لە دڵم نەنیشاند، بگرە ئەوە نەبوو بە رەفتاری تازەی ئەمروّی دوێنیم لەبیر نەباتەوە. بێفەرقی لە بەینمان دا گەیشتبوە پلەی دوایین. لەخوّوە تێبینی ئەوەی دەکرد کە پیوەندی دوّستایەتیو خزمایەتی بەربلاوم لە رانیەو پژدەر لیم داوا دەکات گەلیك دەعوای بە ئەرکی بێمزە بە ئەستوّوە بگرم ئیتر ئەو بەزیادەوە تییدا دەکوّشا وەك کە بوّ برای خوّی بکوّشیت. وەها دەبوو لەو کەشفانەی ماندووبوونی زوّریان تیدابوو، بێئەوەی پیم بڵێو لەسەرمی حیساب بکات بە چاکە، خوّی بە تەنها بوّیان دەچوو. لیرەدا نوکتەیەك دیتەوە بیرم سەر بەو روّژانەی کە جارێ دەعواکەی دوڵی شالە بەگیان لە کیشەدا بوو. سبەینەیەکی هاوینە ٣٢ کەس لە شیخ مەسووریو کانیوەتمانییان بە ١٦ بارەدارو دەپازدە کەڵەباب و مریشکەوە لیم میوان بوون. دەست بەجێ ٨ بارەدارو نیوەی کەڵەباب و مریشکەکانم بوّ کاك بەکر نارد، راشم سپارد پێیبڵین ئەگەر حەز دەکات شازدە میوانیشی بوّ دەنیرم بەپێی شەراکەت. گوتبووی خوابەزیادی بکات ئەو پەرەوڵانەم بەسە. . .

ئیمە لە بیستەکانەوە بەپێی داخوازی پیوەندیمان بە دەشت و دەرەوە حەساریکمان هەبوو جێی ١٠٠ ـ ١٥٠ ولاغی تیدا دەبوّوە، دەرگای بەرانبەر بە دەرگای ماڵەکەمانەوە بوو، نە لە داکردنی ولاغ نە لە هاتوّچوّی ئالیك دانیان هەستمان بە ئەرك و زەحمەتی نەدەکرد. لەبەر راهاتن، میوانی دەشت و دەریش ئیسکیان قورس نەبوو لامان، بەتایبەتی کە لیان میوان دەبووین بەدڵ و گیان خزمەت و حورمەتمان لیان دەدیت. جێی نووستنی میوانی شەوانەشمان هەبوو کە عەلاقەی بەماڵەوە نەبیت، خوّ شەوانی هاوین کە خەڵق لەسەر بانان دەنووستن لە رایەخ بەو لاوە پێخەفیشیان نەدەویست. خولاسە بوّ وەزعی من بەخیرهێنانی بێعەزاب بوو چ جایی ئەوەی میوانیکی پێشتر نەمەکم کردبێ لە ماڵی، وەیا پیمەوە خەریك بووبیت. . کاك بەکریش لەلای

خۆیەوە کە جیپێکی لێدەخوری و من سەیارەم نەبوو، جیپەکەی هیندەی حەسارەکەی ئیمە بو من بی تەکلیف بوو: دەیان و، رەنگە، صەدان سەفەری سلێمانیو رانیەو ـ لادزەو بیتوین و بیرەو ئەوێمان بەیەکەوە پێدەکرد، وەهاشی بە خاوینی رادەگرت هەمیشە چریسکەی دەهات. بە کەتەلۆگ رەفتاری لەگەڵ دا دەکرد. لێرەش دا نوکتە دەهاتەپێش: کە لە بوسکێن دەبووین، زستانان، جیپەکەی شێخ حسێن سەر لە بەیانی بەپاڵ نەبا هەڵ نەدەبوو ئیتر وادەبوو کۆمەڵێك لە نوکەرو تووتنەوان بە پاڵ دەیان گێراو هەزار گاڵتەشیان پێدەکرد ئنجا هەل دەبوو کەچی جیپەکەی کاك بەکر کە کونتریش بوو لە هی شێخ بە یەك سیلف دەکەوتەگەر. شێخ حسێن دەیگوت جیپی خۆم هی پاڵەوانانە وەك کەڵەگا دەغەزرێ. کاك بەکریش جیپی هەیە؟

ئەم وێنانە لە ژیانی من وتودا رووپیوێکی بەرین داگیر دەکات لە مەیدانی چالاکیمان، خۆ هەموو دەم هەر خەریکی بەرەوپێش بردنی رەورەوەی میژووی گرژو مون نابین، ئاخر گرژینەوەیەك، سەلام و مەرحەبایەك، تۆران و ئاشت بوونەوەیەك و شین و شادییەك و کەلابەگوێزانییەك و کەوشەك و سیبازێکی هەر دەبێ تێدابێت. راستە بگوترێ، نابێ یاداشتی بسمارك و لینین و چەرچل کە لە چەرخ و فەلەکی سیاسەتی جیهانی، وەیا هەر نەبێ بەشێکی بەرچاوی جیهان تێنیشتن، یاداشتیان لە کاری گرنگەوە بۆ کاری بێبایەخ راگوێزێت بەلام ئیمەمانان بە حال چەند داوێکی کلافەی سیاسەتی بێدەسەلاتی کاوڵگەی ولاتی خۆمانمان هەڵ کردۆتەوە کەوا رەنگە بە چەند لاپەرەیەك لە حیکایەتیان ببینەوە ئەگەر لە کلافەی بابەتی غەیری سیاسەتی رووتیش داو هەڵ نەکەینەوە. خۆ ئەوەی راستی بێ بە پێی حال و باری کەم دەسەلاتیو بەرتەسکی جغزی تەلاشمان پتر لە تێوەرامانی هەرەمەی رووداوی ژیانی خاوەن یاداشت روون دەبینەوە تا ئەوەی خەبەراتی بە سەرو سەدای گرنگ و زیندە گرنگی ناوخۆو جیهان بدەینە بەر زەین و خەیاڵی رۆخ ئاگردانە ساردو سڕەکانمان و دەوروبەری زەوییە سەرکێل کراوەکانمانەوە: یەنی ژاپۆنی لەتەك رۆبڵ دا وەستا بەلام بە دۆلار وێرا. تەرازووی تیجارەتی برازائیل و برازیل لەنگەریان بەزی. لوکەی فیلستان بە تراکتۆری پەنیرستان ئاڵ وگۆڕ کرا. نۆرەسەرۆکایەتی نوێنەری شێلمستانە لە مەجلیسی ئەمن بەسەر چوو: ئنجا بە من چی؟ بەراستی، وەك کە سەلکەسلق بە کونی دەرزیدا ئاوا نابێت ئەم خەبەرانەش بە صەد پێلەقە ناتڕنجێنە ناو پۆرگی هیچ بەرژەوەندێکی من و تۆی پێوە خەریك دەبین. بەلام بێگومان کە بۆم گێرایتەوە جارێکیان لە سەردانی سلیمانیم رەشۆڵی هەمیشە زیندوو لەدڵم دا، ویستی لە نادیەکەی خۆی

متعهدی بوو داوەتێکم بکات مەرجم لەسەر دانا کە لە گون و گورجیلە بەولاوە چیدیکە ناخوم ئەویش گوتی: هەر تۆو گون؟ ئیتر کە لێبووینەوە پێم گوتەوە: رەشۆل قەت ئەم گونەت لەبیرناکەم، ئا ئەم باسە کورتیلەیە چەژێکی کوردانەی لەبەر زار ئاشتا لە یاداشتەکەم دەگێرێ.

بەر لە شۆرشی تەمووز دوو هەلکەوتی سیاسی رووبەرووم بوو: یەکێکیان ئەوە بوو، لە دەمی پێك هێنانی ئەو بەرەنیشتمانییە یەك گرتوەی کە نوینەرانیان لە وەزارەتی (١٤)ی تەمووز بەشدارییان کرد رۆژێکیان (صدیق شنشل) لە چێشتخانەی مەسبەح داوەتی کردم و بەدەم خواردنەوە تێیگەیاندم کە هەموو تەرتیباتێك بەنهێنیکراوە بۆ گۆڕینی باری سیاسی عیراق، گوتی: القضية باقية عليكم انتم الأكراد. پێم گوت من ناتوانم خۆم بە نوینەری کورد دابنێم، گوتی: بە ناوی خۆتەوە وەك گەلێك کەسیدیکە وەرە جەبهەوە ئەگەر گلەییەکیش هەیە هەر ئیستا دەچین بۆ لای سەرۆك جەمال عەبدولناصر لە قاهیرە چی لە دڵتدایە پێیبڵێ تا هیچ تێبینی سەلبی لە کوردەوە نەمێنێت. قسەمان درێژەی هەبوو، کورتەی ناوەرۆکی رای خۆم دژی بەشداریکردنم ئەوە بوو کە گوتم لایەنێکی پێك هێنەری ئەم بەرەیە بیرورایەکی هەیە کە بەرەی یەکگرتوو بە قۆناغی کاتەکی دادەنێت بۆ زووتر گەیشتن بە قۆناغی دواتر تاکوو پێبەپێ لایەنەکانیدیکەی بەرەی یەکگرتوو لەناو دەبات و خۆی بە فەرمانرەوای تاك و تەنها دەمێنێتەوە. من بە ئەرك و مەسرەفی خۆم نایەم رۆژی لەناوچوونم پێش بیەخم بۆی، با بە ئەرك و مەسرەفی خۆی ئەم ئامانجە جێبەجێ بکات. گوتی ئەمانە هێزێکن لە ولاتەکەمان ناشێ پشت گوێ بخرێن. گوتم: بایەخی هەلوەستەکەم ئەوەیە کە ئەمانە هێزن ئەگەر هێز نەبانایە منیش دوورە پارێزم نەدەکرد. ئەمە بوو هۆی بەشداری نەکردنم لەو بەرە یەکگرتوەدا. ئەوساش و ئیستاش دەڵێم: من لە جیاتی ئەوەی پارمەتی لایەنێك بدەم لە ناوم ببات، خوم دەبمە ئەندامی ئەو لایەنە، کە رەوا نەبینم ببمە ئەندامی بەولا تەریقەوە رەوا نابینم خۆم بکەمە قوربانی ئامانجەکانی کە من هەرگیزاو هەرگیز لەگەل براندنەوەو لەناوبردن و پەل پەل کردن دا نیم و نابم. هەڵکەوتی دوەم ئەوە بوو، کامل چادرچی هاتەلام لە ئوتێلی تروکادیروی بەغداد بۆ داوەت کردنم بۆ بەشداربوونم لە پێك هێنانی ئەو حیزبەی کە قەول بوو حیزبی وەتەنی دیموقراتیو حیزبی ئیستیقلالی تیدا بتاوێتەوە. کە مەنهەجەکەم خویندەوە پێم گوت، من ناتوانم پشت گیری لە مەنهەجتان بکەم چ جایی ببمە ئەندامی حیزبتان چونکە ناوی کوردی تێدا نەهاتوە. گوتی قسەت

حەقە بەڵام ئیشەکە ئانقەست نەبوو. . ویستی سبەینێ بچمەلای لە ماڵەوە بۆ پتردوان لەو مەسەلەیەو رێك خستنی دەقێکی لەبار کە باسی ماڤی نەتەوەیی کورد بکات. گوتم نوێنەرێکی گەورەی ئەو حیزبەی من تێدایم وا لە بەغدایە بەیەکەوە دێین.

سبەینێ بە جووتە چووین بۆ لای چادرچی: هەر لە سەعات ٩ی بەیانی‌یەوە هەتا یەکی پاش نیرەوڕۆ ماینەوە. . لەو بەینە من و ئەو نوێنەرە لەسەر تەکلیفی چادرچی بە پەلە دەقێکمان نووسی. .

کە گەڕامەوە کۆیێ زۆری نەبرد نامەیێکی چادرچیم بۆ هات بەم جۆرە دەست پێ‌دەکات:

بغداد، ف ٨/٦/٥٦.

عزیزی الأخ مسعود

تحیة وشوقا وبعد ان الموضوع الذی کنا قد بحثناه اثناء وجودکم في بغداد قد قوبل مبدئیا بالترحاب من قبل الجمیع. .

ئنجا دەڵێ لەبەر هەندێ تێبینی دەقەکەی ئێوە تەعدیل کرا بەم دەقە. ئاخۆ چۆنە بەلاتەوە. .

ڕاستی‌یەکەی دەقی ئەوان لە هی ئێمە چاکتر بوو، هەر وەهاشم بۆ نووسیەوە. کە شۆڕشی چواردەی تەمووز قەوما فکرەی ئەو دەقانە بە دارشتنێکی تازە بوو بە مادە (٣) لە دەستووری موقت.

خۆیشم تەکلیف کرام کە ئەندامەتی ئەو حیزبە قبوڵ بکەم، بەڵام نە حیزبەکەی ئەوان ڕێی پێ‌درا نە ئەگەر ڕێشی پێ‌درابایە دەم توانی تێیدا ببمە ئەندام.

---

## - الحلقة التاسعة -

# رحلة حياتي

مسعود محمد

تتضمن هذه الحلقة الفترة التي اعقبت حل الدورة الرابعة عشرة للمجلس النيابي بنوابه العشرة من الجبهة الوطنية والاجراءات الامنية في التمهيد لحلف بغداد وفي اثناء العدوان الثلاثي على مصر وماكان من إتجاه أطراف المعارضة لتكوين جبهة موحدة من الاحزاب والشخصيات الوطنية بنيّة تغيير جذري للحكم كله ويذكر اعتذاره في قبول دعوته شخصيا للأنضمام الى الجبهة هذه الاسباب خاصة به وكذلك يشرح اتصال كامل الجادرجي به في حيثيات توحيد حزبي الوطني الديمقراطي والاستقلال وما أثمر ذلك من إدخال مادة خاصة بالمنهج المقترح للحزبين تخص حقوق القومية الكردية ضمن وحدة العراق وصارت في ما بعد المادة الثالثة في الدستور الموقت لثورة ١٤ تموز بصياغة جديدة.

ويعرج على المظاهرة التي حدثت في كويسنجق في شباط ١٩٥٥ وتذرع الحكومة بها في سجنه وآخرين من المنتمين الى الحركة القومية الكردية ثم تقديمهم الى المحاكمة بتهمة المشاركة في المظاهرة. ويعرض نماذج من تجربته في المحاماة في مناسبات ذات دلالة من وجود إستقلال للقضاء وطرق للاعتراض والمتابعة يسلكها المحامي بجديّة ونجاح في العهد السابق على ثورة تموز ١٩٥٨ بالأضافة الى امور اخرى ذات الصفة الشخصية التي لاتخلو رحلة حياة ايّ انسان من أمثالها.

ROSHINBIRY NWE
QUARTERIY MAGAZINE
FOR STUDIES AND RESEARCHES
PUBLISHED BY: THE KURDISH
CUL TURAL AND PUBLISHING HOUSE
MLNLSTRY OF CUL TURE AND
INFORMATLON
BAGHDAD - IRAQ

رۆشنبیری نوێ
مجلة فصلية تعنى بالدراسات
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد



العنوان : دار الثقافة والنشر الكردية
الوزيرية : قرب المعهد القضائي
تلفون ٤٢٥١٨٤٦ بدالة (٤) خطوط
ص.ب ١٤٠١٦

الثمن ٥٠٠ فلس
دار الحرية للطباعة
بدل الاشتراك السنوي ٤ دنانير



نیسان بەهاری ئێمەیە وا چاوەڕێین کە بێ
هەرقەترەیێکی گەوهەرە، تەرزەی لەگەڵ دانەبێ
مۆژدەی بەهاری پێیە شکۆفەی نیهاڵی گوڵ
وەک ئایەتی ژیانەوە ئومێد ئەدا بەدڵ

پیرەمێرد